# وتەیەکی پێویست

وا ژمارەیەکی نوێی گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی دەخەینە بەردەستی توێژەران و خوێنەرانی ئازیز و بە پێویستی دەزانین ئاماژە بۆ ئەو گۆڕانکارییانە بکەین کە لەم ژمارەیەدا بەدی دەکرێن.

وەك نەریتێکی باو لە کۆڕی زانیاری کوردستان و دوای ئەویش لە ئەکادیمیای کوردی لەگەڵ هەڵبژاردنی دەستەی نوێی سەرۆکایەتی، لێژنە تایبەتمەندییەکانی ئەکادیمیا، بە دەستەی نووسەرانی گۆڤاریشەوە نوێ دەکرێنەوە.

ناوی سەرنووسەری پێشووی گۆڤارەکەمان پرۆفیسۆری خوالێخۆشبوو محەمەد مەعرووف فەتاح بۆ ماوەی زیاتر لە ساڵێك دوای ماڵئاوایی کردنی، وەکو سەرنووسەر بە سەر گۆڤاری ئەکادیمیای کوردییەوە هێڵرایەوە. ئەمەش ڕێز و پێزانینمان بوو بۆ ماندووبوونی ئەو لە پێناو پێشخستنی گۆڤارەکە و پایەو پێگەی لە ئەنجومەنی ئەکادیمیای کوردیدا.

دەستەی نووسەرانی نوێ بۆ ئەوەی گەشە بە گۆڤارەکە بدەن، مەرامیانە بە شێوەیەکی فراوانتر نووسەران و توێژەرانی کورد لە دەوری کۆبکەنەوە. بە هیوای ئەوەی لە ژمارەکانی داهاتوودا ئەم ڕەوتە بە ڕوونی رەنگ بداتەوە. هەروەها ئێمە یەکدەنگین لە سەر ئەوەی گۆڤارەکەمان لە کاتی خۆیدا بگاتە دەستی خوێنەران.

هەروەها دەستەی نووسەران، لە تەك ئەنجومەنی ئەکادیمیای کوردی، پێمان باشتر بوو ناوی گۆڤارەکە (گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی) بێت وەك ئەوەی لە زۆربەی دەزگا زانستییەکانی جیهاندا باوە.

هیوادارین توێژەران و نووسەران هاوکارمان بن بۆ ئەوەی بە هەموو لایەکمانەوە پەرە بدەین بە توێژینەوەی زانستیی هەمەلایەنە و هاوچەرخانە لە بوارەکانی زمانی کوردی ، مێژووی کورد و کوردستان، ئەدەبی کوردی ، بار و دۆخی کۆمەڵگەی کوردی ، جوگرافیای کوردستان و زانستی کوردۆلۆجیا لە جیهان ...هتد.

**دەستەی نووسەران**

# میتۆد و ڕێبازەکانی ڕەخنەی هاوچەرخ لەنێوان بونیادگەری و ڕێکخستندا

د. ئازاد ئەحمەد مەحموود

**بانێژەی لێکۆڵینەوە**

ڕەخنــە، گــرینگترین و لــەبارترین هۆکــار و بنــەمای بەدیارخــستنی داهێنــانی ئەدەبییــە، جگــە لەمــەیش، فۆرمــەکانی هونــەری و نیــاز و مەبەســتە هــزری و ڕۆشـنبیرییەکان پـێش دەخـات، هەمـەجۆری لـە میتـۆدە شـرۆڤەییەکان، دیـاری دەکات. بە درێژایی سەردەم گشت بەرهەمە ئەدەبییـەکان چ شـیعری، چ چـیرۆکی (پەخشان)، پێویستییان بە داهێنانی ڕەخنەیی بووە. لە هیچ سەردەمێکدا ئەدەب پێشکەوتنی بەخۆوە نەبینیوە، ئەگەر پانتایی و قـووڵایی ڕەخنـە (شـرۆڤە و ڕاڤـە کردن" هەڵسەنگاندن" داهێنان...) هاوتەریبی نەبووبێت، هـەر دەمێـك خوێندنـەوە (هەڵسەنگاندن و توێژینەوە)ی داهێنەرانە کز بـووبێ، ئاسـۆی داهێنـان و داهێنـراو کەوتۆتە پـەنهانی، ئەوسا نووسـەرانیش بابـەتی ئاسـایی و سـاکاری بـێ داهێنـان بەرهەم دەهێنن و ڕەخنەگرانیش خوێندنەوەیەکی ڕووکەشی و نابابەتی و لێوانلێـو لە دیاردەی دووبارەیی پێشکێش دەکەن، مەبەستیان تەنیا دەق دەبێت و هەسـت و نیاز و خولیای نووسەر بزر دەبێت.

ڕەخنـــەی ئـــەدەبی لـــە کـــاروانی پێـــشکەوتندا چـــەندین ڕێبـــاز و میتـــۆدی دەستاودەسـت کـردووە، بـە چـێژوەرگرتن لـە خوێندنـەوە دەسـت پێـدەکات و بەڕایەڵـەکانی ڕەوانبێـژی و کۆمەڵایـەتی و دەروونـی، لـە چوارچێوەی دەربڕینـدا تێپـەڕ دەبێـت، بـە وەرچـەرخانی گونجـاو، بـە سـەرهەڵدانی بونیادگـەری و دوای بونیادگەری وەك: (هیماگەری، تیۆری دەقوەرگرتن، دەقناسـی، هەڵوەشـاندنەوە، بابەتییەت، دەستاودەست...) دەگات. لـەناو ئـەو میتۆدانـەدا، ئـەو تیۆرانـەی کـە

لـەناخ و قـووڵایی زمانناسـیی هـەڵێنجراون، زۆرتـرین کاریگـەرییان لەسـەر ڕەوت و کاروانی ڕەخنەی ئەدەبیدا هەیە.

لە دووتوێی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵدراوە، کەموکورتی میتۆد لە خوێندنـەوە و خستنەڕووی ڕەخنەی هاوچەرخ، لە چوارچێوەی تیۆری و پراکتیکیدا پەنجەیان بۆ درێـژ بکرێـت. لـە دەروازەی تیۆرییـەوە هەوڵـدراوە چـەمکی زاراوەی ڕەخنـە و هاوبەندبوونی بە ناوەندە ڕێبازەکـانی شـرۆڤەکردن، کـە لـەناخی لێکۆڵینـەوەکانی زماندا دەرکێشراون دەستنیشان بکرێن و بخرێنە ڕوو. وێـڕای ئەمـەیش هەنـدێ لـە میتۆدە ڕەخنەییەکانی هاوچەرخ، کە زۆرترین کاریگەرییان هەیە و لەم کۆتاییانەدا بەدیار کەوتوون، باس بکرێن، هەروەها هەر لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەوەش فـەرامۆش نـەکراوە، کـە پـڕۆژەی میتـۆدی خوێندنـەوە و لێکۆڵینـەوەی زمانناسـی، لـەژێر ڕۆشـنایی لێکۆڵینـەوەی ڕێکخستندا چـەندین تیـۆری نـوێ وەبەرهـەم دێنێـت. لـە بونیادی ڕستەدا بۆ مەبەسـت گەیانـدن، ڕسـتەی بـەرایی و ڕسـتەی دوای ڕسـتەکە دەبنە پشتۆك، لە دەقیشدا تیۆرەکانی ڕێکخستن و دەستاودەستی یەکە و بنەمای یەکەم و کۆتایی هەموو خوێندنەوەیەکی ڕەخنـەیین. هـیچ یەکەیـەك لـە یەکـەکانی هونەری لە پێکهاتەی دەقدا بەبێ یەکتر دەسەڵات و چالاکی نابێت.

لێکۆڵینەوەکـە بـەو ئەنجامـە دەگـات، کـە ڕەخنـەی ئـەدەبی پێویـستە وەك پڕۆژەیەکی ئایندە و نوێکار بەردەوام بێت، لەبەرامبەر هەموو تیۆر و میتۆدەکانـدا دەرگای لەسەر گازەرای پشت بێت، مادام میتۆدی یەکەم میراتگرە و مافی شرۆڤە و ڕاڤەکردن بۆ دەق دەگەڕێنەوە، مادام دەقیش خانەیەکی گـەیێنراوە و سـنوور و چوارچێوەکەی ڕێکخستنە و میکانزمی دەربڕینەکەیشی زمانـە، بۆیـە دیاردەیـەکی کۆمەڵایەتییە، گشت بەها و بنەما و ڕەهەنـدە شارسـتانی، هـزری و کۆمەڵایـەتی و ئایینی و هونەری و سیاسی... تێی ئاڵاون.

**تەوەری یەکەم:**

# چەمکی ڕەخنە و میتۆد

زاراوەی ڕەخنە، زاراوەیەکی بەربڵاوە، چەندین زانیاری و ڕوخساری مرۆیی و ئاستی هزری لەخۆ دەگرێت، هەرچەند زانیاری، یان ئاستی هزری تێ بئاخنێت چەمکی دەلالەتەکەی دەگۆڕێت، بە گوێرەی پێشکەوتنی زانستە مرۆییەکان، ئاکامەکەی دیاری دەکرێت، دەق و وتاربێژی و ژینگەکەی و کایە هزری و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و هونەری و سیاسی لەگەڵ زەمەندا دەستنیشان دەکرێن.

ڕەخنە لەم ڕووەوە داهێنانە بۆ داهێنانێکی دیکە، هیچ یەکێك بەبێ ئەوەی تر مەحاڵە گەشە بکات و پێش بکەوێت، چونکە دوو بابەتی هاوتەریبن. بەرهەمی پڕ لە داهێنان پێویستی بە ساغکردنەوە و کاروبارەکانی دەبێت، هەر بۆیە داهێنانی یەکەم بۆ ئەوەی ڕاڤە بکرێت و بەهێز بکرێت و پێش بخرێت، جیهانبینی دواڕۆژی تێدا ڕەنگ بداتەوە، پێدڤی بە داهێنانی دووەم دەبێت. لەم ئاست و ناوەندەدا ڕەخنە هونەرێکی گشتگیرییە، بەمەبەستی خوێندنەوە و شرۆڤەکاری چەندین لایەنی پراکتیکی لەخۆ دەگرێت، لە دەرەتانێکی تریشدا، بەمەستی بنیات و ڕەسەنی و داهێنان، پانتایی بەراوردی دەگرێتەبەر، ئەم دوو حاڵەتەیش، لە هەوڵەکانی (ئەرستۆ)وە دەست پێدەکات، کە لە کتێبی (هونەری شیعر)دا چەند قانونێکی بۆ داهێنان دانا، بە لای (حازم قرتاجی) تێدەپەڕێن لە (منهاج بلغاء) ، تا دەگاتە (پلەی صفر)ی لەلای (ڕۆلان بارت).

حازم قرتاجی تێکۆشا بۆ ئەوەی ئەدەبیاتی ئەدەب، لە زاری خەڵکەوە، کە مۆرکێکی ئەفسانەیی، مەبەست دیارکراوەی یۆنانەکانە، بۆ واقیعی داهێنان بگوازێتەوە، بەو ئەنجامە گەیشت کە قانوونەکانی شیعریی ئەرستۆ بۆ شیعری عارەبی بەرتەسکە، چونکە بە دابونەریتی تایبەت بەخۆیانەوە پابەندە. هەرچەندە ئەرستۆ بۆ پترکردنی قانونەکانی لە شیعری عارەبیدا نموونەی داهێنانی دۆزیوەتەوەو بەکاری هێناوە[1]، دەڵێت: "من خەڵکم دیت ئەگەر لەهەندێ دیاردە

نەبوایە نەدەدوان، وەك پیشەیەكی گشتگیر، من ئەو دیاردانەم تێپەڕاند"[٢]. لەم ڕوانگەوە یەكە و توخمی داهێنانی ڕەخنەیی ڕوون كردەوە و داینا. لە سەردەمی هاوچەرخدا دەبینین (میخائیل نعیمە)، لە ڕەخنەدا گوزارشت لە خاسیەتی داهێنان دەكات، "كاری ڕەخنەگر تەنیا بژاركردن و قرساندن و ڕێكخستن... نییە، بەڵكو بەبارتەقای بژاركەر و قرسێنەر و ڕێكخەر، داهێنەر و فێركار و ڕابەریشە"[٣]. دواتر (مەحموود ئەمین ئەلعالم) قووڵتر لەم ئایدیایە دەڕوانێت، ڕەخنە بە پێوانەی ئەو ئامانجەی كە بۆ ڕاڤەكردن و هەڵسەنگاندن و ئاشكراكردن هەیەتی، ئامانجی ڕوونكردنەوە و بەقووڵایی ئاگایی و چێژوەرگرتن، ڕوو دەچێت و كەم و كورتییەكان بە تێپەڕاندنێكی داهێنەرانە تێدەپەڕێنێت[٤].

ئەگەر ئەركی ڕەخنەگر بەو شێوەیەی سەرەوە بێت كە باسمان كرد، كەواتە بۆ هیچ نووسەر و دەقێك خوێندنەوە و شرۆڤەی داهێنانیان بۆ ناكرێت، ئەگەر پشت بە میتۆد نەبەسترێت. میتۆدیش لە سادەترین پێناسەدا جگە لە جیهانبینی هزر — ڕێگایەكی بابەتییانەیە بۆ بەدواداچوونی دیاردەكان، یان دەستنیشانكردن و كەمكردنەوەی كەموكورتییەكان، بۆ لادانی پەردە لەسەر ڕاستی و ڕاستەقینەیی و ڕەهەندەكانی، لێكۆڵەر دەیگرێتەبەر، تا هۆكارەكان بە سانایی قامكیان لەسەر دابندرێت و پێوەندی نێوان بەشەكان و قۆناخەكانی، پێوەندی بە كێشەكانی تر دیاری بكرێن. ئاكام و نیازیش بەدەستهێنانی ئەو ئەنجامە دیاریكراوانەیە بەشێوەی ڕێنمایی و بنەما و قانوون پۆلین بكرێن و بگشتێندرێن، بۆ ئەوەی لە ئاستەكانی هزری و هونەری سوودیان هەبێت. ئەوەیش ڕوون كراوەتەوە، كە ناكرێت لێكۆڵینەوە بۆ هیچ دیاردەیەك ئەنجام بدرێت و شرۆڤە و شیكاریی زانستی بۆ بكرێت، ئەكەر میتۆدێكی گونجاو بەو دیاردەیە لەبەر چاو نەگیرێت، پاشان یەكەكان و ڕەهەند و پێوەندییەكانی بە دیاردەكانی دیكەوە دیاری دەكرێن.

كەواتە ڕێباز و میتۆد، ڕێگایەكە بۆ لێكۆڵینەوە لە كورتترین كات و كەمترین هەوڵدا بە ئەنجامی باوەڕپێكراو و مسۆگەر، یان نیمچە مسۆگەرمان دەگەیەنێت، هەروەها ڕێگایەكی پتەویشە بۆ ئەوەی لێكۆڵەر تا لە دەریای هزری تیۆری نقوم نەبێت و ناتوانێت لە ماوەیەكی ئەندازەییدا ئەنجامی زانستی بەدەست بهێنێت.

ئەو ڕاستییەش لەلایەن فەیلەسووفی فەرەنسایی (دیکارت — ١٥٩٥/ ١٦٢٦ز) باس کراوە، لەبارەی گرینگی و چییەتی میتۆدەوە، دەنووسێت: "وازهێنان و دوورکەوتنەوە لە ڕەخنە و لێکۆڵینەوە باشترە ئەگەر بەبێ میتۆد و ڕێبازەکان کار بکەین"[٥].

ڕاستییەك هەیە و دەبێت دەرکی پێ بکرێت، کانزای دەگمەن و گرانبەها هەمووکات لەگەڵ گڵ تێکەڵە، بۆ دەرهێنان و جیاکردنەوەی لە گڵەکە، پێویستی بە کەرەسە و ئامێر هەیە، دۆزینەوەی واتای پڕ واتاییش لە دەقدا، پێویستی بە کلیل و کۆد و میکانزمی هەمەجۆر هەیە، چونکە لێڵی لە دەسەڵاتی ڕێکخستنی دەقدا و داهێنانی ڕاستەقینە بەبێ ئەرك و سوود و سەرکەوتوویی میکانزم نابێت. جۆرجانی دەڵێت: "واتا و هاوشێوەکەی کاتێك ڕوون دەبێتەوە، کە بۆ داواکەی بگەڕێتەوە و پێویستیت پێی بێت، بەهزر هانی ئەندێشە و ئامانجی داواکە بدەیت، چەند لەگەڵی نەرمونیان بێت، بەرهەڵستی پتر دەبێت، ملنەدانی دیارتر دەبێت، ناڕەزایی توندتر دەبێت، لە ڕاستیدا بەدەستهێنانی هەر شتێك بە داواکردن و تامەزرۆیی بێت، بەدەستهێنانەکەی شیرینتر دەبێت. نموونەی ئەم جۆرە واتایە، بە مەرجانێك لەناو سەدەف دەچوێندرێت، تا سەدەفەکە شەق نەکەین نابینە خاوەنی، یان وەك ئەو خۆشەویستە وایە کە پێی سەرسامی، تا داوای یارمەتی و مۆڵەتی لێ نەکەی ڕووت ناداتێ. هەموو هزرێك ڕوومالّی ئاشکراکردن ناکات، هەموو ئەندێشەیەك بە ئامانجت ناگەیەنێ، گشت کەسێکیش لە لەتکردنی سەدەف دەستکەوتی نابێت، جگە لەوانەی کە پڕاوپڕن لە شارەزایی"[٦]. نهێنی لێڵی لە داهێنانی ئەدەبیدا، مەبەست لێڵییەکە خۆی نییە، بەڵکو مەبەستی نیشاندانی واتای بەرز و هزری بڵندە، کە بە گۆتە و وتەی سادە و ساکار دەرنابڕدرێن، دەقنووس پەنا بۆ کەرەستەکانی ڕوونبێژی: خوازە و درکە و خواستن و لێکچوون... هتد. دەبات، پێکهاتەی هەمەجۆر و فرەشێوازی پێ دادەڕێژرێت.

کەواتە ڕەخنە، جیهانبینییەکە بە ناوەڕۆکی پڕ پەنهانی و مەبەستەکانی دەقمان دەگەیەنێت، هۆکار و بەرنامەکانی لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی لە سنووری بە ئامانج گەیشتنمان نزیك دەخاتەوە. نموونەیەکی کرداری دەخەینە بەرچاو... بۆ

پاککردنـەوەی ئـاو چـەند ڕێگایـەکی جیـاواز هەیـە، لەوانـە: دلۆپانـدن، پـاڵاوتن، پارزوونگ و زمانەی کارەبایی... هتد. میتۆد و خوێندنەوەی دەقیش بریتی دەبێت لـــە: چـــێژوەرگرتن، مێـــژوویی، دەروونـــی، بونیادگـــەری، دەستاودەســـتی و هێماگەری... هتد، سەرتاپایان ئامانج دەپێکن، بەڵام ئەو ئامانجە بەدەستهاتووە بـەگوێرەی مـاددە و میتـۆدی پێڕەوکـراو دەگۆڕێـت، چـونکە ڕێبـاز لـە جەوهـەری خۆیدا تەنیا ئامراز و هۆکـار نییـە، بـەڵکو بـە ئاراسـتەی گـەردوون بـیر و هزرێکـە، هەوڵدەدات هەموو ئـەو دیـاردە و بوونانـەی کـە گـەردوون لـە خـۆی گرتـوون شـی کاتەوە و ڕاڤەیان بکات، هەڵوەستەیش لەسەر ئەو پێوەندییانەی کە بـە یـەکتریان دەبەسـتنەوە دەکـات، هـەڵگری جیهـانێکی پـاژی یـان هەموویییـە، بـە ڕێگایـەك پاڵپشت بە تیۆر و هۆکار، ئارێشە دەربڕاوەکان چارەسەر دەکات، بەو پێودانگـەی کە دەقنووس داهێنەرە و دەقیش پێویستی بە لێکۆڵینـەوە هەیـە، ئاسـانکاری بـۆ مەبەستەکانی داهێنان و داهێنەر دەکات.

بێ گومان هەر دەقێك ڕاستییەك و حەقیقەتێك لە ناوەرۆکەکەیدا هەیە، ڕەنگـبێ ئـەم ڕاسـتییە لەگـەڵ بابەتەکـە هاوسـەنگ، یـان نـا هاوسـەنگ بێـت، لـەم کاتـەدا شیکارکردن بۆ ڕاڤە و دۆخگۆڕین (تەئویل) کـردن، دەبێتـە دەروازە، کاتێـك زمـان ناتوانێـت نـاوی هـەموو بابەتـەکانی پێکهاتەکـە بهێنێـت، ناچـار پارێزگـاری لـە ڕاستییەکی شاراوە دەکات، لەسـەرییەتی بـە ڕایەڵـەکانی تیـۆر و هۆکارەکـان ئـەم حەقیقەتە پەنهانییە ئاشکرا بکـات. ئەگـەر ڕەخنـەگر کاروبـار و کێشـەی میتـۆد و بەرنامەمان بەو پێودانگەی کە ئامرازێکی کردارییە تێپەڕانـد، هەسـت دەکـەین کـە کێـشەی ئـەدەب بابەتێکـە بـۆ لێکۆڵینـەوە و توێژینـەوە خولقـاوە، کەرەسـتە پـڕ هەستەکەش (دەق)ە، دەقـیش لـە ناوئاخنیـدا کۆمـەڵێك هـزر و ڕۆشـنبیریی لـەخۆ دەگرێت. لەگەڵ هەموو جۆرەکـانی زانـست تێکـەڵ بـە یـەکتر دەبـن، تێکـەڵبوونی میتۆدەکان بەشێوەیەکی پێویست بۆ ئەوەیە، ئـەدەب ببێتـە ئـەدەبێکی بـوونی و تەواو، ئامانجیش تەنیا ئەدەب و شیعر نییە، بەڵکو مەبەست ئەدەبیاتی ئـەدەب و شیعرایەتیی شیعرە، بە واتایەکی تـر، ئـەدەب کاتێـك بـوونی دەبێـت کـە خـاوەنی خاسیەت و کار و کێشە و جیهانبینی ئێستایی و ئایندەیی بێت.

**تەوەری دووەم:**

# میتۆدەکانی ڕەخنەی هاوچەرخ

میتۆدەکانی ڕەخنەی نوێ و هاوچەرخ لە ئەورووپادا بۆ ئەو کەلتوورە دەگەڕێتەوە کە لە ئەنجامی کەڵەکەبوونی چەندین ڕۆشنبیریی و ئاستی هزرییە جیاوازەکان لە گەلانی ناودار پێکدێن، شوێنەواری تێکەڵبوونی کۆمەڵێك ئاداب و نەریت و زانیاری و شارستانییەتی جیهانی لەخۆ دەگرێت. وێڕای ئەمەیش، ئەم میتۆد و ڕێبازانە لە فەلسەفەکانی ئەندێشەگەرایی و ئایدیای نموونەیی، ئیسلامی و بوونایەتی و ماددیایەتی... هتد هەڵهێنجراون. هەرچەندە ڕۆژئاوا شوێنی لەدایکبوونی ئەم میتۆدە ڕەخنەییانە بووە، بەڵام کاریگەرییەکی زۆریان لە ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی گەلانی ڕۆژهەڵات کردووە. ئەم تیۆرانە لەچەند ئاستێکدا خۆیان دەنوێنن، دەکرێت لە دوو پاژدا کۆیان بکەینەوە:

أ) **پاژی میتۆدەکانی ڕیزبەستن و میانەیی (سیاق)**:

کۆڵەگەی ئەم پاژە جێکەوتەکانی میانەیی و دەسەڵاتی چێژوەرگرتن و هەل و مەرجە دەرەکییەکانە، بەو ئامانجە کە مەبەست و دەلالەتەکانی دەق دەستنیشان بکرێن، کاروبارەکانی کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری، دەروونی و زمانی... یارمەتی ڕەخنەگر دەدەن بۆ ئەوەی دەق بخوێنێتەوە، یان ڕاڤەی بکات. لە چەقی ئەم پاژە چەند میتۆدێك سەر هەڵدەدەن لەوانە:

* **میتۆدی کۆمەڵایەتی**: کە بە ڕیالیستی سۆشیالیستی و ڕەخنەی ڕۆشنبیری ناسراوە[٧]. ئەم میتۆدە لە منداڵدانی ماددیایەتی مێژوویی، لەگەڵ (کارل مارکس)، لەڕوانگەی پێوەندی و هاوبەندی بەرهەمی ئابووری و چین و توێژە ڕۆشنبیرییەکانی ناو کۆمەڵگا، لەدایك بووە، چونکە ئەدەب لە ڕیالیستی کۆمەڵایەتیدا بەرهەمێکە، لە ڕابەرە دیارەکانی ئەم ڕێبازە: (بیبرزیما، لۆی ئەلتەسیر و جۆرج لۆکاتش...) زۆرانی تر. هەندێ لە ڕەخنەگرە عارەبەکانیش لە ساڵانی پەنجا و شەستەکاندا، لەگەڵ سەرهەڵدان و لەدایکبوونی بزووتنەوەی ڕزگاری و سۆشیالیستی، ئەسپی خۆیان لەم دەرەتانەدا تاوداوە[٨].

* **میتۆدی دەروونی:** جەخت لەسەر جێکەوتەیی مەبەستەکانی دەقی خوێندراو لەڕووی بارە دەروونییەکان دەکاتەوە، کە مرۆڤ لە ئاڵۆزی و تەوژمی دەروونیی دووچاری دەبێت، لەگەڵیدا گەشە دەکات، لە ئاکامی قەدەغەی کۆمەڵایەتی بەبێ ئاگایی، تێدا نقووم دەبێت، میتۆدی شرۆڤەی دەروونی لە ناخی فەلسەفەی بێ ئاگایی (فرۆید و جۆن لاکان... ئەوانی تر) سەرچاوە دەگرێت.

* **میتۆدی دیاردەیی:** سەرچاوەی ئەم ڕێبازە، بوونایەتییە، کە (سارتەر) دایهێنا، پاشان لە فەلسەفەی (ئەدمۆند هوسرل) ڕەنگی دایەوە و تا بەبنەما و زانیارییە بێ پسانەوەکەی (کاستۆن باشلار) کۆتایی هات، بەرەو هێماگەریی سۆفیایەتی (جولیا کریستیفا) ڕۆیشت. ئەوەی لەم ڕێبازە بەدی دەکرێت، ئەوەیە: زانیاری لەبارەی دەق، یان مەبەستەکانی دەق بە هەوڵی شیکارکردنی دەق مەیسەر نابێت، بەڵکو بە شیکاری خود بەستراوەتەوە، ئەوکاتە خۆی بە جیهان دەناسێنێ، کە خۆی لە دەستی کرداری داهێنان ڕزگار دەکات، ڕەخنەگر ئاگایی ئادەمیزاد شیکار دەکات، کە شتی لەناو دەروونداپە، بۆ دیاردەیەك دەیگۆڕێت، کە شایانی لێکۆڵینەوەبن.

**ب) پاژی میتۆدەکانی میانەیی:**

لەم پاژەدا ڕەخنەگر دوور لە هەموو هەل و مەرجە دەرەکییەکان، پشت بە بونیادی دەق و میانەییەکەی دەبەستێت. ئەم پاژە لەگەڵ سەرهەڵدانی زمانناسیی بونیادگەری لەسەر دەستی دی سۆسێر (١٨٥٧ – ١٩١٣ز) و لەژێر فەلسەفەی تێکشکاندن و تیۆری ڕێکخستن و قانوونی گەردانکردنی گەردیلە، دەستی پێ کرد. هەربۆیە (ڕۆمان جاکبسون) ڕابەری قوتابخانەی (براغ) وا دەبینێت، کە دابەشبوونی فۆنێمەکان بۆ سیما و سیفات لە زماندا، بەرانبەر دابەشبوونی گەردیلەیە لە فیزیکدا.

بونیادگەری وەك مەعریفە بە شێوەیەکی رووبەر فراوان لە هەموو زانستە مرۆییەکاندا بڵاو بۆتەوە. لە سەدەی بیستدا وەك هزر قوتابخانە زمانەوانییەکانی لەسەر دامەزرا، تا وای لێهات زمانناسیی بونیادگەریی بووە سەرچاوەی چەندین

میتۆدی ڕەخنەی هاوچەرخ، کە هەر میتۆدێکیش لەلایەن کۆمەڵێك ڕەخنەگرەوە پێڕەو دەکرا، میتۆدی بونیادگەری و جیاواز لە بیر و بۆچوون و ڕێنماییەکانی فۆرمالیستەکان و پێکهاتەییەکان سەری هەڵدا، پاشان بەم شێوەیە تیۆرەکانی خۆی ڕاگەیاند: سەرەتا (ڕۆلان بارت) لە کتێبی (پلەی سفر)دا، ڕەخنەی لە وجوودییەت گرت، پاشان لە کارو بەرهەمەکانی (کلۆدلیفی ستراوس) ڕەنگی دایەوە، دواتریش (بیرس و گریماس)، کاریان لەسەر هێماگەری کرد، لە کۆتاییدا هەڵوەشاندنەوە و دەقناسی و دەستاودەست لە کەلێنە جیاوازەکاندا سەریان هەڵدا.

ئەوەی لێرەدا تێبینی دەکرێت ئەوەیە: هەندێ لەو میتۆدانە ڕۆڵیان نەما و کوژانەوە، وەك: میتۆدی ڕەخنەی ڕۆشنبیری، کە بە بونیادگەری پێکهاتەیی، یان ڕیالیستی سۆشیالیستی ناسراوە، دیاردەیی، میتۆدی شیکاری دەروونی، کەچی میتۆدی بونیادگەری لەسەر فۆرمی تازەگەری، ڕۆڵ و سیما و خەسڵەتی خۆی پاراست – هەرچەندە هەندێك لە لێکۆڵەران و ڕەخنەگران سوورن لەسەر ئەوەی، کە بونیادگەریش کۆتایی هاتووە – خۆپاراستنی بونیادگەری بەناوی (دوای بونیادگەری)، یان (تازەگەری)یەوەیە، هەروەك لە تیۆر و میتۆدەکانی هەڵوەشاندنەوە، دەقناسی، دەقوەرگرتن، تیۆری دەستاودەستی... هتد بەرچاو دەکەوێت.

گرینگترین میتۆدەکانی ڕەخنەی هاوچەرخ، کە کاریگەرییەکی بەرچاویان هەبێت لەناوئاخنکردنی بەرهەمی ئەدەبیدا، بریتین لە: بونیادگەری، هیماگەری، بابەتگەری، هەرچی هەڵوەشاندنەوە، تیۆری دەق وەرگرتن، دەقناسی و تیۆری دەستاودەستن، بە ڕێنماییەکانی دوای بونیادگەرییەوە دەرکەوتن، جگە لەمانەیش، پێشنیازی پرۆژەی میتۆدی خوێندنەوەی دەق (دەقناسی)، بەناوی (میتۆدی زمانناسیی ڕێکخستن) کرا. لە خوارەوە میتۆدەکان دەخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە:

١- **میتۆدی بونیادگەری:** بونیادگەری بە واتا فراوانەکەی بریتییە لە: گشت دیاردە گەردوونی و هەستپێکراوەکان، کە لە بونیاد و بەش و یەکەکاندا جیاوازن.

بەگوێرەی سیستمێکی تـەواو لـە پێوەندییـەکان، بـە مەبەسـتی ڕۆڵبیـنین و کـاری دەلالـەتکردن، بەیەکـەوە بەسـتراونەتەوە، ئـەم پێناسـە و دەستنیـشانکردنە، لێکۆڵینەوە لە گشت دیاردە مرۆییەکان لە ڕووی مەعریفـەوە، وەك زمـان و مـرۆڤ و کۆمەڵگا و ئامرازەکان... هتد، دەگرێتەوە، زمانی یەکێك لەم دیاردانـەیش، کـە بـۆ سیستمێکی تایبەت ملکەچ دەکات لەخۆ دەگرێت. لێرەدا بابەتی هەموو جۆرەکانی دەربـڕین (زمـان)ە، لـە بونیـادێکی تـەواو بـەدیار دەکـەوێت، ئـەرکی زماننـاس و زمانەوان ئەوەیە، یەکە و بەش و پێکهاتەی ئەم بونیـادە ئاشـکرا بکـات، لـە ڕووی دەلالەتەوە پێوەندی نێوانیان بەدیاری بخـات، کـار و نهێنییـەکانی بدۆزرێتـەوە[9]، ئەم کار و هەوڵدانەیش لەئاست زانیارێکی گشتگیری دەبێت.

پێناسەی دی سۆسیر بۆ زمان — بەو پێودانگـەی بونیادێکـە هـەموو بەشـەکانی بەیەکەوە بەسـتراونەتەوە — ئەوەیـە "سیـستمێکی ڕەمزییـە، یەکـە پێکهاتـەکانی لەسەر بنەمای یەکگرتن و لێکجیاوازی بە یەکـەوە بەسـتراونەتەوە"[10]. کـاری ئـەم دەستنیشانکردنەیش لەسەر ئەم بنەمایـە دەبێـت: سیـستمێکە، کۆمـەڵێك لـەکاری پێوەنـدی و هاوبەنـدیی کـە دالی یەکـە زمانییـەکان کـۆ دەکاتـەوە، لـە بـچووکترین یەکەوە بۆ گەورەترین یەکە، کاری بونیادەکەی ڕێك دەخات و ڕۆڵ دەبینێـت، ئـەم بەشانەیش وەك یەکەکانی یاری شەترەنج ڕێکخراون، هەچ فۆنیمێك، یـان وشـەیەك ئەگەر بە سۆنگەی یەکێکی تر نەبێت هیچ شوێنێك ناگرنەوە[11].

سۆسـێر لـە هێمـاوە دەسـت پێـدەکات، بـەو مەبەسـتەی هـەر سیـستمێك لـە سیـستمەکانی گەیانـدنی زمـانی و هێمـایی، یەکەیـەکی دالییـە، ئـەم هێمایانـەیش وێنەیەکی بیستن و بینراو (وتن و نووسین) پێکدێنن، کە ئەمە دالەکە دەگەیـەنێت، چەمك و تێگەیـشتنەکەیش، مـەدلوول دەنوێنێـت. ئـەم هێمایانـە لـەنێوان خۆیانـدا پێوەندیێکی وەزیفی بەیەکیان گرێ دەدات، لەکۆی ئەم پێوەندییانـەدا یەکەیـەکی بونیـادی، کـە هـەر یەکەیـەك، یەکەیـەکی تـر تـەواو دەکـات، پێکـدێت و بنیـات دەندرێت، لە دەرەوەی ئـەو سیـستمە کـە کـاری بەڕێوەبردنـە، هـیچ وەزیفەیـەکی گەیانـدن مەیـسەر نابێـت، کـە لـە ئاسـتەکانی: دەنـگ و یەکـە و پێکهاتـە و دەستاودەستی و دەلالی... هتد. بەرجەستە دەبێت.

بونیادگەری لە میتۆد و ڕێبازی ڕەخنەدا، لە شەستەکانی سەدەی بیستدا، ڕەنگی دایەوە، لەو ساتەوە زۆربەی میتۆدە ڕەخنەییە میانەییەکان وەك: دیاردایەتی، مێژوویی، دەروونی، پاشەکشەیان کردووە، بونیادگەریی پاڵپشت بە کارو بەرهەمەکانی دی سۆسیر، لەلایەن (ڕۆمان جاکبسون و ئیمیل بنفست) هاتە ناو گۆڕەپانی ئەدەبییەوە، دواتریش وتارو بەرهەمەکانی (کلودلیفی ستراوس)، پتر ئەم دەرەتانەی بەدیار خست[١٢].

(ئیمیل بنفست) بە کورتی لەبارەی میتۆدی بونیادگەرییەوە دەڵێت: (زمان ڕێکخستنێك پێکدێنێت، کە هەموو بەشەکانی لە چوارچێوەی پێوەندییەکانی هاوبەشی و هاوبەندی لەخۆ دەگرێت، یەکەکان ڕێکدەخات، ئەم یەکخستنەیش، بریتییە لەو هێما لێك جیاکراوانەی، کە لەگەڵ یەکتری جیاوازن و لە جیاتی و لە برێتی یەکتریش دیاری دەکرێن... میتۆدی بونیادگەریی فێرمان دەکات، کە گونجاندن و ڕێکوپێکی دەسەڵاتی بەسەر سیستمی هێمایەکاندا هەیە، لەڕێگای ئەو پێوەندییە پتەوەی، کە لە نێوان یەکەکاندا هەیە، بونیاد تەواو دەکات"[١٣].

شیکاری بونیادگەری لە ڕەخنەی ئەدەبیدا جەخت لەسەر دەق خۆی دەکاتەوە، سەراپای یەکە هونەرییەکانی دیکەی وەك: نووسەر (دەقنووس)، خوێنەر (دەقوەرگر) و ئەو سەرچاوانەی، کە میانەییەکان و هەلومەرجەکانی دەق دەگرێتەوە، دوور دەخاتەوە.

بونیادگەری لە ڕەخنەی ئەدەبیدا لەسەر کۆمەڵێك بنەما وەستاوە: دەق بەو پێوەرەی کە یەکەیەکی سەربەخۆیە و خۆی خۆی تەواو دەکات. شاردنەوە و پەنهانی کردنی میانەیی دەق و نووسەر بە یەکەوە، کە دواتر بە (مەرگی نووسەر) ناسرا، بونیادگەری لەسەر ئەم بنەمایە مامەڵە لەگەڵ دەق دەکات، کە بابەتێکی سەربەخۆیە و لە میانەیی و ڕۆحی خوێنەر دابڕاوە.

بنەمایەکی تر، دابەشکردنی دەقە بۆ بنیات، کە لە فۆنێم دەست پێ دەکات و پاشان یەکە و دانەپەیڤ (مفردات) تا دەگاتە ڕستە، کە لەلای بونیادگەرییەکان بناغەی شیکار کردنە، هەوڵدان بۆ خوێندنەوەی دەق لەژێر ڕووناکی ئەو پێوەندییانەی، کە یەکەکانی ڕستە بەیەکەوە شەتەك دەدات. فۆرمالیستە

ڕووسیاییەکان لە سایەی قوتابخانەی (براغ)دا هەوڵیان دا یەکەم شرۆڤە و شیکاری بونیادگەریی پراکتیك بکەن، بەتایبەتیش لەگەڵ (فلادیمیر بروب)ی ڕەخنەگر، کە هەوڵی دا کار و وەزیفەی چیرۆك لەژێر زاراوەی (مۆرفۆلۆجیای خەرافییەت) شرۆڤە بکات، لەم شرۆڤەیەدا قانوونێك ڕەچاو بکات، کە هەموو هەلومەرجە مێژوویی و دەروونییەکان لە دەقدا پەراوێز بخات، ئەم ئاڕاستەیەیش لەلایەن (لیفی ستراوس و گریماس) قووڵتر بووەوە.

هەرچەندە بونیادگەری لەلای هەندێ لە ڕەخنەگران کۆتایی هاتووە، بەڵام واقیعی حاڵ شتێکی ترە، چونکە زۆربەی ئەو بەرهەمانەی، کە بە بەرهەمی دوای بونیادگەری ناویان دێت، نەیانتوانیوە دەستبەرداری بانێژە و دەروازەی شیکاری بونیادگەری ببن، ئەم ڕاستییەیش لە کارەکانی (ڕۆلان بارت) لە کتێبی (س/ ز)، بەڵگە نەویستە، کاتێك بە نازانستی باسی کرا، هەروەها لە کارەکانی (جاك دریدا)یش ڕەنگیان دایەوە، کە لەسەر ئەو هزرە ڕەخنەی لێ گیرا، کە بنەمای جیاکاری قۆرخ کردووە. گەورەترین ناتەواوی بونیادگەری لەوە سەرچاوە دەگرێت، کە گونجاندن لە دەقدا دەکاتە پێوەر و میانە بەلاوە دەنێت، نووسەر دوور دەخاتەوە، تێڕاهێنان (اکتفاء) بە دەستکەوت دەکات، ڕستەیش بەیەکەی شیکار و شرۆڤە دادەنێت.

### میتۆدەکانی دوای بونیادگەری:

زاراوەی دوای بونیادگەری، دەلالەتێکە بۆ ئەو میتۆد و ڕێبازانەی کە هەوڵدەدەن لە بونیادگەری سەرپەڕترین، لە سەرەتای سەرهەڵدانیاندا پێش ئەوەی بۆ چەند میتۆدێك دابەش و سنووردار ببن، پشتیان بە بنەمایەکی بونیادگەری بەست. دەرکەوتنی بەرزترین و پڕ شکۆترین بەرهەم لە قەڵەمڕەوی دەقە زمانناسییەکاندا، لە قۆناغی دوای بونیادگەری، لە قوتابخانەی (پاریس) بوو، بەر لەوەی بە میتۆدی سەربەخۆ بناسرێت، کاتێك بونیادگەری و دەرئەنجامە هێماگەرییەکان تێکەڵ بە یەکتر کران و هەڵوەشاندنەوە و دەستاودەستی (التداول) دوور خرانەوە. یەکێك لەو ناوانەی، کە زمانناسیی دەقیی گرتە خۆی

(ڕۆلان بارت)، خاوەنی کتێبەکانی: (سیمیولۆجیا / ١٩٦٤ز، س/ ز ١٩٧٠م) بوو. ناوبراو بە پێچەوانەی (دی سۆسێر)، هێماگەری بە بەشێك لە زمانناسی دانا، چونکە ئەو هۆکارە سەرەکییەی، کە مامەڵە لەگەڵ هێمای هێماگەرییەکان دەکات، زمانە. لەبارەی دەقەوە بەو پێوەرەی، کە ڕستەیەکی درێژە، دەڵێت: "هەموو باس و گێڕانەوەیەکی دیاریکراو، ڕستەیەکی درێژە، گشت ڕستەیەك لەجیاتی هێڵی پانتایی بۆ گێڕانەوەی کورت، جێگر دەبێت"[١٤] لە ڕوانگەی زانیاری و هاوبەشی لە دەقی نوێدا، دەقی کلاسیکی و دەقە خوێندراوەکان، دەقی تازەگەری و دەقە نووسراوەکانی لە یەکتر جیا کردەوە. وێڕای ئەمەیش، لەسەر چیرۆکی (سارازین)ی نووسەری فەرەنسایی (بەلزاك)، لێکۆڵینەوەیەکی پێشکێش کرد، لە لێکۆڵینەوەکەیدا هەندێ کەرەستەی ڕایکردنی بەکارهێنا، (٥) پێنج جفرەی دیاری کرد: ئەو کارانەی کە قسە و باس دەجووڵێنن، کورتکراوەی (ACT) بۆ ڕاڤەکاری، (HER) و ڕەمزگەری (SCM) و سایکردنی (SEM) و سەرچاوەگەری (REF)ی دانا. دەقی بەسەر پێنج سەد و شەست و یەك یەکەی خوێندراو دابەش کرد و پێنج جفرەی پێشووی لەگەڵیدا جێگیر کرد بۆ ئەوەی شرۆڤەکە بە (٥٦١ × ٥) یەکە بگات، کە بە زاراوەی (Lexias) ناسراوە. بە کورتی ئەنجامی دەستکەوتوو بریتییە لە دیاریکردنی واتای گشتیی دەق، کە دەکرێت لە سایەیدا جارێکی تر بینای دەقەکە، یان چیرۆکە شیکراوەکە بکرێتەوە[١٥]. لە ڕاستیدا ئەو پۆلینکردنەی (بارت) بۆ شیکارکردن و ڕاڤەکردنی دەق، پشت بە هیچ دەرئەنجامێکی زمانی، کە لەلای خوێنەر ئاشکرا و زانراوە بە تیۆرەکانی شیکارکردن و تیۆرەکانی خوێندنەوەیشەوە نابەستێت. بەڵام ئەم هەوڵدانەی (بارت)، کە بۆ شیکارکردنی چیرۆکەکەی (بەلزاك) دای، هەوڵدانێکی لێك نزیککردنەوە بوو، بۆ ئەوەی لە زمانناسیی دەق نزیك بێتەوە. هەروەها، لەم قوتابخانەیەدا هەوڵێکی دیکەی بەراوردی بۆ زمانناسیی دەق بەدی دەکرێت، ئەویش زمانەوانی فەرەنسایی (میشال ئادام)ە، کە لە کتێبەکەیدا (بنەمای زمانناسیی دەق)، چەندین گریمانەی لەسەر بنەچەی جێبەجێکردنی کاری وتەبێژی پێشکێش کرد، کە بۆ شیکارکردنی دەق ئاستی دەستاودەستی پێڕەو

كـردووە[١٦]، كـە پـشت بـە سروشـتی دەق دەبەسـتێت، بـە سـۆنگەی پێوەندییـە پێکهاتەییەکانی ڕێزمانی و دەلالەتە هێماییەکان ڕێکی و گونجاندن و هاوبەندبوون، دەخاتە ڕوو.

**٢- میتۆدی هێماگەری:**

ئەم میتۆدە لێکۆڵینەوە لە بوون و چالاکیی هێما زمانی و نا زمانییەکان دەکات، پێ لەسەر پێوەندی نێوان دال و مـەدلوول دادەگرێـت، لـەم ڕووەوە جیاوازییـەکی ئەوتۆی لەگەڵ میتۆدی بونیادگەری نییە، کـە گرینگـی بـە نیـشانە نـا زمانییـەکان دەدات، لـە دەرەوەی دەقـدا جێگـای دال و مـەدلوول و سەرچـاوە دەگرێتـەوە. لێـرەدا هێماگـەری گرینگـی لێکۆڵینـەوەکانی ڕەمـز و نیـشانە و ڕێکخـستنیان لـە ئەستۆ دەگرێت، هەتا ئەگەر ئەوانـە لـە دەرەوەی زمانیـشدا بـن، کـە شـوێنێك لـە نـاوەوەی وتـار پێکـدێنن. بـە واتایـەکی تـر شـیکاری هێماگـەری ئەوکاتـە دەسـت پێـدەکات، کـە شـیکاری زماننـاسـی کۆتـایی پـێ بێـت. هـەر بۆیـە هێماگـەری بـە پێچەوانەی بیر و بۆچوونەکانی (دی سۆسیر) بـە بەشـێك لـە زماننـاسـی دادەنێـت، ئـەم لێکۆڵینــەوە دوای قـسەکەی (ڕۆلان بـارت – ١٩١٥/ ١٩٨٠) "پێویـستە لــە ئێستاوە دەربڕینەکەی سۆسێر ئاوەژوو بکرێتەوە، چونکە زماننـاسی بەشێك نییـە لە هێماگەری، بـەڵکو هێماگـەری بەشـێك لـە زماننـاسـی پێکـدێنێت"[١٧]، خـۆی لـە نـاخی ڕەخنـەی ئەدەبیـدا دۆزییـەوە بـەم جـۆرە شـیکارکردنی بونیادگـەری بـۆ شیکارکردنی هێماگەری وەك دەستپێك دەبێت.

ئاڕاستەی هێماگەری وەك میتۆدێکی ڕەخنەیی لە شەستەکانی سـەدەی بیـستدا بـەدیار کـەوت، پـاش ئـەوەی بونیادگـەری لـە ئاکـامی داخـراوی بـەڕووی دەقـدا، دووچاری گرفت و کورتی هێنان هات و هەموو دەرئەنجامەکان و ئەو میانەییانـەی، کە بە ڤاڵای دەرەوە بەستراونەتەوە، ڕەت کردەوە. چەندین بنەما لە سەرهەڵدانی ئەو میتۆدە هاریکار بوون لە هەموویان بەرچاوتر، گرووپـی (Tel.. quel)ە، کـە لە ساڵی ١٩٦٠ز لە پاریس لە سەر دەستی (فلیب سولرز) دامـەزرا، ئـەم کۆمەڵەیـە سەرەتا ڕێبازی مارکسییان پێڕەو دەکرد پاشـان بـەناو ڕایەڵـەکانی سـۆفیگەری و

هزری ئایینیدا ڕووچوون، پاشان لەگەڵ دامەزراندنی (کۆمەڵەی هێمای ئەدەبی) لە ساڵی ١٩٦٩ز، بڵاوکردنەوەی گۆڤارێکی مانگانە بەناوی (هیما لە پاریس) ڕەنگی دایەوە. کۆمەڵە لێکۆڵەرێکی هەڵبـژێردرا و پوختەی وەك: (جولیا کریستیفا/ فەرەنسا، ئەمبرتۆ ئیکۆ/ ئیتاڵیا، یۆری لۆتمان/ ڕووسیا، سیبوك/ ئەمریکا..) زۆرانی تری کۆکردنەوە.

ئەوەی پێویستە لێرەدا قامکی بۆ درێژ بکرێت ئەوەیە، بەدەستهێنانی ئاراستەی هێماگەری لە شرۆڤەکردنی پێکهاتەکانی دەقدا، بابەتێکی تازە نەبوو، چونکە یۆنانەکان تەنانەت عارەبەکانیش هەستیان بە گرینگی نیشانە و هێما نازمانییەکان لە هەواڵ و گەیاندندا کردبوو، ئەم نیشانانەیان بۆ ئەوە دەگەڕاندەوە، کە کارێکی وەزیفییان بۆ خوێندنەوە و ڕاڤەکردنی دەلالەتەکانی دەق هەیە، هەروەها بۆ بەدەستهێنان و وەرگرتنی مانای شاراوە، هاوبەشی لەفزەدا بە دووەم جۆری ڕوونبێژییان دادەنا. جاحظ دەڵێت: "نیشانە و لەفز دوو بابەتی هاوبەش و هاوکارن، نیشانە یارمەتی لەفز دەدات، ئەویش وەرگێڕانی بۆ دەکات. خەتیش لەفز دەوڵەمەند دەکات"[١٨]. لە سەرەتای سەدەی هەژدەدا، (جۆن لیك)ی فەیلەسووف، گرینگییێکی بەرچاوی پێداوە، ئەمانە هەموویان بە پێچەوانەی (دی سۆسێر)، ئەم ئاراستەیان بە لێکۆڵینەوەی زمانناسی دانەناوە.

هێماگەری لەڕووی پراکتیکردنەوە لە جێبەجێکردنی کاری ڕەخنەیی چەند ئاراستەیەك لەخۆ دەگرێت[١٩]، ئاراستەی یەکەم: هەندێك وا دەبینن، کە لێکۆڵینەوە لە سیستەمەکانی (دال) لە ڕوانگەی دەرئەنجامی دیاردەکانی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی دەقەوە دەبێت، ئەو لێکۆڵەرانەی کە ئەم بۆچوونەیان لەلا پەسەند بوو، بریتی بوون لە: ڕۆلان بارت، بیێرجیرو، گریماس و کورتیس... هتد)، لە لێکۆڵەرە عارەبەکانیش: محەمەدی عەززام، ڕەشید بن مالیك، عەبدئەلکەبیر ئەلخەتیبی... هتد). ئەمانە لە کار و بەرهەمە ڕەخنەییەکانیاندا لە فۆرمی بونیادگەری گرینگییان بە پراکتیکردنی چەمکەکانی زمانناسییان دەدا، دەلالەتەکانیشیان بە ئاراستەی ژیانی کۆمەڵایەتیی تاك و کۆمەڵیان دەبرد، بارت وای دەبینی، کە دەقی ئەدەبی بەرهەم نییە، بەڵکو ئاماژەیە بۆ شتێك، کە لە

دوای خۆی ڕوودەدات، ئەرکی ڕەخنەگر ئەوەیە باس لەم ئاماژە و نیشانەیە بکات و ڕاڤەی بکات[٢٠]، بارت بۆ دروستی و ڕوونکردنەوەی بۆچوونەکەی، وێنەی سەربازێکی زەنجی، کە سڵاو بۆ ئاڵای فەرەنسا دەکات دەخاتە ڕوو، بۆ وێنە، کە سێ خوێندنەوە پێشکێش دەکات، یەکەم: سەربازێکی فەرەنسایی سڵاو لە ئاڵای وڵاتەکەی دەکات، دووەم: فەرەنسا ئیمپراتۆریەتێکی گەورەیە ڕۆڵەکانی بەبێ جیاوازی لەنێوان ڕەگەز و ڕەنگ خزمەتی دەکەن، بەمەبەستی سەرفرازی پابەندبوونی خۆیان دەنوێنن، سێیەم: فەرەنسا دەوڵەتێکی ئیستعماری فراوانە، پایەبەرزی و شکۆدارییەکەی لەسەر چەوساندنەوەی کەمە نەتەوەییەکانە. لێرەدا (دال): سەربازە زەنجییەکەیە، کە سڵاو لە ئاڵای فەرەنسا دەکات، (مەدلوول): هاتنەڕیز و ئینتیمای سەربازی فەرەنساییە. (دەلالەت)ەکەیش سەربازی فەرەنساییە[٢١].

ئەم هێمایانە سەرتاپایان بۆ پێوەندی نێوان گرفتی کەسەکان لە کارا کردنی دەق و کارا و بابەت لەلایەك، لەلایەکی تریش لە نێوان هاریکار و هاودژ شیکار کردنن. لێرەدا (گریماس)، بۆ دەستنیشانکردنی جەمسەرەکانی گرفت لەژێر ڕووناکی پلانێکی حەوتەوانەیی، بەو ئامانجەی یەکە و ڕەگەزەکانی کاراکردنی وتار بەرجەستە بکرێن، دەخاتە ڕوو:



هەروەها هەوڵیدا لە ڕێگەی چوارلایەکی هێمایی لە سایەی جووت دووانەیی دژبوون لە وەکیەك و بەرانبەردا، باس و ڕاڤەیەکی درامی بۆ دەق بکات:




ئاراستەی دووەم: لەم ئاڕاستەیەدا تیمێك، لە هەموویشیان دیارتر و سەرپەڕتر، (جۆرج مۆنان) بوو، کە باوەڕی وابوو، کە لێکۆڵینەوە لە سیستەمەکانی و پێوەندی گەیاندنی زمانی و نا زمانی دەگرێتەوە، ناوبراو وای نیشاندا، کاتێك بارت لێکۆڵینەوەی لەسەر سیستەمەکانی جلك و خواردەمەنی کرد، لە ڕوانگەی سیستمێکی دالی ناچاری تێی ڕوانیوە. ئاریشەی نێوان بنێر و وەرگر ئەوکاتە چارەسەر بووە، کە دی سۆسیر ورووژاندبووی لێرەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە بارت خۆی لە گرفتە بنەڕەتییەکە لادابوو، کە پێوەندی بە دەلالەتە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە[٢٣]. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، کە هێما بنەڕەتە، پێویستە لە سایەیدا دیاردە پێش لەفز شرۆڤە بکرێت.

هەرچی ئاڕاستەی سێیەمە: هەوڵی دا هاوسەنگییەك لە نێوان هەردوو ئاڕاستەی پێشوو ڕابگرێت، بە واتایەکی تر، هاوسەنگی لەنێوان ڕەمزی زمانی و نازمانی بەو مەبەستەی، کە دوو یەکەن لە زمانناسیدا یەکتر تەواو دەکەن، لەژێر ڕووناکی ئەو ڕاستییەی، کە دەلالەتکردنی گەیاندن لەسەر تیۆری بەرهەمی نیشانە و هێما وەستاوە، نیشانەیش بەهیچ کلۆجێك لە تیۆری جفرە (Code)، کە بنەما و بناغەی دەلالەتکردنە دانابڕێت. جولیا کریستیفا، ئەمبرتۆئیکۆ، محەمەد مفتاح... هتد لە لایەنگرانی ئەم ئاڕاستەیە بوون. کریستیفا دەنووسێت: "دەق سیستمێکی زمانی نییە وەك بونیادگەرییەکان بانگەشەی بۆ دەکەن، یان هەر وەك فۆرمالیستە

ڕووسیاییەکان وا دەخوازن، بەڵکو بۆ واتا و دەلالەتە دیار و گۆڕاو و ئاڵۆزەکان لە چوارچێوەی سیستمەکانی کۆمەڵایەتی و ئاینی و سیاسی بەربڵاوە و هاوێنەیەکی قۆقزە"[٢٤]. وا لە دەق دەگەین، کە سەرچاوەی ئەم ئاڕاستەیە بیّ کۆتاییە: زمان، فەلسەفی، کۆمەڵایەتی، ئاینی و دەروونی... بە قەڵەمڕەوی هـزری هاوچەرخ بەستراوەتەوە. ئەگەرچی دەق خۆی بابەتێکی داخراوە، بەڵام دەبینین بە تیۆری وەرگرتن (دەقوەرگرتن) بەستراوەتەوە، کاتێك بنێر و وەرگر لە چوارچێوەی کەسە کارایەکانی ڕووداو دەبن، هەرچەندە هێماگەری نەیتوانی لە ڕووی تیۆرییەوە میتۆدێکی ڕێکوپێك و بیّ کەموکورتی بێنێتە ئاراوە، کە بە پلەی یەکەم پشت بە دەرەنجامە ڕاییکردنەکانی بونیادگەری ببەستێت، تەنیا بۆ لایەنگرانی پەشێوێکی بیر و باوەڕ بوو.

٣- **میتۆدی بابەتایەتی:**

ئەم میتۆدە لەسەر بنەما و بناغەی بونیادگەری لەبواری ڕەخنەی ئەدەبی، لە پانتایی ئامار کار دەکات، ناوەندە بابەتییەکانی زاڵگە لەدەق، یان لە هەر نووسەرێك دەکاتە سۆنگە، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ شیکاری بونیادگەری نییە، تەنیا ئەوەندە نەبیّ، کە میتۆدی بابەتایەتی، پیّ لەسەر دیاریکردنی بابەتێك، یان چەند بابەتێك دادەگرێت، کە نووسەر لە دەقەکەیدا وەك چارەیەك پێڕەوی دەکات، بابەت بەو سیفەتەی کە هزرێکی ناخییە، یان واتایەکی زاڵی دەق، یان چەند دەقێکە، دەبێتە ئامانج، ڕەخنەگری بابەتایەتی لەسەریەتی، کە دەستنیشانی بکات و بە دیاری بخات. بابەت، یەکەیەکی هونەری دەقە، تیۆری ناوەندە دەلالییەکان، گرینگترین بنەمایە، کە بۆ دیاریکردنی یەکە و مفرەداتە دوورخراوەکان پشتی پیّ ببەسترێت، بۆ ئەو بابەتە زاڵگەییانە پۆلین بکرێن، کە مەبەستی دەق دیاری دەکەن[٢٥]. لێرەدا بابەت بۆ دەق، یان بۆ ناوەندە دەلالییەکان، وەك هزرێکی گشتی هەژمار دەکرێت. هەربۆیە عەبدولکەریم حەسەن دەبێژێت: "خێزانە زمانییەکان لەڕووی فەرهەنگەوە سنووری بابەتەکانن"(٢٦).

گرینگترین لەو لێکۆڵەرانەی، کـە ئـەم میتۆدەیـان لـەخۆ گـرت و کاریـان لەسـەر کرد، بریتی بوون لە: (جۆن بول ویبر، جۆن بیار رشارد) لە فەرەنسا، هەروەها لای عارەبەکانیش (عەبدولکەریم حەسەن) بوو.

لایەنگرانی ئەم ئاڕاستەیە هەوڵیانـدا میتـۆدێکی سـەربەخۆ بێننـە ئـاراوە، بـەڵام نەیانتوانی تیۆری تەواو بێ کەم و کورتی، چ لە ئاست دامەزراندنی تیۆر، یان چ لە ئاست پراکتیککردن پێشکێش بکەن، هۆی سەرنەکەوتنی هەوڵەکانیش، بۆ کێشەی پـۆلێنکردنی بابەتایـەتی دەگەڕێتـەوە، پێوەنـدی بـە کـرداری ئامـاری هونـەرە فرەییەکانی ڕەگەزێك لە ڕەگەزەکانی دەقەوە نییە. بەم جۆرە ئەم ئاڕاستەیە بـوو بە بەشێك، یان ئاستێك لە ئاستەکانی شیکاری بونیادگەری، یان دەقناسـی، جگـە لە پۆلێنکردن بۆ تیۆری ناوەندە دەلالییەکان هیچی تر ناگەیەنێت.

**٤- تیۆری دەقناسی:**

سەرهەڵدانی تیۆری دەقناسی لە پانتایی لێکۆڵینەوە ڕەخنەییەکانی ئـەوروپادا، بۆ سـەرەتای حەفتایـەکانی سـەدەی بیسـتەم دەگەڕێتـەوە. بـەهێزترین هانـدەری دەرکەوتنی ئەم تیۆرە، چاوپێداخشاندنەوە و پێداچوونەوە بوو بەدەرئەنجامی ئەو قوتابخانە زمانناسییە ڕۆژئاواییانەی، کە لـە دەقـدا هەڵوەسـتە لەسـەر کۆڵەگـەیی ڕستە دەکەنەوە، لە هاوبەندی نێوان ڕەهەندەکانی دیـاردەی زمـانی دادەبڕێـت، چ لـە ڕوانگـەی بونیادگەرییـەوە، کـە بـۆ مەبەسـتی شـیکارکردنی دەلالـی، بونیـادی پێکهاتەی ڕستە دەکاتـە یەکەیـەکی بنـەڕەتی، هـەر یەکـە لـە توانستی بەرهـەمی زمان، میانە و حاڵی دەق و دیاردە ئاخاوتییەکان دوور دەخاتەوە، چ لـە ڕوانگـەی کاروبارەکانی بەرهـەمهێنان و گوێزانەوەیـە، کـە ڕاسـتەوخۆ ڕسـتەی بەرهـەمهاتوو دەکاتە یەکەی بنەڕەتی شـیکارکردن، میانـەی دەستاودەسـتی پـەراوێز دەخـات و جەخت لەسەر قسەکەرێکی نموونەیی و بونیادێکی ناخی دەکاتەوە، کە ئەم دووانە دوو ڕەگـەزی گـوێزراوەن، ئەگـەر لـە بـاس و خواسـی لێکۆڵـەران نـەبێت هـیچ بوونێکیان نییە. ئەم کەموکورتییە وای کرد کە زمانناسیی نوێ لە گونجاندنەوە بۆ میانەیی، لە بونیادێکی تەواو بۆ دەستاودەست و بەکارهاتن، لـە ڕسـتەوە بـۆ دەق بگوازرێتەوە[٢٧].

مەبەست لە تیۆری دەقناسی: دەق و میانەییە دەستاودەستییەکەی بە شێوەیەکی هاوبەش لە نێوان چەندین تیۆر و میتۆدی ڕاییکردن، بۆ لێکۆڵینەوە، وەك یەکەیەکی بنەڕەتی وەربگیرێن، یەکەمین کەسیش کە هەوڵی دابێت بۆ ئەوەی تیۆرێکی زمانناسی بۆ خوێندنەوەی دەق دابنێت، لێکۆڵەر (ڤان دیك) بوو، کە لەنێوان ساڵانی (١٩٧٢ – ١٩٧٧ز) لە لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی پوختە و خەستەکەی (بینا و کار و وەزیفەی دەق، بەراییەکە بۆ دەقناسی)[٢٨]، بونیادی ناخی بۆ زاراوەی بونیادی گەورە ئاڵوگۆڕ کرد. دواتریش کار و بەرهەمەکانی زمانەوانی ئەڵمانیایی (ڕۆك هانس) بڵاوبوونەوە، ئاماژەیان بۆ ئەوە دەکرد، کە دەقناسی لەگەڵ هەریەك لە بونیادگەری و بەرهەمهێناندا جیاوازە، چونکە دەق لە جیاتی ڕستە دەکاتە بناغەی لێکۆڵینەوە. دەنووسێت: "زمانناسیی دەق بەو پێناسەیەی، کە زانستێکە و گرینگی بە بونیادی دەقە زمانییەکان دەدات، لەم ساڵانەی کۆتاییدا شوێنێکی فراوانی لە گفتوگۆ و مشتومڕی زانستی، سەبارەت بە چۆنێتی پەلکێشکردنی بۆ بەکارهێنانی لە شتەکاندا داگیر کردووە، ناکرێت ئەمڕۆ لەڕووی زمانەوانییەوە بە بابەتێکی تەواو و بێ کەم و کورتی دابندرێن، کە هەڵوەستە لەسەر ڕستە دەکاتەوە و بە گەورەترین یەکەی شرۆڤەکردن، لە قەڵەم دەدرێت و پشتی پێ دەبەستێت، بەڵکو دەقناسی هەوڵ دەدات، بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوە زمانناسییەکان لەسەر ڕێسایەکی تر، کە بریتییە لە تەنیا دەق خۆی، دابمەزرێنێت"[٢٩]. بێجگە لەمەیش زمانناسی فەرەنسایی (جان میشال ئادەم) چەندین بنەما و ڕێسای پێشکێش کرد و[٣٠]، لە دوو توێیاندا بنەمایەکانی شیکارکردنی زمانناسیی دەقی ڕوون کردۆتەوە، لێکۆڵەرێکی عارەبی وەك (سەلاح فەزل)یش هەوڵ دەدات کە دەقناسی بە ڕەوانبێژی کۆن ببەستێتەوە[٣١].

لەڕاستییدا یەکێتی دەق لە جیاتی ڕستە لەلای زۆربەی لێکۆڵەران پانتاییەکی رووبەر فراوانی داگیر کردبوو، کاتێك هەموو جۆرەکانی پێکهاتە و بونیادیان بەیەکەوە دەبەستەوە، لە ئەنجامدا خانەیەکی دەق لە بچووکترین بنیات کە (وشە)یە بۆ گەورەترین بنیات کە (دەق) پێکدێنێت، وەك ڕەگەزێکی پاڵپشت لە ڕستەیان دەڕوانی، ڕستە بۆ ئاشکرا کردن و بە دەستەوەدانی واتای پڕ مەبەستی

دەق، ئەو ڕۆڵە نابینێت، چونکە لە کاروباری ڕستەدا واتاکەی بەجۆرێك لەگەڵ بینا دەڕوات، شتێك دەگەیەنێت، کە ئەو مەبەست نییە، لە خودی خۆیدا دەگۆڕێت، هەر بۆیە کۆمەڵە ڕستەیەك لە هەر دەقێکدا (دێرە شیعرێك، یان قەسیدەیەك، یان پارچە پەخشانێك) یەکەیەکی سەربەخۆیە و دابەش ناکرێت، جۆرجانی وای گوتووە "ڕستە ئەگەر بنیاتێکی لێ پێکهات و مانای بەخشی، ئەوەی لێی پێکدێت چییە؟"[٣٢].

٥- **بیردۆزی دەقوەرگرتن:**

ئەم بیردۆزە ئاڕاستە هێمایەك وەردەگرێت، چونکە بەو ڕواڵەتەی کە (دال)ە، دەیەوێت شتێك بڵێت و بگەینێت، بەڵام توانستی نییە، دەقوەرگر لەجیاتی ئەو، بەدەنگی دەبیێژێت، بە هزر و بیری گوزارشت و دەربڕین دەکا، لە خوێندنەوەکەشیدا دەق لەدایك دەبێت[٣٣]، یان وەك بارت دەڵێت: لە نا ئامادەیی دەقوەرگر، دەق هیچ بوونێکی نابێت، هەربۆیە تیۆری وەرگر (دەقوەرگر)، خوێندنەوە لە دەسەڵاتی دەق — وەك لای دریدا دەبینەرێت — بۆ دەسەڵاتی خوێنەر — کە لەلای گرووپی وەرگر (دەقوەرگر) پێڕەو دەکرێت، دەگوازێتەوە، لەم ئاستەدا هەڵوەستە لەسەر (کاریگەر و کارلێکراو) دەکرێتەوە هەروەك لە بەرهەم و ڕاو بۆچوونەکانی هەریەك لە (و. ئیزر، ستانلی فیش) بەدی دەکرێت، کرداری خوێندنەوە پشت بە دوو بابەتی ئاڵوگۆڕ دەبەستێت، ئەوانیش، یەکەم: وەرگرتن لەدەقەوە بۆ خوێنەر، لێرەدا دەق زانیاری و هێما و نیشانەی جیاواز بە خوێنەر دەبەخشێت، دووەم: گەیاندن لە خوێنەرەوە بۆ دەق، خوێنەر خۆی ڕەهەندی تازە دەخاتە سەر دەقەکە، کە لە دەقە خوێندراوەکە بەدی ناکرێت[٣٤].

خوێندنەوە لە ڕێگای چەندین پێشینی هەمەجۆر مێژوویی و ڕۆشنبیری دەبێت، کە زمان بۆ کاریگەری دەقەکە دەیگوازێتەوە، بەو سیفەتەی سەرچاوەیەکە دەقنووس (نووسەر) بەبێ ئاگایی تۆماریان دەکات، ڕەنگبێ گرینگی ڕێباز و شێواز و سەرچاوەیی ئەم بیردۆزە، بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، کە پشت بە (دەقوەرگر) دەبەستێت، ڕەگەزە هونەرییەکانی تر فەرامۆش دەکات، هەرچەندە دەقوەرگر (خوێنەر) هەوڵبدات خۆی بابەتییانە بێت، بەڵام بەدەق لێوانلێو دەکرێت. ستاتلی

هەوڵی داوە، کە بەرگری لە بابەتییەکی خوێنەر (دەقوەرگر) بکات، بە گرووپی ڕاڤەکار پارێزراوە[٣٥] لە ڕاستییدا ئەم گرووپە لەکاتی خوێندنەوە و ڕاڤەکردنی دەقدا، بوونیان نییە.

٦- هەڵوەشاندنەوە و جیاوازی:

ئەم تیۆرە لەسەر بنەمای هەڵوەشاندنەوە و داڕماندنی بیر و هزری کۆن و خوێندنەوەی دوولایەنە بۆ دەق دامەزراوە. هەوڵدەدات بونیاد لەبەریەك هەڵوەشێنێتەوە، نەگۆڕ بۆ گۆڕاو، گۆڕاویش بۆ نەگۆڕ بگۆڕێت، بەپێی ڕێسای یەکێتی جیاوازی هێگلێی، جیاوازییەکانی تر لە هاودژی و نامۆیی ئاشکرا دەکات[٣٦]. لەم ئاقارەدا فەیلەسووفی فەرەنسایی (دریدا) هەوڵی دا ئاڕاستەیەکی فەلسەفی دابمەزرێنێت و بە هۆکاری داڕماندنی بنیات و پێکهاتەدا، ناسنامەیەکی بێ ناونیشان ئامادە بکات، لێرەدا مەبەستی دەق ناپێکرێت، ئەگەر لە شوێنی لەناوچوون و جیاوازی و ئامادەیی، بزردا نەبێت،: "جیاکار نابێت دیار نەبێت، بوونەوەرێکی ئامادەباش نییە، بەڵکو ئەوەی هیچ نەبێت ئەوە، یان هەموو شتێکە، لە بەرانبەر هەر یەکێك، نەزان پەراوێز دەخات"[٣٧]، بیرو بۆچوونەکانی دریدا بۆ ڕەگ و ڕیشەی ئەنتۆلۆجی و ئایینی دەگەڕێتەوە، لە قسەیەکیدا دەڵێت: (جیاوازی لە دەستپێکدا هەبووە)، ئەمەیش هاوبابەتی ئایەتێکی ئینجیلییە، کە دەڵێت: (لە دەستپێکدا وشەیەك هەبوو، ئەویش وشەی خودا... بووە)[٣٨]، وێڕای ئەمەیش بۆ فەلسەفەی مشتومڕ (جدل)ی هیگل دەگەڕێتەوە پاش ئەوەی سۆسێر لە پێناسەکردنی هێما زمانییەکاندا پاشەکشەی پێ کردبوو، کە لەسەر بنەمای یەکێتی و جیاوازی بە یەکتر دەبەسترانەوە[٣٩]. لەم تێڕوانین و تێگەیشتنەدا هەوڵی دا فەلسەفەی میتافیزیکی ڕۆژئاوایی لەباریەك هەڵوەشێنتەوە، گشت بنەمایەکانی لەق بکات، بۆ مەبەستی سەلماندنی دووانەیی (ئامادە و بزر) تا شوێنەواری ڕەسەن و بینای جیاواز نەمێنێ، ستراتیجییەتی هەڵوەشاندنەوەی گرتەبەر، ئەم هەوڵەیش بۆ ئەوەبوو، کە هەر دەقێك بێت بە دووان و هیچ یەکێکیشیان لەوی دیکە نەچێت، دەقی حازر بەدەست و ئامادە، ئەگەر بە جیاوازی و نادیاری بزریی نەبێت ناتوانێت بوونی خۆی بچەسپێنێت، بە واتایەکی تر دەق ئەگەر بە بوونی

دەقێکی تری جیاواز لەخۆی نەبێت، بوونی نابێت. لێرەدا میکانزمی بە دەقکردن بۆ گرینگی و پێویستی شیکارکردن دەبێتە بڕبڕەی پشتی ئەم میتۆدە.

ڕێنمایی و بنەمایەکانی میتۆدی هەڵوەشاندنەوە دوور لە بیر و بۆچوونی سیاسەت، ڕەنگدانەوەی هێڵە گرینگ و ستراتیجییەکانی جیهانی نوێیە، بۆ ئەوەی جیهانبینی و سکۆلاررزم مسۆگەربێت. ئەم ستراتیجییە، هەوڵ دەدات لەناوەوە کار لە هزر بکات بۆ ئەوەی بنەماکانی دارمێنێت تا زاڵ بێت دەسەڵات بنوێنێت. واتە، لەناوئاخنی دیاردەدا شوێنێك دیاری دەکات، چەندین جار دەیکاتە مەبەست بۆ ئەوەی بیپێکێت. باشترین نموونەیش بۆ ئەم میتۆدە ئەو ڕووداوانەن، کە لە جیهانی هاوچەرخ ڕوودەدەن، هەوڵدانە بۆ هەڵوەشاندنەوەی قەوارە ڕۆشنبیرییەکان، بۆ ئەوەی سەر لەنوێ جیهانێك دروست بکرێتەوە، کە هەندێك ڕۆشنبیریی و شارستان لە تۆمارگەی مێژوودا، دەربێنن، زۆر پێشبینی لەبارەی ئایندەی ئەم ئاستە نووسراون[٤٠].

**٧- بیردۆزی پراگماتیکی**

ئەم بیردۆزە بە زمانناسیی دەقەوە بەستراوەتەوە[٤١]، بریتییە لە چۆنێتی کارکردنی زمان، جەخت لەسەر دەستنیشانکردنی شوێن و بەهای میانەیی دەکاتەوە، کە دەق لەکاتی ئەنجامدانی کرداری وتووێژ لەنێوان نووسەر (دەقنووس) و وەرگر (خوێنەر، دەقوەرگر) لە ئاستی زارەکی، یان نووسین دەیهێنێتە دی. ئەم تیۆرە هەوڵدەدات لەڕێگای بەکارهێنانی زمانەوە، دەق و کرداره میانەییەکان بە یەکتر ببەستێتەوە، هەڵوەستە لەسەر پاراستنی دەلالەتەکانی دەق لە نادیاری و لێڵی و لادان.. بکرێت و بە بابەتە زمانییەکانی گرێ بدات، هەروەها ڕەمز و نیشانە جەستەییەکان، کە هاوشان و هاودەمی کرداری ئاخاوتن، لە وتووێژکردن و نووسیندا ڕەنگدانەوەی سروشت و ئەتوار و شێوازی خەڵکن. پراگماتیك لەم ڕەخ و ئاڵییەدا نوێنەرایەتی دوو ڕەهەند، لە پێنج یەکەکانی ڕاگەیاندنی شرۆڤەکاری دەقدا (کە دواتر باسیان دەکەین) دەکات، ئەوانیش بریتین لە: بنێر و وەرگر، ئەم دوو بابەتە بۆیە لەم ئاستەدا پشتیان پێ دەبەسترێت، چونکە هەر یەکێکیان چەندین شوون و پاشماوەی ڕۆشنبیری، لە

نووسین، یان ڕەخنەدا، بە مەبەستی بنیاتی مەبەستی دەق، لەخۆ کۆ دەکەنـەوە، کاتێك گفتوگۆکاران ئاشکرایان نەکردبن.

ئەوانەی گرینگییان بەم تیۆرە داوە بـەرەو پێـشیان بـردووە، بـریتی بـوون لـە: (ئۆستین، جۆن سیرل)[٤٢]، لـە لێکۆڵینەوەکانیانـدا لـە بـارەی (ڕووداننـی ئاخـاوتن) کاریان کردووە، وێڕای ئەمەیش، سیرل تیۆری ڕوودانی ئاخاوتنی فراوان کردو ئەو ڕووداناناەی، کە هاوبەندن بە کار و فزە ڕاستەوخۆیەکانی، پۆلینی کردن. هـەروەها لێکۆڵـــەری فەرەنـــسایی (فرەنـــسوا رکانـــاتی) دەروازەیـــەك بـــۆ تیـــۆری دەستاودەستکردن لەمـەڕ ڕێکخـستن و شـوێن و سـنووری سەرچـاوەیی پێـشکێش کرد.

زۆر لە زمانەوانە عارەبەکان بەتایبەتی زانایانی ڕەگەزناسی، هەستیان بە میانـە و بەها و کاریگەرییان لە ڕێنمایی بۆ دەلالەتکردن، کردووە، گرینگی ئەو بابەتـەیان لە ئاشکراکردنی پوختەیی و دیاریکردنی گونجاندنیان خـستۆتە ڕوو، نامەبەسـت و ئارەزوویان جیا کردەوە، گشتیان دەستنیشان کرد، ڕەها و فرە دەلالییان پابەنـد کرد[٤٣] ئاماژەیان بە شوێن و بەهای قسە و کردار و جووڵە کرد، هـەروەك فـزە بـە کـرداری ڕاســتەوخۆوە جــووت دەکــات، (ئــیبن ئەلقــەیم) جــەخت لەســەر دەرئەنجامەکانی جێگا و بـەها، پێوەنـدی بـە دەلالـەتکردنی فزەکـان دەکاتـەوە و دەبێژێت: "مەبەست لە ئەلفاز و فزە خاوەنەکەی نییە، بەڵکو بۆ نیاز و مەبەسـتی قسەکەر هۆکارێکی دالییە، ئەگەر نیاز و مەبەستەکەی بەدیار کەوت، بەهەر ڕێگا و هۆکارێـك – هێمـا، کنایـە، دەلالـەتی ئـاوازی، حـاڵی، ڕەوشـتی – بێـت، لاوازی ناگەیـەنێت"[٤٤] ئەمـە ئـەوە دەگەیـەنێت، کـە لـە نێـوان گفتوگۆکەرانـدا کـرداری هاریکـاری و لـەجیاتی بـەدی دەکرێـت، بـۆ ئـەوەی کـون و کەلێنـە دەلالییـەکان دابخرێن، بۆشاییەکان بە هێمـا جیاجیایـەکانی دەربـڕین، بـەپێی ڕێـسا و قـانوونی زمانی پڕ بکرێنەوە و کەم و کورییەکان تەواو بکرێن، بۆ ئەوە چـەمك و تێگەیـشتن دەست بکەوێت، کە ئەمەیش گرینگی ڕەهەندی دەستاودەسـتی و هێماگەرییـە لـە شیکارکردنی دەقەکاندا، ئاماژەیەکی ڕوون و ئاشکرایە.

**تەوەری سێیەم:**

# بەرەو میتۆدی زمانناسی لە بونیادگەرییەوە بۆ ڕێکخستن

لە قووڵایی لێکۆڵینەوەکەماندا بەناو پانتایی جیهانی میتۆدەکانی ڕەخنەی هاوچەرخ و ئەو ئەنجامانەی، کە پێیان گەیشتین، هەروەها بەراوردکردنی کەرەستەکان لە شرۆڤەکردنی دەقەکاندا، بەم ڕاستییە دەگەین: تێکڕای میتۆدەکان لە بنەڕەتدا، لە هزرەکانی بونیادگەری هەڵهێنجراون، تەنیا لە دەرەتانی پراکتیکردندا لە یەکتر جیاوازن، هەر یەکێك لە میتۆدەکان پشت بە ڕەگەزێك لە ڕەگەزە هونەرییەکانی دەق دەبەستێت. بۆ نموونە، بونیادگەریی فۆرمالیستی، تەنیا دەق هەژمار دەکات، تیۆری وەرگرتن (دەقوەرگرتن) بۆ هەموو شیکارێك ڕەچاوی ئایندە دەکات، بابەتایەتی جەخت لەسەر بابەت دەکاتەوە، پراگماتیك هەردوو ڕەگەزی دەقنووس و دەقوەرگر، بەو سیفەتەی دوو کرداری گەیاندن، لەخۆ دەگرێت، دەقناسی، دەق لە بڕێتی ڕستە بە یەکەی شیکار دادەنێت، هێماگەریی ڕایەڵەکانی گرفتی دەقی، کە لە ڕەمز و هێماکان و جووتە هاودژەکان پێکدێت و پابەندن بە سەرچاوەکانەوە، دەیانکاتە ناوەندی خوێندنەوە و ڕاڤەکردن، هەرچی تیۆری هەڵوەشاندنەوەیە، سەرتاپای ڕەگەزە هونەرییەکانی دەق، بە دەق و دەقنووس و دەقوەرگریشەوە، ڕەت دەکاتەوە، ئەم وەلاوەنانەیش لە ڕێگای سڕینەوە و کوژانەوە ئەنجام دەدرێت بۆ ئەوەی، بەدوای دەق، یان شوێنەواری بزرا و جیاکار بگەڕێن، ئەم کردارەیش بە مشتومڕ و دەسەڵاتی ئاوەزی ئامادە، یان نادیار بەڕێوە دەچێت.

ئەم ئاکامانە دەمانخاتە بەردەم داوایەکی ترسناك، ئەوەیش ئەو تێکۆشانەیە بە هۆکاری لەناوبردنی ڕەگەزە هونەرییەکانی دەق، دەق لەبەریەك هەڵبوەشێتەوە و لەناو خۆیدا دووچاری داڕمان بێت. لە کۆتاییشدا بەشێك لە شرۆڤە و ڕاڤەیەکی خودی دەست دەکەوێت، پێوەندی بە دەقەکەوە نابێت، لەم ئاستەدا خوێندنەوەیەکی ڕەخنەییانە لە ڤالایەکی شێواویی، ڕاڤەیەکی نادروست

سەرهەڵدەدات، کە مەبەستە بنەڕەتییەکەی دەق و ئەدەبیاتی ئەدەبەکە لەناو دەچن، ئەو کەموکورتییانە هانمان دەدات خوێندنەوەیەکی دیکە بۆ ئەم میتۆدانە بکەین، خوێندنەوەیەك کە پەسەندی ڕێژە و کەموکورتی و تێپەڕاندن بکات، بۆ ئەوەی میتۆدەکان چییەتی هزر و شارستانی و ڕۆشنبیریی نەتەوەیی لەدەست نەدەن.

بەر لەوەی پرۆژەی ئەم میتۆدە بخەمە ڕوو، دەمەوێت و بەلامەوە گرینگ و مەبەستە، پرسیارێك بکەم، کە هەمیشە لە پانتایی ئەدەبی کوردییدا ئامادەبوونی هەیە، ئەویش: بۆچی ڕەخنەگرانی کورد، یان ئەوانەی خۆیان بەم بوارەوە خەریك کردووە، بوونەتە، یان دەبنە مشەخۆر لەسەر ئەو میتۆدانەی کە لە ڕۆژئاوادا سەرهەڵدەدەن؟ یان هیچ نەبێت لە ئان و ساتی خۆیدا وەبەرهەمیان ناهێنن، بۆ ئەوەی ڕەخنەگرە ڕۆژئاواییەکان بزانن جگە لەوانەیش داهێنان هەیە.

ئایا هەڵوێستمان چی دەبێت ئەگەر ئەم میتۆد و تیۆر و ڕێبازانە بە کۆتا هاتن؟ – هەرچەندە هەندێکیان کۆتاییان هاتووە – دەبێت لە چاوەڕوانیدا بین تا ڕۆژئاواییەکان میتۆد و ڕێباز و تیۆری نوێ بێننە ئاراوە و داهێنان بکەن؟ یان بۆچی ڕەخنەگرە کوردەکان، لە میتۆدە ڕۆژئاواییەکان دوور ناکەونەوە و میتۆد و ڕێبازێکی شایان بە شەقڵی نەتەوەیی و بەهای شارستانییەتەکەی داناهێنن، کە ئەمەیش بە دوو ئاست دەبێت، یەکەم: گەڕانەوە بۆ کەلتوور، وەك لە تیۆری ڕەوانبێژی و تیۆرەکانی ڕێکخستن... لە ئەدەبی کوردیدا بەدی دەکرێت. دووەم: کارکردن بۆ ئەوەی میتۆدێکی نوێ دابهێندرێت کە هەموو تازەگەرییەکانی سەردەم لەخۆ بگرێت. هەر بۆ زانین زۆرێك لە ڕەخنەگرە عارەبەکان[٤٥] لەسەر ئەم کەموکورتییانە هەڵوەستەیان کرد و ئاوڕیان لە داهێنان و مۆرك و تازەیی دایەوە. (شوکری عەیاد) لێکۆڵینەوە لە ڕێبازە ڕۆژئاواییەکان، (کەمال ئەبودیب) لە شیعرایەتی و مشتومڕی نهێنی – زۆرانی تر گەواهی ڕاستی قسەکانمانن.

بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکان پێویستە ئەم ڕاستییە بدرکێنین، هەوڵدان بۆ داهێنانی میتۆد و ڕێبازی ڕەخنەیی لە ئەدەبی کوردیدا، پێویستییەکی زۆر پێویستە، بەمەرجێك سوود لە تێکڕای بیرۆکە و هزرە تازەییەکان وەربگرین، تا

ئێستا ئەم هەوڵە لەلایەن ئێمەوە چەکەرەی نەکردووە، چ لـە ئاسـت گەڕانـەوە بـۆ کەلتووری کوردی، چ لە ئاست سوود وەرگرتن لە میتـۆد و ڕێبـازە ڕۆژئاواییـەکان. لە هەموو جیهاندا هەندێك لە میتـۆد و ڕێبـازە کەلتوورییـەکان وادە و سـەردەمیان تـەواو بـووە، هەندێکیـشیان بـە سـۆنگەی خوێندنـەوەی (خۆپـارێزی) پێـشکەوتن بەخۆوە نابینن و چەقبەستوون، یان تێکەڵ بە تیۆرەکـانی ڕەخنـەی تـازە بـوون، هەرچی میتۆدە ڕۆژئاواییەکانە، بە ئامادەکراوی وەبەرهەم دێـن، خوێندنەوەیـەکی ڕێژەیی، کەموکورتی... بۆ نەکراوە، چونکە لە میانەی مێـژوودا گەشـەی کـردووە، ئامانجە گرینگ و ستراتیجییەتەکەی، دابینکردنـی مەبەسـتە دیاریکراوەکانـە، نـەك هەستپێکراوەکان.

بێ گومان زانست وەك میراتێکـی هاوبـەش بـە گـڕ و تینـەوە هەڵـدەکات و بـڵاو دەبێتـەوە، پێویـستە ڕەخنـەگری کـوردی لێـی بێبـەش نـەبێت و بـە ئاڕاسـتەیەك بیقۆزێتەوە، کە لەگەڵ بەرژەوەنـدی و ناوەنـدەکانی ئـەدەبی کوردیـدا بگونجێـت، هەوڵبـدات بـۆ دڵنیـابوون لـە ڕاسـتی و دروسـتیی میتۆدەکـان، تاقییـان بکاتـەوە، پەرەی پێبدات و شتی بخاتە سەر و بیگونجێنێت بۆ ئەوەی وەك مۆرکێکی کوردی بناسرێت و کاری لەسـەر بکرێـت، بـۆ نموونـە: شـەپۆل و تـەوژمی تەکنـەلۆجیا بـە ئاستێکی بەرز هەڵی کردووە (کۆمپیوتەر نموونـە ئاسـا) ناکرێـت کـورد پـشتی تـێ بکات و سوودی لێ وەرنەگرێت و بەو ئاقارەی داببات، کـە گوایـە ئـەدەبی کـوردی شـتی وای پێویـست نییـە. ڕەخنـەگری کـوردی لەسـەرییەتی وەك ئـەرك میتـۆدە ڕەخنەییـەکان لەبەرچـاو بگرێـت و لێکۆڵینـەوەیان لەمـەڕ پێـشکێش بکـات لـە چوارچـێوەی میتـۆدە پێـشکەوتوو و باوەڕپێکراوەکـان بـەپێی پێویـست داهێنـان بکات.

**پرسیار:** بۆچـی ئـالیی ڕەخنـەی ئـەدەبی کـوردی بـە شـێوەیەکی پێویـست و لەبەرچاو نییە، ڕەخنەگرانی کورد نە میتۆدێك دادەهێـنن، نـە خـاوەنی ڕێبـازێکی گونجـاو پێویـست و زانـستین، کـە پێویـستییەتی ئـەم ڕەخ و کەموکورتییانـە پـڕ بکاتەوە، ڕەخنەگرانی کورد ئەمڕۆ لە بۆشاییەکدا دەسووڕێنەوە، بێ کارییان پێوە دیارە، لە ژینگەیەکدان، ئامانجی شارسـتانی بـزرە و چـالاکی و هانـدەری داهێنـان

خانەی بەتاڵن، لێکۆڵەرانی کورد ئەمڕۆ دوو دەستەن، دەستەی یەکەم: ئالوودەی خوێندنەوەیەکی خۆپارێزن، لە کەلتوور تێناپەڕن، دەستەی دووەم: خوێندنەوە بۆ تیۆرە ئامادەکراوەکانی ڕۆژئاوا دەکات بەبێ ئەوەی لە میانەی مێژوودا دایانبڕێت، لەو دەمەدا داهێنان بەبێ خوێندنەوەیەکی ڕێژەیی، کە لە باو بڵاو تێدەپەڕێت و نەگۆڕ گەشە دەکات و گۆڕاویش پێشدەکەوێت، جێبەجێ نابێت. لێرەدا پێویستە، ڕووبەری پانتایی لێکۆڵینەوەی زانستی فراوان بکرێت، ئازادی بۆ ئەکادیمییەکان مسۆگەر بکرێت. بۆ ئەوەی بڕوا بەخۆی بێنێت و بەگیانێك، کە پابەندبێت بە هاوبەندی شارستانی کار بکات، کەواتە چۆن داهێنانی میتۆد لەو کۆمەڵگایانە مەیسەر دەبێت، کە ئامانجە ستراتیجییەکانی هزری ڕۆشنبیری بە لێکۆڵەر نادرێت، بێ بەش بێت لەو بەرهەمانەی کە کۆمەڵگایەك لەڕووی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە و کتێب و بەرنامەکانی کۆمپیوتەر بەرهەمیان دەهێنێت. دەستکەوتەکەی کەمتربێت لە دەستکەوتی دەوڵەتێکی ئەوروپایی وەك ئیسپانیا، کە کەمترین پێشکەوتنی بەخۆ بینیوە.

ڕاستییەك هەیە پێویستە پەنجەی بۆ درێژ بکرێت، ئەدەبی کوردی لە ئاراستە و ژینگەی کۆمەڵایەتی، هزرییەوە لەگەڵ ژینگەکانی تر جیاوازە، ڕەنگبێ بە ئاسانی میتۆد و ڕێبازە نوێ و تازەگەرییەکان نەگونجێ و پەسەندیان نەکات، بەڵام دەکرێت سوودیان لێ وەربگیرێت و بابەتێکی هاوشانی ئەوانیان لێ هەڵبهێنجرێ، لەگەڵ تایبەتمەندی زمانی کوردی بیگونجێنی و مۆرکی زمانی نەتەوەیی پێ ببەخشێت. ئەوەی لە ڕوانگەی ئەم ئاسۆیەوە کاربکات، لەو بەڵگەنەویستە دوور دەکەوێتەوە، کە ئەدەب لە سروشتی هەموو نەتەوەکاندا، بەرهەمێکی مرۆیی هاوبەشە، تەنیا دەربڕین و بەندە ئاوەزەییەکان و تایبەتمەندە نەگۆڕەکانی هەر نەتەوەیەك لە نەتەوەکان جیاوازە. تیۆر و ڕێبازەکان لە نێوان گەلاندا کەلتوورێکی هاوبەشە و هەر گەلە بەگوێرەی بنەما فیکرییەکان و مەبەستە ئاینییەکان دەیگونجێنێ، بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆی گەشەی پێ دەکات، بۆیە لێرەدا هەست دەکەین، کە ئەدەب بەر لە هەر شتێك ناوەند و خانەیەکی زمانییە، زمانیش لە جەوهەری خۆیدا لە نێوان مرۆڤەکاندا لەڕووی ناونانی شتەکان و

ڕەنگدانەوەی هزرەكان و كەرەستەكانی شرۆڤەكردنی واتـادا، جیـاواز نییـە بـەڵكو تـەنیا لـەڕووی ڕەمزەكـانی دەربڕینـەوە (قـسە كـردن و نووسـین) جیـاوازە. ئـەبو حامید ئەلغەزالی دەڵێت: (زمانانی مرۆیی لە حەقیقەتی دەروون و بیردا یەك شـتن، لەڕووی دەربڕین و ڕەمزی نووسیندا جیاوازن)[٤٦].

بەڵام میتۆدی زمانناسیی بۆ؟ میتۆدەكان هەرچەندە ڕەهەندە فیكری و ئایدیا و هونـەری خۆیـان ئاشـكرا دەكـەن، بـەڵام پـشت بـە دەرەنجامـە زمانناسـییەكان دەبەستن و وەك پشتۆك تێی دەڕوانن، دەقـیش لـە جەوهـەری خۆیـدا بونیـادێكی زمانییــە، ئــەو بونیــادە زمانییــەش، بــۆ مەبەســتەكانی دەق، كــە پــاراوە بــە سەرچاوەكان، تێكەڵ و هەمەجۆرە، بۆیە هەرگیز لەبەر ڕووناكی و ڕایەڵەكانی یـەك تیۆر، یان میتۆدێك لە میتۆدەكانی ڕەخنەی هاوچەرخ، شـرۆڤە و شـیكار ناكرێـت، هەریەك لەم میتۆدە هاوچەرخانە، لـە بنەمایانـدا ڕەگـەزێك لـە ڕەگـەزە هونـەری و ڕاگەیاندراوەكانی دەق، یان دەق خۆیشی ڕەت دەكاتەوە[٤٧]. لەلایەكی تریـشەوە، ئەمڕۆ ئەدەبی كوردی، لەهەموو كاتێك پتر پێویستی بە داهێنانی ڕەخنەیی هەیـە، بۆ ئەوەی لەگەڵ هـەموو گۆڕانكارییـەكان و دەسـەڵاتە جیهانییەكانـدا، ناسـنامەی هـەبێت. تیـۆرە ئەدەبییـە نوێیـەكان ڕۆڵـی خۆیـان بـینی، بـۆ نموونـە: ڕیالیـستی سۆشیالیـستی و دەروونـی و بونیادگـەری، سـەدەیەك لـە زەمەنـدا زاڵگـەی كـاری ڕەخنــەیی بــوون، ڕیالیــستی گــرۆتینی بزووتنــەوەی ڕزگــاریخوازی جیهــانی بــوو، بونیادگــەری هانــدەری پێكهێنــانی قــەوارەی ســەربەخۆ بــوو، هەڵوەشــاندنەوە و دەستاودەست و تیۆری وەرگرتن هەوڵی بەجیهانی بـوونی شارسـتانیەت و گـۆڕانی نــەگۆڕەكانیان دەدا، دەوڵەتــەكان پارچــە پارچــە بكــەن، لــە نــاوەوە ناسـنامەی شارستانییان لە باریەك دەترازان بۆ ئەوەی لە مێژوودا دەریانكێشن.

لـە داڵانــی ئــەم دەرئەنجامانــەدا، میتـۆدی پێـشنیازكراو هــەوڵ دەدات تیۆرێـك دابمەزرێنێت لەسەر ئەو بڕوایەی، كە ڕێكخستنی ڕوئیـای مرۆڤایـەتی بـۆ جیهـان و ئەو پێوەندییەی، كـە بوونـە گەردوونییـەكان لـە میانـە و پێگەیـشتنیان بـە یـەكتر دەبەستێتەوە، بگەڕێنێتەوە. لـەم ڕوانگەیـەوە، دیـاردەی گەیانـدن، بـەپێی كـات و ڕەهەند و چین و توێژ، دیاردەیەكی كۆمەڵایەتییە، ڕەگەزە هونەرییەكانی هەوڵ لە

پێکهاتەی وتووێژن، لە قسەی ڕۆژانە، یان لە دەقێکی داهێنراو و خوێندنەوەیەکی ڕەخنەییانەدا، هاوسەنگ دەبن.

ناوئاخنکردنی دەق لە ڕوانگە و سێبەری میتۆدی زمانناسیی ڕێکخستندا، چەندین کۆد لەخۆ دەگرێت، واتە ڕەخنەگر لە ڤالای دەق و خوێندنەوە و ناوئاخنکردندا، دەتوانین پەنا بۆ ژمارەیەك تیۆر و کەرەستە و تەکنیکی هونەری ببات، بەو ئەنجامە پەی بەو پەنهان و نهێنییانە ببات، کە لە ناخی دەقەکەدا کەڵەکە بوون و خاڵ و ڕایەڵە ڕووکەشی و قووڵییەکان دیاری بکات. ناوئاخنکردن و شیکارکردن بە ئاڕاستەی چەندین ئاستدا دەڕوات، بۆ ئەوەی فرە خوێندنەوە بۆ دەق بکرێت، لێرەدا دەق خۆی لەجیاتی ڕستە، دەبێتە یەکەیەکی خوێندراو، هەموو خوێندنەوەکان کۆمەڵێك تیۆری گونجاندن و میانەیی بەرهەمی دەهێنێت، تاوەکو لە سەراپای پێکهاتەکەدا شیکاری هەمەجۆر پێشکێش بکات و پەنجەیش بۆ ئەو پێوەندییە درێژ بکات، کە لە پوختەی خوێندنەوەکانی تردا هاتوونەتە ئاراوە. وا لە خوارەوە نموونەی کۆدەکان بەشێوەی تیۆر و ئاست دەخەینە بەر دیدان:

**١- ڕەگەزەکانی هونەری دەق:**

بریتین لەو ڕەگەزە هەواڵییانەی، کە لە دەقدا دەبینرێن، کە عەبدولقاهر جرجانی[٤٨] لە (هەواڵ، هەواڵدەر، هەواڵ بۆدراو، هەواڵ لێدراو کۆیان دەکاتەوە، لە دەقیشدا بریتین لە: (بنێر، وەرگر) دەق (بونیاد و ڕێکخستن، بابەت، سەرچاوە)، شرۆڤە و ڕاڤەی ڕێکخستن لەنێوان ئەم ڕەگەزانە هاوسەنگی دروست دەکات، هیچ یەکێك لەم ڕەگەزانە، بەو ڕاستییەی، کە تەواوکەری مەبەست و واتای دەقن، فەرامۆش ناکات، بەم پێیە دەقێکی ڕەخنەیی داهێنراو پێکدێت، ئەمەیش هاودژە لەگەڵ هەریەك لە: بونیادگەری چونکە بونیادگەری تەنیا و تەنیا جەخت لەسەر دەق هەر خۆی دەکاتەوە، تیۆری وەرگرتن، وەرگری بەلاوە گرینگە، هەڵوەشاندنەوە، جگە لە سەرچاوە گشت ئەوانی تر ڕەت دەکاتەوە، ڕەگەزە هەواڵییەکانی هونەری دەق (وێشتن، یان نووسراو) پێنجن بەم شێوەی خوارەوە:

أ) **بنێر** دەقنووس، یان نووسەر، ڕاستەقینە، یان ڕاگەیەنەر، یان نووسراو.

ب) **دەق** ئاستەکانی بونیادی زمان و ڕێکخستن دەگەڕێتەوە.

پ) **بابەت** ئەو لایەن و هزرانە لەخۆ دەگرێت، کە کاری هەواڵی دەق دەگەیەنن.

ت) **وەرگر** (دەق وەرگر، خوێنەر) قبوولّ و پەسەندکەری دەق، بێ لایەن بێت، یان هاوڕا و دژە ڕا، کاریگەری و کارلێکراو بێت.

ج) **سەرچاوە (سەرچاوەیی)**: کاریگەریی بە دەقکردنی هزر و بیرەکانی پێشتر، کە لەگەڵ دەقەکە تێکەڵاو بووە.

**٢- کارایەتی ڕووداوی دەق:**

لێکۆڵەر پێ لەسەر ئەو جەمسەرانە دادەگرێت، کە کارایەتیی دەق پێکدێنن، بەزۆری لە جێناوەکان و بابەتە گرینگ و بەرچاوەکان، لەشێوەی کەس و جەمسەرە کێشەییەکاندا بەرجەستە دەبن، بەوێنەی جۆراوجۆر لە وتار بەدیار دەکەوێت: (من/ کارا/ بنێر – منی دووەم/ هاریکار/ لەجیاتی بنێر – ئەو/ دژێکی تر – تۆ/ گوێگر/ وەرگر – بابەت/ مەبەست...)، ئامادە و نائامادە، پاڵپشت بەو بابەتانەی، کە هەر هەموویان ڕێکدەخات، ئەو پێوەندییانەی، کە ڕووداوی گێڕانەوەیی، یان وەسفی گشتی دەیجووڵێنێت، لەگەڵ ئەوەشدا منی دەروونی، کۆمەڵایەتی، دەقی، کە بابەت پێویستە من، یان کارا، مەبەستایەتی یان بەهایی وەك گریماس[٤٩] ناوی ناوە. جەمسەرەکانی کارایەتیی دەق بەتەماهی و لەبرێتی و ئاڵوگۆڕی شوێن لەیەکتر جیا دەکرێنەوە، (من) لەژێر سایەی کەسەکان: (تۆ، یان ئەو، یان بابەت) بەدیار دەکەوێت، ئەمانە بۆ پێوەندی نێوان بنێر و بابەت و وەرگر لەلایەك، نێوان هاریکار و کارا و هاودژ لەلایەکی تر دەگەڕێتەوە[٥٠] بۆ ئەوەی مەبەست و بەهای دەق بپێکرێت. دیاریکردنی ئەم کارایەتییە لەڕێگای دەستنیشانکردنی ئەو دیاردانەوە دەبێت، کە بەهۆی جێناوەکان و ناوەندە

دەلالییە زاڵەکانی هەر جەمسەرێك لە جەمسەرەکانی کێشەکان، لەناو دەقەکە دابەش بوون، کە توانستی پەکخستنی کارایەتیی دەقیان هەیە.

**٣- کاری دەلالییەتی دەق:**

مەبەست لەم کۆدە: دیاریکردنی ئەم کارە دەلالییە زاڵانەیە، کە پانتایی ئاستە جیاوازەکانی: فۆنیمەکان، یەکە و دانەپەیڤەکان (مفرەداتەکان)، پێکهاتەکان، بەپێی کاری ڕستەکان لە کارچالاکیی وتەبێژیدا وەك، کە لە تیۆری جاکبسوندا هاتووە داگیر دەکەن[٥١]. لێرەدا سەرتاپای دەق بەدەرنابێت لە هەڵچوون بۆ بەدیارخستنی هەڵوێست – فەرهەنگ بۆ ڕوونکردنەوە، سەرچاوە بۆ هەواڵ و دیاریکردنی ئامانج، یان بابەتی بەهاو نرخ – سەرنجی بانگێشت کردن بۆ داوا و فرمان – شیعرایەتیی ئێستێتیکا بۆ بوارەکانی هونەری – تێگەیشتن بۆ دابینکردنی گەیاندن، کە لەبەر ڕووناکییەکەیدا مەبەستی نووسەر دەدۆزێتەوە. کارچالاکیی دەق، کە لە ڕێگای کارو چالاکییە زاڵەکان دەق دیاری دەکرێن.

**٤- ڤالا (فضاء)ی دەق:**

حاڵ و بار و هەلی بابەتی هزری و شارستانی و کۆمەڵایەتیی کات و شوێن و دەستاودەستی دەگرێتەوە، کە هەموویان لەژێر چەتری دابونەریتی خەڵکدان، دەق خۆیشی لە ڕوانگەی جۆر و پابەندبوونی و ناونیشان، بەرایی و کۆتایی، بەها و شوێن و بۆنە و دەقنووس و دەقوەرگر، لێی بەدەر نییە.

**٥- ناوەندە دەلالییەکان:**

لەو یەکە و مفرەداتانە پێکدێت کە بۆ ناوەندە دەلالییەکان دابەش بوون، کۆمەڵە پابەندبوونێکی زاڵ دروست دەکەن لەم ناوەندەدا بە لەبەرچاو گرتنی بار و بوار و بابەت و داتاکانی زاڵگەلی، ئەو پێوەندییە دەرەکییانە ئاشکرا دەکات، کە نووسەر بانگێشتیان بۆ دەکات، دەبنە بنکە و مەڵبەندی ڕوواو، پاش ئەوەی ڕێکدەخرێن و سەروخوار ڕیزبەند دەکرێن ئەوجا شرۆڤە دەکرێن.

**٦- پێوەندییە هاودژەکان:**

لەشێوەی دووانەیی (جووتە) هاودژ، یان سیانەیی زاڵگەلی بەدیار دەکەوێت و ڕۆڵی لە ڕووداوی نهێنی دەقدا هەیە ((من – ئەو/ خۆشەویستی – ڕق/ شەو –

ڕۆژ...). هاودژی لە ئاستی فزە (لەفز) و ڕستە، هاویەك و ڕووبەڕووییش دەبێت، وێڕای ئەمەیش، ئاستی كەسەكان و كات و شوێنیش دەگرێتەوە، زۆرجاران هەندێ لە لێكۆڵەران لەكاتی ناوئاخنكردنی ئەم ناوەندەدا، پەنا بۆ چوار لایەك، یان پێنج لایەكی هێماگەریی دەبەن، بەو پێودانگەی كە (دال)ێكی ئەندێشەیی سەرچاوەییە.

**٧- كاتی دووری:**

لەم ئاستەدا، پێویستە جیاوازی لەنێوان كاتی شۆڤار (الساعي) و كاتی گێڕانەوەی قسە و باسدا بكرێت، ئەوەی دوایی بە چركە ناپێورێت، دەكرێت كاتی شۆڤار بە سێكوچكەی ڕێزمانی (ڕابردوو، ئێستا، ئایندە) بەپێی خوێندنەوەیەكی دیاریكراو بۆ كاتەكە، نەك شێوەی كار و داڕژاوەكانی هەژمار بكرێت. بۆ نموونە: هەروەك لە دەلالەتی ڕانەبردووی نەفی (نایكات، نایخوات...) لە ڕابردوودا هەستی پێ دەكرێت بۆ ئەوەی ڕەهەندی كاتی زاڵگەلیی دیاری بكرێت، پێویستە هەوڵی بەدەستهێنانی پێوەندی نێوان زاڵگە و نێوان كارایەتیی ڕووداو بدرێت و باسی ئاستەكانی دیكەیش بكرێت.

**٨- پانتایی شوێن:**

ئەم كۆدە لە ڤاڵای ناوەوە و دەرەوەی دەقدا — لە تەنگەبەرێكی خودەوە بۆ جێگایەك، هۆدەیەك، شارێك، هەرێمێك، كیشوەرێك، بۆ گەردوون، بۆ بوونێكی سەرتاسەری بەدیار دەكەوێت. ئەم پانتاییە لە ڤاڵای خاڵ و شوێنی ڕووداو جوولەی كەسەكان هەڵدەهێنجرێت.

**٩- ئاستی ڕیتمی:**

ئەم ئاستە، لایەنەكانی: مۆسیقای ناوەوە، كە بونیادێكی زمانییە، مۆسیقای دەرەوە، كە لە كێش و كێشە عەروزییەكان پێكدێت، دەگرێتەوە، جگە لەمانەیش، ڕیتمی واتاییش (مضمونی) كە هزر و بیر و وێنە لەكاری داهێنانیدا بەرجەستە دەكات، لەفۆنێمەوە دەست پێ دەكات بۆ وشە و تا بە ڕستە كۆتایی دێت، لەخۆ دەگرێت، بنیات و بونیادی گەورەی دەق بەشێوەیەكی گشتی، بونیادی ڕیتمی گشتیی بۆ دەق پێكدەهێنێت، كە كاریگەری لەسەر مەبەستایەتیی دەق دەبێت.

**١٠- ڕەمزە نیگاییەکان:**

بۆ وەبەرهێنانی ئـەو ئاسـتە، دەرەتانـەکانی مرۆیـی، ڕۆشـنبیری و کۆمەڵایـەتی دەوریان هەیە، نیشتووی سەرچاوەیی یاد و ڕەتە لەو نیشانە و هێمایانەی، کە بەو لەفزانــە یــان دەســتەواژانە هاوبەنـدن، کــە هــەڵگری شـرۆڤەیەکی دەلالـی، یـان هێماگەربێت، کە دەکرێت لە سایەی دەرئەنجامی ئاستەکانی پێشوو، ڕاڤە بکرێت.

**١١- بەدەقکردن:**

واتای بەدەقکردن بریتییە لە: چەند دەقێك لـە ڕێگـای پەسیسە و عـەمارکردنی یادەوە، تێکەڵ بـە دەقێکـی تـازە بکـرێن و تێـك بترنجێنـدرێن، دەقـە نادیارەکـە، بــەهۆی لــەبار یەکترازانــدنی یەکــەکانی، ڕەهەنــدە مەعریفییــەکانی لــەناو دەقــە تازەکــەدا دەتوێتــەوە، دەق و بــیر و هــزر جێگــای دەگرێتــەوە، بـۆ تێڕامـان لـە سەرچاوەکانی هزری و ئایینی و ڕۆشنبیریی هەر دەقنـووس و دەقێکـدا، پێویـستە بۆ دەیان دەق بگەڕێینـەوە. ئـەویش بـە بەرانبـەر کردنـی دەقـەکان لەگـەڵ دەقـە ئامادەکراوەکان لەڕێگای بەدەقکردنەوە.

**١٢- تیۆری دەقوەرگرتن:**

لەم ئاستەدا جەخت لەسەر دوو ڕەخ: کاریگەر و کارلێکراو، لەنێوان دەقنووس و دەقــوەرگردا دەکرێتــەوە، ئــەم کــردارەیش لــە چوارچــێوەی دەقــدا پــشت بــە سەرچاوەکانی هەر یەکێکیان دەبەستێت. بۆچـوونی (ئیـزر) لـەبارەی ئـەم تیـۆرە ئەوەیە: بنەمای تیۆری دەقوەرگرتن، لـە کرداری خوێندنـەوەدا پـشت بـە بابـەتی ئاڵوگۆڕ دەبەستێت، ئەوانیش: أ) خوێنەر شت لە دەق وەردەگرێـت، دەق زانیـاری و نیشانەی جیاواز بە خوێنەر دەبەخشێت. ب) خوێنەر شت بـە دەق دەگەیـەنێت، خوێنــەر ڕەهەنـدی ڕاڤــەی نــوێ پێــشکێش بــە دەق دەکـات، زۆر لــە لێکۆڵــەرە ڕۆژئاواییەکان لە توێژینەوەکانیاندا، پـشت بـە دەسـەڵاتی دەقـوەرگر دەبەسـتن و دەسەڵاتی دەق و ڕەگەزەکانی دیکە بەلاوە دەنێت. ڕەنگبێ لەلایـەن خوێنـەرەوە ڕاڤە و تەئویلی ئەوتۆ بۆ دەقەکە بکرێت، کە لە دووتوێی دەقە بنەڕەتییەکە بوونی هەر نەبێت[٥٢] هــیچ بـر و بیانووێکیـشی بـۆ نادۆزێتـەوە لـە سـایەی مەبەسـتەکانی دەقدا، کە لە ئاستەکانی تردا دەرکێشرابن.

**١٣- نەگۆڕ و گۆڕاو:**

لە دوو ناوەندا خۆ دەنوێنێت، ئەوانیش: یەکەم: ناوەندی ڕستەی کاری، کە دالی گۆڕانە. دووەم: ڕستەی ناوی، ئەویش دالی نـەگۆڕ و بـەردەوامی بنیـاتی کێشەیە. ئـەم ئاسـتە بەکێـشە دەربڕاوەکـانی دەق لـەڕووی چـالاکی و توانـستی گـۆڕان بـە درێژایی کات، یان بە نەگۆڕە بەردەوامەکان دیاری دەکرێت.

**١٤- میانەی پراگماتیکی**

ئەوەی لەم ئاستەدا تێبینی دەکرێت ئەوەیە، گـەڕان و بەدواداچـوونە بـە کـار و کردارەکانی ئاخاوتن، ئـەو ئـەرك و ڕۆڵـەی لـە ژیـانی کـرداری، لـەڕووی دەروونـی، کۆمەڵایـەتی و سیاسـیی... دەیبینێـت، بـە دیـاردە و نـاوەرۆکی: داوا، ئـارەزوو، ڕەتکردنـــەوە و هەڕەشـــەکردن... ئاشـــکرا دەبێـــت. پێوەندییـــەکانی دژبـــوون (بەریەککەوتن)، یان ڕێگەگرتن، یان کۆکبوون ڕوون دەکاتەوە. ئەم ئاسـتە گـرفتی گشت جۆرەکانی دەقی دەربڕاو: زمانی، وێنەیی[٥٣] و ئامێری (حاسـوبی) دەکـات، جگە لەمانەیش، ئەو کەرەستە نوێیانەی، کە لە هۆکـارە جیاوازەکـانی ڕاگەیاندنـدا وەك: دەقی نووسراو، دەقی وێنەیی و دەقی ئەلیکترۆنی[٥٤] بەرجەستە دەبـن، کـە لە ناوەرۆکیاندا بازنە زانیاری نا زمانی لەخۆ دەگرن.

**١٥- پەرلە (شیفرە) زانین و دەق پێکهێنان:**

ئـەم ئاسـتە هـەوڵ دەدات ئـەو پێوەندییانـە دیـاری بکـات، کـە دەرەنجـامی ئاستەکانی پێشتر بەیەکەوە دەبەستێتەوە[٥٥]، ئەنجام و ئەو بارگانەی کە هەڵگری ئـایۆنی دەلالـی و ڕەمـز، ڕاڤـەیی و جووتـە هاودژەکـانن لەیـەکتر جیـا بکرێنـەوە، هەوڵدان بەو نیازەی، کە لە ڕێگای ناوئـاخنکردن و ڕاڤەکردنـدا، لەنوێـژەوە بینـای دەقێك دروست بکرێتەوە، یان خوێندنەوەیەك، کە سـەراپای دەرەنجـام و نهێنییـە شاراوەکان، کە لـەناخی پەلەکانـدا هـەڵگیراون، ئاشـکرا بکـات، بـەو ڕامانـەی، کـە پێوەندییە زمانییە بنەڕەتییەکە دەرەتانەکانی: گەیاندن، دەستاودەستی و ڕاڤەیی بـەدیار دەخـات، کــە بــە دەقــی دووەم، یــان داهێنــراو دادەنرێــت، مەبەســتە بنەڕەتییـــەکانی داهێنـــەر و دەقـــی خـــوێنراو هاوســـەنگ دەکـــات. لێـــرەدا پەراوێزخستنێك بەدی دەکرێت، چونکە لەگەڵ مەخسەدەکانی دەقە بنەڕەنییەکە، یـان هاوشـێوەکەی، یـان پـێ داپۆشـراوەکەی، یـان دروسـتکراوەکەی، پێـچەوانە دەبێت.

## ئەنجام

بە کۆتایی هاتنی لێکۆڵینەوەکە بەو ئەنجامە دەگەین، کە ئەوەی لەم ئاستە بۆ ناواخنکردن و شیکارکردنی زمانناسیی پێشنیار دەکرێت، بریتییە لە چەندین تیۆری شرۆڤەکاری زمانناسی، دەکرێت ڕەخنەی ئەدەبی جۆرە گشتگیرییەکی فرە ئامانج و ڕەهەند، لەدەقی ئەدەبیدا وەبەرهەم بێنێت، ئەو پرۆژەیە هەوڵێك نییە بۆ ئەوەی دەرگای چەند خوێندنەوەیەك بەڕووی دەقدا بکاتەوە، بەڵکو ژمارەیەك تەکنیك و تیۆر و میتۆ لەخۆ دەگرێت، هەلیش بۆ خوێنەر دەڕەخسێنێ، کە لە بەرهەم و ڕاڤەکردن و داهێناندا بەشدار بێت، لەڕێگای زمانی دەقەوە، کە سەرچاوەی زانیاری هەمەچەشنەیە کاری فرە دەلالی بکات، لێرەدا دەق لەژێر سایەی هاوسەنگی نێوان ڕەگەزەکانی، دەسەڵاتی ڕاگەیاندن دەنوێنێت کاتێك هەندێك لە ڕەگەزەکانی دەق بەرەو دژبوون و پێچەوانەیی و بزربوون و نەبوونی دەچن، شرۆڤە ئەندێشەییەکان و خوێندنەوە جۆربەجۆرەکان ڕێکدەخرێن، (جان ئیف تادییە)[٥٦] دەڵێت: بۆ گەیشتن بە ڕاستیی ڕاستەقینەیی ڕەخنە و هونەری، جگە لە داڵانی زانست، داڵانی تریشیان پەسەندە.

## سەرچاوەكان


١- منهاج البلغاء وسراج الادباء، حازم القرطاجي، ت/ محمد الحبيب، دار الغرب الاسلامي، بيروت، ١٩٨١، ص: ٦٨، ٦٩، وما بعدهما.

٢- سەرچاوەی پێشوو، ل: ١٨.

٣- الغرباء، ميخائيل نعيمة، مؤسسة نوفل، بيروت، ١٩٧٨، ص: ١٨.

٤- توفيق الحكيم مفكراً وفناناً، محمود أمين العالم، دار شهدي للنشر، قاهرة، ١٩٨٥، ص: ٩.

٥- مناهج البحث الادبي، علي جواد طاهر، مؤسسة العربية للكتاب، بيروت، ١٩٨٩، ص: ٢٠.

٦- اسرار البلاغة، عبدالقاهر الجرجاني، ت/ رشيد رضا، القاهرة، ١٩٥٩، ص: ١١٠.

٧- المذاهب الادبية والنقدية عند العرب والغربيين، شكري عياد، عالم المعرفة، ع: ١٧٧، الكويت، ١٩٩٣، ص: ٣٨.

٨- بڕوانە: دراسات في ضوء المنهج الواقعي، حسين مروة، مؤسسة الايمان العربية، بيروت، ١٩٦٥، ص: ٦١ وما بعدها.

٩- درس في الالسنة العامة، دي سوسير، ت/ صالح القرمادي، دار العربية للكتاب، طرابلس، ١٩٨٥، ص: ٢٤، بڕوانە: بؤس البنيوية، ص: ٤٣٠.

١٠- دي سوسير، الجنرال اللغوي، ميجر ديڤد، ت: د. يوسف يوسفي، وزارة الثقافة، دمشق، ١٩٩٨، ص: ٨٦.

١١- بڕوانە: دلائل الاعجاز في علم المعاني، عبدالقاهر الجرجاني، مكتبة المعارف، الرياض، ١٩٧٨، ص: ٤٠، ٥٠، اسرار البلاغة، ص: ٢٠٠.

١٢- النقد الادبي في القرن العشرين، جان إيف تاديية، ت/ قاسم المقداد، وزارة الثقافة، دمشق، ١٩٩٣، ص: ٢٦٧.

١٣- سەرچاوەی پێشوو، ل: ٢٦٨.

١٤- بؤس البنيوية، ص: ٢٢٣.

١٥- س/ ز رولان بارت، جان ايف تادية، ت، قاسم المقداد، دمشق، ١٩٩٧، ص: ٤٥.

١٦- مفهومية لغة عند ج. آدم، محمد الساعي، دار القصة للنشر، جزائر، ٢٠٠٣، ص: ١٦٧.

١٧- الخط اللغوي (رولان بارت)، عبدالحسن قرع، بيروت، ١٩٩٩، ص: ١٢١.

١٨- البيان والتبين، ابوعثمان الجاحظ ج/١، المطبعة التجارية، القاهرة، ١٩٤٧، ص: ٧٨.
١٩- المنهج السيميائي وتحليل النص، حلام ج. الموقف الادبي اتحاد الكتاب العرب، العدد: ٣٦٥، دمشق ٢٠٠١، ص: ٤٥ وما بعدها.
٢٠- النقد والدلالة نحو تحليل سيميائي للأدب، محمد عزام، وزارة الثقافة، دمشق، ١٩٩٦، ص: ٢.
٢١- دليل الناقد الادبي، ميجان الرويلي وسعد البازعي، المركز الثقافي العربي، بيروت، ٢٠٠٢، ص: ١٨٣. من امثلة ذلك محاولة تحليل الرموز الوطنية والوان اعلام الدول.
٢٢- النقد الادبي في القرن العشرين، ص: ٣١٢.
٢٣- مقدمة للسيمولوجيا، جورج مونان، ت/ جماعة من الباحثين، باريس، ١٩٧٠، ص: ١٩٦.
٢٤- حوار مع جوليا كريستيفا، فواد منصورن، مجلة الفكر العربي، ع/ ١٨، بيروت، ١٩٨٢، ص: ١٢٢.
٢٥- المسار اللغوي، ج. دوبيس، ت، مصطفى ابوالقاسم، القاهرة، ١٩٨٩، ص: ٧٦.
٢٦- المنهج الموضوعاتي، عبدالكريم حسن، شراع للدراسات والنشر، دمشق، ١٩٩٦، ص: ١٨٥.
٢٧- منهج التداول، د. اسماعيل رشاد، مجلة الفكر العربي، عدد ٦، بيروت، ١٩٨٠، ص: ١١١.
٢٨- بۆ زانیاری پتر بڕوانە: النص بناءه ووظائفه، مقدمة أولية لعلم النص، مركز الإنماء القومي، بيروت، ١٩٨٩، ص: ١٢٨.
٢٩- نظرية التلقي، فان ديك، ت: ليث الراوي، الجامعة، القاهرة، ١٩٦٥، ص: ١٨.
٣٠- لغوية النص، ج. ميثال آدم، ت: جرجيس جورج، بيروت، ١٩٩٨، ص: ٨٦.
٣١- بلاغة الخطاب وعلم النص، صلاح فضل، مكتبة غريب، قاهرة، ١٩٩٦، ص: ٣١٩.
٣٢- الخروج من التية، دراسة في سلطة ن ، عبدالعزيز حمودة، عالم المعرفة، ٤/ ٢٩٨، مكتبة المعارف الكويت، ٢٠٠٣، ص: ١١٢ ومابعدها.
٣٣- فن القص بين النظرية والتطبيق، نبيلة ابراهيم، مكتبة غريب، قاهرة ١٩٩٢، ص: ٤٥.
٣٤- الخروج من التية، ص: ١٤٠

٣٥- التفكيكية، إرادة الاختلاف وسلطة العقل، عادل عبدالله، دار الكلمة، دمشق، ٢٠٠٠، ص: ٦٤.
٣٦- سەرچاوەی پێشوو، ل: ٧٢.
٣٧- الكتاب والاخلاق، جاك دريدا، ت/ كاظم جهاد، دار الحصاد، دمشق، ٢٠٠٠، ص: ٣٢.
٣٨- دي سوسير الجنرال اللغوي، ص: ١٠٢.
٣٩- بۆ نموونە: نهاية التاريخ لفرنسيس فوكو ياما، نهاية الجغرافيا لبول فيلر، نهاية اليوتوبيا لراسل جاكوبي، وصراع الحضارات لصمويل هنتكشتن...
٤٠- زاراوەی ئاڵوگۆڕ کردن بەرانبەر زاراوەی پراگماتیك دێت. بەواتای، ئاڵوگۆڕکردنی ڕووداوەکانی ئاخاوتن لەنێوان قسەکەر و گوێگر، جیاوازییێکی زۆری هەیە لەگەڵ زاراوەی الذرائعیەی فەلسەفی کە باس لە سوودی لایەنی پراکتیکی بیروڕا دەکات کە پێی دەوترێت پراگماتیك.
٤١- بڕوانە:
١) مبادئ في اللسانيات، خولة الابراهيمي، دار القصة للنشر، الجزائر، ٢٠٠٠، ص: ١٦١.
٢) اصول واتجاهات المدارس اللسانية الحديثة، محمد يونس، عالم الفكر، ع/ ٣/٣٢، كويت، ٢٠٠٣، ص: ١٦٦ وما بعدها.
٤٢- التداولية، - كاناتي فرانمرا، ترجمة: دلاش جيلاني، مطبوعات الجامعية، الجزائر ١٩٩١.
٤٣- اعلام الموقعين، ابن القيم الجوزية، ت/ محمد محي الدين، ج/ ١، دار الفكر ١٣٧٤، ص: ٢١٦.
٤٤- المستصفى في علم الاصول، ابو حامد الغزالي، ج: ١، مكتبة مطبعة بولاق، قاهرة، ١٣٢٢هـ، ص: ٢١
٤٥- نموونە بۆ ئەم جۆرە میتۆدانە: هەڵوەشاندنەوە کە دەقنووس و دەقە بنەڕەتییەکە بەلاوە دەنێت، تیۆری وەرگرتن، کە دەقە بنەڕەتییەکە بەلاوە دەنێت و تەنیا جەخت لەسەر وەرگر (دەقوەرگر) دەکاتەوە... هتد.
٤٦- دلائل الاعجاز، ص: ٤٠٦.
٤٧- النقد الادبي في القرن العشرين، ص: ٣١٢.
٤٨- بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل: ٣١٢.

٤٩- بروانـة: الـسنية علـم اللغـة الـحديث، ميـشال زكريـا، المؤسـسة الجامعيـة، بـيروت، ١٩٨٣، ص: ٢٤١.

٥٠- فن القص بين النظرية والتطبيق، ص: ٥٤.

٥١- دەقی وێنەیی، ئـەو دەقانـەن کـە دەخرێنـە سـەر شـریت و CD وێنـەیان نیـشان دەدرێت.

٥٢- سێ جۆرە فۆرمی دەق هەیە:

أ) دەقی نووسراوی سەر کاغەز.

ب) دەقی وێنەیی، کە لەسەر شریت و CD تۆمار دەکرێن.

ج) دەقی ئەلیکترۆنی کە لەڕێگای کۆمپیوتەر دەخرێتە ڕوو.

٥٣- بڕوانە: نحو منهج لسانياتي، مجلة كتابات معاصرة، حلام الجيلالـي، بـيروت، عـدد ١٨، ص: ٧٥ ومابعدها.

٥٤- سەرچاوەی پێشوو، ل: ١٠٥.

٥٥- النقد الادبي في قرن العشرين، ص: ٤٢٤.

## ملخص البحث

التحليل اللسانياتي المقترح في إطار هذا التوجه، يأتي تتويجاً لجملة من نظريات التحليل اللسانياتي التي يمكن استثمارها في النقد الادبي، في نوع من شمولية يستدعيها النص الادبي المتعدد الغايات والابعاد، مما يجعل في المشروع لا يسعى من اجل انفتاح النص على عدد من القراءات فحسب، بل على عدد من التقنيات والنظريات والمناهج، ويتيح للقاريء نصيب المشاركة في الانتاج والتأويل والابداع، وممارسة التعدد الدلالي عبر لغة النص الذي تتداخل فيه المعارف والمرجعيات المختلفة. مما يبقى على النص سلطته التبليغية في ظل التوازن بين عناصره الفنية ويضبط التأويلات التهويمية والقراءات المتباينة التي جرفتها دعوات الاختلاف نتيجة استبعاد بعض عناصر الخطاب الى التناقض والغياب والعدم.

## Abstract

This study presents a level to internalize and analyze linguistics ahich consists in several theories of linguistic analysis. Thus, we maintain that literary criticism might generalization in a literary text.

The study is not an attempt to offer numerous readings to texts, rather it presents a number of techniques, theories and methods to give the reader an opportunity to participate in the innovation and hermeneutic process and through textual language, to serve polysemantic functions. Here text exercises an informative authority especially when some textual element head towards opposites, converses, disappearance and absence, then imaginative analyses and the various readings are organized.

# وێنەی لێکچوواندنی پایز، لە شیعری (گۆران) و (قوبادی جەلی زادە) دا

## لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەیی هاوسەنگییە

**م.ی. هاوژین صلیوە عیسی**
**زانکۆی کۆیە / سکولی زمان**
**بەشی زمانی کوردی**

**م.ی. دەریا جەمال حەویزی**
**زانکۆی کۆیە / سکولی زمان**
**بەشی زمانی کوردی**

### پێشەکی :

لە ڕەخنەی ئەدەبی جیهانی ئەمڕۆدا بایەخێکی زۆر بە وێنەی شیعری دەدرێت، و هەموو ئەو هۆکارانە لێك دەدرێنەوە کە بوون بە مایەی بنیاتنانی وێنە شیعرییەکان، یەکێك لەو هۆکارانەش بریتییە لە هونەری لێکچوواندن، کە هونەرێکە لە هونەرەکانی ڕەوانبێژی و زۆر وێنەی شیعری بە هۆیەوە بنیات دەنرێت، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە لە ئەدەب و ڕەخنەی نوێی کوردیدا زۆر کەم قسە لەم بارەیەوە کراوە، بە هۆی ئەوەی خەڵکانێك هەن وا دادەنێن کە هونەرەکانی ڕەوانبێژی تایبەتن بە ئەدەبی عەرەبی و گەر لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیشدا بەرچاو بکەون ئەوا بە کاریگەری ئەدەبی عەرەبی بووە، لەمەوە ئەم لێکۆڵینەوەیە بە ناونیشانی ***وێنەی لێکچوواندنی پایز لە شیعری (گۆران) و (قوبادی جەلی زادە) دا***، هۆکارێك بۆ لەدایکبوونی خۆی دەدۆزێتەوە، کە لە چوارچێوەیدا هەوڵ دەدرێت چەند نموونەیەکی شیعری لێکبدرێتەوە و بە هۆیانەوە دەردەکەوێت ئەو جوانییەی وەرزی پایز بە سروشتی دەبەخشێت، وای کردووە شاعیران بە هۆی لێکچوواندنی ئەم دیمەنانە بە بابەتی تری ژیانمان پایزمان جوانتر پیشان بدەن .

وەك ئاشكرایە دیدو بۆچوون و ڕوانینی هەر شاعیرێك بۆ جیهانی دەوروبەر جیاوازە، بە هەمان شێوە ڕوانینی ئەم دوو شاعیرەش بۆ وەرزی پایز جیاواز دەبێت، هەرچەندە وەرزی پایز لای ڕۆمانسییەكان زیاتر بووەتە هۆی گرنگی پێدان، لە شاعیرانی كوردیش (گۆران) گرنگییەكی زۆری پێداوە، دواتریش شاعیرانی تریش گرنگییان بە ئێستێتیكای وەرزی پایز داوە .

سنووری لێكۆڵینەوەكەش شیعرە پایزییەكانی گۆران و قوبادی جەلی زادە دەگرێتەوەو ئەو دەقە شیعرانە دەكەینە كەرەستەی لێكۆڵینەوەكەمان .

ئامانجی لێكۆڵینەوەكەش سەرەتا خستنەڕووی پێناسە و چەمكی لێكچوواندن و هاوسەنگی ئەدەبی و خستنەڕووی بەهای وەرزی پایزە لای هەردوو شاعیر، وە دواتر دەرخستنی وێنە هاوشێوەكان لای هەردووكیان، لێكۆڵینەوەكە گیروگرفتێكی وەهای نەهاتە پێش كە شایەنی ئاماژە پێكردن بێت .

لێكۆڵینەوەكەمان بە میتۆدی وەسفی شیكاری تاوتوێ كردووە، سەرەتا بۆ بەشی یەكەم میتۆدی وەسفیمان گرتۆتەبەر، بۆ ئەوەی لایەنی تێوری توێژینەوەكە بە شێوەیەكی زانستییانە بخەینەڕوو، بۆ شرۆڤەكردن و لێكدانەوەو ڕاڤەكردنی دەقەكانیش میتۆدی شیكاریمان بەكارهێناوە، لە زۆر شوێنیش هەردوو میتۆدەكەمان تێكەڵ كردووە .

ستراكتۆری لێكۆڵینەوەكەش لەم پێشەكییەو دوو بەش و ئەنجام و سەرچاوەكان، و هەروەها كورتەی باس بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی پێكهاتووە، كەوا بەم شێوەیەی خوارەوە دابەش كراون : بەشی یەكەم : لە سێ تەوەر پێكهاتووە: لە تەوەری یەكەمدا لە بارەی چەمك و پێناسەی لێكچوواندن دواوین، تەوەری دووەم بریتییە لە كورتەیەك لە بارەی هاوسەنگی ئەدەبی، لە تەوەری سێیەمدا باسمان لە بەهای پایز كردووە لە شیعری شاعیرانی كورددا .

بەشی دووەمیش بەسەر سێ تەوەردا دابەش كراوە : لە تەوەری یەكەمدا بە نموونەی شیعری و ڕاڤەكردنەوە وێنە لێكچوواندنەكانی پایزمان لە نێو شیعرەكانی گۆراندا خستۆتە ڕوو، لە تەوەری دووەمیشدا ڕاڤەی ئەو دەقە شیعرانەی قوبادی جەلی زادەمان كردووە كە لە بارەی پایز دەدوێن و بە شێوازی لێكچوواندن بنیات

نراون، لە تەوەری سێیەمیشدا وێنە هاوشێوەکانی لێکچوواندنی پایزمان لە شیعری هەردوو شاعیر گۆران و قوبادی جەلی زادە پیشان داوە، دواتریش دەقە شیعریەکانمان لێکداوەتەوەو کاریگەرییەکانی گۆران بەسەر شیعرەکانی قوبادی جەلی زادە دەستنیشان کراوە .

لە کۆتاییدا هیوادارین توانیبێتمان مشتێکمان خستبێتە سەر خەرمانی ئەدەبیاتی کوردی و خزمەتێکی بچکۆلانەمان لەم بوارەدا کردبێت .

## بەشی یەکەم

## پێناسەو چەمکی وێنەی لێکچوواندن :

بێ گومان وێنەی شیعری کرۆك و رۆحی شیعر دەگرێتەوە، چونکە بەرلەوەی شاعیر دەست بکات بە نووسینی شیعرێك یان کۆپلەیەك سەرەتا وێنەیەك بە خەیاڵیدا دێت، هەندێ کەس ئەوە بە ئیلهام ناودەبەن، ئەم وێنە بۆهاتنە وا لە شاعیر دەکات دەست بداتە قەڵەمەکەی تا بینووسێتەوە، کاتێ کە شاعیر وێنەکە دەخاتە قاڵبی شیعرییەوە، بێ گومان زۆر پێکهاتەی تر خۆیان دەخزێننە پاڵ وێنە شیعرییەکەوە، لەوانە مۆسیقا، سۆز، هەست، خەیاڵ ... هتد، واتا شاعیر هەوڵ دەدات بە جوانترین شێوە وێنە بۆهاتووەکەی بخاتە قاڵبی شیعرییەوە و لە بەرزترین ئاستی هونەری پێشکەشی بکات .

((وێنەی شیعری لە سادەترین مانایدا وێنەکێشانە بە وشە))[1]، واتا وەك چۆن کەرەستەی وێنەکێشان بۆیە و ڕەنگە، کەرەستەی دارتاش تەختە و دارە، بەم شێوەیەش کەرەستەی شاعیر وشەو زمانە بۆ دەربڕین و خەڵقکردنی شیعر، هەروەکو لەم بارەیەوە رۆلان بارت دەڵێت : ((ئەدەب جگە لە زمان شتێکی دیکە نییە))[2]، واتا هەر تێکستێکی ئەدەبی سەیر بکەین دەبینین زمانە، بەڵام بە شێوازێکی جوان هونەرێکی لێ دروست کراوە . هەرچەندە وێنەی شیعریش وەك هونەرێکی تازە لە شیعردا سەری هەڵداوە، بەڵام لەوەتەی شیعر هەیە بێ بەش نەبووە لە وێنە، بەڵام لە سەرەتادا لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکان وەك دیاردەیەکی سەربەخۆ لە وێنەی شیعری نەدواون، تا ئەم دواییە کە بۆ پێناسەکردنی

دەگوترێت ((وێنەی شیعری ڕێگایەکی جەوهەرییە بۆ گواستنەوەی ئەزموونەکانی هونەری لە ژیانی شاعیردا، چونکە شاعیر ڕێگای تری نییە بۆ گواستنەوەی ئەزموونەکانی وەك چۆن مۆسیقاریێك لە ڕێی تەلی کەمانەوە، یا ئەو جۆرە ئامێرە مۆسیقایەی بەکاری دەهێنێت ئەزموونەکانی خۆی تاقی دەکاتەوەو نۆتە دادەنێت و مۆسیقا دەژەنێت و گوزارشت لە ناخی خۆی دەکات، ئەوا شاعیریش لە ڕێی وێنەی هونەرییەوە گوزارشتەکانی خۆی دەردەبڕێت))[3]، زۆر جار وێنە شیعرییەکان بە هۆی هونەری لێکچوواندن بنیات دەنرێت، کە بابەتی بنچینەیی ئەو لێکۆڵینەوەیەی بەردەستمانە، و دەتوانین لە پێناسەکردنیدا بڵێین ((لێکچوواندن پەیوەندییەکی بەراوردییە لە نێوان دوو لایەن بە هۆی یەکبوون و هاوبەشییان لە خاسیەتێك یان حاڵەتێك یان لە چەند خاسیەت و حاڵەتێکدا، ئەو پەیوەندییە دەکرێت بدرێتە پاڵ هاوبەشییەکی هەستی، وە دەکرێت بدرێتە پاڵ هاوبەشییەك لە حوکم و پێویستییەکی ژیری کە هەردوو لایەنە بەراوردکراوەکە بەیەکەوە دەبەستێت، بێ ئەوەی پێویست بەوە بکات دوو لایەنەکە لە جەستەدا و لە هەموو خاسیەتێکدا بەیەك بچن))[4]، بە هۆی ئەو ڕۆڵەی کە هەر لەکۆنەوە ئەو هونەرە لە ژیانی ئاسایی مرۆڤدا کێشاویەتی، هەمووومان کەم و زۆر لە ژیانی ڕۆژانەماندا لێکچوواندن بەکاردەهێنین و دەیکەین بە هۆکارێك بۆ دەربڕینی بیروڕاکانمان، هەروەها ((ئەو هەموو وەسف و جوانییەی کە شاعیران بۆ ئازیزان و بۆ وڵات و نیشتمان و بۆ هەرچ شتی جوان و سەرنج ڕاکێشی بەرهەستەکانیان هەیە، هەموو ئەمانە لەسەر بنچینەی لێکچوواندنی شتی نائاشکرا بە شتە ئاشکراکان دەهێننە بەرهەم))[5]، ئەم هونەرەی ڕەوانبێژی لای (م. عەلائەدین سوجادی) بە (وەك یەك) ناسراوە و لە بارەی کەڵك و سوودەکانیەوە دەڵێ : ((کەڵك لە وەك یەکدا ئەوەیە کە شتێك هەیە، ئەو شتە بەلای تۆوە ئاشکرا نییە و نایزانی، ئەو کەسە کە قسەت لەگەڵ ئەکا دێنێ ئەو شتە ئەچوێنێ بە شتێك کە ئەوەیان بە لای تۆوە ناسراوەو ئەیزانی . کەوا بوو (وەك یەك) بۆ هەڵدانەوەی پەردەیە لە سەر شتێکی نادیار، ئەمەش بۆ ئەوە کە شتی نادیار لە ئارادا نەمێنێ و ئاشکرایی بێتە مەیدانەوە))[6].

سەرەڕای ئەوەش پێویستە بزانین کە لە دروستبوونی لێکچوواندندا چەند پێکهاتەیەك بەشداری دەکەن، کە بە بنەڕەتەکانی لێکچوواندن ناودەبرێن، و«بنەڕەتەکانی لێکچوواندن چوارن : لێچوو، لەوچوو، ئەوزرای لێکچوواندن، ڕووی لێکچوواندن. دوو لایەنەکەی بریتییە لە : لێچوو و لەوچوو، ئەوانە دوو لایەن و دوو بنەڕەتیان پێ دەگوترێت، بەڵام ئامراز و ڕووی لێکچوواندن تەنها بنەڕەتن، جیاوازی نێوانیان ئەوەیە : بە بێ بنەڕەت لێکچوواندن دروست دەبێت بەڵکو نەبوونی باشترە لە بوونی، بەڵام بێ دوو لایەنەکە لێکچوواندن بوونی نابێت»[7]، کەواتە دەشێت بگوترێت لێکچوواندن یەکێکە لە پێکهاتە سەرەکییەکانی وێنەی شیعری، چونکە پانتاییەکی زۆری لە بنیاتنانی وێنەی شیعری لای شاعیران داگیر کردووە، و بێ گومان دیوانی هەر شاعیرێك وەربگرین بێبەش نییە لە وێنەی لێکچوواندن، بەڵام مەرج نییە شێوەکانی تری وێنەی شیعری لە نێو دیوانەکەیدا هەبن، چونکە شاعیر کاتێ وەسفی یارەکەی دەکات یان باڵایەکی جوان دەبینێ، یاخود سروشت دەیرووژێنێ دەست دەکات بە وەسف بە شێوەی لێکچوواندن، هەموو ئەم وەسفەی بۆ پەرچەم و زولفی یار و چاو و گەردەن و بەژن و باڵاو سنگ و بەرۆك و ... هتد بەشێکی زۆریان بە شێوازی لێکچوواندن دروست دەبن .

«لێکچوواندن بە سادەترین جۆرەکانی وێنەی ڕەوانبێژی دادەنرێت، ئەمەش زۆری بەکارهێنانی دەگەیەنێت لە کۆن و نوێدا، ئەویش ئەو جۆرە وێنەکێشانەیە کە پشت بە دوو لایەن دەبەستێت، بەڵام ناتوانن بیانگەیەننە پلەی بەیەك بوون، بەڵکو پەیوەندییەکە لە سەر بنەمای جیاوازی تەنیایی هەریەکێکیان بنیات دەکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا بێ بەش نییە لە یەکگرتن و کارلەیەك کردن»[8]، هەمیشە لەوچوو سیفەتی گەشترو بەرزترو جوانتری تێدایە بۆ ئەوەی لێچوو خۆی لە ئاوێنەی لەوچوو ببینێتەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا دەبێ سیفاتی هاوبەش هەبێت لە نێوانیاندا تا لێکچوواندنەکە دروست ببێت، بۆ نموونە : شاعیران زۆرجار مەمکی ئافرەتیان بە خۆخ و هەنار و سێو ... هتد چواندووە، کە سیفەتی هاوبەشی ئەو دوو لایەنە لێکچوونە لە شێوە خڕییەکەیاندا .

((غایەی خوازە و لێکچوواندن ئەوەیە ڕامان دەهێنێت بڵێین یەکەمیان ڕوونکردنەوەیە، دووەمیان جوانکارییە))[9]، واتا لێکچوواندن جۆرێکە لە وردەکاری و شیکردنەوەو بەرجەستەکردنی شتەکان و زیاتر خستنە ڕوویان، زۆر جۆری وێنە هەیە کە لە شیعری کلاسیکیدا بوونی نەبووە تەنها لە شیعری نوێدا دەردەکەون لەوانە وێنەی بازنەیی، وێنەی دووبارەبوونەوەی هەرەمی، وێنەی بنیاتی پێچاوپێچ ... هتد، بەڵام وێنەی لێکچوواندن لەوەتەی شیعر هەیە وێنەیەکی کاریگەر و بەشدارە و لە ئامێزی سەرجەم دیوانە شیعرەکان ئامادەیە .

### کورتەیەك لە بارەی هاوسەنگی ئەدەبییەوە :

پێش هەموو شتێك پێویستە بزانین کەوا بەراوردی ئەدەبی واتای چی دەگەیەنێت، لە فەرهەنگدا بەراورد هەر هەبووە، بەڵام دواتر پەڕیوەتەوە ناو بواری ئەدەب و ڕەخنەی جیهانییەوە، بەراوردی ئەدەبی کردارێکە لە نێوان دوو دەقی ئەدەبی جیاواز ئەنجام دەدرێت، و دەشێت بگوترێت : ((زانستی ئەدەبی بەراورد لە پەیوەندییەکانی نێوان ئەدەبە جیاوازەکان دەکۆڵێتەوە، کە بریتییە لە پەیوەندی (ڕاستەوخۆ، کاریگەری، لێکچوونە هاوبەشەکان) و ئەو کارانەی کە دەبنە هۆی بەرەو پێش چوونی ئەدەبە جیهانییەکان))[10]، لە ئەدەبی کوردیشدا (عەزیز گەردی) وەك پێشەنگێك کتێبێکی بۆ ئەم بوارە بە ناونیشانی (ئەدەبی بەراوردکاری) تەرخان کردووە و تیایدا دەڵێ : ((لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری کارتێکردنی دوو نەتەوە دەردەخا و باسی پەیوەندی نێوان دوو نووسەر دەکا کە بەرهەمی ئەدەبییان لە یەك بکات و هەر یەکە سەر بەر ڕەگەز و نەتەوەیەك بێ و سنوورێکی سیاسی و جوگرافییان لە نێواندا بێ))[11]، بەڵام بە پێی ئەم پێناسە و لێکدانەوانە بێت و لەبەرئەوەی ئەم دوو شاعیرەی بابەتی لێکۆڵینەوەکەمان پێك دەهێنن هەردووکیان کورد زمانن و لە زمان و نەتەوە و ژینگەی جیاواز نین، بۆمان نییە ئەم هەوڵە بە بەراوردی ئەدەبی ناو بنێین، بەڵکو بە کردارێکی تر دادەنرێت کە بە (هاوسەنگی ئەدەبی) ناودەبرێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بۆچوونە لە نێوان

قوتابخانەکانی ئـەدەبی بەراوردکاریـدا جێگـەی بـیروڕای جیاجیایـە کـە لێـرەدا بـە پێویست نازانرێت لە سەری بوەستین .

بێ گومان هیچ نووسەرێکیش نییە لە سەر ڕووی زەمین کـە بەرهـەمی بـاش و بە پێز بنووسێت و کاریگەر نەبووبێت بە نووسەرانی پێش خۆی یاخود نووسەرانی هاوچـەرخی خـۆی، بۆیـە شـتێکی ئاسـاییە دوو دەقـی ئـەدەبی بدۆزینـەوە کـە لەیەکدی بچن، یان خاڵی هاوبەشییان تێدا بەدی بکرێت، بـەڵام بەداخـەوە زۆرجـار تەنانەت لە ناو چینی ڕۆشنبیرانیش ئەم دیاردەیە بە دیاردەیەکی نامۆ و قێـزەوەن ناو دەبەن، یان بە دزیی ئەدەبی لە قەڵەمی دەدەن، لە ڕاستیدا ئەمە دزی ئەدەبی نییـە، چـونکە نووسـەری دووەم توانیویـەتی شـتێکی نـوێ بهێنێتـە کایـەوە، توانیویەتی بیر و بۆچوونەکانی پێش خۆی شەنوکەو بکات و مـشتوماڵیان بکـات و شتێکی نوێی لێ دروست بکات، ئەمەش مانای ئەوە نییە کە شـتێك نییـە بـە نـاوی دزی ئەدەبییەوە، بەڵکو بوونی هەیە و لە هەموو سەردەمێکدا هەبووە، واتە ئەگەر نووسەرێك دەقێکی کەسێکی تری سەد لە سەد وەك خۆی وەرگێڕابێت، یان کاتێك نووسەری یەکەم هاوزمانی خۆی بێت و ئەم دەقاودەق بەرهەمەکەی هێنابێت و بـە ناوی خۆی بڵاوی کردبێتەوە، ئەمە دەچـێتە قـاڵبی دزی ئەدەبییـەوە، بـەڵام گـەر نووسەرێك هاتبێت بیرۆکەی دەقێکی پێش خۆی وەرگرتبێت و بێنەوبـەردەی تێـدا کردبێت و دەست ڕەنگینی خۆی پێیـەوە دیـار بێـت ئـەوا بـە جۆرێـك لـە داهێنـان دادەنرێت، لـەم کاتـەدا دەتـوانین دوو دەقەکـە بـەرەو ڕووی یـەکتری بکەینـەوە و ئێـستێتیکا و جوانکـاری هـەردوو دەقەکـە بخەینـە ڕوو، هـەروەها خاڵـە جیـاواز و لەیەکچووەکانیـشیان دیـاری بکـەین، ئـەم کـردارەش ناودەبرێـت بـە هاوسـەنگی ئەدەبی .

لەم بارەیەوە (هۆراس) ی نووسەر و ڕەخنەگری ڕۆمانی دەڵـێ : (( ئەوەنـدەی پەیوەندی بە منەوە هەیە، بـۆم سـاغ نەبۆتـەوە کـە ئایـا خوێنـدن بـە بـێ شـنەی بـەهرەی زگمـاك یـاخود بـەهرەی زگمـاك بـە بـێ خوێنـدن چ بـەروبوومێکیان دەبێـت))[١٢] . لـەم گوتەیـەی هۆراسـدا ئـەوەمان بـۆ ڕوون دەبێتـەوە کـەوا ڕاسـتە پێویستە کەسێك کە بەرهـەمێك دەنووسـێت بـەهرەی زگمـاکی هـەبێت بـۆ ئـەوەی دەقێکی ئەدەبی بنووسێت، بەڵام ئەم بەهرەیەش خۆراکی دەوێت بۆ گەشەکردن و

پەروەردەکردن و بەرەو پێش چوون، خۆراکەکەش ئەوەیە دەقنووس بەرهەمی کەسانی تر و بابەتی هەمە لایەن بخوێنێتەوە، کە ئەم بابەتەی خوێندەوە بێ گومان لە کاتی نووسیندا هەندێ لەو شتانەی کە خوێندوویەتیەوە بە ڕەنگ و بۆیەکی ترەوە دەڕژێنە جیهانی نووسینەکانی، ئێمە بۆ کتێبێك دەخوێنینەوە ؟ بێ گومان بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگرین و ئاسۆی بیرکردنەوەمان فراوانتر بێت، بۆ نووسەرانیش هەمان شت گونجاوە .

بێ گومان ((هیچ شاعیرێك نابینین توانیبێتی شاعیرێکی باش بێت، بە بێ ئەوەی گرنگی بە ئەدەبی ڕابردوو نەدات))[13]، چونکە ئەو شاعیرەی بەرهەمی شاعیرانی دەوروبەر و شاعیرانی کۆنی میللەتەکەی دەخوێنێتەوە کەموکوڕییەکان دەدۆزێتەوە و هەوڵ دەدات کەلێنەکان پڕ بکاتەوە، ((ئەمەش مانای ئەوە نییە کە شاعیر وێنەی ڕابردوو پیت بە پیت بگوازێتەوە، بەڵکو شاعیری چاك دەتوانێت سوود لە ڕابردوو وەربگرێت و بە شێوازی خۆی دایبڕێژێتەوە))[14]، بە شێوەیەکی تر : ((واتە پشت بەستن بە ئەزموونی شاعیرانی پێشوو ڕەوایە بە مەرجێك لاساییکردنەوەی تێدا نەبێت، بەڵکو هەوڵێکی نوێ بێت بۆ داهێنان))[15]، و شاعیر بتوانێت ئیحا لە وێنە شیعرییەکان وەربگرێت و سێبەری وێنەکان بنووسێتەوە، یاخود ڕێڕەوی وێنەکە بگۆڕێت و ئاراستەی تری پێ ببەخشێت، لێکۆڵەریش کاتێ دوو دەقە لێکچووەکە ڕووبەڕووی یەك دەکاتەوەو دەمەتەقەیان پێدەکات، هەست بەوە بکات دەقی دووەم دەتوانێت داکۆکی لە خۆی بکات و کەسایەتی خۆی هەبێت و ڕەنگ و ڕووی خۆی هەبێت، چونکە دەقی دووەم واتە ئەو دەقەی کە لەبەر ئامێزی دەقێکی کۆندا لە دایك بووە زۆرجار دەبینین لە دەقی یەکەم باشتر و جوانتر و بەپێزترە، چونکە ئەو شتەی لە دەقی یەکەم تەواو نەکراوە و ناکامڵە دەشێ لە دەقی دووەمدا تەواوتر و کامڵتر دەربکەوێت .

## بەهای وەرزی پایز لای شاعیرانی کورد :

مرۆڤ لە ناو سروشتدا لە دایك دەبێت و لە ناو ئەو سروشتەش کۆتایی دێت، لە ماوەی ژیانی خۆیدا بە بەردەوامی لە ناو چوار وەرزەکانی ساڵدا دەخولێتەوە و خۆشی و ناخۆشییەکانی خۆی لە ناو ئەو سروشتەدا دەدۆزێتەوە . هەربۆیە لە نێو

شیعری زۆربەی شاعیراندا هەر چوار وەرزەکەی ساڵ بەدی دەکرێت، شاعیر کاتێك وەسفی وەرزی زستان بکات زیاتر دیمەنی بەفر و باران بارین دەکاتە کەرەستەی خۆی، وەرزی هاوینیش بە ناڕاستەوخۆیی باس دەکرێت، چونکە وەرزێکی گەرم و تا ڕادەیەك ناڕەحەتە، هەروەکو لە شیعری شاعیراندا زۆر وەسفی هاوینە هەوارەکان و شوێنە گەشتیارەکان کراوە، یان هەندێ شتی تری وەك وەسفی ئاسمان و چیاکان، کە ئەمانە لە هەموو وەرزێکدا بوونیان هەیە، بەڵام لە هەر وەرزێکدا شێوەیان دەگۆڕێت بە بەراورد بە وەرزێکی تر، لە وەسف و لێکچوواندن و باسکردنی وەرزەکانیشدا زیاتر هەردوو وەرزی بەهار و پایز لای شاعیران ڕەنگیان داوەتەوە، و دەبینین وەرزی پایز لای زۆر لە شاعیرانی کورد، بۆ نموونە: (نالی، مەحوی، بێسارانی، مەولەوی، پیرەمێرد، قانع، گۆران، بەختیار زێوەر، حەسیب قەرەداغی، دیلان، کاکەی فەلاح، شێرکۆ بێکەس، قوبادی جەلی زادە، محەمەد عومەر عوسمان، زۆری تریش) زۆر بە جوانی ڕەنگی داوەتەوە، دەتوانین بڵێین لای شاعیرانی کلاسیك و ڕۆمانتیکیش زۆرجار وەرزی پایز وەرزی دابڕان و خەم و خەفەت و نەخۆشی و مەینەت و ئازار بووە. هەر شاعیرەی بە شێوەیەك وەسفی وەرزی پایزی کردووە، بەڵام لە شیعرەکانی گۆراندا لایەنی جوانی پایز خراوەتە ڕوو، هەر بە تەنها غەم و خەفەت و مەینەت نەبووە، بۆ نموونە لەو شیعرەدا کە باسی (سەوزە گیای پایز) دەکات، ئەوە دەردەخات کە وەرزی پایز هەرچەندە وەرزی هەڵوەرینە، بەڵام بە هۆی باران بارینەوە لەم وەرزەدا هەندێ ڕووەك و گیای ناسك و وردیلە دەڕوێت کە جوانییەکی بێ وێنە بە سروشت دەبەخشێت، گۆران وەسفی ئەم جوانییانەی کردووە، لە لای قوبادی جەلی زادەش وەرزی پایز وەرزێکی خۆش و جوان و ڕازاوەیە و توانیویەتی بە دەیان وێنەی لێ دروست بکات . کەواتە ئەوە ((ڕاستە هەندێ کەس هەن، چارەی وەرزی پایزیان ناوێ))[(١٦)]، بەڵام زۆر کەسی تریش هەن ئێستێتیکا و جوانی لە وەرزی پایزدا دەبینن .

ئەگەرچی لای شاعیرانی کلاسیك هێندە گرنگی بە وەرزی پایز نەدراوە، بەڵام ڕێبازی ڕۆمانسییەت کە گرنگی و بەهای زۆری بە سروشت دا، و ((بە هۆی

ئاڵۆزی باری شارستانێتی و دروستبوونی جیاوازی چینایەتییەوە ڕۆمانتیکەکان خۆیان بۆ ڕاگیر نەکرا بەرانبەر بەم بارودۆخە ئاڵۆزەی ناو کۆمەڵ بۆیە تووشی ڕەشبینی و نائومێدی بوونە لە ژیاندا، ڕۆژ بە ڕۆژ خۆیان لە گێروگرفتی ناو کۆمەڵ دوورخستەوە، لە شەقەی باڵی خەیاڵیان داوە بەرەو باوەشی سروشت باڵیان گرتووەتەوە))[17]، لە شیعری کوردیشدا ئەم ڕێبازە ئەدەبییە بە هۆی کۆمەڵێك خاڵ و بنەما دەناسرێتەوە، یەکێك لەمانە بریتییە لە پەنابردنە بەر سروشت، و((گەڕانەوە بۆ سروشت : ئەمە یەکێکی تر بوو لە بنەما بیرییەکانی نووسەرانی ڕۆمانسیزم، ئەوان کە لە واقیع و ژیانی شاری سایەی تەکنەلۆژیا وەڕس ببوون، چونکە پێیان وابوو ئەم واقیعە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی تێك شکاندووەو، ژیانی ناخۆش کردووە، بە جۆرێك کە گەیشتبوونە ئەو قەناعەتەی تازە شتێك نییە ژیانی کۆمەڵی مرۆڤایەتی بگۆڕێت، بە بارێکی باشترو خۆشتردا، بۆیە زۆرجار ئازاریان دەچەشت و کەوتنە بارێکی دەروونی ناڕەحەت، لێرەوە بیری ئەوەیان بۆ دروست دەبوو کە سروشت پەناگەیە بۆ خۆ دەربازکردن لە خراپییەکانی کۆمەڵگای مرۆڤ))[18].

بێ گومان سروشت سیحرێکی جوانی هەیە، مرۆڤ کاتێ تووشی ئازار و مەینەتی دەبێت ئاسمانی شینی جوان و شەپۆلی دەریا و پێدەشت و باخچە و گوڵ و گوڵزار و چریکەی جۆرەها تەیر و توار و دیمەنی جوان باوەشی بۆ دەکەنەوە و هێوری و ئارامی پێ دەبەخشن، بەلام کاتێ ڕێبازی ڕۆمانسییەت گەڕانەوە بۆ سروشتی کردە پایە و بنەمای خۆی شاعیران زیاتر ئێستێتیکا و جوانییان لە نێو سروشتدا دۆزییەوە و پەنایان بۆ برد، ((سروشت لای ڕۆمانتیکییەکان مەڵبەندێکی پیرۆز و بێ گەرد بوو، چونکە تاقە سەرچاوەیەك بوو کە ئادەمیزاد بە بەختیاری تیادا دەحەسایەوە دوور لە گێروگرفتی ناو شار، پێشڕەوی ئەم لایەنەش ڕۆسۆ بوو کە داوای دەکرد بگەڕێتەوە بۆ باوەشی سروشت و دوورکەوتنەوە لە باری ئاڵۆزی ناو شارستانێتی))[19]، بەلام ڕۆمانسییەت زۆر بە درەنگەوە گەیشتە نێو ئەدەبیاتی کوردی ئەویش لە نێوان هەردوو جەنگی جیهانی بوو، کۆمەڵێ شاعیری کورد لە نموونەی شێخ نوری و گۆران و چەندانی تر

بە کاریگەری شاعیرانی تورك، توانییان دەستپێشخەری بکەن لە نوێکردنەوە لە ئەدەبی کوردیدا کەوا ڕۆمانسییەتیش لەو کاتەوە هاتە ناوەوە، دەبینین «سووچەکانی ڕۆمانتیزم لە شیعری گۆراندا زۆر دیارن . ئەم دیاربوونەش ئەنجامی کارتێکردنی تەنیای ناو کوردەواری نییە. چونکە بەرەو پێشچوونی بەرهەم و پێوەندییەکانی بەرهەمهێنان لەو سەردەمەدا ڕێبازی ڕۆمانتیکییان بەو چەشنە بەرهەم نە ئەهێنا کە لای گەلانی تر بەرهەم دەهێنرا ـ بەڵکو کارتێکردنی ئەو شاعیرە بێگانانەی باس کران و ژیانی تایبەتی خۆی هۆی گەورەی پەیدابوونی بەرهەمەکانی ئەو ڕێبازەین . لەم پلەیەدا ماتەم و گریانی بە کوڵ، لەگەڵ هەموو دیاردەیەکی خەمناکی، تاریکی ژیاندا وێنەی بەرهەمی شاعیرە، گۆران لە ڕیزی پێشەوەی ئەوانەیە کە بەدەست کلۆڵی ژیانەوە ئەگریان بۆ سیسبوونی گوڵێك و ئاوابوونی ئەستێرەیەك و ڕەنجانی خۆشەویستێك . دوور لە ژیان گۆران بە دەست هەموو ئەو شتانەوە دەگریا کە ژیان ئاڵۆز دەکەن، بە قووڵی نائومێدی خۆی دەردەبڕی»[20].

ڕێبازی ڕۆمانسییەت ڕۆڵ و کاریگەری خۆی هەبوو بەسەر شاعیراندا بۆ گەڕاندنەوەیان بۆ باوەشی سروشت، بەلام بەر لە سەرهەڵدانی ڕێبازی ڕۆمانسییەتیش لە شیعری شاعیرانی کورددا دیاردەی سروشت بوونی هەبووە، بە تایبەتی لە شیعرەکانی مەولەوی دا، و سروشتی جوانی کوردستان لە شاخ و داخ و سەرجەم جوانییەکانی تر کاریگەری هەبووە بەسەر شاعیراندا، پایزیش لە دیمەنی باخ و بێستان و دارستان و وڵاتی شاخاوی و کێڵگە زیاتر بەدەردەکەوێ و دیمەنە جوانەکانی خۆی نمایش دەکات، بۆیە دەبینین ئەم سروشتە جوانەی پایزی کوردستان بووەتە هەوێنی لەدایکبوونی سەدان شیعری پایزی جوان، هەر شاعیرە و بە شێواز و شێوەی خۆی سوودی لەم سروشتە وەرگرتووە و ترنجاندوویەتییە نێو شیعرەکانیەوە.

## بەشی دووەم

## وێنە لێکچوواندنەکانی پایز لای گۆران :

هەروەکو لە سەرەتاوە ئاماژەمان پێکرد، ((لەبەرئەوەی عەبدوڵلا گۆران شاعیری سروشت و خۆشەویستی و جوانییە، کارکردنی لەگەڵ سروشت جیاوازە لەگەڵ شاعیرە هاوچەرخەکانی خۆی، ئەو لاسایی سروشت ناکاتەوە بەڵکو دەیەوێت سروشتێکی تر پێك بهێنێت کە بگونجێت لەگەڵ هەست و ئارەزووەکانی، و دەیەوێت جوانی ئافرەت و جوانی سروشت یەك بخات، بەڵکو بە هۆی بەشداریکردن و دەرخستنی ئافرەت جوانییەکی زیاتر بە سروشت دەبەخشێت، هەر بۆیە دەبینین هەردەم ئاماژە بە ئافرەت دەکات لە شیعرە لیریکییەکانیدا))[٢١]، هەروەکو ئەم بەراووردکردنەی نێوان سروشت و ئافرەت لە دەقی شیعری (پایز) دا دەبینین، و ((لە هۆنراوەی پایزدا هەڵوێستێکی ڕۆمانسی زۆر بەتینی هەیەو خودی خۆی تێکەڵ بە پایز کردووەو سەرتاپا ئەزموونێکی شیعری بە زمانێکی پاراو داڕشتووە ناتوانێ لێی جیابێتەوە و بووە بە بەشێك لە بنیاتی ماتبوونی شیعری پایز))[٢٢]، هەروەکو دەڵێ :-

**من فرمێسکم، تۆ بارانت،**
**من هەناسەم، تۆ بای ساردت،**
**من خەم، تۆ هەوری گریانت ..**
**دوایی نایە : دادم، دادت،**
**هەرگیز، هەرگیز،**
**پایز ! پایز !** گۆران : ١٦٣

هەروەك دیارە شاعیر ((خەو بە ڕابوردووەوە دەبینێ، بەو ڕۆژانەوە کە چوون و نایەنەوە، هیوای بە ساڵی ڕابوردووە کە بێتەوە، بەشکم ئەو بەختیارییەی دەست کەوێتەوە کە لە کیسی چوو، کە بێ بەش دەبێ، بە وەرزی ساڵدا دەگەڕێ، لە هەموویان خەمناکتر دەدۆزێتەوە تا بیکا بە هاوڕێی دەروونی پەستی

و لەگەڵ ئەودا بۆ بەدبەختی خۆی بگری)[23]، ئەو وەرزەش وەرزی پایزەو بە هاوتای خۆی دەزانێت لە خەم و خەفەت و گریاندا .

لەم کۆپلەیەی سەرەوەدا وێنەیەکی لێکچوواندن دەردەکەوێت، کەوا تێیدا پایز : لێچووە، مرۆڤێکی خەمناك (گۆران خۆی) : لەوچووە، ئامرازی لێکچوواندن دەرنەکەوتووە، ڕووی لێکچوواندن : خەمبارییە، کەوا پایز وەك ئەم گران و خەمناکەو فرمێسك دەرێژێت و هەناسەی سارده . لە کۆپلە شیعرێکی تردا پایز وەك تەمەنی پیری مرۆڤ پیشان دەدات و دەڵێ :

**بەڵام سبەینێ کە پیری وەکوو حولوولی خەزان ،**
**بە ڕەنگی زەردەوە دەستی لە گەردنت ئاڵان ،**
**ئەکێشی ئاهی تەحەسسور لە بەر خەساری دڵان :**
**دڵانی پڕ لە شەباب و غەرامی جانبازان ! ..** گۆران : ٧٠

لێرەدا پیربوونی مرۆڤ : لێچووە، حلوولی خەزان (هاتنی پایز ) : لەوچووە، وەکو : ئامرازی لێکچوواندنە، ڕەنگی زەرد : ڕووی لێکچوواندنی نێوان مرۆڤی پیر و درەختی پایزە، وەك ئاشکرایە زۆرجار «ڕەنگی زەرد ئاماژەیە بۆ پیری و نەخۆشی، چونکە مرۆڤ کە گەیشتە تەمەنی پیری نەخۆش و ڕەنگ زەرد دەبێت)[24]، هەرچەندە ئەم لێکدانەوەیە بۆ ڕەنگی زەرد مەرج نییە هەموو کاتێك دروست بێت، بەڵکو هەندێ جار ئەم واتایە دەبەخشێت وەك لێرەدا هاتووە.

دیسان لە دەقە شیعرێکی تریدا بەناونیشانی (گوڵی کەم خایەن) بەهەمان شێوە لە بارەی پایزەوە دەڵێ:

**وەهام ئەزانی کە ئەی گوڵ، نیگاهی شەوقە زەمان**
**لەسەیری شێوەیی شۆخت هەمیشە تێر نابێ،**
**وەهام ئەزانی کە هەرگیز کزەی گەڵاڕێزان،**
**بە ناسکیی پەل و پۆی تۆ – مەحاڵە، فێر نابێ** گۆران:٩٥

لەم کۆپلەیەدا، کزەی گەڵاڕێزانی پایز: لێچووە، هێزی لەناوبەری تەمەن: لەوچووە، ئامرازی لێکچواندن دەرنەکەوتووە، ڕووی لێکچواندن بریتییە لە هەڵوەرین و لەناوبردن.

دیسان لە کۆپلەیەکی تری لەم شێوەیەدا، پایز دەکاتە بنەمای وێنەیەکی لێکچواندن و دەڵێ :

**منیش لە دایکی طەبیعەت زاوم**
**بۆچ کردەوەی ئەو نابینێ چاوم ؟**
**ها، وا بەسەرچوو خەزانی پیریش**
**کەچی، ئەو زیاتر ئەکا ئارایش** گۆران : ١٦٨

لەم نموونەیەدا، پیری : لێچووە، خەزان (گەڵاڕێزانی پایز) : لەوچووە، ئامرازی لێکچواندن دەرنەکەوتووە، ڕووی لێکچوونیش وەك نموونەکەی پێشوو بریتییە لە هەڵوەرینی تەمەنی مرۆڤ لە پیریدا وەك گەڵاڕێزانی پایز .

دیسان لە دەقە شیعرێکی تریدا لە ژێر ناونیشانی (گوڵی کەم خایەن) دا لە بارەی پایزەوە دەڵێ :

**وەهام ئەزانی کە ئەی گوڵ، نیگاهی شەوقە زەمان**
**لە سەیری شێوەیی شۆخت هەمیشە تێر نابێ ،**
**وەهام ئەزانی کە هەرگیز کزەی گەڵاڕێزان ،**
**بە ناسکیی پەل و پۆی تۆ ـ مەحاڵە، فێر نابێ !** گۆران : ٩٥

لەم کۆپلەیەشدا وێنەیەکی لێکچواندنی تایبەت بە پایز بەرچاو دەکەوێت، کەوا لێچوو و لەوچووەکەی پێچەوانەی نموونەکەی پێشووە، و گوڵێکی ناسك کە بە کزەی گەڵاڕێزان پەلوپۆی دەوەرن : لێچووە، مرۆڤێکی سەرمابردەی پەلوپۆ شکاو بە کزەی سەرما : لەوچووە، ئامرازی لێکچواندن دەرنەکەوتووە، ڕووی لێکچوون بریتییە لە هەڵوەرین، کەوا گوڵە ناسکەکەو مرۆڤە سەرمابردووەکە بە سەرمای پایز پەلوپۆکانیان هەڵدەوەرن .

**وێنە لێکچوواندنەکانی پایز لای قوبادی جەلی زادە :**

**قوبادی جەلی زادەش شاعیرێکی هاوچەرخە، زیاتر لە دەقێکی شیعری لە سەر بنەمای وێنەی لێکچوواندن بۆ وەرزی پایز تەرخان کردووە، هەروەکو لێرەدا ئەم شیعرانەی شیدەکەینەوە، بۆ نموونە لە دەقە شیعری (کۆچێکی سوور) کە وەك لە ناونیشانەکەی ئاماژەی پێ دەکات، بەهۆی لەدەستدانی هاوڕێیەکی ئازیزی لە تەمەنی لاویدا نووسیویەتی، لە بارەی پایزەوە دەڵێ :**

**ئەو ساتەی من ..**
**لە ژوورێکی تەنگەبەرا**
**خەفەت یەخەی دەگرتم و**
**چنگی خەزان ،**
**پەڕو باڵی هیواکانمی .. هەڵدەبڕی** قوبادی جەلی زادە : ٩٧ ـ ١٠٥

لەم وێنەیەی سەرەوەدا، خەزان (پایز) : لێچووە، مرۆڤێکی خەمناك : لەوچووە، ئامرازی لێکچوواندن دەرنەکەوتووە، هەڵبڕین : ڕووی لێکچوواندنە، کە بە واتای هەڵوەرینی ئاواتەکانی شاعیر و گەڵاڕێزانی پایز هاتووە .

لە کۆپلە شیعرێکی تریدا نزیك لەم واتایەی سەرەوە، دەڵێ :

**سبەی دەڕۆی ..**
**(لە ئەلبومی یادگارا) ،**
**وێنەم وەك بنە نێرگزێ**
**لە ڕیشەوە هەڵدەکێشی ..!**
**دەربەست نایەی ،**
**لە هەڕەتی بەهاریدا**
**زامی سەختی گەڵا ڕێزان**
**چۆنە ئێشی** قوبادی جەلی زادە : ١٠٧

لێرەدا دیسان : گەڵاڕێزان : لێچووە، زامی سەخت، لەوچووە، ئامرازی لێکچواندن دەرنەکەوتووە، هەڵوەرین و هەڵکێشان : ڕووی لێکچوونە کەوا پایز گەڵاو گوڵ هەڵدەکێشێت، خەمیش وێنەی شاعیر لەناو دەبات .

دیسان لە بارەی پایزەوە نموونەی تریشی هەیە، هەروەکو دیسان دەقێکی تری بە (پاین) ناوناوەو تێیدا دەڵێ :

**پایز، منداڵێکی لاسارە ..**
**بە قەدی هەر درەختێکدا هەڵگەڕێت ،**
**ڕوومەتی زامار دەکات و**
**پرچی دەڕنێتەوە .** قوبادی جەلی زادە : ٥٧٦

لەم کۆپلە شیعرەی سەرەوەدا، پایز : لێچووە، منداڵێکی لاسار : لەوچووەکەیەتی، ئامرازی لێکچواندن دەرنەکەوتووە، ڕووی لێکچواندن : هەڵگەڕان بە درەخت و زامدارکردن و ڕنینەوەی پرچە .

هەروەها لە دەقێکی تریدا بەناونیشانی (شەنگە بی) دیسان لە بارەی پایزەوە دەڵێ :

**شەنگە بییەکە**
**((لەپەنجەرەی ژوورەکەی دام))**
**پێ پەتی ،**
**ڕووت .**
**دەیویست بە دەستێك**
**مەمکەکانی داپۆشێت و**
**بە دەستێك ناو لەشی .**
**بە شپرزەییەوە پێی گوتم :**
**ئەم بەرەبەیانە خۆم دەشت ،**
**سۆلەکەم لەبەر پێما بوو جلوبەرگم بەتەنافی ،**
**گوڵەباخە سوورەکەوە ،**

**هەڵخستبوو.**
**کەچی سەگەکە، سۆلەکەی**
**لیٚ فڕاندم و**
**با ـ ش ،**
**ئەتەگ و مەمك بەندو**
**دەرپێکەم !** قوبادی جەلی زادە : ٥٩٢، ٥٩٣

لێرەدا شەنگەبی : لێچووە، ئافرەتێك کە لە پەنجەرە دەدات، کە ڕووت و پیٚ پەتییە، خۆی شوشتووەو جلی هەڵخستووە، با ئەتەگ و مەمك بەندو دەرپێی لیٚ فڕاندووە : لەوچووە، ئامرازی لێکچوواندن دەرنەکەوتووە، لە پەنجەرە دان، ڕووتی و پیٚ پەتی، خۆشوشتن، جل هەڵواسین، بیٚ سۆلٚ و ئەتەگ و مەمك بەندو دەرپێی : ڕووی لێکچوواندنە .

هەر لە شێوەی ئەم وێنەی سەرەوە، لە کۆپلەیەکی تریدا دیسان بە ناونیشانی (پایز) دەڵیٚ :

**لە گۆشەیەکدا . با .**
**پەلکە ڕژاوەکانی باغ چڕ دەکاتەوە.**
**با ... دەڵیٚ، ئەو گەڵا وەریوانە ،**
**کراس و**
**ئەتەگ و**
**ستیان و**
**دەرپێی درەختن !!** قوبادی جەلی زادە : ٥٧٥

لەمەیاندا، درەختی باغ لە پایزدا : لێچووە، ئافرەتێکی ڕووت کە جلەکانی ژێرەوەی دەردەکەون : لەوچووە، ئامرازی لێکچوواندن دەرنەکەوتووە، ڕووی لێکچوواندن : بریتی یە لە ڕووتبوونەوە .

دیسان لە کۆپلەیەکی تریدا بەناونیشانی (شەرم) وێنەیەکی لێکچواندنی تر دەخاتە ڕوو و دەڵێ :

**ژووژکێك، بە نێو دارستانێکی ڕووتا**

**ڕەت دەبێ**

**دارستان لە ئاپۆرەیەك ژنی ڕووت دەچێ** قوبادی جەلی زادە : ٦٤٧

وەك دەبینین لەم وێنەیەشدا، دارستان لە کاتی هاتنی پایزدا : لێچووە، کۆمەڵێك ئافرەتی ڕووت : لەوچووە، ئامرازی لێکچواندن دەرنەکەوتووە، ڕووی لێکچواندن : بریتییە لە ڕووتبوونەوە .

دیسان لە کۆپلە شیعرێکی تریدا بەناونیشانی (خاك) لە بارەی پایزەوە دەڵێ:

**درەخت و خاك ژن و مێردن**

**بەڵام تەنیا ،**

**لە پایزا ڕووت دەبنەوە**

**تەنیا لە زستانێ، جووت دەبن**

**تەنیا لە بەهارێ، منالّ دەخەنەوە!** قوبادی جەلی زادە : ٦٦٥، ٦٦٦

لەم وێنەیەدا، درەخت و خاك : لێچووە، مرۆڤی ڕووت : لەوچووە، ئامرازی لێکچواندن دەرنەکەوتووە، ڕووی لێکچواندن بریتییە لە ڕووتبوونەوە .

لە شێوەی ئەم نموونەیەی سەرەوە، لە دەقی شیعری (وەرزی کوتاڵ) دا دەڵێ :

**پێش ئەوەی بەهار ،**

**دەستەوانەی سەوز بکاتەوە پەنجەی دار ،**

**دەچمەوە نێو جەنگەڵستانێکی ڕووت**

**ناو لەپ و پشتی درەخت ماچ دەکەم و**

**ئەنگوستە زیوینەکانی**

**دەکرۆژم ...** قوبادی جەلی زادە : ٧٠٤، ٧٠٥

لەو وێنـە لێکـچوواندنەی سـەرەوەدا، دارسـتان لـە پـایزدا : لێـچووە، مرۆڤـی ڕووت: لەوچووە، ئامرازی لێکچوواندن دەرنەکەوتووە، ڕووی لێکچوواندن : بریتییە لە ڕووتبوونەوە .

سەرەڕای ئەو وێنەیە، لە کۆپلەیەکی تردا، قوبادی جەلی زادە پایز دەکاتـەوە بە مرۆڤ، هەروەکو دەڵێ :

**ئەو باڵندە نێرینانەی ،**

**لە وەختی ڕووتبوونەوەی درەختەکانا**

**کۆچ دەکەن ،**

**ڕەوە پیاوێکن**

**نێرەمووك !!** قوبادی جەلی زادە : ٥٧٢

لـەو وێنـە لێکـچوواندنەی سـەرەوەدا، دارسـتان لـە وەرزی پـایزدا : لێـچووە، مرۆڤی ڕووت : لەوچووە، ئامرازی لێکچوواندن دەرنەکەوتووە ، ڕووی لێکچوواندن: بریتییـە لـە ڕووتبوونـەوە، سـەرەڕای ئـەوەش لێکـچوواندنێکی تـر لـەم کۆپلەیـەدا بەرچاو دەکەوێت، کە ئەویش بەم شێوەیەیە :

باڵندەی نێرینە کە لە پایزدا کۆچ دەکەن : لێچووە، ڕەوە پیاوێکی نێرەمـووك کە ئافرەتی ڕووت لەبەردەمیانەو ئەوان ئارەزووی سێکسییان نییە و کۆچ دەکـەن، ئامرازی لێکچوواندن دەرنەکەوتووە، ڕووی لێکچوون : بریتییە لە گوێ پێ نەدان و دوورکەوتنەوە .

### وێنەی لێکچوواندنی هاوشێوە لای گۆران و قوبـادی جەلی زادە :

هەروەکو لە باسی هاوسەنگی ئەدەبیـدا ئاماژەمـان پێکـرد، لـەکاتی بەرانبـەر یەك کردنی هەندێ دەقی ئەم دوو شاعیرە، هەست بە جۆرێك لە کاریگەری گـۆران بەسەر قوباددا دەکەین، ئەوەش وەك بەرزی پایەی هەردوو شاعیر سەیر دەکـەین، چونکە بێ گومانین کەوا گۆران شاعیرێکی بە توانا بـووە، بۆیـە کاریگـەری بەسـەر شـاعیرانی هاوچـەرخدا جـێ هێـشتووە، هـەروەها قوبـادی جـەلی زادەش گـەر

شاعیرێکی بە توانا نەبووایە نەیدەتوانی شان لە شانی شیعرەکانی گۆران بدات و هاوشێوەی ئەم بنووسێت، بەڵکو لە هەندێ خاڵدا نوێکاری و گۆڕانکاری جۆراوجۆری ئەنجام داوە کە سەلیقە و توانای ئەوی پێوە دیارە، هەروەکو لەم چەند نموونەیەدا دەردەکەوێت کە لێرەدا دەیانخەینە ڕوو .

گۆران لە دەقێکی شیعریدا جوانی ئافرەت و جوانی سروشتی پایز بەرانبەر یەکتر دەکات و((جوانترین تەعبیری ئەدەبی لە پایز داوەتەوە، چواندوویەتی بە نەشمیلانەیەکی شان و مل ڕووت، ئەمیش بە هۆی باو بارانەوە گەڵاکانی لە کیس داوە بە شان و مل ڕووتی و ڕەنگ زەرد هەڵگەڕاوییەوە ڕووبەڕووی سروشت بە عاجزییەوە وەستاوە. گۆران بە شێوەیەکی هونەرمەندانە وەك شاعیرێکی داهێنەر بە هۆی ئەو هەنسك و فرمێسکی ئەشك و هەوری پایز و بارانی گریانەوە پارچە شیعرێکی لیریکی پڕ ئاوازو مۆسیقای لێ دروست کردووە هەر ئاوازێکی ڕەنگدانەوەی ڕەشبینی و ماتەمی شاعیری ڕۆمانتیکە بەرانبەر بە ژیانی کوێرەوەری خۆی))[٢٥]، هۆی دەرکەوتنی پایزیش وەك وەرزێکی ساڵ بۆ ئەم مەبەستە زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە، ((پایز : ڕەمزە بۆ زەردبوونی گەڵاو پیری و نەخۆشی و سیسبوون و خەم و ژاکاوی و مەرگی بەهارو ڕووتبوونەوەی دارودرەخت و نائومێدی و ماتەمی، بۆیە ... پایز بە لای گۆرانەوە جگە لە خەم و خەفەت و نائومێدی و سیسبوون هیچ شتێکی تر ناگەیەنێت))[٢٦]، هەروەکو دەبینین ((ئەوەتا " گۆران " لە هۆنراوەی پایزدا هەڵوێستێکی ڕۆمانسی زۆر بەتینی هەیەو خودی خۆی تێکەڵ بە پایز کردووەو سەرتاپا ئەزموونێکی شیعری بە زمانێکی پاراو داڕشتووە ناتوانێ لێی جیابێتەوە و بووە بە بەشێك لە بنیاتی ماتبوونی شیعری پایز))[٢٧]، لەسەرەتای دەقەکەیدا دەڵێ :

**پایز ! پایز !**

**بووکی پرچ زەرد ،**

**من مات، تۆ زیز**

**هەردوو هاو دەرد** گۆران : ١٦٣

لێرەدا ((دەبینین چۆن عەبدوڵڵا گۆران لە سەرەتادا هەست و سۆزی بەرامبەر جوانی پایز دەردەبڕێت و بە بووکێکی قژ زەردی دەچوێنێت، بەڵام ئەو ساتەی گەڵاکانی درەخت دەوەرن بارودۆخە دەروونییەکەی دەگۆڕێت و بە جۆرێك ئازار دەکێشێت و بەشداری تەواو لەگەڵ پایزدا دەکات . بەمەش لە شێوەی ئێش و ئازاردا دەردەبڕێت، و پایز بە هەموو بنەماکانیەوە، لە هەڵوەرینی گەڵاکان، هەڵکردنی بای سارد، تۆزو خۆڵ، بارینی باران، دەکات بە دەمامکێك بۆ خۆی، ڕووی دەرەوەی پایزی سروشت، کاریگەری لە سەر دەروونی شاعیر دەبێت، و ئەو دروستبوونەی پەیوەندییە لە نێوان ژیانی ناوەوەو دەرەوە، وێنەیەکی پڕ ئیحای قووڵ لە دەروونی شاعیر جێگیر دەکات تا بە هۆیەوە ئێش و ئازارە ناوەکییەکانی دەروونی دەربڕێت))[٢٨]، بەهۆی ئەمەش زۆر بە شێوەیەکی جوان دیمەنە دڵڕفێنەکانی پایز بە ئافرەتێك دەچووێنێت و لەمەوە وێنەیەکی شیعری زۆر جوانمان لەسەر بنەمای هونەری لێکچوواندن پیشان دەدات : پایز : لێچووە، بووکی پرچ زەرد : لەوچووە، ئامرازی لێکچوواندن دەرنەکەوتووە، ڕووی لێکچوواندن بریتییە لە ڕەنگی زەردی خودی شاعیر خۆی و زەردی دارو درەختی پایز، وەك ئاشکراشە ((ڕەنگی زەرد : واتای (نە خۆشی، خەم و خەفەت، پیری، بێتوانایی، سەرنەگرتنی تێکۆشان، حەسوودی، ڕق و کینە، لاوازی، بیابان، لم) دەگەیەنێت))[٢٩] .

ئەم شیعرەی گۆران شیعرێکی داهێنەرەو لەوپەڕی جوانی و گەش و گوڵێدایە، دەتوانرێت بگوترێت ((لە شیعری (پایز)دا جگە لە ڕەشبینی و شەوەزەنگی ژیان بەولاوە هیچی تر بەدی ناکرێت پارچە شیعرەکە لە سەرەتاوە تا کۆتایی بە شێوەیەکی ڕۆمانتیکی سەخت و پڕ ئەندێشە تێ دەپەڕێت، هەڵوێستی گۆران بە چڕی تێدا گەڵاڵە کراوە هەموو هەست و هۆشێکی تێکەڵاوی ناو پارچە شیعرەکەی کردووە، سەرگوزەشتەی ژانی پڕ لە ئازارو ئەشکەنجەی تیادا ڕەنگی داوەتەوەو دەڵێت : پایز، پایز! ...))[٣٠]، شاعیر کاتێك خۆی بەرانبەر پایز ڕادەگرێت جۆرێك لە ڕەشبینی بە دەقەکەیەوە دەبینرێت، ((بێ گومان ئەو ڕەشبینییەی کە ڕۆمانتیکی بەخۆیەوە دەبینێت بریتییە لە دارمانی ئاواتە فراوانەکەی و نەگەیشتنی

بە نموونە دیاریکراوەکانی، ... لەوانەیە ڕۆمانتیکەکان لە چەند چرکەیەکدا هەست بە کامەرانی ڕاستەقینە دەکات، بەڵام لە پڕ ئەو هەستەی دەتوێتەوەو دووبارە تووشی ڕەشبینی دەبێت، ئەمەش دەردەکەوێت لە وەسفی ڕۆمانتیکەکان لە کەسایەتی چیرۆکە شانۆگەرییەکانیاندا، بۆیە دەیانبینین ئاواتی مردن دەخوازن لە کامەرانیترین چرکەکانی ژیانیان بە هۆی هەستکردنیان کە ئەو کامەرانی بەدەست ناهێنرێت، و گەر بەدەست بێت ئەوا بەردەوام نابێت)[(٣١)]، کە ئەم وەرزەش وەرزی پایزە وەك لە نموونە شیعرییەکەدا دەردەکەوێت، و ((گۆران بە شێوەیەکی ڕۆمانتیکی ڕەشبین چووەتە ناو تاقیکردنەوەیەکی بێ پایان بە جۆرێك خۆی لەگەڵ ماتەمی پایزدا جووت کردووە دەڵێت، دوو چڵی یەك دارێکن وەك گیانلەبەرێکی خاوەن هەست و نەست هەڵسوکەوتی لە گەڵدا کردووە بە جووتە پێکەوە هاوبەشی ئەم ئازارو ناخۆشییەی ژیان دەکەن ئەم بە فرمێسکی حەسرەت و ماتەمییەوە، ئەو بە بارانی ئەم بە هەناسەی پڕ ئێش و ناسۆرەوە ئەو بە هەوای ساردی دڵتەزینی یەوە ئەم بە بارێك مەینەتی گرانەوە ئەو بە هەوری ڕەش و تاڵەوە ئەم هەموو دەردو ئازارەش بە داستانێکی تراجیدی جگەربڕ کۆتایی پێ دێنێت .))[(٣٢)] .

ئەم شیعرە کاریگەرییەکی زۆری بەسەر قوبادی جەلی زادەدا جێ هێشتووە، و هەرجارەی سوودی لە جومگەیەکی شیعرەکەی گۆران وەرگرتووە و بە بیرو بەهرەی خۆی شتی نوێی لێ هەڵهێنجاوە و کۆپلەیەك یان شیعرێکی لێ ڕسکاندووە، کە شیعرەکانی لە وەسفی ئافرەتدا بێ وێنەن، ئەوەتا لەو کۆپلەیەدا دەبینین جوانی درەختەکان لە پایزدا وەسف دەکات و دەڵێ :

**پایز**
**بووکی نێو پەردەیە ...**
**یەکەم زاوا، - با - یە .**
**دووەم، باران .**
**سێیەم، بەفر**

قوبادی جەلی زادە : ٦٤٠

بە هەمان شێوەی شیعرەکەی گۆران، لەم وێنەیەشدا پایز : لێچووە، بووك : لەوچووە، ئامرازی لێکچوواندن دەرنەکەوتووە، ڕووی لێکچوواندن بریتییە لە پەیوەندی و خۆشەویستی کەوا پایز لەگەڵ باو باران و بەفر هاوسەرگیری دەکات وەك ئەوەی پایز بووکە و ئەوان زاوان .

هەر لە هەمان شێوە قوبادی جەلی زادە بە کاریگەری گۆران لە لێکچوواندنێکی تردا دەڵێ :

**ئەم شەو شیعر چی بیستووە . .**

**بۆ وەك پایز**

**گەڵای قژی دەڕنێتەوە**

**بڵێی زریان**

**شاعیرێکی، بەزنجەوە ڕانەدابێ ؟؟** قوبادی جەلی زادە : ٤٧

بێ گومان لێرەشدا گەڵا هەڵوەریوەکانی بە قژی ئافرەت دەچوێنێت، هەروەك گۆرانیش پایزی بە بووکی قژ زەرد چواندووە، چونکە گەڵاکانی بۆ قژ خواستووە کە زەردن، واتە گەڵای زەردی پایز : لێچووە، قژی زەرد : لەوچووە، ئامرازی لێکچوواندن دەرنەکەوتووە و ڕووی لێکچوونیش ڕەنگی زەردیانە .

جگە لەم نموونەیەی سەرەوە، لێکچوواندنێکی تری پایز بە ئافرەتێکی ڕووت لای هەردوو شاعیر بەرچاو دەکەوێت، هەروەکو گۆران دەڵێ :

**پایز، پایز !**

**شان و مل ڕووت** گۆران : ١٦٣

وەك ئاشکرایە، ئەم وێنەیەی گۆران بێ وێنەیە، ئەم جۆرە وەسفەش بۆ وەرزی پایز تا پێش گۆران نەکراوە، گۆرانی شاعیر هەڵوەرینی گەڵای دار و درەختی زۆر بە جوانی وەسف کردووە، دارێکی ڕووتەن و بێ گەڵای بە ئافرەتێکی شان و مل ڕووت چواندووە، «لەم دێرەدا شاعیر وەرزی پایزی بە کچێکی جوان چوواندووە کە شان و مل ڕووتە، چونکە لە وەرزی پایزدا بە هۆی باو بارانەوە گەڵای دارەکان دەوەرێن و دار و درەخت ڕووت دەبنەوە و شان و ملیان

دەردەکەوێت)[٣٣]، ئەم وێنەیە لای قوبادی جەلی زادەش لە زیاتر لە دەقێکی شیعریدا دەبینرێت، هەروەکو دەڵێ :

**سوپاس پایز**
**تۆ نەبوویتایە ،**
**کەس بە ڕووتی**
**قۆڵ و باسك و**
**سینگ و مەمك و**
**ڕان و سمت و**
**نێو گەڵی دار و دەوەنی**
**نەدەبینی**
**سوپاس پایز** قوبادی جەلی زادە : ٦٤٥

دەبینین قوبادی جەلی زادە لە بەر ئامێزی ئەم وێنەیەی سەرەوەی گۆران ئەم کۆپلەیەی نووسیوە، و توانیویەتی بە وەسفکردنێکی زیاتر ئەندامەکانی لەشی ئافرەت زۆرتر بەراوردی نێوان درەختی پایزو لەشی ئافرەت بکات، واتا لە لێکچوواندنەکەیدا ئەوە دەخاتە ڕوو کە درەختەکانی پایز وەك ئافرەتێکن کە ڕووت ڕووت بۆتەوەو قۆڵ و باسك و ئەندامەکانی تری لەشی بەدەرکەوتوون، واتە درەختی پایز : لەوچووە، ئافرەتی ڕووتی قۆڵ و باسك سینگ و مەمك و ڕان و سمت و نێو گەڵی دار بەدەرکەوتوو : لێچووە، ئامرازی لێکچوواندن دەرنەکەوتووە، ڕووی لێکچوواندن بریتییە لە ڕووتبوونەوەو داماڵینی ئەو بەرگەی لەمەوپێش درەخت و ئافرەتەکەی داپۆشیبوو .

لێکچوواندنی درەختی پایز بە ئافرەتی ڕووت زیاتر لە شوێنێك لە شیعری قوبادی جەلی زادەدا دەبینرێت، هەروەکو بە هەمان شێوەش لە دەقێکی تریشدا، دەڵێ :

**پایزان باغ ،**
**لە شۆڕە ژنێك دەچێ ،**
**ڕووت**
**ڕووت .** قوبادی جەلی زادە : ٥٧٧

لـەم کۆپلەیەشـدا، بـاغ لـە وەرزی پـایزدا : لێـچووە، شـۆڕە ژنێکـی ڕووت : لەوچـووە، دەچـێ : ئـامرازی لێکـچوواندنە، ڕووی لێکـچوواندنیش بریتییـە لـە ڕووتبوونـەوە، لـەم لێکـچوواندنە جـێ پەنجـەی کاریگـەری شـیعرەکەی گـۆران دەبینرێت .

وێنەیەکی تری هاوشێوە لای هەردوو شاعیر بریتییـە لـە لێکـچوواندنی گـەڵای زەردی پـایز بـە ئـاڵتوون، هـەروەکو گـۆران لـە کۆتـایی دەقـە شـیعرەکەی بـە ناونیشانی (پایز) دا دەڵێ :

**هەر چەند گوڵ سیس ئەبێ بگرین ،**
**ئاڵتوونی دار ئەڕژێ بگرین،** گۆران : ١٦٤

ئەوەی لەم دێرە شیعرەی سەرەوەدا دەبینین، بۆ ئەوە دەگەڕێتە کـە ((ئـەو کـەش و هـەوا دڵتەنگـەی کـە عەبـدوڵڵا گـۆران بـە فڵچە بەهرەمەندەکـەی وێنـەی کێـشاوە، کاریگـەری لـە دەروونـی شـاعیر و وەرگـر بـە یەکـەوە هەیـە، خـەم و ئازارەکانی دەگاتە پلەیەك کاتێك چەند جارێك (بگرین) دووبـارە دەکاتـەوە، ئـەو دووبارە کردنەوەیەش شتێکی ئاسایی و سادە نییە، بەڵکو دەربڕینی بـارودۆخێکی دەروونییـە چـونکە وشـەکە ئـەو بیرۆکەیـە دەردەخـات کـە بـاڵی کێشاوە بەسـەر شاعیردا، هەربۆیـە تـا بگـەین بـە ڕۆحـی نووسـەر پێویـستە بگـەڕێین بـەدوای ئـەو وشانەی کە لە کارەکانیدا زۆر دووبارە دەبنەوە، هەروەکو بودلێر دەڵێت))[٣٤] .

لەم نموونەیەی سـەرەوەدا لێکچوواندنەکە بـە شـێوەیەك دروست بـووە، کـە گەڵای دار لە وەرزی پایزدا : لێچووە، ئـاڵتوون : لەوچـووە، ئـامرازی لێکـچوواندن دەرنەکـەوتووە، ڕووی لێکـچوواندنیش بریتییـە لـە ڕەنگـە زەردەکـەی گـەڵاکان و پارچە ئاڵتوونەکان، ئەم لێکچوواندنەش سـیفەتێکی تـری ڕۆمانـسییە، ((ژیـانی پـڕ غەم و ڕەشبینی : شاعیری ڕۆمانسیزم زۆرجار بـە هـۆی کێـشەو گرفتـە زۆرەکـانی ژیان کە نوشست بە خۆشـی دێـنن، لـە واقیعەکـەی بێـزار دەبێـت، بۆیـە هەمیـشە

غەمبارو دڵتەنگە، (گۆران) لە دەست غەمە زۆرەکانی نازانێت پەنا بۆ کوێ بەرێت، دێت ڕوو لە (پایز) دەکات و هاوغەمی و مەینەتی خۆی بۆ دەردەبڕێت : پایز، پایز ... بۆیە شاعیر شەکەت و غەمبار دەبێت، دێت ژیانێکی پڕ لە ئازارو غەمی گەورەو گریانی بێ کۆتایی بۆ خۆی و پایز هەڵدەبژێرێت و، دەڵێت : هەرچەند گوڵ سیس ئەبێ بگرین ...))[٣٥]، ئەمەی لێرەدا دەبینرێت پەیڕەوکردنێکی ڕۆمانسییەتە، چونکە ((تێڕوانینی شاعیرانی ڕۆمانتیك بەرانبەر بە وەرزی پایز تێڕوانینێکی ڕەشبینییە، چونکە بە لایانەوە وەرزی پایز وەرزێکی ماتەم و دڵ پەستی و تەمەن کورتییە، گۆرانیش وەك شاعیرێکی ڕۆمانتیکی هەر بە هەمان شێوە دەڕوانێتە ئەم وەرزە، دێری شیعری پڕ دەبێت لە نائومێدی و فرمێسك ڕژاندن بەسەر تەرمی دارو درەختەکانی سروشتدا، چونکە دڵە تازە پشکووتووەکەی گۆران لەم وەرزەدا سەری تیا دەچێت و ئاڵتوونی دارەکان دەڕژێن و باڵندەکان هێلانەکەیان بەجێ دەهێڵن، ئەم گریان و شیوەنەی گۆران تا دێت شێوە ڕۆمانتیکییە ڕەشبینییەکەی خەستتر و ئاڵۆزتر دەبێت تەمومژ و دووکەڵی ناو دەروونی دەبێتە هەوری پایزو دەست دەکات بە قوڵپی گریان هەتا دوا دڵۆپی فرمێسك ناوەستێتەوە : بەڵێ بگری، بە کوڵ بگری ...))[٣٦]، جگە لەم دەقە شیعرییە، دیسان گۆران ((لە شیعری (هەوری پایز، ل ١٦٥) دا دەڵێت : تەبیعەت زەرد و ژاکاوە ... سروشت بە هۆی زەردبوون و ژاکانی گەڵاو گوڵ و دارو درەختەکانییەوە لە حاڵەتی سەرەمەرگدایە، ئەمەش ڕەمزە بۆ هاتنی وەرزی پایز))[٣٧] واتە دووبارە خەم و خەفەتی خۆی لەگەڵ پایزدا بەرانبەر دەکات :

**هەوری پایز**

**دڵۆپی ساردو فێنك با لەسەر دارو دەوەن بڕژێ ،**

**پەپوولەی زەردی ئاڵتوونی لەسەر لق هەڵوەرێ، بپژێ ...**

**بەڵێ ! بگری هەور، بارانی پایز، بێ وچان بگری ،**

**لەسەر باغچەی گوڵێ وا سیس ئەبێ چڵی عومری !**

**بگرمێنێ، تەپ و نم دابکا، بیکاتە شەست، هەرگیز ،**

**نەوەستێ قوڵپی گریانی، نەوەستێ هەورەکەی پایز،** گۆران : ١٦٥، ١٦٦

ئەم لێکچوواندنەی لێرەدا بۆ پایز کراوە جیایە لەوەی پێشوو، لێرەدا گەڵای زەردی وەریوی پایز : لێچووە، پەپوولەی زەردو ئاڵتوونی : لەوچووە، ئامرازی لێکچوواندن دەرنەکەوتووە، ڕووی لێکچوواندنیش بریتییە لە ڕەنگی زەرد و ئەو جووڵەیەی گەڵا زەردەکان کە لەگەڵ شنە بایەك وەك پەپوولە بە ناسکی دێن و دەچن .

هەروەها قوبادی جەلی زادەش زیاتر لە جارێك گەڵای زەردی پایز دەكات بە لێچوو بۆ ئاڵتوون، یان لە زاراوەی زێڕ و زێڕنگەردا دەری دەخات، بەڵام یەكێك لەم وێنانە لێك دەدەینەوە كە لەوانەیە ئاشكراترینیان بێت، كە ئەویش دەقە شیعرێكە بەناونیشانی (بارانی زێڕ)، كەوا هەر لە ناونیشانەكەیەوە لێكچوواندنێكی جوان لە نێوان گەڵاڕێزان و باران بارین بەدی دەكەین، و تێیدا دەڵێ :

**پایز ،**
**لە جامخانەی زێڕینگەرانەوە**
**هەڵدەكات**
**نێو قەدی دارستانەكان ،**
**ڕادەوەشێنێ**
**دنیا دەكات ،**
**بە یەك پارچە ئاڵتوون !** قوبادی جەلی زادە : ٦٤٠

لێرەدا دیارە كە قوبادی جەلی زادەش بە هەمان شێوەی وێنەكەی لای گۆران گەڵا وەریوەكانی پایز دەكات بە لێچوو، پارچە ئاڵتوون : لەوچووە، ئامرازی لێكچوواندن دەرنەكەوتووە، ڕووی لێكچوواندنیش بریتییە لە ڕەنگە زەردەكەیان .

ئەم لێكچوواندنە لە چەند كۆپلەیەكی تریش لای قوباد دەبینرێت، بۆ نموونە :

**پایز ،**
**چۆلەكەیەكی گەردەن زەردە**
**لە ناو دەستی ئاڵتوونچییاندا ،**
**هەڵەفڕێت**

**دوو گەڵا لە ئەنگوستی شەنگەبی**
**دەکاتەوە و**
**دەیکاتە گوێ گەرم و گوڕەکانی**
**کانی !** قوبادی جەلی زادە : ٦٤١

لەم وێنەیەشدا، گەڵا وەریوەکانی پایز : لێچووە، ئەنگوستیلە و گوارە (کە نموونەی ئـالْتوونن) لەوچووە، ئـامرازی لێکچواندن دەرنەکەوتووە، ڕووی لێکچواندنەکەش ڕەنگە زەردەکەیە .

جگە لەم نموونانە، لە دەقێکی تردا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەم لێکچواندنە دروست دەکات، هەروەکو دەڵێ :

**پایز**
**دەسبلاوترین**
**زێڕینگەرە** قوبادی جەلی زادە : ٦٤٣

لێرەدا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هەمان لێکچواندن دەبینرێت، کاتێك پایز : لێچووە، زێڕنگەرێکی دەستبلاو: لەوچووە، ئـامرازی لێکچواندن دەرنەکەوتووە، ڕووی لێکچواندنەکەش بلاوکردنەوەیە، وەك چۆن زێڕنگەرێك دەست بلاوبێت و پارچە زێڕو ئـالْتوون ببەخشێتەوە، پـایزیش ئەوهایە گەڵا زەردە ئالْتوونییەکان بلاودەکاتەوە .

**پایز**
**بەنێو دارستانەکاندا ،**
**ڕەت دەبێت**
**بە دەنووکی تەزیو ،**
**ملوانکەی لقەکان دەپسێنێ و**
**بەر پێی درەختەکان ،**
**پڕ دەکات لە لیرە!** قوبادی جەلی زادە : ٦٤٢

هەرچەندە لەم کۆپلەیەدا شاعیر ڕاستەوخۆ باسی ئالّتوونی نەکردووە، بەلاّم بێ گومان لیرەی عوسمانی لە ئالّتوون دروست کراوە، هەر گەلاّیەکی هەلّوەریویش بە لیرەیەك دەچوێنێت، واتە گەلاّی وەریوی پایز : لێچووە، لیرەی ئالّتوونی لەوچووە، ئامرازی لێکچوواندن دەرنەکەوتووە، ڕووی لێکچوواندنیش ڕەنگی زەردە، کەواتە ناڕاستەوخۆ دەگەڕێتەوە سەر ڕەگ و ڕیشەی شیعرەکەی گۆران و کاریگەری ئەوی بەسەرەوە دیارە .

## ئه نجام :

له میانەی لێکۆڵینەوەکەماندا گەیشتینە چەند ئەنجامێك لەوانە :

لێکچوواندن هونەرێکی شیعرییە و پانتاییەکی زۆری لە شیعری شاعیران داگیر کردووە، و زۆر بەکارهاتووە و لە شیعری کلاسیکی و لە شیعری نوێشدا بوونی هەیە .

گرنگی وەرزی پایز لە دوای بڵاوبوونەوەی ڕێبازی ڕۆمانسییەت بە نێو ئەدەبی کوردیدا بە شێوەیەکی بەرچاو دەرکەوت .

دیاردەی کاریگەری و کارلێکردن هەر لە کۆنەوە لە نێو ئەدەبدا هەبووە و، گەر شاعیر هونەرمەندانە سوود لە وێنەکانی پێش خۆی وەربگرێت، ئەوا دەتوانێت داهێنان بکات و لەبەر ئامێزی ئەو وێنانە وێنەی جوان و نوێ بهۆنێتەوە .

هەردوو شاعیر گۆران و قوبادی جەلی زادە توانیوویانە وێنەی زۆر جوان لە وەرزی پایز دروست بکەن، بە تایبەتی ئەو وێنە شیعرییانەی لە سەر بنەمای لێکچوواندن بینات نراون .

کاریگەری گۆران بەسەر قوبادی جەلی زادەوە بە ئاشکرا لە بنیاتنانی وێنە شیعرییەکاندا دیارە، بە تایبەتی لەم دەقانەی تایبەتن بە وەسفی سروشت .

## سەرچاوەكان :

### ١. كتێب :

### أ. كوردییەكان :

ئیدریس عەبدوڵڵا : قۆناغی پێش ڕۆمانسیزمی شیعری كوردی (١٨٥١ — ١٩٢١)، لێكۆڵینەوەیەكی ڕەخنەیی مێژوویییە، وەزارەتی ڕۆشنبیری، بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاپ و بڵاوكردنەوە، هەولێر، بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی ڕۆشنبیری، چاپی یەكەم، ٢٠٠٦ .

پەخشان عەلی ئەحمەد : شێوازی شیعری گۆران، سەرۆكایەتی ئەنجومەنی وەزیران، مەڵبەندی كوردۆلۆجی، سلێمانی، چاپخانەی ڕەنج، ٢٠٠٩ .

حوسێن محەمەد عەزیز : یاقووت و زمرووتی كوردی (سروشت و جوانی)، بەرگی سێیەم، چاپی یەكەم، سلێمانی چاپخانەی سیما، ٢٠٠٧ .

خورشید ڕەشید ئەحمەد : ڕێبازی ڕۆمانتیكی لە ئەدەبی كوردی دا، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوكردنەوەی كوردی، بەغدا، ١٩٨٩.

دەریا جەمال حەوێز حەوێزی : وێنەی ڕوونبێژی لە كۆمەڵە شیعری (شەهید بە تەنیا پیاسە دەكات) ی قوبادی جەلی زادە دا، وەزارەتی ڕۆشنبیری، بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆژنامەوانی و چاپ و بڵاوكردنەوە، بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بڵاوكردنەوەی سلێمانی، چاپخانەی كەمال، سلێمانی، ٢٠٠٩ .

ڕێزان سالح مەولوود : ئەندێشەی شیعریی لە نێوان ڕێبازی كلاسیك و ڕۆمانتیكی كوردی لە كرمانجی خوارووودا، لە بڵاوكراوەكانی سەنتەری لێكۆڵینەوەی فیكری و ئەدەبی نما، هەولێر، چاپخانەی شەهاب، چاپی یەكەم، ٢٠٠٩ .

سەردار ئەحمەد حەسەن گەردی : بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری كوردی دا (١٩٧٠ — ١٩٩١)، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٤ .

عبدالقادر محەمەد ئەمین : وێنەی شیعری لە ڕێبازی ڕۆمانسیی كوردی دا، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠٣ .

عـەزیز گـەردی : ئـەدەبی بـەراوردکاری، چـاپخانەی کـۆڕی زانیـاری کـورد، بەغداد، ١٩٨٧ .

علاء الدین سجادي : خۆشـخوانی، گوزارەکـاری ـ ڕەوانکـاری، جوانکـاری، بـە بڕیار و لەسەر ئەرکی زانکۆی سلێمانی، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ١٩٧٨ .

عیزەدین مـستەفا ڕەسـوول : ئـەدەبیاتی نـوێی کـوردی، بـۆ پـۆلی چـوارەمی زانستگا، مطبعة التعلیم العالي، أربیل، ١٩٩٠ .

مـەلا عەبـدولکریمی مـدرس و فـاتح عبـدالکریم : دیـوانی مـەحوی، إنتـشارات کردستان، سەردەشت، چاپ دووەم، ٢٠٠٣ .

مەلا عەبدولکریمی مـدرس و فـاتح عبـدالکریم : دیـوانی نـالی، محەمـەدی مـەلا کـەریم ئەنـدامی یاریـدەدەری کـۆڕی زانیـاری کـورد پیاچـووەتەوە، إنتـشارات کردستان، سەردەشت، چاپ دووەم، ١٣٨٣ هەتاوی .

محەمەد کوردۆ : گەڕان بە دوای شیعرو جیـاوازی دا، بەڕێوەبەرایـەتی چـاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی، ٢٠٠٦ .

هاوژین سلێوە عیسی : بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری شـێرکۆ بێکـەس دا، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم، ٢٠٠٩ .

هۆراس : هونەری شیعر، حەمید عەزیز لە ئینگلیزییەوە کردوویە بـە کـوردی، بڵاوکراوەکانی کتێبفرۆشی سۆران، هەولێر، چاپخانەی چوارچرا ـ سلێمانی، چـاپی دووەم، ٢٠٠٥ .

قوبادی جـەلی زادە : شـەهید بـە تـەنیا پیاسـە دەکـات، بڵاوکـراوەی ئـاراس، چاپی دووەم، هەولێر، ٢٠٠٧ .

گۆران : سەرجەمی بەرهـەمی گـۆران، لـە بڵاوکراوەکـانی یـەکێتی نووسـەرانی کورد، محەمەدی مەلای کـەریم، کـۆی کردۆتـەوەو ئامـادەی کـردووەوە پێـشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیووە، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێـراق، بـەرگی یەکـەم، بەغـدا، ١٩٨٠.

**ب . عەرەبییەکان :**

أمية حمدان : الرمزية والرومانتيكية في الشعر اللبناني، الجمهورية العراقية، وزارة الثقافة والإعلام، دار الرشيد للنشر، ١٩٨١ .

جابر عصفور (د.) : الصورة الفنية في التراث النقدي والبلاغي عند العرب، الدار البيضاء، المركز الثقافي العربي، بيروت ـ الحراء، الطبعة الثالثة، ١٩٩٢ .

روز غريب : تمهيد في النقد الحديث، دار المكشوف، بيروت ـ لبنان، الطبعة الأولى، ١٩٧١ .

س. دى . لويس : الصورة الشعرية، ت: د. أحمد نصيف الجناني مالك ميرى ـ سلماز حسن إبراهيم، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٨٢ .

كمال غمبار، عبدالله گۆران ـ رائداً لحركة تجديد الشعر الكردي ـ، دراسة نقدية تحليلية مقارنة، وزارة الثقافة والشباب، المديرية العامة للصحافة والطباعة والنشر، مديرية النشر أربيل، الطبعة الثانية، مطبعة الثقافة، كوردستان، ٢٠١٠ .

محمد غنيمى هلال (د.)، الأدب المقارن، بيروت ـ لبنان، دار العودى و دار الثقافة، الطبعة الثالثة، ١٩٨١ .

يوسف أبو العدوس، البلاغة والأسلوبية ـ مقدمات عامة ، المملكة الأردنية الهاشمية، عمان، الدار الأهلية للنشر والتوزيع، الطبعة العربية الأولى، ١٩٩٩ .

**٢ . نامەی ئەکادیمی :**

عمر خليل إبراهيم المحمدي، البناء الشعري عند إبن زيدون، رسالة ماجستير، جامعة الأنبار، كلية التربية، فرع اللغة العربية وآدابها، ١٩٩٦ .

جليل رشيد صالح، الصورة المجازية في شعر المتنبي، رسالة دكتوراه، مخطوطة، مكتبة كلية الآداب، جامعة بغداد، ١٩٨٥ .

# پەراوێزەکان

(١) س. دی . لویس ، الصورة الشعرية ، ت: د. أحمد نصيف الجناني مالك ميرى ـ سلماز حسن إبراهيم : ٢١.

(٢) محەمەد کوردۆ ، گەڕان بە دوای شیعرو جیاوازی دا : ٧٣.

(٣) هاوژین صلیوە عیسا ، بنیاتی وێنەی شیعری لە شیعری شێرکۆ بێکەس دا : ٢٣.

(٤) د. جابر عصفور ، الصورة الفنية في التراث النقدي والبلاغي عند العرب : ١٧٢.

(٥) دەریا جەمال حەوێز حەوێزی ، وێنەی ڕوونبێژی لـە کۆمەڵـە شـیعری ( شـەهید بـە تـەنیا پیاسە دەکات) ی قوبادی جەلی زادە دا: ٦٢.

(٦) خۆشخوانی ، گوزارەکاری ـ ڕەوانکاری ـ جوانکاری ، علاءالدين سجادي : ٤٤ .

(٧) يوسف أبو العدوس ، البلاغة والأسلوبية ـ مقدمات عامة : ٩٨.

(٨) جليل رشيد صالح ، الصورة المجازية في شعر المتنبي : ٤٥.

(٩) روز غريب ، تمهيد في النقد الحديث : ١٩٦ .

(١٠) د. محمد غنيمى هلال ، الأدب المقارن : ٧٧ .

(١١) عەزیز گەردی ، ئەدەبی بەراوردکاری : ١٥.

(١٢) هۆراس ، هونەری شیعر ، و: حەمید عەزیز : ١٢.

(١٣) عمر خليل إبراهيم المحمدى ، البناء الشعرى عند إبن زيدون : ١٢٩.

(١٤) سەردار ئەحمەد حەسەن گەردی ، بنیاتی وێنەی هونەری لە شیعری کوردی دا ( ١٩٧٠ – ١٩٩١) : ٢٨٧.

(١٥) مـەلا عبـدالکریمی مـدرس و فـاتح عبـدالکریم ، دیـوانی نـالی ، مـەلا خـدری ئەحمـەدی شاوەیسی مکایەڵی : ٢٥٨.

(١٦) حوسێن محەمەد عەزیز ، یاقووت و زمرووتی کوردی ( سروشت و جوانی) ، ب ٣ : ٢٢٨ .

(١٧) خورشید ڕەشید ئەحمەد ، ڕێبازی ڕۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردی دا : ٢٣ .

(١٨) ئیدریس عەبدوڵڵا مستەفا ، قۆناغی پێش ڕۆمانسیزمی شیعری کوردی ( ١٨٥١ ـ ١٩٢١) : ٧٣ .

(١٩) خورشید ڕەشید ئەحمەد ، ڕێبازی ڕۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردی دا : ٤٦ .

(٢٠) ئەدەبیاتی نوێی کوردی ، عیزەدین مستەفا ڕەسوول : ١٢٦ .

(٢١) عبدالله گۆران رائداً لحركة تجديد الشعر الكردي ، دراسة نقدية تحليلية مقارنة ، كمال غمبار : ٢٨٦ ، ٢٨٧ .

(٢٢) عبدالقادر محەمەد ئەمین ، وێنەی شیعری لە ڕێبازی ڕۆمانسیی کوردی دا : ٥٦ .

(٢٣) ئەدەبیاتی نوێی کوردی ، عیزەدین مستەفا رەسوول : ١٢٧ .

(٢٤) پەخشان عەلی ئەحمەد ، شێوازی شیعری گۆران : ٢٠٨ .

(٢٥) خورشید رەشید ئەحمەد ، رێبازی رۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردی دا : ٢٠٤.

(٢٦) پەخشان عەلی ئەحمەد ، شێوازی شیعری گۆران : ٢١٩.

(٢٧) عبدالقادر محەمەد ئەمین ، وێنەی شیعری لە رێبازی رۆمانسیی کوردی دا : ٥٦ .

(٢٨) عبدالله گۆران رائداً لحركة تجديد الشعر الكردي ، دراسة نقدية تحليلية مقارنة ، كمال غمبار : ٢٦٠ ، ٢٦١ .

(٢٩) پەخشان عەلی ئەحمەد ، شێوازی شیعری گۆران : ٢٠٤.

(٣٠) خورشید رەشید ئەحمەد ، رێبازی رۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردی دا : ٢٠٢ ، ٢٠٣.

(٣١) الرمزية و الرومانتيكية في الشعر اللبناني ، أمية حمدان : ٢١ .

(٣٢) خورشید رەشید ئەحمەد ، رێبازی رۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردی دا : ٢٠٣ ، ٢٠٤.

(٣٣) پەخشان عەلی ئەحمەد ، شێوازی شیعری گۆران : ٢٤٥ .

(٣٤) عبدالله گۆران رائداً لحركة تجديد الشعر الكردي ، دراسة نقدية تحليلية مقارنة ، كمال غمبار : ٢٦٢ .

(٣٥) ئیدریس عەبدوڵڵا مستەفا ، قۆناغی پێش رۆمانسیزمی شیعری کوردی ( ١٨٥١ ـ ١٩٢١) : ٩١، ٩٢.

(٣٦) خورشید رەشید ئەحمەد ، رێبازی رۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردی دا : ٢٠٥ .

(٣٧) پەخشان عەلی ئەحمەد ، شێوازی شیعری گۆران : ٢١٩.

# ملخص البحث

مما لا شك فيه بأن الصورة التشبيهية لها دور فعال في بناء الشعر، من الشعر الكلاسيكى إلى شعر الجديد، وبنيت من خلاله كثيراً من الصور، لهذا تمت كتابة هذا البحث بعنوان (الصورة التشبيهية لفصل الخريف في أشعار كوران وقوبادى جلى زاده)، يظهر فيها النواحي المتشابهة والمختلفة بينهما من جانب وصفهم لفصل الخريف، يتضمن حدود البحث أشعار الخريف للشاعرين ونجعل هذه الأشعار مواداً للبحث، ويتكون البحث من مقدمة وفصلين .

الفصل الأول : يتضمن تعريف و مفهوم التشبية و الموازنة الأدبية و قيمة الخريف لدى شعراء الكورد .

أما الفصل الثاني : حللنا الصور التشبيهية لبعض أشعار كوران وقوبادى جلى زاده اللذان يوصفون فيها الخريف وأظهرنا الصور المتشابهة للخريف لأشعار الشاعرين، وحددنا تأثير كوران على أشعار قوبادى جلى زاده، وفي النهاية كتبنا نتائج البحث والمصادر التي إستفدنا منها خلال بحثنا وكتبنا ملخص البحث بلغتين العربية والانجليزية .

## Abstract

There is no doubt that similarity plays a great role in creating poems , this has been seen in classical poems as well as the modern poems , in light of this, this study has been written under the title of (The similarity of autumn image in Goran and Qubadi Jali Zada poems) in which their views towards autumn as well as the similarity and differences between their poems concerning autumn will be stated.

The scope of the study is limited to showing those poems that talk about autumn by the two poets.

The study consisted of an introduction and two chapters.

Chapter one is concerned with introducing and analyzing the term of similarity, as well as explaining comparative literature then the importance of the autumn notion in Kurdish poems has been talked about.

In chapter two similarity of autumn image in Goran's poems has been clarified which is exemplified by his poems and Qubadi Jali Zada's poems that are about autumn image have been talked about. Inspite of these the similar images of autumn in poems by both poets have been shown, and then the influence of Goran on Qubadi Jali Zada's poems has been indicated.

The study ended with conclusion of the research and the resources that have been taken benefit from. Abstract in Arabic and English have been presented.

# پێکهاتەی خێڵەکی و ناخێڵەکی ناوچەی چەمچەماڵ

## ناوچەی چەمچەماڵ لە نێوان ساڵانی (١٩١٨-١٩٣٩ز) توێژینەوەیەك لە بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ڕۆشنبیری

قوتابی فەرهاد عەبدولعەزیز محەمەد ئەمین
بە سەرپەرشتی
د. محەمەد عەبدوڵڵا کاکەسوور

### پێشەکی

خێڵ ڕۆڵێکی گرنگی لە مێژووی کورددا هەیە، ئەو گرنگییە تاکو ئێستاش بەردەوامە، هەرچەندە ئەم ڕۆڵە لایەنی ئەرێنی و نەرێنی هەیە، بەڵام پێویستی بە توێژینەوەیەکی زانستییە. لەسەر ئەم بنەمایە (پێکهاتەی خێڵەکی و ناخێڵەکی ناوچەی چەمچەماڵ لە ماوەی ١٩١٨–١٩٣٩) بووە ناونیشانی ئەم توێژینەوەیە. چەمچەماڵ کەوتۆتە نێوان پارێزگای کەرکووك و سلێمانییەوە. یەکێکە لەو ناوچانەی کوردستان کە پتر بە ناوچەیەکی خێڵەکی ناسراوە بە تایبەتی لەو ماوەیەی توێژینەوەکە دەیگرێتەوە.

سەرەڕای مۆرکی خێڵەکی لە ناوچەکەدا خەڵکێکی ناخێڵەکیشی تیادا دەژی واتە لێرەدا دەکرێ بکرێتە نموونەیەك بۆ کوردستان بە شێوەیەکی گشتی کە بە زۆری لە خەڵکی خێڵەکی و بەڕادەیەکی کەمتر لە خەڵکی ناخێڵەکی پێك دەهات.

ئەم توێژینەوەیە باس لە خێڵەکانی ناوچەی چەمچەماڵ دەکات لە ڕووی پێکهاتەی هۆزەکان و پەیوەندییان لەگەڵ یەکتری و پەیوەندییان لەگەڵ

دانیـشتوانی ناخێڵـەکی ناوچـەکە و ئـەو کـارەی پێیـەوە دەژیـن، دواتـر دێتـە سەرباسکردنی خەڵکی ناخێڵەکی لە چەمـچەماڵ و ڕەگ و ڕیـشەیان لـە ناوچـەکەدا کە پێش خەڵکی خێڵەکی لەوێ نیشتەجێ بوونە و ئەو کـارو پیـشانەی ئـەنجامیان دەدا بۆ دابینکردنی پێویستییەکانی ژیانیان.

بۆ ئەنجامدانی ئەم توێژینەوەیە پشتمان بەچەند سەرچاوەیەکی کوردی و عارەبی لە شێوەی کتێب و وتار بەستووە لە گرنگترینیـان (دائـرة الحـاکم المـدني: ملاحظات عن عشائر کردستان)، (مارتن ڤان برونەسـن: ئاغـا و شـێخ و دەوڵـەت)، (المحـامي عبـاس العـزاوي: عـشائر العـراق الکردیـة)، (کـەیوان ئـازاد انـور: هـۆزە کوردەکانی کوردستانی عێراق ١٩١٨–١٩٢٥، گۆڤاری پـەیڤین) سـەرەڕای چـەندین سەرچاوەی تر کە لە پەراوێزدا هەن.

لـەو تەگەرانـەی هاتنـە پێـشمان بـۆ نووسـینی ئـەم توێژینەوەیـە کـەمی سەرچاوە و پەرت و بڵاوی زانیارییەکان بوون لە کتێبەکان سـەبارەت بـە ناوچـەی چەمچەماڵ کە تاکو ئێستا وەکو پێویست نووسینی لەسـەر نەنووسـراوە بـەڵام بـە گـەڕان و مانـدووبوون تـوانرا ژمارەیـەکی بـاش کتێـب و وتـار لـەبارەی بابـەتی توێژینەوەکە کۆبکەینەوە و زانیارییەکانیان بەکاربهێنین و تێکهەڵکێشی بکەین و ڕا و سەرنجی خۆمانی لەسەر بدەین تاکو بتوانین بەم هەوڵە خاکەڕایـە خزمـەتێك بـە بواری توێژینەوەی زانستیی مێژووی کورد بکەین. دیـارە ئـەم کـارەش وەکـو هـەر کارێکی زانستی تر بەبێ کەم و کوڕی نابێ بەڵام هیوادارین ئـەم ماندووبوونـەی کـە دراوە لە ئەنجامدانی بە هەند وەربگیرێت.

## تەوەرەی یەکەم
## پێکهاتەی خێڵەکی و ناخێڵەکی لە ناوچەی چەمچەماڵ

### باسی یەکەم
### پێکهاتەی خێڵەکی

لەناوچەی چەمچەماڵدا کۆمەڵێ هـۆزی کـوردی نیـشتەجێن، بەشـێوەیەك کـە ڕەنگە هیچ ناوچەو مەڵبەندێکی تری ئەم کوردستانە، هێندەی ئەم مەڵبەندە هۆزی لەخۆ نەگرتبێت. مێـژووی دوور و درێـژی ئـەم مەڵبەنـدە لـە ئـاوەدانی و، فراوانـی سنووری ناوچەکە و، بوونی دەشتی بە پیت و فراوانی کشتوکاڵی و لـەوەڕگای زۆر بۆ لەوەڕاندنی مەڕو ماڵات، کۆمەڵێ هۆکار بوون کە وایان کـردووە ژمارەیـەکی زۆر لە هۆزەکان لەم مەڵبەندەدا جێگایان ببێتەوە. هۆکارێکی تری گرنگ و کاریگەر کە ڕۆڵی هەبووە لە کێشکردنی هۆزەکـان لەناوچـە جیاجیاکانـەوە بـۆ ئـەم مەڵبەنـدە ئـەوە بـووە، کـە هـەر لـە کۆنـەوە ناوچـەکە ئـاوەدان بـووە بـە خـەڵکانێك کـە بـە (مـــسکێن) ناســـراون و خـــەڵکی ڕەســـەنی ناوچـــەکەن و ناخێڵـــەکین. ئەمانـــە عەشیرەتیان نەبووە، گەر هەشیان بووبێت پاش نیـشتەجێبوون و ڕووکردنیـان لـە کشتوکاڵ، وردە وردە ئەو گیانی هۆزایەتییەیان پووکاوەتەوە و نەماوە. جا لەبـەر نەبوونی یەکێتی هۆزایـەتی لەنێوانیانـدا، نـەیانتوانیوە بەربـەرەکانی هێـزی هـۆزە یەکگرتووەکان بکەن، بۆیە ژێـر چـەپۆك خـستنیان لەلایـەن هۆزەکانـەوە کـارێکی ئاسـان بـووە. بەتایبـەت مـسکێنەکان زانیویانـە هـەر بەربەرەکانییـەکی هۆزەکـان بەلای کەمەوە بەرهەمی ساڵێکیان ڕووبەڕووی فەوتان دەکاتەوە[1].

سیاسەتی حکومەتە یـەك لـەدوای یەکـەکان، هۆکـارێکی تـری کاریگـەر بـووە لـە کۆبوونەوەی ژمارەیـەکی زۆری هـۆز لـە ناوچـەکەدا. عوسمانییـەکان لـە پاداشـتی بەشداریکردنی هۆزی هەمەوەند شانبەشـانی سـوپای عوسمـانی لەشـەڕی (ڕوس– عوسمـانی ۱۸۷۷–۱۸۷۸)، جیـا لـە ناوچـەکانی تـری کوردسـتان، لـە ناوچـەی چەمچەماڵدا زەویوزاریان پێ بەخشیون[2].

بەشێوەیەکی گشتی خێڵەکانی کوردستان بۆ دوو نموونـەی دیـار دابـەش دەبـن. یەکەمیان، ئەو هۆزانە دەگرێتەوە کە لەسەر بنەمای ڕەچەڵەکی هاوبـەش دروسـت بوون. دووەمیشیان، ئەوانەن کە شوێن و جێگەی هاوبەش، یەکی خـستوون[٣]. لـە ناوچـەی چەمـچەماڵدا بـۆ هـەردوو نموونەکـە هـۆزی دیـارو بەرچـاو نـین هەیـە. هۆزەکانی (هەمەوەند، شێخ بزێنی، مکایلی، جەباری)، لەو هۆزانە هەژمار دەکرێن کـە ڕەچـەڵەکی هاوبەشـیان هەیـە. هەرچـی هـۆزی (شـوان و قەڵاسـێوکە )شـە، بەحوکمی یەکێتی شوێن و جێگەی هاوبەش دروست بوون .

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ڕاستییەکیش بکەین، کە ئەو جۆرە دابەشـکردنەی بـۆ هۆزەکان کراوە سەد لە سەد بەسەر هیچ کام لـە هۆزەکـانی ناوچـەی چەمـچەماڵدا جێبەجێ نابێـت. هـیچ گومـانی تێـدا نییـە کاتێـك کـە تـیرەی (مکـایلی) جـاف لـە ناوچەی سەنگاو گیرساونەتەوە، گوندەکانی ئەو ناوچەیە خاڵی نەبوون لـە خـەڵك، بەڵکو دانیشتوانیان تێدا بووە. بەڵام لە ئەمڕۆدا هەموو ئەو گوندییانـە خۆیـان بـە بەشێك لە تیرەی مکایلی دەزانن، وە خۆیان دەبەسـتن بـەو ڕەچـەڵەکەوە کـە ئـەو تیرەیـەی لـێ کەوتۆتـەوە. ئەمـە لـەلای هەریـەك لـە هۆزەکـانی جـەباری و، شـێخ بزێنیش، بە هەمان شێوازە. ئەم بارودۆخە بۆ ئەو هۆزانەش هەر وایە کە ئێمە لـەو چوارچێوەیەدا پۆلێنمان کردوون کە شوێن و جێگەی هاوبـەش کاریگـەری هـەبووە لەسەر دروستبوونیان. چونکە ئـەوانیش لـەلای خۆیانـەوە پێیـان وایـە کـە هـەمان ڕەچەڵەکی هاوبەش پێکەوەیان دەبەستێتەوە. هۆزی گـەورەی شـوان، دیـارترینی ئەو هۆزانەیە کە ئەندامەکانی پێیان وایە کـە ئـەوان هـەموویان هـەمان ڕەچـەڵەکی هاوبەشیان هەیە ، خۆیـان بـە نـەوەی ئـەو پێـنج برایـە دەزانـن کـە لـە سـەرەتای سەدەی ڕابـردوودا، دەزگـای هـەواڵگری بـەریتانیا لـەزمانی مەلایـەکی ناوچـەکەوە تۆماریـان کـردووە. ئـەوانیش شـاهوان (شـوان)، ڕەشـەوند (ڕەشـید)، تارژەوەنـد (طـە)، قیبلاونـد (قابیـل)، میـازان (وەرام )ن[٤]. نـاوی هۆزەکـەش کـە بـە ڕای مێژوونووسـان لـەناوی ناوچـەکەوە (ناوچـەی شـوان — ناوشـوان). یـا لەپیـشەی خەڵکەکەیەوە کە شوانی و ئاژەڵداری بووە وەرگیراوە[٥]. بەڵام ئەندامانی هۆزەکـە زیاتر ئەو بۆچوونەیان بەلاوە پەسەندە کە ڕەچەڵەکی هۆزەکەیان دەباتـەوە سـەر

هـۆزی گـەورەی شـوانکارەی نیـشتەجێی لوڕسـتان. گوایـە لەئـەنجامی رووخـانی دەسـەڵاتی میرنـشینەکەیان ،( میرنـشینی شـوانکارە ٤٢١–٧٥٦ك)، هـاتوون و لـە باکوری ڕۆژهەڵاتی کەرکوك نیشتەجێ بوون[٦].

**پێکهاتەی هۆزەکان :**

زاراوەی (خێڵ)، لەلای کـورد زاراوەیـەکی گـشتگیرە، واتـای ئـەو ڕێکخـستنە کۆمەڵایەتییە دەگەیەنێت، کە سیمای یەکگرتنی ڕامیاری یـان جـوگرافی بەسـەریدا زاڵە. پێکهاتەی هەر هۆزێکیش  بە شـێوەیەکە، کـە دابـەش دەبێـت بەسـەر چـەند (تیرە و بنەماڵەیەکەدا ). تیرە، بەشێکی بـچووکترە لـە هـۆز ، زیـاتر ئـەو کەسـانە دەگرێتەوە کە بنەچەی خۆیان دەبەنەوە سەر یەك بەرەباب ، زۆرجار تـیرە، نـاوی هەمان ئەو باوکە هەڵدەگرێت کە لێی کەوتووەتەوە[٧].

جافی (مکایلی) تیرەیەکن لە هۆزی گەورەی جاف، ئەوان هەرچەندە کـە خۆیـان دەبەستنەوە بەو ڕەچەڵەکە سەرەکییەوە کە هۆزی جـافی لـێ کەوتۆتـەوە. بـەڵام وەکو تیرەش، پێیان وایە رەچەڵەکێکی نزیکتریان هەیەو، دەچنەوە سـەر (مکایـل یا پیر مکایل )ی باپیرە گەورەی تیرەکە. کە نەوەی خەلیفەی سێیەمی موسڵمانان (عوسمانی کوڕی عەفان) بووە[٨]. لە ناوچەی سنە ژیاوەو، پاش مردنی، نەوەکانی ئەو کۆچیان کردووەو لە ناوچەی قەرەداغ و سەنگاو گیرساونەتەوە[٩].

هەروەها هۆزی هەمەوەنـد، کـە هـۆزێکی ناسـراوی ناوچـەی چەمـچەماڵن. وەکـو رەچەڵەك، هۆزەکە دەگەڕێتەوە سەر کەسێك بەناوی خوادی (خودادادە شەل)، کە لـە کوردسـتانی ئێرانـەوە هـاتووەو لـە ناوچـەی پێنجـوێن و هەنگـەژاڵ نیـشتەجێ بووە[١٠]، هەر لەوێ خێزانی پێکەوەناوەو، چوار کوڕی لێ  بووە، لـەو چـوار کـوڕە هەر چوار تیرە سەرەکییەکەی هەمەوەند کەوتوونەتەوە کە ئەوانیش :–

یەکـەم: یادگـار، کـە (چـەلەبی) پـێ وتـراوە، تـیرەی (بـەگزادە )ی هەمەوەنـد (بەگزادەی چەلەبی) لێ کەوتۆتەوە. دووەم: رەمـەزان، تـیرەی (رەمەوەنـد)ی لـێ کەوتۆتـەوە. سـێیەم: رەشـید، تـیرەی (رەشـەوەند) .چـوارەم: سـەفەر، تـیرەی (سەفەوەند )ی لێ کەوتۆتەوە[١١].

ئەم جۆرە دابەشبوونە لە ناو (هۆزی شوان)یشدا بەدی دەکرێت، ئەو هۆزە بۆ دوو تیرەی سەرەکی (کێشك و، خاسە) دابەش دەبێت. هەندێك لە نووسەران تیرەی سێیەمیشی بۆ زیاد دەکەن کە تیرەی (گوڵم کەوە) یە. بەڵام لەڕاستیدا (گوڵم کەوە) کە ئەدمۆندز بە تیرەی (سەرخاسەی گوڵن کێو) ناوی بردووە. هەر بەشێکە لە شوانی خاسە بەڵام لقێکی جیایە لە (سەرخاسەی یەختەکان)[12]. بەڵام ئەوەی کە دابەشبوونی هۆزی شوان، لەو دوو هۆزەی سەرەوە جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە تیرەکانی شوان هەڵگری ناوی کەسێك نین، بەڵکو ناوی خۆیان لە دیاردە سروشتییەکانی دەوروبەری خۆیانەوە وەرگرتووە. بۆ نموونە کە دەگوترێت (تیرەی شوانی خاسە)، ئەم تیرەیە لە باشوورەوە نزیك رووبارێکە کە ناوی (رووباری خاسە) یە[13]. ئەمە لە کاتێکدا هەم تیرەی مکایلی و، هەم تیرەکانی هۆزی هەمەوەند، هەڵگری ناوی ئەو کەسایەتیانەن کە تیرەکەیان لێ کەوتۆتەوە. تایبەتمەندییەکی تری ئەم دابەشبوونە لەناو هۆزەکانی ناوچەی چەمچەماڵدا، ئەوەیە کە هەم (هۆزی جەباری) و، هەم (ساداتی بەرزنجە)، دابەش نابن بەسەر تیرەو تایەفەدا. ئەمەش ڕەنگە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە هەموویان خۆیان بە سادات دەزانن و نایانەوێ خۆیان لەو ڕەچەڵەکە پیرۆزە دابڕن. بۆنموونە جەباری تیرەیان نییە، بەڵکو هەموو ئەندامەکانی خۆیان بەنەوەی (شیخ عەبدول جەبار) ناوێك دەزانن کە لە بنەڕەتدا خەڵکی شاری (حەما) بووە لە شام و بە مەبەستی ئیرشاد پێش زیاتر لە چوار سەد ساڵ، هاتۆتە ناوچەکەو لە گوندی (تەکیەی جەباری) نیشتەجێ بووە. بەپێی شەجەرەیەك کە لای جەبارییەکانە، (ئەم عەبدول جەبار )ە، نەوەی ئیمام حەمزەی کوڕی موسای کازم و، برای (سەفیەدینی ئەردەبیلی) باپیرە گەورەی سەفەوییەکانە[14]. وە تێکڕای هۆزی جەباری لە (شەرەفەدینی) کوڕی کەوتوونەتەوە، کەپاش گەڕانەوەی باوکی بۆ شام، لە سەر تەکیەکەی ماوەتەوە[15].

ماوەتەوە بڵێین کە مەرج نییە تێکڕای تیرەکانی هەر هۆزێك لەهەمان ئەو رەگ و سەرچاوەیەوە هاتبێتە خوارەوە کە هۆزەکەی لێ پێکهاتووە، بەڵکو زۆر جار روودەدات، هۆزێکی بچووکی سەربەخۆ، یا تیرەیەك لە تیرەکانی هۆزێکی

دیاریکراو، بە هۆی هۆکاری جۆراوجۆرەوە سەربەخۆیی خۆیان لە دەست بدەن، یان لە هۆزەکەی خۆیان دابڕێن و تێکەڵاوی هۆزێکی تر ببن. ئەمانە، لەناو ئەو هۆزانەدا کە سیستەمی دەرەبەگایەتی تیایاندا لاواز بووە، بوون بە بەشێك لەو هۆزەو بەسوود وەرگرتن لەو جیاوازی نەکردنە بەیەکجاری خۆیان بەو هۆزەدا هەڵواسیوە، بەجۆرێك زۆر جار ئەستەمە لە ئەمڕۆدا لێکتر جودا بکرێنەوە و رەسەن و ناڕەسەنیان بناسرێنەوە. ئەم جۆرە تێکەڵاو بوونە زۆر بە ئاشکرا لە ناو تیرەی (مکایلی)دا رەنگ دەداتەوە. کاتێك تێبینی دەکەین ئەو خەڵکە رەسەنەی کە پێش هاتنی مکایلی لە گوندەکانی ناوچەی سەنگاودا نیشتەجێ بوون، لە ئێستادا خۆیان بە بەشێك لەو تیرەیە دەدەنە قەڵەم و. بەڵام ئەم بارە لەلای هەمەوەندەکان بەشێوەیەکی ترە، تیرەکانی (سێتە بەسەر، سۆفیەوەند، میتمەوەند، قرکەوەند، قاسمەوەند، هەمەیل، بابلەوەند ...)[16] ئەمانە چەند تیرەیەکی بچووك بوون و، هاوڕێیەتی هەمەوەندیان کردووەو لەگەڵیاندا ژیاون، دواتر لەناو ئەو هۆزەدا تواونەتەوە. بەڵام مێژووی زۆربەیان ئاشکرایەو دەتوانرێت بە ئاسانی بناسرێنەوەو لە تیرە رەسەنەکانی هەمەوەند جیابکرێنەوە. لەناو ئەمانەدا، تیرەی وەهایان تێدایە کە لەپێش هاتنی هەمەوەندەکان، لە ناوچەکەدا بوونیان هەبووە، بەڵام پاش هاتنی ئەوان بەهەر هۆیەك بووبێ تێکەڵیان بوون. لەوانە تیرەکانی (سێتەبەسەر و سۆفیەوەند) لە بنەڕەتدا جافن، تێکەڵ بە هەمەوەند بوون[17].

**پێشەوایەتی هۆزو چینەکانی :**

سەبارەت بە سەرۆکایەتی هۆزو چۆنیەتی وەرگرتنی ئەو پلەیە لەلایەن کەسێکەوە لەو هۆزە، بەگوێرەی بارودۆخی هۆزەکان گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە. هەندێ جار لەڕێی پشتاوپشتەوە بەدەست هاتووە. هەندێ جاریش بەهۆی هەڵبژاردنەوە. هەروەها دەستێوەردانی دەسەڵاتیش لە دیاریکردنی سەرۆکی هۆزەکاندا رۆڵی لەو دوو شێوازەی پێشوو کەمتر نەبووە. سەبارەت بە شێوازی پشتاوپشت کە زۆر بە بڵاوی لەلای زۆربەی هۆزەکانی کوردستان و ناوچەکەوە پەیڕەو کراوە. لەلای هۆزەکانی ناوچەی چەمچەماڵیش بەکارهاتووە. بۆ نموونە

سـەرۆکایەتی هـۆزی هەمەوەنـد بـۆ ماوەیـەکی دوور و درێـژ لـە دەسـت تـیرەی بـەگزادەی هەمەوەنـددا بـووەو لـەناو کەسـایەتییەکانی ئـەو تیرەیـەدا ئـاڵوگۆڕی کردووە. لەکاتی هاتنی ئینگلیزەکاندا سـەرۆکایەتی ئـەو هـۆزە بەدەسـت (حەمـە ئەمین ئاغای فەقێ قادر )[18]ەوە بووە لەتیرەی بەگزادە، ئەو پایەیەشی لە (فەقێ قادری )ی باوکییەوە بۆ ماوەتەوە کە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا سـەرۆکی هـۆزی هەمەوەنـد بـووە[19]. لەهـەمان ئـەو سـەردەمانەدا تـیرەی مکـایڵی جـاف، سـەرەتا (حـاجی قـادری ئەحمـەد شاسـوار) لـە بنەماڵـەی حەمـە عـەلی وەیـسی سـەرۆکی بـووە، دوای ئـەویش (حـسن )ی کـوڕی شـوێنی گرتۆتـەوە[20]. (سـەید محەمەد)ی[21] سەرۆکی هۆزی جەباریش، لە شوێنی سەید عەبدولسەمەدی بـاوکی پایەی برا گەورەیی وەرگرتووە[22].

ئینگلیزەکـان پـاش ئـەوەی لـە سـاڵی ١٩١٨دا دەسـتیان گەیـشتۆتە ناوچـەکە، هەوڵیان داوە ئەو سەرۆك هۆزانە بۆ خۆیان کێش بکـەن، لـەو پێناوەشـدا تـەواوی هەوڵـەکانی خۆیـان خـستۆتە گـەڕ. بـەڵام کاتێـك لـە ڕاکێـشانی هەنـدێك لەوانـدا شکستیان خواردووە. هاتوون کەسانی تری لایەنگر بە خۆیـان بـە ڕوویانـدا ڕاسـت کردۆتـەوە. لـە بەرامبـەر (حەمـە ئـەمین ئاغـا)ی سـەرۆکی هەمەوەنددا، (ئـەمینی ڕەشید ئاغا)[23]ی سەرۆکی (ڕەمەوەند )یان ڕاسـت کردۆتـەوە[24]. چـونکە (حەمـە ئەمین ئاغا) لایەنگری شـێخ مـەحمود بـووە، بـەڵام (ئـەمین ئاغـا) لەگـەڵ شـێخدا نـاکۆك بـووە. سـەرەتا وەك نوێنـەری چەمـچەماڵ، (مێجەرسـۆن) کردوویـەتی بـە ئەنـدامی ئـەو ئەنجوومـەنی ڕاوێژکارییـەی کـە لـە سـلێمانی دروسـتی کـردووە[25]. دواتـــریش لەســـاڵی ١٩٢٣، لەلایـــەن (ئەدمۆنـــدز )ەوە کـــراوە بـــە قایمقـــامی چەمچەماڵ[26].

أ- لـەناو هـۆزی شـێخ بزێنیـشدا[27]، لـە بـەری چـەپی زێ، (تۆفیـق ئاغـای قەسرۆك)، سەرپەرشتی ئەو بەشەی هۆزەکەی کـردووە. بـەڵام بـە حـوکمی ئـەوەی کـە لایـەنگری شـێخ مـەحمود بـووەو ئامـادە نـەبووە ملکەچـی داواکـاری ئینگلیزەکـان بێـت. هـاتوون کەسـێکی تریـان بەڕوویـدا ڕاسـت کردۆتەوە، ئەویش (فارس ئاغای کوڕی ڕەشید ئاغای سەرچنار) بـووە، کـە

برازای تۆفیق ئاغا خۆی بووە، چونکە ئەم توانیویەتی (٦٠) کەسیان بۆ ئامادە بکات بۆ ناو ریزەکانی هێزی لیڤی هەرچەندە زۆری نەخایەندووە ئەمیش لەگەڵیاندا تێکچووە و چووەتە پاڵ شێخ[٢٨].

ب- بەڵام ئینگلیزەکان، لەم جۆرە هەڵوێستەیاندا بەرامبەر بە (سەید محەمەدی جەباری)، شکستیان خواردووە. چونکە سەید محەمەد، هەرچەندە کە ((بەهۆکاری جۆراوجۆر هەمیشە لە لیستەی ڕەشی حکومەتدا بووە)). بەڵام بەحوکمی ئەوەی لە نێوان خزمەکانیدا، ئینسانێکی لێهاتوو بووە و کەس ململانێی نەکردووە. هەروەها لەبەر دەسەلاتە ئایینییەکەشی، گوندییەکان بەبێ ئەم لاوئەولا فەرمانەکانیان بەڕێوە بردووە. بەم جۆرە بەشایەدی خودی ئینگلیزەکان، ئەو لەڕادەی سەرۆك هۆزێکی گرنگدا بووەو، هەموو ئەو هەوڵانەی کە داویانە بۆ شکست پێهێنانی بێ ئاکام بوون[٢٩].

سیستەمی سەرۆکایەتی لەناو (هۆزی شوان )دا، شێوازێکی تایبەتمەندتری هەبووە، کە جیاواز بووە لە شێوازی دیاریکردنی سەرۆك هۆز لەلای هۆزەکانی تری کوردستان و ناوچەکە. چونکە هۆزی شوان سەرۆکی گشتییان نەبووە، بەڵکو هەر کۆمەڵە گوندێك سەرۆکێکی تایبەت بەخۆیان هەبووە. بۆ نموونە لەناو شوانی کێشکدا، (١٠) لە گوندەکانیان (کوێخا حسن)، وە (٣٥) گوندی تریان لەلایەن (کوێخا ڕەجب )ەوە سەرپەرشتی کراوە. هەرچی (شوانی خاسە )شە، (١١) لە گوندەکانیان (عەزیزی شەریف جلیل) سەرپەرشتیانی کردووە. (٦) گوندیش لە ژێر سەرپەرشتی (کوێخا ڕەشید عوسمان )و، (٨) گوندی تریش لە ژێر سەرپەرشتی (کوێخا عەبدوڵا عوسمان )دا بووە[٣٠]. لەلای ئەم هۆزە (بەتایبەت لەلای شوانی خاسە)، سەرۆکایەتی بە پشتاوپشت نەبووە. بەڵکو هەر کەسایەتییەك لە سوارچاکی و، نان بدەیی و، سەرکردایەتی کردندا، توانیبێتی ئەسپی خۆی تاو بدات، خەڵکەکە بە برا گەورەی خۆیانیان قەبووڵ کردووە. کەواتە خەڵکی شوان هەموویان ڕەعیەت بوون و ئاغایان لەسەر نەبووە. ژێردەستەو پاشکۆی هیچ عەشیرەتێکی تریش نەبوون[٣١]. شوان دەمڕاست و

سەرۆكەكانی خۆیانیان بە (كوێخا) ناوبردووە. كوێخاكانی شوان بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ هاوگوندییەكانی خۆیاندا وەكو دەرەبەگ هەڵسوكەوتیان نەكردووە. هیچیشیان لەڕووی موڵكدارییەوە لە جووتیارێكی ئاسایی هۆزەكەیان موڵكدارتر نەبوون[٣٢]، ((سەرجەمیان لە خانووی ئاسایی و ساكاردا ژیاون، تەنها یەك تا دوو پاسەوان زیاتریان نەبووە))[٣٣].

وەكو پێشتر ئاماژەی پێكرا، هۆزایەتی هەمەوەندیش بەشێوەیەك بووە كە هەریەكە لە تیرەكانی سەرۆكێكی تایبەت بەخۆیان هەبووە، هەر كێشەو كاروبارێكیش كە هەموو لقەكانی هۆزەكە دەربەستی بووبێتن، لە ئەنجومەنێكدا گفتوگۆیان لەبارەوە كردووە، كە لە سەرۆكی هەر چوار تیرە سەرەكێكە پێكدەهات[٣٤]. ئەو دەستە راوێژكاریانەی كە لە بەڕێوەبردنی كاروباری هۆزەكاندا هاوكاری سەرۆكی هۆزیان كردووە. دەكرێت ناوی (چینی خانەدانان و پیاوماقوولان)ی هۆزیان لێ بنرێت. (جەنگاوەران و هێزی شەڕكەری هۆزەكان)یش، چینێكی گرنگی تری پێكهاتەی هۆز بوون[٣٥]. كە ئەندامەكانی لە گوندەكانی ژێر دەستی هۆزەكەدا ژیاون، لە هەر گوندێكیشدا، ژمارەیان لە نێوان (١٠ بۆ ١٥) جەنگاوەردا بووە ، كە لە كاتی پێویستدا لە ژێر سەركردایەتی ئاغای گونددا بۆ ناو لەشكری هۆز ئامادە كراون. هەریەك لەو سوارانە بە (نیشانچی) ناوبراون، كە دەبوو ئەسپێك و تفەنگێك و فیشەكی یەدەگی زۆریان پێ بێت. سەرۆكی هەر تیرەیەكیش، سەرپەرشتی ئەو سوارانەی كردووە كە لە گوندەكانی سەر بە تیرەكەیدا كۆكراونەتەوە[٣٦]. كە لەناویاند زۆر جار ژنانیش بەشدارییان كردووە[٣٧].

هۆزەكانی ناوچەی چەمچەماڵ، سەرجەمیان خاوەنی هێزو توانای باشی سوارە و پیادەی تایبەت بەخۆیان بوون. ئەمەش بەئاشكرا لە ڕاپۆرتەكانی دەزگای هەواڵگری ئینگلیزەكاندا دەردەكەوێت كە لە سەرەتای هاتنیاندا بۆ ناوچەكە تۆماریان كردووەو، تیایدا ژمارەی هێزی شەڕكەری زۆربەی هۆزەكانی كوردستانیان دیاریكردووە. سەبارەت بە ناوچەی چەمچەماڵ، بەم شێوەیەی هێزی شەڕكەری هەندێك لە هۆزەكانیان خەملاندووە: مكایلی،٥٠٠ سوارەو ١٠٠٠

پیادە. هەمەوەند، ٢٥٠سوارە .شێخ بزێنی، ٧٠ سوارەو ٥٠٠ پیادە. جەباری ٢٠٠، سوارەو٢٥٠ پیادە[٣٨]. شوان، ٥٠٠ سوارە[٣٩]. شیاوی باسە لەناو هۆزەکاندا کەسێکی دیاریکراو، سەرۆکایەتی لەشکری گشتی هۆزەکەی کردووە. بۆ نموونە (کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند[٤٠]) سەرکردایەتی هێزی شەڕکەری هەمەوەندو، (عەزیزی شەریف جەلیل) سەرکردایەتی هێزی شەڕکەری شوانی کردووە[٤١].

چینێکی تری هۆزەکان، بریتی بووە لە (ئاغای گوندەکان ). وەك ئاشکرایە هەر هۆزەو خاوەنی چەند گوندێك بووە، هەر گوندێکیش کەسێك سەرۆکایەتی کردووە، کە لای هەمەوەند و شێخ بزێنییەکان (ئاغا ). وە لای شوان و میکایلییەکان (کوێخا )یان پێ وتراوە. ئەمانە بەتایبەت لای (هەمەوەند و شێخ بزێنی)، هەموو دەسەڵاتێکی رەهایان لەو گوندانەدا لەلایەن سەرۆکی گشتی هۆزەوە پێ بەخشراوە، هیچ گوندییەکیش نەیتوانیوە لە دەسەڵاتیان دەربچێت[٤٢].

(جووتیارە خێڵەکییەکان)، چینی هەرە خوارەوەی هۆزەکانیان پێکهێناوە. کە زۆرجار لەگەڵ جووتیارە ناخێڵەکییەکاندا جیاوازییەکی ئەوتۆیان نەبووە، بەڵکو ئەو خەرجی و باجانەی کە لە جووتیارە ناخێڵەکییەکان سەندراوە، بە هەمان ئەندازە بەسەر ئەمانیشدا سەپێنراوە[٤٣].

## باسی دووەم

## پێکهاتەی ناخێڵەکی

کە دەوترێت هۆزەکان پێکهاتەی بنچینەیی دانیشتوانی ناوچەی چەمچەماڵ پێکدەهێنن، ئەمە وا ناگەیەنێت کە تەنها پێکهاتەی دانیشتوانی ناوچەکە بووبن. بەڵکو بەدەر لە ئەندامانی هۆزەکان، لە ناوچەی چەمچەماڵدا دانیشتوانی ناخێڵەکیش بوونیان هەبووە. کە ئەمانە ئەو کوردانە دەگرێتەوە کە دانیشتووی رەسەنی ناوچەکە بوون، بەڵام هەستی خێڵایەتییان لەناو چووە، رەنگە باب و باپیری ئەمان پاش نیشتەجێبوون و مل نان بۆ کارو پیشەی جووتیاری، هێدی هێدی شیرازەی رێکخراوەیی خێڵەکییان پسابێت و، توانا جەنگاوەرییەکەی

سەردەمی رەوەندیان لەدەست دابێت ، پاشان لەلایەن هۆزێکی دیکەوە ژێردەستە کرابن. دووریش نییە هۆزی سەرکەوتوو ناچاری ئەوەی کردبن کە مل وەبەر جووتیاری بنێن[٤٤] . ئەمان هاوین و زستان لە گوندەکانی خۆیاندا دەمانەوە، مەڕەکانیان لە دەوروبەری ناوچەکانی خۆیان لە سەر تەپەو تەلانە نزیکەکان دەلەوەڕاند، لە زستانانیشدا لە نێو کۆزی تایبەتدا لەناو خانووەکانی خۆیاندا لە سەرماوسۆڵەو ئاژەڵی دڕندە دەیانپاراستن[٤٥].

دانیشتوانە ناخێڵەکییەکان لە ناوچەی چەمچەماڵدا، بەتایبەت لە گوندەکانی سەر بە ناوچەکانی هەمەوەند و شێخ بزێنیدا، بە (مسکێن)[٤٦] دەناسران. ئەمە تاڕادەیەك لای جافەکانیش هەر وابووە، هەرچەندە هەندێ جار جافەکان (گۆران)یشیان پێ گوتوون[٤٧] .

هۆزە شوانکارە کۆچەرەکان، لە سەدەی رابردوودا بەو چاوە سەیری خەڵکە نیشتەجێبووەکانیان کردووە، کە بێ خێڵ و بێ تیرەو تایەفەن، نازناوی (گۆران)یشیان وەك توانج بۆ بەکارهێناون[٤٨] . بەڵکو هەندێك لەوان پێیان وابووە کە (گۆران)ەکان هەر کوردیش نین، چونکە بەلای ئەوانەوە کورد ئەو کەسە بووە کە سەر بە هۆزێکی دیاریکراو بێت و، پیشەکەیشی شوانکاری و ئاژەڵداری بێت، نەك کشتوکاڵکردن کە پیشەی (گۆران)ەکان بووە[٤٩] .

سەبارەت بەوەی کە چۆن هۆزە رەوەندەکان خۆیان سەپاندووە بەسەر گوندەکانی مسکێنەکانداو، ناچاریان کردوون کە ژێردەستەییان قەبووڵ بکەن، ئەوا لەلایەن ئەو هۆزانەوە رێگاو شێوازی جۆراوجۆر گیراونەتە بەر، کە لە سەرووی هەموویانەوە بەکارهێنانی هێز بووە. بۆ نموونە کە هەمەوەندەکان هاتوونەتە ئەم مەڵبەندەی ئێستایان لەنێوان سلێمانی و کەرکوکدا، شێوازی زۆر توندیان گرتۆتەبەر لەپێناو سەپاندنی دەسەڵاتیان بەسەر وەرزێرە ناخێڵەکییەکاندا. تەنانەت هەوڵی مل پێ کەچکردنی ئەو خێڵەکییانەشیان داوە، کە لەکاتی هاتنی ئەواندا لە ناوچەکەدا بوونیان هەبووە. ئەوان کە خاوەنی هێزو ئەزموونێکی دوور و درێژی شەڕکردن بوون، توانیویانە خێڵەکییەکی زۆریش بهێننە ژێر بارو بیانکەن بە ژێردەستەی خۆیان. لەوانە (هۆزی پیریادی)[٥٠]، کە بەماوەیەکی زۆر پێش

هاتنی هەمەوەندەکان لەم مەڵبەندەدا ژیاون[٥١]، هەروەها هۆزەکانی چنگنی و، سۆفیەوەندەکانیش. لەناو ئەو هۆزانەدا، هۆزگەلی وەهایان تێدا بووە کە توانیویانە سەرباری ژێردەستەکردنیان، پارێزگاری لە هەیکەلی هۆزایەتی خۆیان بکەن، لەوانە (پیریادی )یەکان. هەشیان بووە وەکو (سۆفیەوەند )ەکان، خۆیان خستۆتە ژێر باڵی هۆزی هەمەوەندەوە و، لە ئێستادا خۆیان بە بەشێك لەو هۆزە دەدەنە قەڵەم. بەڵام چنگنییەکان نەیانتوانیوە پارێزگاری لە مانەوەی خۆیان بکەن لە مەڵبەندەکەدا، بۆیە لە ئێستادا هۆزێك بەو ناوەوە لە ناوچەکەدا بەدی ناکرێت[٥٢].

لای شێخەکان، خۆسەپاندن بەسەر گوندییە ناخێڵەکییەکاندا، سەرباری بەکارهێنانی هێز، شێوازێکی تریشی وەرگرتووە. کە ئەویش بەکارهێنانی پلەو پایەی ئاینی بووە. زۆرجار ئەوان بەبیانووی کردنەوەی تەکیەو ئیرشادکردن و پێشنوێژیکردنی خەڵکەوە هاتوونەتە گوندێکی دیاریکراو، بەڵام پاش قایمکردنی جێ پێی خۆیان، ئەوسا کەوتوونەتە وێزەی خەڵکەکەی و دەستگرتن بەسەر موڵك و سامانەکانیاندا. سوود وەرگرتن لە پایەی ئاینی، یارمەتی ئەو شێخانەی داوە، کە دەستیان بگات تەنانەت بەو گوندانەش کە خەڵکانی خێڵەکی و سەر بەهۆزەکانیان تێدا ژیاون .

هاوکاری حکومەتە یەك لە دوای یەکەکان، هۆکارێکی یارمەتیدەری تر بووە بۆ هۆزە رەوەندەکان لە سەپاندنی دەسەڵاتیان بەسەر جووتیارە ناخێڵەکییەکاندا. هۆزەکان وەکو چۆن لە سەردەمی دەسەڵاتی بابانەکان و دواتریش عوسمانییەکاندا لەلایەن دەسەڵاتەوە پاڵپشتی و پشتیوانییان لێ کراوە. ئاوهاش لە سەردەمی ئینگلیزەکان و، دواتر لە سەردەمی حوکمی دەوڵەتی عێراقیشدا. ئەو پاڵپشتی و پشتیوانییەیان هەر ماوەتەوەو کەمی نەکردووە. بەڵکو ئەم دوو دەسەڵاتەی دواییش، بەردەوام لە هەوڵی رازیکردنی ئەو هۆزانەو کێشکردنیاندا بوون بەلای خۆیاندا. هەر لە سەرەتای هاتنیاندا بۆ ناوچەکە، ئینگلیزەکان کەوتوونەتە هەوڵی دووبارە رێکخستنەوەی هۆزەکان، بە تایبەت ئەو هۆزانەی کە لە رووی رێکخستنەوە جۆرێك لە پەرت و بڵاوییان پێوە دیار بووە. بەڵکو

ئینگلیزەکان ڕۆڵی گەورەشیان هەبووە لە هاندانی هۆزەکان بۆ نیشتەجێبوون و، ڕێگرییان کردووە لە کۆچ و ڕەوی ئەو هۆزانە[53]. لەم پێناوەشدا ئەو دابەشکردنە کارگێڕییانەی کە کردوویانە لەسەر بنەمای هۆزایەتی دایان ڕشتووە و زۆربەی زۆریان مۆرکی هۆزایەتییان پێوە بووە. لەوانە هەر لە ناوچەی چەمچەماڵدا، ناحیەیەکیان دروست کردووە بەناوی (ناحیەی زاب)ەوە لە ساڵی١٩٢٣، بۆ ئەو بەشەی هۆزی شیخ بزێنی کە کەوتبووە بەری چەپی زێی بچووکەوە. هەروەها دروستکردنی ناحیەیەکی تر بەناوی (جەباری)یەوە لە ساڵی١٩١٩، بۆ گوندەکانی هۆزی جەباری دا بووە[54].

هەوڵەکانی ئینگلیز بۆ نیشتەجێکردنی هۆزەکان، باری سەر شانی مسکێنە ناخێڵەکییەکانی هێندەی تر گران و ناهەموار کردووە. چونکە پاش ناچاربوونی هۆزە ڕەوەندەکان بەوەی کە واز لە ژیانی کۆچەری بهێنن و بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانیان مل وەبەر جووتیاری بنێن. لە جاران زیاترو خراپتر کەوتوونەتە وێزەی مسکێنە ناخێڵەکییەکان و چەوساندنەوەیان. دیارە بەهۆی پلەوپایە کۆمەڵایەتییە باڵاترەکەیانەوە، دەرفەتی پەیوەندییەکی چاکتریان لەگەڵ فەرمانبەرانی دەوڵەتدا بۆ ڕەخساوەو، توانیویانە ئاسانتر کاریان تێ بکەن و لەسەر حسابی مسکێنە ناخێڵەکییەکان دەسکەوتی زیاتر بۆ خۆیان بچننەوە و دەست بەسەر گوندەکانیاندا بگرن. ئەنجامدانی کاری داگیرکردنی گوندەکان، ئەرکی سەرشانی ئاغاکان بووەو، دەستوپێوەندیان بۆ ئەو جۆرە شەڕە لە هۆزەکانی خۆیان کۆکردۆتەوە[55]. لەکاتی داگیرکردنی گوندێکیشدا چەند ئاغایەك هاوکاری یەکیان کردووە. گەر گوندە پەلامارِدراوەکە یەکسەر خۆی بەدەستەوە دابێت، ئەوا تەنها بەوە وازیان هێناوە کە باجیان بەسەر خەڵکەکەیدا سەپاندووە. بەڵام گەر بەرگرییان کردبێت، ئەوا پاش تاڵانکردنی گوندەکەیان، (ئاغا )یەکیشیان لەسەر داناون. لەم شەڕانەشدا زۆرتر هۆزەکان سەرکەوتنیان بەنسیب بووە، چونکە وەرزێری پەلاماردراو، بە باشی بۆ بەربەرەکانی ئامادە نەبووە[56]. هەرچەندە زۆربەی گەڕیدە ئەورووپییەکان، لەکاتی دیراسەکردنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ژیانی هۆزایەتی ناوچەکەدا هۆزی هەمەوەندیان وەك نموونە وەرگرتووەو، زۆربەی

بیرو بۆچوونەکانی خۆیان بەوەرگرتنی نموونە لەسەر ئەو هۆزە پاڵپشتی کردووە. بەڵام هەمان شت بەسەر زۆربەی هۆزەکانی تری ناوچەکەدا جێبەجێ دەبێت. ڕاستە هەمەوەندەکان بەناوی باجەوە (١/٥ بۆ١/١٠) بەرهەمی دانەوێڵەو (١/٣) بەرهەمی بەراویان لە وەرزێرەکان سەندووە. بەڵام کەسێکی وەکو (شێخ عەبدوڵای عەسکەر) لە مسکێنەکانی خۆی لە ناوچەی قەڵاسێوکە هەتاکو (مەڕانە )شی سەندووە[٥٧]. هەروەها شێخ قادری حەفید، کە کۆمەڵێ گوندی ناوچەی چەمچەماڵی بە دەستەوە بووە، لەگەڵ ئەوەی بە هەمان ڕێژەی هەمەوەندەکان باجی سەندووە، ئەو کە خۆی لە سلێمانی ژیاوە، ئەوەشی بە سەردا سەپاندوون کە ساڵانە بە وڵاخ و باری خۆیان داهاتی ئەو باجانەی بۆ بەرنە سلێمانی[٥٨].

ماوەتەوە بڵێین، مسکێنەکان لە بەرامبەر ئەو بڕە باجەی کە بە هۆزەکانیان داوە، لە هێرشی هۆزەکانی تر پارێزراون. هەروەها لە گوندەکانی سەر بە هۆزی هەمەوەنددا بۆ نموونە، سوودی ئابووریشیان لە تاڵانییەکانی ئەو هۆزە وەرگرتووەو، پاش ئەوەی لە بازاڕەکاندا بۆیان ساغ کردوونەتەوە ، قازانجی مادییان لێوە دەست کەوتووە. چونکە هەمەوەندەکان خۆیان لەترسی ناسینەوەیان نەیان وێراوە لە بازاڕەکاندا خۆیان دەربخەن[٥٩].

## ئەنجام

پێکهاتەی خێڵەکی لە ناوچەی چەمچەماڵ لە پێکهاتەی ناخێڵەکی بەهێزتر بووە. پەیوەندی نێوان خەڵکی خێڵەکی و ناخێڵەکی گرژی و ناکۆکی و هەندێك جار شەڕی بەخۆوە بینیوە. تەنانەت جۆری پیشە و کاری خەڵکی ناوچەکەشی دیاری کردووە کە پتر بریتی بوو لە کشتوکاڵکردن و شوانکارەیی و هەندێك پیشەی دەستی. هەروەها کاریگەری هەبووە لەسەر بارودۆخی کۆمەڵایەتی و رامیاری و رۆشنبیری لە ناوچەکەدا.

یەکێك لە خێڵە بەناوبانگەکانی چەمچەماڵ هەمەوەند بووە کە ناوبانگی نەك هەر لە ناوچەکە بەڵکو لە هەموو کوردستانی عێراقدا بڵاو بووە ئەمەش بەهۆی توانای شەڕکردنیان کە تەنانەت ژنەکانیشیان بە ئازایەتی ناسرابوون. هەمەوەند نموونەیەکە بۆ ئەوەی کە هەموو جارێك ژمارەی خێڵ توانای خێڵەکە لە رووی جەنگەوە دیاری ناکات. لەهەمان کاتیشدا نموونەیەکە بۆ ئەوەی کە هەندێك خێڵی کوردی لەیەك بەشی کوردستان بوونیان نەبووە بەڵکو لە پارچەکانی تری کوردستانیش درێژبوونەوەیان هەبووە.

ئەگەر چی خێڵ لە کوردستان لایەنی نەرێنی هەبووە بەڵام واقیعێکی مێژووی کوردە بەبێ تێگەیشتن لێی ناتوانین لە مێژووی کورد بگەین. ئەگەر ناکۆکی لە نێوان خێڵەکانی کوردستان لەگەڵ یەکتری و ناکۆکی لە نێوان خێڵ و خەڵکی ناخێڵەکی هەبووە لە هەمان کاتیشدا هەندێك جار ناکۆکی لە نێوان خودی خێڵێك لەسەر سەرکردایەتیکردنی خێڵەکە دروست بووە، هەروەها سیاسەتی حکومەتەکانی عێراقی لە سەردەمی پاشایەتی بە گشتی و لە ماوەی توێژینەوەکە کاریگەری نەبووە لەسەر لاوازکردنی خێڵ بەڵکو بە پێچەوانەوە لە هەموو عێراقدا پایەی خێڵ و سەرۆك خێڵەکان بەهێز بووە، تەنانەت ئینگلیزەکانیش لە لایەن خۆیانەوە هەوڵیان نەدا پایەی خێڵ لە عێراقدا لاواز بکەن بەڵکو وەکو دیفاکتۆیەك (أمر واقع) مامەڵەیان لەگەڵ دا کردن. ئەمەش هەمووی کاردانەوەی هەبوو بەسەر پێکهاتەی خێڵەکی و ناخێڵەکی لە ناوچەی چەمچەماڵدا.

# پەراوێزەکان:

(١) ا. م. مینتیـشاشـڤیلی:العـراق في سـنوات الانتـداب البريطـاني، ت: (الـدكتور هاشـم صـالح التكريتي) مطبعة جامعة بغداد، ١٩٨٧،ص١١٧.

(٢) باسـیلی نیکیـتین : الكـرد دراسـة سوسـيولوجية وتاريخيـة، ت: (د.نـوري طالبـاني)، ط٣، سليمانية، ٢٠٠٧، دار اراس للطباعة والنشر، ص٢٧٣.

(٣) شاكر خصباك : الأكراد دراسة جغرافية اثنوغرافية، بغداد، ١٩٧٢، ص٣٤٦.

(٤) دائرة الحاكم المدني : ملاحظـات عـن عـشائر كردسـتان، ت:(فـؤاد حمـة خورشـيد)، بغـداد، ١٩٧٩، ص١٢١–١٢٢. چاوپێکەوتن لەگەڵ (کوێخا عادل یادگار) کەسایەتی و ریـش سـپی ناوچەی شوان، لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٥، چەمچەماڵ لە بەرواری ٢٠/٤/٢٠٠٩ .

(٥) کەیوان ئازاد انور: هۆزە کوردەکانی کوردستانی عێراق ١٩١٨ – ١٩٢٥، گۆڤاری (پەیڤین)، ژ (٩) ، تەمموز / ٢٠٠٠، ل١٨٩.

(٦) د.رفيق شوانی : شوان، گۆڤاری (هاواری کەرکوك)، ژ (٤) ، ١٩٩٩، ل٣٥.

(٧) کەیوان ئازاد انور : هۆزە کوردەکانی ....، ل١٨١ .

(٨) دیاردەی گێڕانەوەی رەچەڵەك بۆ سەر نەتـەوەی عـەرەب ، بەتایبـەت بـۆ سـەر بنەماڵـەی پێغەمبـەر (د. خ)، دیاردەیەکـە لای زۆربـەی هـۆزە کوردییـەکان هەسـتی پێـدەکرێت، کـە لەڕاستیدا زۆر لەم گێڕانەوانە دوورن لە ڕاستییەوەو، هۆزەکان لەپێناو بەخشینی پـیرۆزی و شەرعیەتدان بەدەسەلآتیان ئەو جۆرە پرۆپاگەندەیان داوەتە پاڵ خۆیان .

(٩) مەلا عبدالكريمی مودەڕیس : یادی مەردان، ب١، بەغداد – ١٩٧٩، ل٧ .

(١٠) پارێزەر عباس العزاوي بـە گواسـتنەوە لـە (سـیاحەتنامەی حـدود) ەوە ئـەو سـاڵەی کـە هەمەوەندەکان تیایدا هاتوونەتە سنووری دەوڵەتی عوسمانییەوە، بـەنێوان سـاڵانی (١١٨٠ – ١١٩٠ ك) داناوە واتا نێـوان سـاڵانی (١٧٦٢ – ١٧٧٢) . ( عـشائر العـراق الكرديـة ، ج٢، مطبعة المعارف، بغـداد – ١٩٤٧، ص٤٨.) هەرچـی (حەیـدەر عـەزیز خەسـرەو )یـشە ئـەو ساڵەی بە ١١٦٢ ك (١٧٤٤) دیاری کردووە. (پوختەیـەك لـە مێـژووی هەمەوەنـد، ١٩٢٨ – (دەستنووس)، ل٣) .

(١١) مارتن فان برونەسن : ئاغا و شێخ و دەوڵەت، و : (کوردۆ)، ب١، چ٣، سلیمانی، ئۆفیـسی ڕوون، ١٩٩٩، ل١٢٥.

(١٢) سیسل جـۆن ئەدمۆنـدز : كـرد– تـرك– عـرب، ت: (جـرجيس فـتح الله)، اربيـل، دار اراس للطباعة والنشر، ١٩٩٩،ص٣٣٥ .

(١٣) م. ن، ص٣٣٥ .

(١٤) حاجی شێخ نوری بابا علی : سەرچاوەی بێگەرد بۆ ناسینی پیاوی مەرد، سلێمانی – ٢٠٠١، ل١١٣ .

(١٥) المحامي عباس العزاوي : عشائر العراق الكردية، ج٢، بغداد، مطبعة المعارف، ١٩٤٧، ص١٦٤.

(١٦) المحامي عباس العزاوي : عشائر ...، ج٢، ن. م، ص٤٩ .

(١٧) محمدامین زەکی بەگ : تاریخی سلێمانی وەلاتی، ئا: (رەفیق صالح)، ب٣، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ١٣٨.

(١٨) کوڕی فەقێ قادری شاعیرە، لەساڵی (١٨٨٢ز) لە چەمچەماڵ لە دایك بووە. لە سەردەمی منداڵیدا خوێندوویەتی و چەند پلەیەکی خوێندنی بڕیوە. کەسایەتییەکی خاوەن دەسەڵات بووە لە ناو هۆزەکەیدا . لە سەردەمی عوسمانییەکاندا سەردەمانێك وەکیلی قایمقامی چەمچەماڵ بووە. کە ئینگلیزەکانیش هاتوون پایەی قایمقامێتی شاریان پێ سپاردووە، بەڵام دواتر بە تۆمەتی پشتیوانی لە شێخ، لە کاریان خستووە. (عبدالمجید فهمي حسن : م. س، ج٢، ص٣٥٣)

(١٩) دائرة الحاكم المدني : م. س، ص١٢١–١٢٢. کەیوان ئازاد انور: هۆزە کوردەکانی ... ، ل١٨٢ .

(٢٠) مەحموود عەزیز حەسەن : مێژووی هۆزی جاف و ژیانی تیرەکانی، چ١، سلێمانی – ٢٠٠٤، ل١٦٠ .

(٢١) سەید محەمەد سەید عەبدولسەمەد سەید قادر، ساڵی ١٨٧٨ز لە گوندی (مەحمود پەریزاد )ی جەباری لە دایك بووە و ساڵی ١٩٣٦ز کۆچی دوایی کردووە. لە رووی کۆمەڵایەتییەوە خۆشەویستی هۆزەکەی و زۆربەی زۆری هۆزەکانی ناوچەکەش بووە. لە رووی رامیاریشەوە پیاوێکی کورد پەروەر بووەو، بەشداری سەرجەم راپەڕینەکانی شێخ مەحموودی کردووە، لە سیبەکانیشدا رۆڵی کارای لە خەباتی سیاسیدا گێڕاوە. (چیمەن تەیب عەلی : رۆڵی هۆزی جەباری لە شۆڕشەکانی شێخ مەحمووددا، گۆڤاری (سەنگاو)، ژ (٩)، بەهاری ٢٠٠٨ز، ل١٢٥، ل١٢٦ ).

(٢٢) عبدالله کریم محمود : رۆڵی سەید محەمەدی جەباری لە شۆڕشی شێخ مەحموددا، بەشی یەکەم، کوردستانی نوێ (رۆژنامە)، ژمارە (١٤٥٨)، ساڵی پێنجەم، یەکشەممە ١٩٩٧/٩/٤: ل١٠.

(٢٣) ئەمین رەشید قادر حەیدەر ئاغا (١٨٩٨ – ١٩٦٦)، سەرۆکی تیرەی رەمەوەندی هۆزی هەمەوەند بووە، لە ساڵی ١٩٢٣ بۆ ماوەیەك قائمقامی چەمچەماڵ بووە، لە ساڵی ١٩٣٩

وەك نوێنەری خەڵكی ناوچەی چەمچەماڵ بووە بە ئەندامی ئەنجومـەنی نوێنـەرانی عێـراق. اعلام كرد العراق، مطبعة شڤان، اربيل – ٢٠٠٦، ص١٣١. مـير بـصري : اعـلام الكـرد، ط١، لندن – ١٩٩١ ز، ص٢١١، ص٢١٢ .

(٢٤) سیسل جۆن ئەدمۆندز : س. پ، ل٣٢٥ .

(٢٥) جمال بابان و ئەوانی تر: سلێمانی شارە گەشاوەكەم، ب٢، بەغداد، ١٩٩٨، ل١٧٣.

(٢٦) سیسل جۆن ئەدمۆندز : س. پ، ل٣٨٧ .

(٢٧) رەچەڵەكیان دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی زاخۆ. پێدەچێت لە سەدەی هەژدەهەمدا هاتبێتنـە ئەم مەڵبەندە. ئەم هۆزە بەهەردوو بەری زێی بچووكدا دابەش بوون. ئەوانەی بەری چەپی زێ نەوەی (مەلا عباس )ن. ئەم بەشەی هۆزەكە دەكەونە سنووری چەمچەماڵەوەو ژمارەی گوندەكانیان ٣٠ گوند بووە .( دائرة الحاكم المدني : م. س، ص١١١–١١٣ .)

(٢٨) دائرة الحاكم المدني : ن. م، ص١١٤، ص١١٥، ص١١٦ .

(٢٩) سیسل جۆن ئەدمۆندز: م. س، ص٦٧.

(٣٠) دائرة الحاكم المدني : م. س، ص١١٩.

(٣١) سیسل جۆن ئەدمۆندز : م. س، ص٣٣٥ .

(٣٢) چاوپێكەوتن لەگەڵ ( هابیل شەوكەت ئەجەل عەزیز شەریف جلیـل) كەسـایەتی ناوچـەی شوان ،٢٠٠٩/٤/٢٠ .

(٣٣) دائرة الحاكم المدني : م. س، ص١٢٠.

(٣٤) ا. م. مینتیشاشڤیلی : م. س، ص١٣٢ .

(٣٥) كەیوان ئازاد انور: هۆزە كوردەكانی ...، ل١٨٩، ل١٨١.

(٣٦) ا. م. مینتیشاشڤیلی : س. پ، ل١١٦ .

(٣٧) م. ر. هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەكەی خوارووی كوردسـتان، ب٢، لنـدن، ١٩٩١، ل٥٢.

(٣٨) دائرة الحاكم المدني : م. س، ص٦٦،ص٧٥، ص٨٢، ص١١٣ .

(٣٩) ئـی. بـی. سـۆن (مێجـەر سـۆن) : سـلێمانی ناوچـەیەك لـە كوردسـتان، و: (مینـە)، چ١، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٦٨ .

(٤٠) كەریم بەگی فەتاح بەگی بەگزادەی هەمەوەند، لەساڵی ١٨٧٠ز لە دایك بـووە. هـەر لـەو كاتەوەی كە شێخ مەحموود بووە بە حوكمداری كوردستان، بە دڵسۆزییەوە داویەتیە پـاڵی و تا كوژرانی لە ساڵی ١٩٢٦ز لێـی جیانەبووەتـەوە. لـە حـوزەیرانی ١٩٢٢ز دوو ئەفـسەری ئینگلیـز (بۆنـد و ماكانـت )ی كوشـتووە. بـەم كـارەی گـورزێكی كاریگـەری ئاراسـتەی ئینگلیزەكان كردووە. بووە بە دوژمنی ژمارە یەكیان، وای كـردووە كـە (١٠ هـەزار) ڕوپیـە

تەرخان بکەن بۆ لە ناوبردنی. (نەوشیروان مستەفا ئەمین : ژیان بە تەمەنترین رۆژنامەی کوردی ١٩٢٦ – ١٩٣٨)، چ١، سلێمانی – ٢٠٠٢، ل٥٢.

(٤١) عەزیز شەریف جەلیل، یەکێك بووە لە کەسایەتییە کۆمەڵایەتی و سەرۆکە دیارەکانی هۆزی شوان لە تیرەی شوانی خاسەی یەختەکان. بە ئازایەتی و دژایەتیکردنی ئینگلیز بەناوبانگ بووە، لە سەرەتای هەڵگیرسانی راپەرینی ساڵی ١٩١٩ز شێخ مەحموودەوە، بە ١٥٠ سوارەوە پەیوەندی پێوە کردووە (د.رەفیق شوانی : شوان، س. پ، ل٤٠ ).

(٤٢) کەیوان ئازاد انور: س. پ. ل١٨٠، ل١٨١.

(٤٣) مارتن فان برونەسن : س. پ، ل١٤٤ .

(٤٤) هـ. س، ل١٤٧ .

(٤٥) د. بەدرخان سندی : س. پ، ل٥٦ .

(٤٦) وشەی (مسکێن )یش بەرامبەر بە وشەی (کرمانج )ە لەناوچەکانی هەولێر و موسل و، بەرامبەر بە وشەی (رەعیەت )ە لە کوردستانی باکور. (شاکر خصباك : الأکراد دراسة جغرافیة اثنوغرافیة، بغداد، ١٩٧٢، ص٢٠٠).

(٤٧) مارتن فان برونەسن : س. پ، ل١٤٧ .

(٤٨) کلۆدیس جێمس ریچ : گەشتی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، (محەمەد حەمە باقی) چ١، تەورێز، ١٩٩٢، ل١٦٧ .

(٤٩) شاکر خصباك : م. س، ص٢٠٠.

(٥٠) هۆزی پیریادی یا (ساداتی پیریادی)، بنچینەیان دەچێتەوە سەر یەکێك لە پیاوە دەوڵەمەندو ناسراوەکانی تورکیا کە ئەویش کەسێك بووە بەناوی (ئیبراهیم بەگ تۆقاتلی) خەڵکی شاری تۆقاتلی تورکیا، ئەم پیاوە لە دەوروبەری چوار سەد ساڵ پێش ئێستاوە هاتۆتە عێراق و لە ناوچەی چەمچەماڵ نیشتەجێ بووە (عبدالمجید فهمي حسن : دلیل مشاهیر الالویة العراقیة، ج١ و ٢، مطبعة السلام، بغداد، ١٩٤٧، ص٣٤٢ ). سەرەتا لە گوندی تەکیەی کاکەمەندو، دواتر گوندی پیریادی نزیك چەمچەماڵیان دامەزراندووە. کە عوسمانییەکان هاتوونەتە ناوچەکە، (٤٥ گوند) یان کردووە بە وەقفی ساداتی پیریادی کە ناوەندی چەمچەماڵ یەکێکیان بووە. (د.ذنون محمد بیریادی : السیرة الحیاتیة والعلمیة، ط١، کرکوك – ٢٠٠٦، ص٤١ ).

(٥١) د. ذنون محمد بیریادی : م. س، ص٤١–٤٢.

(٥٢) محمد امین زەکی بەگ : س.پ، ل١٣٧ .

(٥٣) کەیوان ئازاد انور: س.پ.، ل١٨٢ .

(٥٤) سیسل جۆن ئەدمۆندز : م. س، ص٦٦–٦٧ .

(٥٥) مارتن فان برونەسن : س. پ ، لا١٢٥ .

(٥٦) ا. م. مینتیشاشڤیلی : م. س، ص١١٦-١١٧.

(٥٧) چاوپێکەوتن لەگەڵ پارێزەر (مستەفا عەسکەری) ، لەدایکبووی ١٩٣٢، لە بەرواری ٢٠٠٩/٣/٢٤ .

(٥٨) چاوپێکەوتن لەگەڵ (علی کریم) خەڵکی گوندی خوێڵێن، لەدایکبووی ١٩٣٠ز، لە بەرواری ٢٠٠٨/٩/١٥ .

(٥٩) ا. م. مینتیشاشڤیلی : م. س، ص١١٨ .

## لیستی سەرچاوەکان:

**دەستنووسەکان:**

١. حەیدەر عەزیز خەسرەو: پوختەیەك لە مێژووی هەمەوەند، ١٩٢٨.

**سەرچاوە کوردییەکان:**

١. جمال بابان و ئەوانی تر: سلێمانی شارە گەشاوەکەم، ب٢، بەغداد، ١٩٩٨.

٢. مەلا عبدالکریمی مودەڕیس : یادی مەردان، ب١، بەغداد – ١٩٧٩.

٣. کلۆدیس جێمس ریچ : گەشتی ریچ بۆ کوردستان ١٨٢٠، (محەمەد حەمە باقی) چ١، تەورێز، ١٩٩٢.

٤. م. ر. هاوار : شێخ مەحمودی قارەمان و دەوڵەتەکەی خوارووی کوردستان، ب٢، لندن، ١٩٩١.

٥. مارتن فان برونەسن : ئاغا و شێخ و دەوڵەت، و : (کوردۆ)، ب١، چ٣، سلێمانی، ئۆفیسی ڕوون، ١٩٩٩.

٦. مەحمود عەزیز حەسەن : مێژووی هۆزی جاف و ژیانی تیرەکانی، چ١، سلێمانی، ٢٠٠٤.

٧. محمدامین زەکی بەگ : تاریخی سلێمانی وەلاتی، ئا: (ڕەفیق صالح)، ب٣، چ٢، سلێمانی، ٢٠٠٥.

٨. نەوشیروان مستەفا ئەمین : ژیان بە تەمەنترین رۆژنامەی کوردی ١٩٢٦ – ١٩٣٨)، چ١، سلێمانی – ٢٠٠٢.

٩. حاجی شێخ نوری بابا علی : سەرچاوەی بێگەرد بۆ ناسینی پیاوی مەرد، سلێمانی – ٢٠٠١.

١٠. ئی. بی. سۆن (مێجەر سۆن) : سلێمانی ناوچەیەك لە کوردستان، و: (مینە)، چ١، هەولێر، ٢٠٠٨.

**المصادر العربیة:**

١. أ.م. مینتیشاشڤیلی:العراق في سنوات الانتداب البریطاني، ت: (الدکتور هاشم صالح التکریتي) مطبعة جامعة بغداد، ١٩٨٧.

٢. باسـيلى نيكيـتين : الكـرد دراسـة سوسـيولوجية وتاريخيـة، ت: (د. نـوري طالباني)، ط٣، سليمانية، دار آراس للطباعة والنشر، ٢٠٠٧.
٣. جمال بابان: اعلام كرد العراق، مطبعة شڤان، اربيل، ٢٠٠٦.
٤. دائرة الحاكم المدني: ملاحظات عن عشائر كردستان، ت:(فؤاد حمة خورشيد)، بغداد، ١٩٧٩.
٥. د. ذنون محمد بيريادى : السيرة الحياتية والعلمية، ط١، كركوك — ٢٠٠٦.
٦. سيسل جۆن ئەدمۆندز : كرد– ترك– عرب، ت: (جرجيس فتح الله)، اربيـل، دار آراس للطباعة والنشر، ١٩٩٩.
٧. شاكر خصباك : الأكراد دراسة جغرافية اثنوغرافية، بغداد، ١٩٧٢.
٨. المحامي عباس العزاوي : عشائر العراق الكرديـة، ج٢، بغـداد، مطبعـة المعـارف، ١٩٤٧.
٩. عبدالمجيد فهمي حسن : دليل مشاهير الالوية العراقية، ج١ و ٢، مطبعة الـسلام، بغداد، ١٩٤٧.
١٠. مير بصري : اعلام الكرد، ط١، لندن، ١٩٩١.


**گۆڤارەکان:**


١. د. رەفیق شوانی : شوان، گۆڤاری (هاواری کەرکوك)، ژ (٤) ، ١٩٩٩.
٢. چیمەن تەیب عەلی : رۆڵی هۆزی جەباری لـە شۆڕشـەکانی شـێخ مـەحموودا، گۆڤاری (سەنگاو)، ژ (٩)، بەهاری ٢٠٠٨.
٣. کـەیوان ئـازاد انـور: هـۆزە کوردەکـانی کوردسـتانی عێـراق ١٩١٨ — ١٩٢٥، گۆڤاری (پەیڤین)، ژ (٩)، تەمموز / ٢٠٠٠.


**رۆژنامەکان:**


١. عبداللـە کـریم محمـود : رۆڵـی سـەید محەمـەدی جـەباری لـە شۆڕشـی شـێخ مەحموددا، بەشی یەکەم، کوردستانی نوێ (ڕۆژنامـە)، ژمـارە (١٤٥٨)، سـاڵی پێنجەم، یەکشەممە ١٩٩٧/٩/٤.

**چاوپێکەوتنەکان:**

١. چاوپێکەوتن لەگەڵ (کوێخا عادل یادگار) کەسایەتی و ریش سپی ناوچەی شوان، لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٥، چەمچەماڵ لە بەرواری ٢٠٠٩/٤/٢٠ .

٢. چاوپێکەوتن لەگەڵ پارێزەر (مستەفا عەسکەری) ، لەدایکبووی ١٩٣٢، لە بەرواری ٢٠٠٩/٣/٢٤ .

٣. چاوپێکەوتن لەگەڵ (علی کریم) خەڵکی گوندی خوێڵێن، لەدایکبووی ١٩٣٠ز، لە بەرواری ٢٠٠٨/٩/١٥.

٤. چاوپێکەوتن لەگەڵ ( هابیل شەوکەت ئەجەل عەزیز شەریف جلیل) کەسایەتی ناوچەی شوان، ٢٠٠٩/٤/٢٠ .

## ملخص البحث باللغة العربية

التكوين العشائري وغير العشائري لمنطقة چمچمال في الفترة (١٩١٨-١٩٣٩م) عنوان هذا البحث الذي يتناول هذا الجانب من تاريخ منطقة چمچمال في مدة معينة وذلك لأن الظاهرة العشائرية جانب بارز في جميع فترات التاريخ الكوردي وتعتبر منطقة چمچمال خير مثال في كوردستان العراق لتجسيد دور العشيرة الكوردية وكذلك وجود سكان غير عشائريين فيها وينطبق ذلك على المناطق الاخرى ايضاً من كوردستان بصورة عامة.

ينقسم عشائر چمچمال الى نوعين الأول لهم أصل مشترك اي يرتبطون برابطة الدم ومنهم (هەمەوەند، شێخ بزێنی، مكايلی، جباری) اما النوع الثاني فتجمعهم رابطة المنطقة المشتركة ومن تلك العشائر (شوان، قەلاسێوكە...الخ).

اما السكان غير العشائريين فكانوا يسمون بـ(مسكێن) وكانوا تحت سيطرة العشائر وكان هناك نوع من الصراع بين الطرفين والغلبة كانت للطرف الثاني حيث كان العشائريون يعتبرون انفسهم في منزلة ارفع من (مسكين) وذلك لانهم محاربون في حين ان الطرف الثاني فلاحون مرتبطون بالارض اكثر وكانوا يتجنبون التصادم مع العشائر.

ويعتبر (الهموند) من العشائر المشهورة في التاريخ الكوردي والذين ارتبطت اسمهم بمنطقة چمچمال ورغم صغر حجم العشيرة من ناحية عدد افرادها الا ان لهم سيط كبير بسبب قوتهم وخبرتهم في القتال ضد الدولة العثمانية وبعد ذلك ضد الانكليز.

وتلك التركيبة لسكان منطقة چمچمال أدت الى ان تكون المهنة الرئيسة عبارة عن الرعي والزراعة وبعض المهن اليدوية.

ورغم وجود انتقادات كثيرة موجهة الى العشيرة الكوردية من حيث وجود صراع بين العشائر الكوردية وبين العشيرة والسكان المستقرين وكذلك وجود تناقض نوعاً ما بين الولاء العشائري والولاء القومي الكوردي الا انه لايمكن دراسة التاريخ الكوردي دون تسليط الضوء على دور العشيرة فيه.

## Abstract

### The Tribal & Non-Tribal Composition of Chamchamal area from (1918-1939)

As the title of this research suggests, this paper deals with a specific aspect in a specified time-frame in Chamchamal area. This is because the tribal phenomenon is remarkably evident in all the periods of Kurdish history. Chamchamal as an area may be the best example for such a phenomenon in Iraqi Kurdistan in that it demonstrates the role of the Kurdish clan, as well as having non-tribal population there. This applies to other areas as well in Kurdistan, generally.

The clans of Chamchamal are of two types: some of them have common roots, i.e, they have blood-ties. For instance (Hamawand, Shekh Bizeni, Mikaili, Jabbary) but the other are unified by the ties of a common, shared area, such clans include: Shwan and Qalasewka.

There are also non-tribal inhabitants called "Misken". They used to be under the controlling power of the clans. There also used to exist a sort of conflict between these two sides.

The clans had the upper hand, because the tribesmen considered themselves better and worthier than the "Miskens". This is because the tribesmen are warriors, whereas the Miskens are farmers tied to the land deeplier than the tribesmen. Therefore, the Miskens avoided confrontations with the tribes.

The Hamawand are a well-known clan in the history of the Kurds. Their name was always linked with Chamchamal area. Despite the relatively moderate size of this clan in terms of numbers and members, it has great fame because of its power

and warfare experience, gained by fighting against the Ottoman Empire and, later, against the British Empire.

The demographic composition of the Chamchamal area inhabitants made it possible for some professions to be typical there, such as: sheep-herding, goat-herding, agriculture, and a number of simple, small, handcrafts.

There is a good deal of criticism against the Kurdish clans in that: the clans are in conflict against each other, and there is also another conflict between the clans and the settled population. Another criticism is that there is a sort of contradiction between loyalty to the clan and loyalty to the Kurdish nation. Never the less, and despite these levels of criticism against the clans, the Kurdish history cannot be studied without shedding light on the role of the clans in it.

# تەکنیکی دووبارەکاری
# لە هۆنراوەکانی سەباح ڕەنجدەردا
**( لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری ڕەخنەییە )**

**پ.ی.د. عادل گەرمیانی**
**کۆلێژی زمان / بەشی کوردی**

## پێشەکی

مرۆڤی کۆن و هاوچەرخ، هەندێ جار دووبارەکاری لە ئاخاوتنی ڕۆژانەی خۆیدا بۆ جەختکردن، یان وەبیرهێنانەوە بەکاردەهێنێت، دووبارەکاریش بریتییە لە دووبارەکردنەوەی دەنگێك، یان وشەیەك، یان دەستەواژەیەك، یان ڕستەیەك بۆ مەبەستێکی تایبەت، هەروەها لەوانەیە دووبارەکراوەکە جۆرێکی وێنەی شیعری بێت. هەندێ جار دیاردەی دووبارەکاریی شیعری لە هەندێ هۆنراوە دەکەوێتە بەرچاومان، لەبەر هەندێ مەبەست و هۆکار هۆنیار بەکاری دەهێنی. دووبارەکاری تەنیا لە بواری شیعردا بەرچاو ناکەوێت، بەڵکو لە چەندین بواری دیکەیش بەکاردەهێنرێت، هەرچەندە دووبارەکاری لە شیعردا چێژێکی هونەریی خۆی هەیە، چونکە بەهێزیی دارشتنە شیعرییەکەیە لەڕووی کێش و سەروا دەخاتەڕوو، هەروەها ڕۆڵی خۆی هەیە لە بونیاتی ڕیتمی مۆسیقای شیعریی هۆنراوەکەدا.

لە کاروانی شیعری هاوچەرخی کوردیدا هەندێ دەنگی شیعری هەیە ناوبانگی تایبەتیی خۆیان هەیە، وەك دیاردەیەك لە ئاسمانی شیعری کوردیی هاوچەرخدا دەرکەوتوون، (سەباح ڕەنجدەر)یش یەکێکە لەو دەنگە شیعرییانەی بەکۆششی تایبەتی خۆی و لە ئەنجامی ئەزموونی شیعری خۆیدا توانیویەتی ببێتە مایەی سەرنجڕاکێشانی خوێنەرو ڕەخنەگرانی شیعری هاوچەرخی کوردی، هەر ئەم لایەنە هۆکارێکی گرنگ بوو بەلامانەوە لە هەڵبژاردنی ئەم هۆنیارە بۆ ئەم لێکۆڵینەوەیە. بەڕاستی (سەباح ڕەنجدەر) لە ساڵانی ئەزموونی شیعری خۆیدا توانیویەتی

کەسـایەتییەکی شـیعری تایبـەت بـە خـۆی دروسـت بکـات، بـەلاَم لـە سـالآنی هەشتاکاندا وەك ئەندامێك لە بزاڤی شیعریی گرووپـی پێـشڕەو لـە شـاری هـەولێر ناسرا(*)، لەدوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ بەهێمنی و لەسەرخۆ هەوڵی بێوچـانی داوە بـۆ پێکـەوەنانی شـێوازی شـیعری تایبـەت بـەخۆی، لێـرەدا ئێمـەش وەك نـەجات حەمید ئەحمەد دەڵێین " شـتێکی سـەیر نییـە ئەگـەر بڵـێین شـاعیر هـەوڵی داوە شێوازێکی تایبەت بەخۆی، جودا لە هەندێك شێوازی تری دەربڕینی شـیعری بنیـاد بنـێ. شـێوازێك، کـە لـە هەنـدێك ڕەگـەزی جـوداو تایبەتییـەوە لەزۆربـەی کاریگەرییەکانی شیعری قۆناغە جوداکانی شیعری کوردی دەردەچێ"[1] .

سەباح سابیر حەسەن ڕەنجدەر ڕۆژی ١٨/١١/١٩٦٥ لە گوندی دەربەندی گـۆمی سەر بە شارۆچکەی دووبز – کەرکووك لـەدایك بـووە، یەکـەم شـیعری لـە چـواردە ساڵیدا، واتە لە ساڵی ١٩٧٩ لە ڕۆژنامەی (هاوکاری) بلاَوکردووەتەوە، لـە زۆربـەی زۆری ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکانـدا شـیعر و سـەرنج و بۆچـوونی خـۆی لـەبارەی شیعر بلاَوکردووەتەوە، هەندێك لە شیعرەکانی بۆ چەند زمانێك وەرگێڕدراوە. ئـەم هۆنیارە خاوەن ئەزموونێکی شیعریی باشە لە ماوەی ئەو ئەزموونەدا حەوت کـۆ-شیعری بلاَو کردووەتەوە کە ئەمانەن :

١- (زێـوان/١٩٨٨) ٢- (ڕووەکـەکانی خوداوەنـد/١٩٩٩) ٣- (خـەون وا خـۆی گێڕایـەوە/٢٠٠٤) ٤- (شـەڕی چـل سـاڵە/٢٠٠٥) ٥-(مردوویـەك ئاگـای لـە هەمووانە/٢٠٠٨) ٦-(سەدو یەك شەوە/٢٠٠٨) ٧-(ساڵی سفر/٢٠١٠).

شـێوازی شـیعریی ئـەم هۆنیـارە لـەماوەی سـالآنی ڕابـردوودا بووەتـە مایـەی سەرنجڕاکێـشانی زۆرێـك لـە ڕەخنـەگرو وەرگێـڕو لێکۆڵـەران(*)، کـەوا لـەبارەی شیعرەکانی بابەتیان نووسیوە، بۆیە ئێمەیش بەپێویستمان زانی لە گۆشـە نیگـای دووبارەکارییـەوە ئـەم لێکۆڵینەوەیـەی لـەبارەوە پێـشکێش بکـەین بـەو هیوایـەی خزمەتێکی ڕەخنەی نوێی کوردیمان بکەین.

لە نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەدا تووشی هەنـدێ گیروگرفـت بـووین، وەك نـەبوونی سەرچاوەی زۆر بە زمانی کوردی لەبارەی دووبارەکاری شیعری، هەروەها کێـشەی کەم نووسین و ڕەخنەو خـۆ لەقەرەنـەدان لـەبارەی تـەکنیکی دووبارەکـاری لـەنێو

بەرهەمەکانی ئـەم هۆنیـارە هاوچـەرخەدا، کـەوا هـەردوو جـۆری (شـیعری ئـازاد)و (پەخشانە شیعر) بەشێوەیەکی جوان و سەرنجڕاکێش دەنووسیّ.

لەم لێکۆڵینەوەدا باسی (١٠) دە جۆری دووبارەکاریمان لـەنێو شـیعرەکانی ئـەم شاعیرە کردووە، ئەم لێکۆڵینەوەیە پێکهاتووە لە پێشەکی و سـیّ تـەوەرە لەگـەڵ ئەنجام و لیستی سەرچاوەکان. تەوەرەی یەکەم بۆ باسکردنی بەها و ئامانجەکانی دووبارەکاری لە نێو داڕشتن و زمانی شیعری تەرخان کراوە، تـەوەرەی دووەم بـۆ خستنەڕووی جۆرەکـانی دووبارەکـاریی نێـو هۆنراوەکـانی ئـەم هۆنیـارە تـەرخان کراوە. هیوادارین ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵدانێك بیّ بۆ زیاتر ئاشنابوون بـە جیهـانی شیعریی ئەم هۆنیارەو تەکنیکی دووبارەکاریی نێو دەقی شیعرەکانی.

## تەوەرەی یەکەم : بەها و ئاما نجەکانی دووبارەکاری لە شێوازی شیعریدا

هەرچەندە بایەخدان بەم جۆرە دیاردەیە لـەم ڕۆژگـارەدا زیـاتر لـەنێو شـیعردا بەرچاو دەکەوێت، بەڵام سەرچاوەی ئەم جۆرە بایەخدانە زیـاتر بـۆ سـەرهەڵدان و دەرکەوتنی لەنێو قورئانی پیرۆزدا دەگەڕێتـەوە، کـەوا لـە چـەند سـورەتێکی وەك (الفاتحة – النـاس – الاخـلاص) جـۆرە دووبارەکردنەوەیـەکی دەنگیـی دەکەوێتـە بەرچاومان، وەك دووبارەکردنـەوەی دەنگـی (ن) لـە سـورەتی (الفاتحـة)و دەنگـی (س) لــە ســورەتی (النــاس)و دەنگــی (د) لــە ســورەتی (الاخــلاص)، هــەروەها دووبارەکردنەوەی وشەی (الرحمن)و دەسـتەواژەی (فبـأي آلاء ربکمـا تکـذبان) لـە سـورەتی (الـرحمن)، هـەروەها دووبارەکـاری لـە هـەردوو سـورەتی (المرسـلات)و (الـشعراء) بەرچـاو دەکـەوێت. واتـە بایەخـدان بـەم جـۆرە دووبارەکارییـەی نێـو قورئانی پیرۆز بووە دەروازەیەکی کاریگەر بـۆ بایەخـدان بەسـەرهەڵدانی دیـاردەی دووبارەکــاری لــەنێو شــیعردا. بــەلای الــسیوطی"دووبارەکــاری ڕەوانــترە لــە دووپاتکاری، ئەمەش لە لایەنە باشەکانی ڕەوانکارییە "[٢].

سادەترین پێناسەی دووبارەکاری ئەوەیە :" قسەکەر واژەیەك (لەفزێك) بهێنێت پاشان وەکو خۆی دووبارەی بکاتەوە چ واژەکە هاوواتا بێت، یان جیاواز بێت، یان واتایەك بهێنێت پاشان دووبارەی بکاتەوە. ئەمـەش لـە مـەرجی ڕێکـەوتنی واتـای

یەکەم و دووەمە، جا ئەگەر یەکگرتنەوەی واژەکان و واتاکان بێت سوودەکەی لە سەلماندنی دووپاتکردنەوەی ئەو بارەیە لە دەرووندایە، هەروەها ئەگەر واتاکان یەکگرتوو بێت هەرچەندە واژەکان ڕێکەوتوو بێت و واتاکان جیاواز بێت سوودەکەی بۆ هێنانەوەیەتی وەك هێمایەك بێت بۆ دوو واتا جیاوازەکانە"(٣).

دووبارەکاری (التکرار) شیعری لایەنێکی هونەریی شێوازی شیعرییە، کەوا بەهۆیەوە تێگەیشتن لە دەقی شیعریمان بۆ فەراهەم دەکات، چونکە دووبارەکاری هەر بۆ دووبارەکردن نییە، بەڵکو کەرەسەیەکی گرنگی شێوازی شیعرە بۆ دەرخستنی کاریگەری دووبارەکراوەکە بەسەر هزرو دەروونی خوێنەرەوە. هەروەها دووبارەکاری بنەمایەکی گرنگی بونیادی هونەریی شیعرە، چونکە " دووبارەکاری بناغەی ڕیتیمە بەهەموو جۆرەکانی کەوا لە مۆسیقا دەبینرێت، هەروەها بناغەیەکە بۆ تیۆری سەروا لە شیعردا "(٤). دووبارەکاری لایەنێکی گرنگە لە مۆسیقای شیعری بەهۆی ئەو ڕیتیمە دووبارەکردنەوەکە دروستی دەکات، بەتایبەتی لە مۆسیقای دەرەوەی شیعرییە بە تایبەتیش لەبواری سەروای شیعری، هەروەها دووبارەکاری لەبواری کێشی شیعری کلاسیکی بەدی دەکرێت بۆ نموونە دەریای ڕەجەز بریتییە لە چوار جار دووبارەکردنەوەی هەنگاوی (مستفعلن)، هەنگاوەکانی بریتییە لە دووبارەکردنەوەی چەند دەنگێك جۆرە ڕیتیمێك دروست دەکەن مۆسیقای شیعریی هۆنراوەکە دروست دەکەن.

وشەی دووبارەکاری لە زمانی عەرەبیدا (تکرار)ە کەوا لە وشەی (کرر) وەرگیراوە، بەڵام وشەی دووبارەکاری (Repetition) وشەیەکی لاتینییە بەواتای جارێکی دیکە هەوڵ دەدات، ئەم وشەیە لە وشەی (Petere) بەواتای دەگەڕێ. ئەم جۆرە کارو کردەوە نەك تەنیا لەبواری شیعر، بەڵکو لەبوارەکانی مۆسیقاو نیگارکێشانیشدا بەکار دەهێنرێت(٥).

زمان لە خودی خۆیدا کەرەستەیەکی دەربڕینە بەلای ئادەمیزادەوە بەهۆیەوە بیروبۆچوونی خۆی دەخاتەڕوو، یان پێشکێش دەکات، هۆنیاریش وەك کەسێکی خاوەن هەستێکی ناسك و خاوەن توانایەکی هۆنینەوەو داڕشتنی شیعری جۆرە زمانێکی باڵا لەنێو هۆنراوەکانی بەکاردەهێنێ بۆ بەخشینی جۆرە چێژێکی

هونەری بەخوێنەری هۆنراوەکەی. بۆ ئەم مەبەستە هەندێ تەکنیکی زمانەوانی بەکاردەهێنێت، تەکنیکی دووبارەکاری جۆرە گەمەیەکی شیعریی ئاڕاستەکراوە لەلایەن هۆنیارەوە بۆ ئەوەی زیاتر سەرنجی خوێنەر بۆ لای خۆی ڕابکێشێت. زۆر جار جۆرە لێکچوونێك لەنێو وشە، یان فرێز، یان ڕستە دووبارەکراوەکانی نێو هۆنراوەکە بەرچاومان دەکەوێت لە حاڵەتی هاوتەریبی بەکارهێنانیان ئەگەر دووبارەکراوەکە وەکو خۆی دووبارە کرایەوە، بەلاّم ئەگەر هۆنیار وشەی بۆ زیاد کرد، یان وشەی لێ لابرد ئەوسا حاڵەتی هاوتەریبی دروست نابێت، بەڵکو جۆرە وەکییەکی ناتەواو دەکەوێتە بەرچاومان،چونکە **" لێکچوون لە دووبارەکاری فراوانترە لە وەکیەکی، هەرچەندە هەموو وەکیەکییەك بەلێکچوون دادەنرێت، بەلاّم هەموو لێکچوونێك بە وەکیەکی دانانرێت. هەروەها هەموو دووبارەکارییەك و هاوتەریبی یەك شت نییە، بەڵکو دووبارەکاری یەکێکە لە دەرکەوتنە زۆرەکانی هاوتەریبی، چونکە لێکچوون خاڵی هاوبەشیانە "**[٦].

دووبارەکردنەوە بەلای ئەم هۆنیارەوە جیاوازە لە جووینەوە، یان لاساییکردنەوە، چونکە بەلایەوە دووبارەکاری داهێنان و جوانبەخشی و بەهای خۆی هەیە، بۆیە لەم بارەیەوە دەڵێت : " ئەفراندن لە دووبارەکردنەوەی جوانییەکاندا پەیوەستە بە فرەیی کولتوور و پاراوی ئەزموونی دووبارەکەرەوە. دووبارەکردنەوە جیاوازە لە جووینەوە، چونکە جووینەوە لاساییکردنەوەیە و هیچ داهێنانێکی تێدا بەرهەمە نایەت، بەلاّم دووبارەکردنەوە جیاکاری و داهێنانی لێوە دەدۆزرێتەوە. دووبارەکردنەوە هەمیشە جوانیی شێوە نوێ دەڕژێتە ناو واقیعی نووسین و جوانبەخشی "[٧]. گومان لەوەدا نییە ئەم هۆنیارە بەوشیارییەوە گەمەی دووبارەکاری لەنێو هۆنراوەکانی بەکاردەهێنێ، چونکە لەپێشەکی کۆشیعری (سەدو یەکشەوە) دەڵێت : " پێش ئەوەی بیانخەمە ناو شیعرەوە ئاگاداریان دەکەمەوەو جۆرە ئامادەبوونێکیان لێ دەڕەخسێنم. ئەوجا بەگەمەکردن لەگەڵ هەستەکانی لە ناو ڕستە وێنەدا مامەڵەی بوون بە شیعریان لەگەڵ دەکەم، هەموو بینینەکانی ڕادەکێشمە ناو بینینی خۆم و هەستی جوانبەخشیم لا بەهێز دەکات و پاشان پێی دەگەیەنێت. شیعر لە بەرزایی

ئاسمانەوە دانابەزێتە قووڵایی ژیان، بەڵکو لە قووڵایی مانایەکی شیعریی پەیدا دەکات و بەرز دەبێتەوە تا ئەو ئاستەی دەبێتە پێویستییەك لە پێویستییە گیانییەکانی مرۆڤایەتی و بەدیهێنەری واقیعی نووسین و جوانیبەخشی "[٨].
تەنانەت ئەم جۆرە گەمە شیعرییە بەلایەوە زیاتر بۆ جوانی شیعرە، بۆیە دەڵێت :
" من جوانی دەنووسم لە بارەی جوانییەوە نانووسم "[٩].

مەبەست لە دووبارەکردنەوە زیاتر بەخشینی جۆرە کاریگەرییەك بە بەیت، یان دێر، یان دەستەواژە، یان وشە دووبارەکراوەکەیە، هەروەها ئەو کارە لەپێناوی سەرنجراکێشانی خوێنەری شیعرەکەیە تا بەهۆیەوە بەوشیاری شیعرەکە بخوێنێتەوەو ئاگاداری بەیت، یان دێر، یان دەستەواژە، یان وشە دووبارەکراوەکە بێت. دووبارەکاری بەشێوەی دەنگ، یان وشە، یان فرێز، یان ڕستە دەبێت، هەرچەندە دووبارەکردنەوەی ڕستەی کاری کاریگەرترە لە دووبارەکردنەوەی ڕستەی ناوی بۆ خستنەڕووی کاریگەریی دەروونیی ڕووداوی نێو بابەتی هۆنراوەکە[١٠]، لەم ڕووەوە دووبارەکاریی ڕستەی کاری زیاتر لەنێو هۆنراوەکانی ئەم هۆنیارە بەرچاو دەکەوێت، چونکە هەموو گەمەیەکی نێو زمانی شیعریی هۆنراوەکانی بۆ بەرجەستەکردنی سروشتی ڕووداوی نێو هۆنراوەکەی بەکاردەهێنێت. هەروەها ئەگەر ژمارەی جاری دووبارەکراوەکە کەم بوو ئەوا پێی دەوترێت نا درێژ، بەڵام ئەگەر ژمارەی جاری دووبارەکراوەکە زۆر بوو ئەوا پێی دەوترێت دووبارەکراوی درێژ[١١]، هەرچەندە لەم ڕووەوە دووبارەکاریی نادرێژ زیاتر لەنێو هۆنراوەکانی ئەم هۆنیارە بەرچاو دەکەوێت . لێرەدا بواری بازنەی جووڵانەوەی نێوان دووبارەکاریی نادرێژ فراوانترە لەوەی نێو دووبارەکاریی درێژ، کەوا زیاتر دەبێتە بتەوتر کردنی شێوازی داڕشتنی هۆنراوەکە، هەرچەندە هێزی تەکاندان بۆ پێشەوە لە دووبارەکاریی نادرێژ کاریگەرترە بەحوکمی ئەوەی شوێنەکانی دووبارەکاریی نادرێژ زۆرترە. دووبارەکراو دەبێتە چەقی مەڵبەندەیی نێو هۆنراوەکە، لێرەدا زۆری ژمارەی جاری دووبارەکراو دەبێتە مایەی بەخشینی جۆرە هێزێکی کاریگەر بە چەقە مەڵبەندییەکە.

زاراوەی دووبارەکاری (التکرار– REPETITION) لەڕووی فەرهەنگییەوە بە واتای بۆ دوو جار، یان زیاتر بەکارهێنان بۆ مەبەستێکی تایبەت دێت، بەڵام لەڕووی ئەرکەوە دووبارەکاری وەك ورياکردنەوەيەکە لەمەڕ دووبارەکراوەکەوە. ئەم زاراوەیە هەندێ لێکۆڵەر بەشێوەی دووبارەکردنەوە بەکاری دەهێنێ، هەندێکی دیکە بەشێوەی (گەڕانەوە) بەکاری دەهێنێ. بەلامانەوە زاراوەی دووبارەکردنەوە دروستە ئەگەر وشەکە بۆ دوو جار بەکار هات ئەگینا بەپێی ژمارەی بەکارهێنانەکە دەبێ زاراوەکە دابڕێژرێت وەکو (سێبارە، دەبارە..تاد)، هەروەها گەڕانەوە زیاتر لە دەرەوەی ڕەخنەی شیعری بۆ چەند مەبەستێکی جیاواز بەکاردەهێنرێت، چونکە هۆنیار لەنێو هۆنراوەکەیدا ناگەڕێتەوە بۆ وشەیەك، بەڵکو بۆ مەبەستێك دووباری دەکاتەوە. دووبارەکاری، یان گەڕانەوە بەلای د.ئازاد ئەحمەد مەحموود[١٢]ەوە " دیاردەیەکە لە دیاردەکانی شێوازگەری، ڕەوانبێژان و زماناسان و ڕەخنەگران بەگشتی باسیان کردووە. شوێنێکی دیکەی جیا لەو جێگایەی کە لە بەراییەوە وتراون، یان تۆمارکراون "[١٣]. هەروەها بەلای ئەم لێکۆڵەرەوە " لە شارستانییەت و ئەدەبی ڕۆژئاوادا، گەڕانەوە بە زەق زۆریی بەرچاو دەکەوێت، وەك دیاردەیێکی هونەری، مێژووی خۆی هەیە. ئینسایکلۆپیدیای (برنستون – priceton) ئاماژە بەوە دەکات، کە دیاردەی گەڕانەوە، گەڕانەوە بە گرنگترین خاسیەتی شیعر بووە، شاعیرانی ئینگلیز هەر لە شکسپیر*ەوە تا دەگاتە (ت.س.ئیلیەت) ئاوڕیان لێداوەتەوە. جگە لەمانە، لە ئەدەبی ئینگلیزیدا، ناوەندێکەو گۆشەی تایبەتی خۆی هەیە، لێی کۆڵراوەتەوە "[١٤].

دووبارەکاری لە شیعری کۆندا لەوانەیە بۆ مەبەستی ڕەگەزدۆزی بێت. بۆ نموونە (نالی) لە هۆنراوەیەکدا وشەی (چین)ی دووبارە کردووەتەوە بۆ مەبەستی ڕەگەزدۆزی بەکارهێناوە :

**بڕۆت هەر چین و پەرچەم چین لەسەر چین**
**ئەمەندە چینە، قوربان، پێم بڵێ چین[١٥]**

ئەم جۆرە دیاردەی بەکارهێنانی دووبارەکاری لە هۆنراوەی نوێدا بۆ مەبەستی ڕەگەزدۆزی زۆر بە دەگمەن بەرچاو دەکەوێت، بۆ نموونە دووبارەکاری نێو هۆنراوەکانی ئەم شاعیرە زیاتر بۆ مەبەستێکی ڕەگەزدۆزی نییە، بەڵکو زیاتر بۆ هەندێ مەبەستی دیکەی دەروونی و جوانکاریی داڕشتنی شیعرییە.

دووبارەکاری شیعری بریتییە لە دووبارەکردنەوەی دەنگێك، یان وشەیەك، یان دەستەواژەیەك، یان ڕستەیەك لەنێو دێرەکانی هۆنراوەکە، هەروەها هونەری دووبارەکاری سەر بە شێوازگەرییەو، جۆرێکە لە هونەری داڕشتنی شیعری لای هەندێ هۆنیاری کۆن و نوێ بەرچاو دەکەوێت، زیاتر هۆنیار بە مەبەستی سەرنجڕاکێشانی خوێنەری هۆنراوەکەی بۆ دووبارەکراوەکە پەنای بۆ دەبات. دووبارەکردنەوەی وشە هەندێ جیاوازی هەیە لەگەڵ دووبارەکردنەوەی دەستەواژەو ڕستە، چونکە لە دووبارەکردنەوەی وشە لایەنی واتاسازی و فەرهەنگی زیاتر بە جوانی ڕۆڵی کاریگەری خۆی دەنوێنێ. بۆ نموونە لەڕووی فەرهەنگییەوە وشەکانی (بەفر، بەرف، سەهۆڵ، بووز) هەمان واتای هەیە واتە هاوواتای وشەی بەفرن، هەروەها لەڕووی واتاسازییەوە وشەی (بەردان) بە وشەیەکی فرەواتا دادەنرێت، چونکە چەند واتایەکی هەیە وەك ئاو بەردانەوەو بەردانەوەی شتێك لەسەرەوەو بەردانی بەندکراو.

بەلای نازك الملائكەوە[١٦] سێ جۆر دووبارەکردنەوە لە شیعری نوێدا هەیە، ئەمانەن :

**١- دووبارەکاری بەیانی** (التكرار البياني) : بریتییە لەوەی وشە، یان فرێز، یان ڕستە شیعرییەکە لە چەند شوێنێکی نێو هۆنراوەکە دووبارە بکرێتەوە، ئەم جۆرە دووبارەکارییە لەنێو شیعری سەباح ڕەنجدەردا زۆرە. بۆ نموونە لە هۆنراوەی (سوێسکە) سێ جار وشەی (ژماردن) بەشێوەی دەستکاریکراو لە شوێنی جیاواز بەکارهێناوە :

**سوێسکە هێلکەکانی دادەنێ**

**دەیانژمێرێ و بێ دوودڵی لەسەریان دەکەوێ**

**بۆ ماوەیەك لەبیری هیچدا نابێ**

**تا جووجکەکانی سینگی دەخورێنن**

**دووبارە دەیانژمێرێتەوە**

**لەنێوان هێلکەو جووجکەدا**

**شتێك هەیە وا لە ناخی دەکات**

**ژماردن دووبارە بکاتەوە** (کۆشیعری سەدو یەکشەوە / ل١٣)

**٢- دووبارەکاری دابەشکاری** (تکرار التقسیم) : بریتییە لەوەی وشە، یان فرێز، یان ڕستە شیعرییەکە لەکۆتایی پەرەگرافە شیعرییەکە دەبێت. ئەم جۆرە دووبارەکارییە لەنێو هۆنراوەی ئەم هۆنیارەدا بەرچاو ناکەوێت.

**٣- دووبارەکاری نەستی** (التکرار اللاشعوري) : بریتییە لەوەی وشە، یان فرێز، یان ڕستە شیعرییەکە زۆر دووبارە بکرێتەوە، وەك نازك الملائکە دەڵێت :" دەبێ فرێزی دووبارەکراو لە قسەیەك وەرگیرابێت هۆنیار بیستوویەتی و، تێیدا جۆرە تەعلیقێك بەسەر حاڵەتێکی هەنووکەیی خۆی دۆزییەوە ئازاری دەدات، یان ئاماژەیەکی تێدایە بۆ ڕووداوێکی سەرنجڕاکێش غەمێکی کۆن، یان پەشیمانییەکی نوستوو، یان گاڵتەجاڕییەکی دڵتەزێن وەخەوەر دەهێنێتەوە "[١٧] بۆیە ئەم جۆرە دووبارەکارییە لە ئەنجامی جۆرە کارتێکردنێکی دەروونی ڕەنگ دەداتەوە، زیاتر بۆ بەرزکردنەوەی هەستی خوێنەری شیعرەکەیە تا بگاتە پلەیەکی هاوتەریبی هۆنیارەکە، ئەم جۆرە دووبارەکارییە هەبوونی بەرچاوی هەیە لەنێو شیعری ئەم هۆنیارەدا بەشێوەیەك دەکرێ بڵێین کاریگەری خۆی هەیە لە نەستەکەیداو دەیەوێت لەڕێی دەقی شیعرەکەیەوە بیگوازێتەوە بۆ نەستی خوێنەر، یان پەیام وەرگرەکەی. بۆ نموونە ئەم هۆنیارە لە هۆنراوەی (بۆنە)دا دەستەواژەی (ئەو گوڵەی) لەسەرەتایی شەش دێڕی شیعری بەدوا یەکتردا هاتووە بەشێوەی (دووبارەکردنەوەی خاو — التکرار المائع) دووبارە دەکاتەوە، واتە دێرەکە بەسووکە دەستکارییەك هەر جارێك بۆ بۆنەیەکی تایبەت لە ژیانی خۆیدا تەرخان کراوە، بەم شێوەیە دووبارەکردنەوەکە دەبێتە مایەی نیشاندانی کاریگەری پێشکێشکردنی گوڵ لە نەستی خۆیدا، کەوا لە چەند بۆنەیەکدا گوڵ لە ژیانی مرۆڤدا پێشکێش دەکرێت :

**سوپاس بۆ گوڵی بۆنەکان**
**ئەو گوڵەی لەیەکەم ڕۆژی لەدایکبوونم پێشکێشم کرا**
**ئەو گوڵەی لە یەکەم ڕۆژی چوونە قوتابخانەم**
**ئەو گوڵەی لە یەکەم ژووانی دڵداریمدا**
**ئەو گوڵەی لە بڵاوکردنەوەی یەکەم شیعرمدا**
**ئەو گوڵەی لە چاپکردنی یەکەم کتێبمدا**
**ئەو گوڵەی لە ڕۆژی زاوایەتیم**
**من لە ژیان بەردەوامم** (١٨)

دووبارەکاری بەلای شاعیرەوە دەلالەتی باش بیرکردنەوەی مرۆڤی کاراو چالاکە، چونکە " دووبارە بەرهەمهێنانەوەی جوانییە لە بن نەهاتووەکان نیشانەی ژیانخۆشی و باش بیرکردنەوەی تاکی چالاکی لە ناو کۆمەڵگادا "(١٩) هەروەها بەلایەوە " دووبارەکردنەوەی وشەش هێزێکی دیکە دەبەخشێت، بە جۆرێك لە ناخڕا پێ دەگاتەوەو دەیهێنێتە بوون و پانتایی کارتێکردن "(٢٠). هەروەها بەلایەوە " ئەفراندن لە دووبارەکردنەوەی جوانییەکاندا پەیوەستە بە فرەیی کولتوورو پاراوی ئەزموونی دووبارەکەرەوە. دووبارەکردنەوە جیاوازە لە جووینەوە، چونکە جووینەوە لاساییکردنەوەیە و هیچ داهێنانێکی تێدا بەرهەم نایەت، بەڵام دووبارەکردنەوە جیاکاری و داهێنانی لێوە دەدۆزرێتەوە. دووبارەکردنەوە هەمیشە جوانیی شێوە نوێ دەڕژێتە ناو واقیعی نووسین و جوانبەخشی "(٢١) .

شیعر کۆنترین ڕەگەزەکانی ئەدەبە لەڕووی سەرهەڵدانەوە توانیویەتی لەدێر زەمانەوە تا ئەم ڕۆژگارە ببێتە زمانحاڵی هۆنیار لە دەربڕینی هەستی ناسکی ناخەوەی لە حاڵەتەکانی خۆشی و شادی، یان غەمباری و دڵتەنگی، تەنانەت شیعر بەتایبەتی شیعری مەرگەسات لەسەردەمی یۆنانی کۆندا پیرۆزی خۆی هەبووە، بۆیە دەکرێ بڵێین شیعر جوانترین بەرهەمی ئەدەبییە، دەتوانێ لە هەموو سەردەمێکدا کاریگەری خۆی بنوێنێ.

ڕاستە شیعر لە ئەدەبی گەلاندا پانتایی بەرفراوانی بۆ خۆی داگیر کردووە، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا کاریگەری شیعر بەسەر خوێنەرو گوێگرەکەیدا توانیویەتی مانەوەیەکی کاریگەر بۆخۆی دابین بکات. شیعر زیاتر دەربڕینێکی ویژدانییە کاریگەری خۆی هەیە لە دەروونی ئادەمیزاددا بەشێوەی هونەری جوان دایدەڕێژێت بۆ ئەوەی کاریگەری خۆی هەبێ لە هزر و دەروونی پەیام وەرگرەکەی، هۆنیاریش " شارەزایی هەموو فێڵەکانی زمانە، هەر لە لووتکەی سادەو ساکارییەکەیەوە تا دەگاتە ڕەوانبێژی سەخت "[٢٢]. زمانی شیعر جۆرە زمانێکی تایبەتە هەندێك جیاوازی خۆی هەیە لەگەڵ زمانی ئاخاوتنی ڕۆژانەی خەڵکیدا، چونکە زمانی شیعر خاوەن پەیامی خۆیەتی پێویستی بەکەرەستەی زمانەوانی تایبەت خۆیەتی، دووبارەکاریش یەکێکە لە کەرەستە بەهادارەکانی زمانی شیعر لە داڕشتنی شیعریدا. هۆنیار لە بواری داڕشتنی دەقە شیعرییەکەیدا بۆی هەیە هەندێ دەستکاری لایەنی ڕستەسازی زمانەکە بکات بەپێی ڕێکخستنی کێش و سەروای شیعرەکە، چ لەڕووی پێش و پاش خستنی هەبوونی بکەرو کردارو بەرکار، یان لە ڕووی هەندێ لایەنی زمانەوانی دیکەی داڕشتنی شیعرەکە.

دەکرێ بڵێین شاعیری ئەم لێکۆڵینەوەمان لەبواری زمانی شیعریدا خاوەن جۆرە شەقڵێکی تایبەتە هەموو خوێنەرێکی شیعر بە ئاسانی لەگەڵ جیهانی نێو دەقە شیعرییەکەی و زمانە شیعرییەکەی ئاوێتە نابێ، چونکە جۆرە داڕشتنێکی زمانەوانی بەکاردێنێ، یان جۆرە زمانێکی شیعری بەکاردێنێ، بەئاسانی زۆرینەی خوێنەران لێی تێناگەن، چونکە ئەم هۆنیارە لایەنی کەلەپووری تێکەڵ بە لایەنی ئەفسانەیی دەکات، جۆرە زمانێك بەکاردێنێ بۆنێکی شێوازی هەولێرییانەی پێوە دیارە، بۆیە لەهەندێ شوێندا خوێنەر پێی ناکرێ بەئاسانی لێی تێ بگات، یان لە دیوە شاراوەکانی پشت پەردەی فرێزو ڕستەی دێرە شیعرەکانی شارەزایی پەیدا بکات. بۆ نموونە لە هۆنراوەی سروشت دەڵێ:

**باران سەری ڕۆشنی بە دۆستی هەرە نزیکی**

**زەوی هەمیشە بڕوا پێ کراو کرد**

**ئەمەش بە ڕۆشنایی نۆتە دەست نووسەکانی**

**فەرمانڕەوای دارستان هەڕەشە لە بازی پیر دەکات**
**بازی پیریش ترس و بیری هێلکە نەترووکاندن ئەستێرەدا ناکشێنی**
**مۆزەخانەیەکی لە هەفتەی ئاسوودەی مەستتر ڕابردوو**
**پیاوێکی لە هەفتەی ئاسوودەی چاو ڕوونتر لە ئاگر**
**گوڵدانێکی لە هەفتەی ئاسوودەی لە دیدارتر لە پەنجەرە**
(کۆشیعری خەون واخۆی گێڕایەوە / ل٤٩)

زمانی شیعریی نێو ئەم پارچە هۆنراوەیە تەمومژی زۆری پێوە دیارە پێویستی بەوەیە هۆنیار پەردە لەسەر نهێنی واتای شاراوەی نێو دێڕەکانی ئاشکرا بکات، چونکە خوێنەری ئاسایی زۆر زەحمەتە پەی بە واتای دێڕەکان ببات، ئەم جۆرە بەکارهێنانەی زمانی شیعری لەنێو هۆنراوەکانی ئەم هۆنیارەدا لە چەندین هۆنراوەی دیکە دووبارە بووەتەوە. بۆ نموونە لە هۆنراوەی (شیعر)دا دەڵێ:

**چاو هیچ گرینگ نییە**
**هەرگیز نەیتوانیوە گیان بدۆزێتەوە**
**من بەهەستی پێت**
**دەڕۆم و ختووکەی وشە دەدەم**
**برادەری ملوانکەی باب و باپیران لەمل**
**ڕستەی ئەو بەخشندەییەی دامێ**
**دەنگێکی ڕوون ئاشنا لە هەناوی شیعرەوە**
**چل چرای هەموو چاخەکانی**
**کردە ئاوێنەی ئاسمانی**
**هەموومان خۆمان لەناو داگیرساند**
**منیش بەوەم زانی**
**لەسەر زەوی شیعردا لەدایك بووم**
**شیعریش پێش من ڕوخساری پشکووتبوو**
(کۆشیعری سەدو یەکشەوە / ل٢٨٩)

ڕاستە زمانی شیعر نابێ زۆر ڕاستەوخۆ، یان زۆر سادەو ساکار بێ، بەلأم لەگەڵ ئەوەشدا شیعر سەرکەوتوو نابێ لە گەیاندن و دەربڕینی پەیامی شیعر ئەگەر تێدا لێڵی و تەمومژی زۆر بەکار هێنرا، چونکە زمانی شیعر " وشەکان ڕێك دەخات و پڕ واتایان دەکات، ئەو واتایەی کە لە ئەنجامی تێکەڵبوونی واتای دروست و خوازرای لەلایەك و بینایی ڕیتم لەلایەکی ترەوە هەڵدەقوڵێ "[٢٣]. زمانی شیعر زیاتر بەئەرکی ڕازاندنەوەی دەقی شیعر هەڵدەستێ لەپێناو بەخشینی چێژێکی هونەری بەخوێنەری شیعرەکە، هەرچەندە زمانی شیعرەکە ئاڵۆز نەبێ ئەوەندە بەجوانی دەتوانێ پەیامی شیعری خۆی ڕابگەیەنی و، دەبێتە مایەی زیاتر مانەوەی شیعرەکە لەیادەوەری خوێنەراندا. بۆ نموونە حوسێن عەلی شانۆف لەبارەی زمانی شیعری گۆران دەڵێ: " زمانی شیعری گۆران لە ئەدەبی هاوچەرخی کوردیدا بەجوانترین نموونەی زمانی ئێستاتیکی دادەنرێت "[٢٤].

زمان جگە لەوەی ئامرازێکە بۆ لەیەکتر گەیشتن بە باشترین کەرەستەی دەربڕین لای مرۆڤ دادەنرێت و، ئەم ئەرکە لە زمانی شیعریدا قورستر دەبێ، چونکە هۆنیار لەڕێی ژمارەی کەمی وشەوە ئەرکی دەربڕینی هزرو هەستی خۆی دەداتە کۆڵی زمانی دەقە شیعرییەکەی بۆ ئەوەی ڕۆڵی کاریگەری خۆی بنوێنی لە هزرو هەستی پەیام وەرگرەکەی. لێرەدا پێویستە بڵێین: " زمانی هۆنراوە تایبەتمەندە بەجیهانی شیعرەوە، بەو هەموو گۆڕانکارییە بەردەوامە لەناوەرۆك و شێوازەوە خزمەتی هەردوو دیوی شیعر دەکات وەکو پۆشاك، چۆن بۆی دەگونجێت، یان بۆی دەگونجێنن بەپێی قەد و پانی ئەو جەستەیە زمانی هۆنراوەی ئەو توانایەی هەیە بە گوێرەی ئەو گۆڕانکارییە خۆی دەگونجێنێت"[٢٥].

زمانی شیعر لەگەڵ ڕۆژگاردا گۆڕانکاری بەسەردا دێت، چونکە هەندێ وشەی نوێ بەپێی پێویستی ڕۆژگار شوێن خۆی دەکاتەوە لەنێو زمانی شیعردا، لەوانەیە ئەم لایەنە لەڕێی دووبارەکردنەوەی وشەی تازە زەمینەی باش و کاریگەر بۆ سەقامگیربوونی دابین بکرێت. لێرەدا پێویستە بڵێین: " کەرەستەی هۆنیار وشەیە وەك چۆن لای وێنەکێش و زمانیش وەك هەموو شتی دیکە لە گۆڕاندایە، زمانی

شیعری ئەمرۆ هی دوێنێ نییە هەڵبەتە هی داهاتووش هی ئـەمرۆ نییـە[٢٦]. زمـانی شیعری بە شتێکی گرنگی شێوازی شـیعری دادەنرێـت، کـەوا لـە هۆنیارێکـەوە بـۆ هۆنیارێکی دیکە زۆرجار جیـاوازی دەبـێ. لێـرەدا پێویسـتە بـووترێ جگـە لـەوەی زمانی شیعری لە زمانی ئاسایی جیایە، ئـەوە زمـانی هـەر هۆنیـارێکیش لـە زمـانی هۆنیارێکی دیکە جیایە، تەنانەت زمانی شیعری هەر شـاعیرێکیش لـە قۆناغـە یـەك لەدوای یەکەکانی شیعر نووسـیندا لەیـەکتر جیـاوازن، ئەمـەش پێوەنـدی بـە دنیـا بینینی شاعیرەوە هەیە.

بەحوکمی ئەوەی هۆنیاران هەریەك خاوەنی ئـەزموونی شـیعری خۆیـەتی، بۆیـە کەسایەتی هۆنیار لەڕێگای شـێوازی شـیعرەکەیەوە زۆر جـار دەردەکـەوێ، زمـانی شـیعریش دەبێتـە کەرەسـتەیەکی گـرنگ لـە بەخـشینی مۆرکێـك، یـان شـەقڵێکی تایبەت بە شێوازی شیعری هۆنیارەکەیەو " لە رێگەی ئەو زمانە تایبەتەوە شـاعیر دەنگی خۆی دەدۆزێتەوەو شێوازی تایبەت بەخۆی دەبێت "[٢٧].

## ئامانجەکانی دووبارەکاری شیعری

هەموو کارو کردەوەیەك لە ژیـانی رۆژانەمانـدا چـەند سـوودو ئامـانجی تایبـەتی خۆی هەیە، وەك مەبەستێکی سەرەکیی هەوڵ و کۆششی بۆ دەکات، تا بەهۆیەوە کاریگەری خـۆی بنـوێنی. پـێش ئـەوەی بایـەخ بـەدیاردەی دووبارەکـاری شـیعری بـدرێت سـەرەتا بایـەخ بەهـەبوونی دیـاردەی دووبارەکـاری لـەنێو قورئـانی پـیرۆز دراوە، کەوا ١٤٣٠ ساڵ پێش ئەمرۆ بەشێوەی پچرپچڕ لەڕێی جبریلی گـەورەترینی نوێنـەری خـوای مـەزن بەسـەر محەمـەدی پێغەمبـەر (د.خ) دابـەزیوە، چـونکە دووبارەکـاری دیاردەیـەکی سەرنجڕاکێشە لـەنێو سـورەتەکانی قورئـانی پـیرۆزدا، کـەوا هەنـدێ جـار بەشـێوەی دووبارەکردنـەوەی دەنـگ خـۆی دەنـوێنێ، وەك دووبارەکردنەوەی دەنگی (ن) لە سـورەتی (الفاتحـة)و دووبارەکردنـەوەی دەنگـی (د) لـە سـورەتی (الاخـلاص) و دووبارەکردنـەوەی دەنگـی (س) لـە سـورەتی (الناس)، یان هەندێ جاری دیکە بەشێوەی دووبارەکردنـەوەی وشـەو فرێـز خـۆی دەنوێنێ وەك دووبارەکردنەوەی فرێـزی (فبـأي آلاء ربکمـا تکـذبان) لـە سـورەتی

(الرحمن)، یان هەندێ جار دووبارەكردنەوەی چیرۆكێك لـە چـیرۆكی پێغەمبەرانـە، كەوا بەلای (أ. د. أمـین محمد عطیـة باشـا) لـەنێو لێكۆڵینەوەیـەكی بەناونیـشانی (التكرار في القصص القرآني – دراسة تطبیقیة علـى قـصة موسـى علیـه الـسلام) " دووبارەكردنـەوە تـەنیا لـەپێناو دووبارەكردنـەوە نییـە، بـەڵكو تازەكردنەوەیـەكی واتاكانە نەك تـەنیا دووبـارە وتنەوەیـە، جیـاوازیش لـەنێوان تازەكردنـەوەو تـەنیا وتنەوە ئەوەیە : دووبارەوتنەوە دووبارەكارییەكە هیچ ئامانجێكی نییە، یان تەنیا بۆ جەختكردنە، بەڵام تازەكردنەوە لە دووبارەكردنـەوەی لەفزەكـە بـۆ ئامانجێكـە پاشتر بەبێ ئەو تەواو نابێت "[٢٨].

ئامانجەكانی دووبارەكـاری لـەنێو قورئـانی پـیرۆزدا لەلایـەن (أ. د. أمـین محمـد عطیـة باشـا) لـەنێو لێكۆڵینەوەكـەی بـەوردی دیـاری كـردووەو، بریتییـە لەمانـەی خوارەوە :

١- تەحـداو ئیعجـازە، كـەوا لـە دووبارەكردنـەوەی هـەر چـیرۆكێك زیـادە، یـان كەمكردنەوەیەك بەدی دەكرێت و، بەشێوازێكی دیكە گێڕراوەتەوە.
٢- سەرنجڕاكێـشانی كەسـان بـۆ گـوێگرتن لـە چـیرۆكەكە لـەڕێی گۆڕانكـاری لـە شێوازەكانی یەك چیرۆكدا.
٣- بەهێزكردنی پەندو ئامۆژگاری و بەگەڕخستنی تواناكان.
٤- دووبارەكردنــەوەی چـیرۆكەكە بەخــشینی دڵئارامییــە بــۆ پێغەمبــەر (د.خ)و دڵڕاگرتنی خۆی و هاوەڵەكانی.
٥- بەرزی بایەخدانی خوای گەورەیە بە چیرۆكەكە.
٦- چیرۆكەكە لەوانەیە درێژی بخایەنێت و خاوەن چەندین لایەن بێت.
٧- ترسـاندنی بـێ بـاوەڕان و وشـیاركردنەوەیان بەسـزاو چارەنووسـی ئەوانـەی باوەڕیان نەهێنا بە پێغەمبەران.
٨- دیارخستنی یەكێتی ئاینەكان لە ڕەچەڵەكی باوەڕو یەكێتی بانگهێـشتن بۆیـان لەلایەن پێغەمبەرانەوە.
٩- جــەختكردن بەســەر لایــەنی نــەبینراو (غیبــی)و ســەقامگیربوونی لــە دڵان بەشێوەیەك دەبێتە بەشێك لە ژیانی گوێگر، یان خوێنەر [٢٩].

شیعریش، وەك دارِشتن، یەكێكە لەو كارو كردەوانەی هۆنیار لەرِێی چەند دیاردەیەكی هۆنیارانە كاریگەری خۆی بەسەر هەست و نەستمانەوە دەنوێنێ، بەلاّم هەریەك لەو دیاردە هۆنیارانە خاوەن سوودو ئامانجە تایبەتییەكانی خۆیەتی، بۆیە دەكرێ لێرەدا بلّێین دووبارەكاریی شیعری یەكێكە لەو دیاردانەی خاوەن سوودو ئامانجە تایبەتییەكانی خۆیەتی، وەكو :

١- جەخت و دووپاتكردنەوەیە : بریتییە لەوەی دووبارەكراو بۆ جەختكردن لەسەر واتای ئەوەی پێشتر ئاماژەی پێكراوە لە دێری پێشوو، یان دێرەكانی پێشووتر، واتە هۆنیار جەخت دەكات لەسەر لایەنێكی گرنگی دووبارەكراوەكەیە.

٢- سەرنجراكێشانی خوێنەر بۆ شتێكی گرنگ لەنێو هۆنراوەكە خراوەتەرِوو.

٣- مەزنكردنی دووبارەكراو بەشێوەیەك هەندێ پرسیار لەبارەی دووبارەكراوەكە لای خوێنەر دروست بكات.

٤- بۆ چرِكردنەوەی واتایەكی نێو هۆنراوەكەیە وا لە هۆنیار دەكات پەنای بۆ ببات.

٥- دروستكردنی سەرسوورِمان لای خوێنەر لەبارەی دووبارەكراوەكە.

٦- دووبارەكارییەكە بۆ كارێكی شیعریی پێویستە، هەروەها دووبارەكارییەكە بۆ كارێكی پێویستی مۆسیقاییە وا لە هۆنیار دەكات پەنای بۆ ببات.

٧- چرِكردنەوەی ژمارەی وشە بەكارهاتووەكانی نێو هۆنراوەكەیە لەرِێی دووبارەكردنەوەی هەمان وشە، یان فرێز، یان رِستە لەنێو هۆنراوەكە.

٨- سەرنجراكێشانی خوێنەرە بۆ ئەوەی دوای دووبارەكراوەكە لەنێو دێرەكانی هۆنراوەكە دێت.

٩- سەرنجراكێشانی خوێنەر بۆ شتێكی گرنگ لەنێو هۆنراوەكە خراوەتە رِوو.

١٠- خستنەرِووی توانای هۆنیارە لەچۆنێتی دارِشتنی هۆنراوەكەی بەشێوەیەك دووبارەكردنەوە دەبێتە بەشێك لە شێوازی شیعریی هۆنراوەكە.

١١- دانپێنانە بە بەها و هێماكانی دووبارەكراوەكە لەنێو هۆنراوەكە.

١٢- ئاگاداركردنە لەبارەی واتای دووباركراوەكە تا خوێنەر دركی پێ بكات.

١٣- وەبیرخستنەوەی دووبارەكراوەكەیە لە زەینی خوێنەر تا وشیاری پەیدا بكات.

١٤- بەها بەخشینە بە دووبارەكراوەكە لەڕووی دەروونییەوە تا خوێنەر چ لەڕووی باشی، یان مەترسیدارییەوە ئاگاداری و شارەزایی پەیدا بكات.

١٥- دووبارەكراو دەكەوێتە ژێر كۆنترۆڵی هەندێ یاسای شاراو، بەتایبەتی یاسای هاوسەنگی.

بەگشتی دەتوانین بڵێین شیعر وەك بەرهەمێكی ئەدەبی خاوەن پەیامێكی مەعریفی كاریگەرەو، شاعیر زمانی شیعر دەكاتە كەرەستەیەك بۆ جوانی دەربڕینی هزرو هەستی ناخەوەی خۆی بۆ خوێنەری، یان گوێگری شیعرەكەو، دەتوانین بڵێین كاریگەری هەموو دەقێكی شیعری زیاتر پابەندە بەكاریگەری و جۆری ئەو زمانە دەربڕینە لەنێو شیعرەكەدا بەكار هاتووە، كەوا لەلایەك زمانی شیعر دەبێتە جلوبەرگێك، یان پۆشاكێك بۆ ڕازاندنەوەی دەقە شیعرییەكە لەپێناو بەخشینی چێژی هونەری بە پەیام وەرگری شیعرەكە، هەروەها زمانی شیعر لەلایەكی دیكەوە دەبێتە باشترین كەرەستەی دەربڕین لە پرۆسەی داهێنان و داڕشتنی هەموو دەقێكی شیعریدا.

## تەوەرەی دووەم : جۆرەكانی دووبارەكاری

هەر هۆنیارێك لە پرۆسەی دووبارەكاری شیعرییەكەیدا، جگە لەوەی ئامانجێكی جوانكاری و بەخشینی چێژی شیعری هەیە، هەوڵ دەدات توانای داڕشتنی شیعری خۆیشی بخاتە ڕوو. ئەم جۆرە دیاردەیە زۆر بە جوانی لەنێو هۆنراوەكانی سەباح ڕەنجدەردا ڕەنگی داوەتەوە، خوێنەری هۆنراوەكانی هەست بەو تەكنیكە شیعرییە دەكات :

### ١- دووبارەكاری نەپچڕاو :

بریتییە لەوەی هۆنیار دووبارەكراوەكە لەهەمان دێرە شیعرەكە دووبارەكراوەكە بەدوای یەكتردا بەكار دەهێنێت. ئەم هۆنیارە لەم بوارەدا خاوەن شەقڵی تایبەتی خۆیەتی بەشێوەیەك هەرجارێك وشەیەك زیاد دەكات، یان هەر جارێك وشەیەك،

یان پیتێك دەقرتێنی. بۆ نموونە لە پەرەگرافی یەکەمی هۆنراوەی (سرووش)دا ڕستەی ناتەواوی (بەرەو ئاگری پیس نەبوو هەنگاومان پێ هەڵدەهێنێ) سێ جار بەدوای یەکتر هاتندا دووبارە دەکاتەوەو، هەر جارێك ڕستەکە بە وشەیەکی تازەی وەك بکەر دەگۆڕێت :

**منداڵی بەرەو ئاگری پیس نەبوو هەنگاومان پێ هەڵدەهێنێ**
**چارەنووس بەرەو ئاگری پیس نەبوو هەنگاومان پێ هەڵدەهێنێ**
**شکۆ بەرەو ئاگری پیس نەبوو هەنگاومان پێ هەڵدەهێنێ**
(کۆشیعری خەون واخۆی گێڕایەوە / ل٥٩)

ئەم جۆرە دووبارەکارییە بەهەمان شێوەی دووبارەکراوەکە لەناوەندی دێرەکەوە دەست پێدەکات لە کۆشیعری (زێوان)دا بەرچاومان دەکەوێت :

**دانیشتنی مردوو لەناو کفن**
**ڕاچەنینی مردوو لەناو کفن**
**مەستی مردوو لەناو کفن**
**نامەنووسینی مردوو لەناو کفن** (کۆشیعری زێوان / ل٨٩)

لە کۆشیعری (ساڵی سفر) ئەم جۆرە دووبارەکارییە هەیە، بەڵام دووبارەکراوەکە وشەی (حەوت)ەو لەسەرەتای دێرەکانن :

**حەوت هێلکەم تررووکا**
**حەوت جۆگەلە لە یەکتر نزیك بوونەوە بۆ مەلەوانیی بێچووە مراوی**
**حەوت گوڵە گەنم پڕ شیر بوو**
**حەوت باڵ لە کووپەی گەنجینەم ڕوا**
**حەوت پەندم لە تابلۆی شاردا هەڵواسرا**
**حەوت پشکۆم بووە فەرامۆشی جەستەی ئاگردان**
**بەهار خوێنی زەویی هێناوەتە کوڵ و جۆش**
**سروشت لە حەوتەیەکدا دووبارە لەدایك بووەوە**
**ناڵەیەکی پچڕپچڕی لە سینەوە هەستا**
**حەوت پەلکە زێڕینە**
**لەپێش چاوی مندا ونە** (کۆشیعری ساڵی سفر / ل١٩٢)

هەروەها لە کۆشیعری (ساڵی سفر)دا ئەم جۆرە دووبارەکارییە بەرچاومان دەکەوێت :

**لە شەممەدا باوکم فاتەڕەشەی ئەستوور بوو**

**لە شەممەدا دایك فەرشەی شکا**

**لە شەممەدا دوو برازام بەردی بن پێیان خزی**

**لە شەممەدا خوشکەزایەکم لەگەڵ ئاودا شەڕی ڕاگەیاندو شکا**

**لە شەممەدا یەکەم پایسکیلم دزرا**

**لە شەممەدا بەردی خەتخەتانێی کیژانی دەربەندی گۆمم فڕاندو هاویشتمە تیتراوسك**

**شەممە جۆرێکە لە ئەفسوون**

**زوو کار لە ناخ دەکات**

**ئەو هەڵبەزو دابەزکردنە بەدڵ چییە**

**فیل ئاژەڵێکی خاوو خلیچك و حۆلە**

**ڕووەکی دڕکاوی دەخوات**

**لە شەممەدا**

**یادکرنەوەی خوداو نیشتەجێبوون لەبوونی بزر بوو**

(کۆشیعری ساڵی سفر / ل١٣٦)

لەم پەرەگرافەدا هۆنیار دووبارەکاری کردووەتە کەرەسەیەکی دەروونی بۆ خستنەڕووی هەندێ بەسەرهاتی ناخۆشی خۆی لە ڕۆژی شەممدا، کەوا بۆمان دەردەکەوێت حەوت کارەساتی ناخۆشی وەك (باوکی فاتەڕەشەی ئەستوور بووە، فەرشەی دایکی شکاوە، بن پێی دوو برازای خزاون، خوشکەزایەکی لەشەڕی لەگەڵ ئاودا شکاوە واتە خنکاوە، یەکەم پایسکلی دزراوە، بەردی خەتخەتانێی کیژانی ڕفاندووە، یادکرنەوەی خوداو نیشتەجێبوونی بزر بووە). بۆیە ڕۆژی شەممە بەلایەوە جۆرە ئەفسانەیەکە بەسەریدا هاتووەو لە نەستی کەڵەکە بووەو، لەنێو ئەم پەرەگرافە ئەو بەسەرهاتانە ڕەنگیان داوەتەوە.

## ٢- دووبارەکاری پچڕ پچڕ :

بریتییە لەوەی هۆنیار دووبارەکراوەکە لە چەند شوێنێکی ناو دێرەکانی هۆنراوەکە، یان لە چەند هۆنراوەیەك بەکاردەهێنێت. بۆ نموونە شوێن وەك چوارچێوەیەکی کراوە، یان داخراوە بەهاو ڕۆڵی گرنگی خۆی هەیە لە هزرو نەستی مرۆڤدا، چونکە دەبێتە هۆکاری دروستبوونی کۆمەڵێ یادەوەری لەئانوساتی خۆیدا بریسکە دەدات و، دەبێتە هۆی وروژاندنی ناخەوەی مرۆڤەکە، بەتایبەتی ئەگەر ئەو مرۆڤە هۆنیارێکی خاوەن هەستێکی ناسك بوو وەك سەباح ڕەنجدەر، کەوا سەرجەم چامە شیعرییە نۆبەرەکەی بەناوی (زێوان) بۆ گێڕانەوەی چەندین یادەوەری منداڵیی خۆی لەو گوندەی تێیدا لەدایك بووە گوندی دەربەندی گۆم، هەرچەندە ڕاستەوخۆ ناوی ناهێنێ، بەلاّم لەڕێی (٤٣) چلو سێ جار دووبارەکردنەوەی دەستەواژەی (گوندی گەنجینەی منداڵیم) بۆمان دەردەکەوێت تا چەندێ ئەو گوندەی بووەتە هۆکاری دروستبوونی ئەو گەنجینە پڕ لە یادەوەرییەکانی، کەوا لە هەندێ شوێندا سووکە دەسکارییەکی ئەم دەستەواژەی کردووە، بەلاّم لەڕێی ئەو دووبارەکارییە توانیویەتی جۆرە ئەفسانەیەکی سەرنجڕاکێش بۆ گوندەکەی. بۆ نموونە :

**کۆلاّنەکانی دەیگەیاندمە قوتابخانەو گۆڕەپانی ڕووخۆشی تۆپی پێ**
**پاشان دووکانە پڕ نهێنییە ڕەنگاوڕەنگەکانی گوندی گەنجینەی منداڵیم**
**چاوی خەون جۆگەی هاوێشت**[٣٠]

**یان دەڵێت :**

**گوندی گەنجینەی منداڵیم حەوش و بانێکی خانەدانە**
**جۆگە لە ناویدا سێبووری دەداتە**
**ئەو کەنارانەی پێی ڕاوچییەکان ڕێزیان گرتووە** (کۆشیعری زێوان / ل٢٤)

**یان دەڵێت :**

**گۆڕێك لە گوندی گەنجینەی منداڵیم ڕێنمایکەریمە** (کۆشیعری زێوان / ل٢٥)

**یان دەڵێت :**

**چرا بە ناوچەوانی کۆلاّنی**

**گوندی گەنجینەی منداڵیم هەڵواسراوە** (کۆشیعری زێوان / ل٢٨)

ئـەم جـۆرە وێنانـە بـۆ تۆبۆگرافیـای گوندەکـە بەشـێوەیەکی کاریگـەر لـە یادەوەرییەکانی چەسپیوە، بۆیە جۆرە پیرۆزییەکی گوندەکەی لا دروست بـووە، ئەوسا بەڕاشکاوی ڕایدەگەیەنێت کەوا گوندەکەی ٤/٣ پێکهاتەی بەشەکانی گیـانی خۆیەتی :

**ئەم دنیایە**

**سێ بەشی ئاوە**

**بەشێکی زەوی**

**منیش سێ بەشم گوندی گەنجینەی منداڵی**

**بەشەکەی دیکە حەکایەتی پاڵەوانەکانی دەم ئاگردانی داپیرە**

(کۆشیعری زێوان / ل٣٧)

تەنانەت گوندی گەنجینەی منداڵی هۆنیار بووەتـە هـەوێنی بەخـشینی سرووشـی دەستنووسی هۆنراوەکانی و، لەم بارەیەوە دەڵێت :

**دەچمەوە گوندی گەنجینەی منداڵیم**

**خاڵی ڕووی بەردەکانی**

**هەموو دەستنووسەکانم دەداتێ**

**دەمکات بە نووسەری بێهاوتاو بێباک** (کۆشیعری زێوان / ل٤٧)

دیارە شەیدایی ئەم هۆنیارە بۆ گوندی گەنجینەی منداڵی دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی لەوێ سرووشی پێغەمبەرێکی پێگەیشتووە، بۆیە دەڵێت :

**لە دیوی ئەم دیو گوندی گەنجینەی منداڵیم**

**گوێم لە دابەزینی سرووشی پێغەمبەرێکە**

**یەکەمین خەونی مرۆڤی بینیوە** (کۆشیعری زێوان / ل٤٨)

ئەم وەبیرهاتنەوەی گوندی منداڵیی هۆنیار لەسەر زاری خۆیەوە بـۆ بەجێهێـشتنی ڕەنگی خۆیەتی لەو گوندە، کەوا لەم بارەیەوە دەڵێت :

**ئەو گوندی گەنجینەی منداڵیمە**

**ڕەنگم لەناو جێهێشتووە** (کۆشیعری زێوان / ل٦٨)

پـاش ئـەم بەسـەرکردنەوەی گونـدی گەنجینـەی منـداڵێتی، ئەوسـا ڕاسـتەوخۆ ڕایدەگەیەنێت :

**لەنێوان لەدایکبوون و مردندا**

**گوندی گەنجینەی منداڵیم**

**یادەوەرییەکی جوان و ئەفسانەیەکی بەهێزە**

**لەناوی دانیشم خەیاڵ خۆشحاڵم دەکات** (کۆشیعری زێوان / ل٧٦)

تەنانـەت هۆنیـار نایـەوێت بـەهیچ شـێوەیەك لـە گونـدی گەنجینـەی منـداڵێتی دابپچڕێت، چونکە بەلایەوە لە بەهەشت نەرم و نیانترە، بۆیە دەڵێت :

**ئەی لە بەهەشت نەرم و نیانتر گوندی گەنجینەی منداڵیم**

**ئەگەر چەتەکان ڕێیان نەدام بێمەوە ناوت**

**دڵم لە یاخەم دەدەم**

**کۆلارە هەڵدەدەم و دەگەشێمەوە** (کۆشیعری زێوان / ل٨٤)

لە کۆتایی ئەم چامە شیعرە هۆنیـار ڕایدەگەیـەنێت گونـدی گەنجینـەی منـداڵێتی دایکە نازدارو نازەنینەکەیەتی :

**گوندی گەنجینەی منداڵیم**

**دایکێکە خاوەن کۆمەڵێ نازدارو نازەنین** (کۆشیعری زێوان / ل٩٧)

لـە کۆشـیعری (سـاڵی سـفر)دا ئـەم جـۆرە دووبارەکارییـە پچڕپـچڕمان بەرچـاو دەکەوێت لەڕێی دووبارەکردنەوەی وشـەی (باڵنـدە) لـە سـەرەتای چـەند دێرێکـی هۆنراوەکە :

**باڵندەی بەیان**

**هیچ شتێك لەبارەی تاریك و ڕوون نازانێت**

**دەستەوەستان چاوەڕوانی ڕژانی خۆرە**

**باڵندەی باران**

**هیچ شتێك لەبارەی تێنوێتی زەوی نازانێت**

**دەستەوەستان چاوەڕوانی دابارینە**

**جادووبازی حەکایەتخوان**

**لەسەر چیای زێڕو زیو وەستاوە**
**باڵندەیەكی فریودەری**
**بۆ بەڕێوەبردنی زەمین نارده خوارەوە**
**باڵندەی فریودەر**
**بەردی یاقووت خۆراكیەتی** (كۆشیعری ساڵی سفر / ل٨٣)

هەر لەم كۆشیعرە، كەوا بریتییە لە (١٦٦ كۆپلە شیعری بێ ناونیشان دوو جاری دیكە دووبارەكرنەوەی پچڕپچڕی بەكار هێناوە :

**<u>سمۆرە</u> بە ئاسانی بەدار هەڵدەگەڕێ**
**گاز لە دڵی فەریكە گوێز دەگرێ**
**گۆپكەو چرۆ بریندارن**
**<u>سمۆرە</u> دارگوێزێكی كلۆر كرد** (كۆشیعری ساڵی سفر / ل٥١)

**هەروەها :**

**<u>ڕەنگی</u> یەكەم مرۆڤ**
**لە خۆری سبەینان دەچوو**
**پاشان خۆر**
**<u>ڕەنگی</u> بردەوە سەر ڕەنگی هەموو شتەكان** (كۆشیعری ساڵی سفر / ل٦٠)

## ٣- دووبارەكردنەوەی واتا :

بریتییە لەوەی واتای هەمان وشە لەڕێی هاودەنگی، یان هاواتاییەوە دووبارە بكرێتەوە. ڕێژەی ئەم جۆرە دووبارەكارییە كەمترە، هەرچەندە زیاتر توانای زمانەوانی هۆنیارەكەو دەوڵەمەندیی گەنجینەی فەرهەنگیی هۆنیارەكە دەخاتەڕوو. وەكو لە كۆشیعری (زێوان) بەرچاومان دەكەوێت كاتێك مردن و ناشتنی هەندێ هۆنیار وەك نالی و حاجی قادری كۆیی و مەولەوی لەشوێنی لەدایكبوونیان دەبێتە خۆڵ و بەسەر زامی برینەكانی منداڵییان بكرێت، پاشان دەبێتە جێی شانازی بۆ خەڵكی ئەو گوندە، بۆیە ئەم هۆنیارەیش لەڕێی ئەم جۆرە دووبارەكردنەوەیە دەیەوێت ئەو جۆرە واتایە ڕابگەیەنێت، واتە ئاواتەخوازە

خۆڵی ئێسکەکەی بەسەر برینی سەردەمی منداڵییدای بکرێ پاش مردنی و ببێتە جێی شانازی بۆ خەڵکەکەی هەروەك چۆن گوندەکانی نالی و حاجی قادری کۆیی و مەولەوی بوونە جێی شانازی بۆ خەڵکی ئەو گوندانە :

**نالی ئێسکەکانی خۆی بە خاك و خۆڵی بەخشی**

**تا ببێتەوە خۆڵ**

**بەسەر برینی منداڵییدا بکرێ**

**ژانی بشکێت**

**حاجی قادری کۆیی ئێسکەکانی خۆی بە گۆڕ قەرەج بەخشی**

**تا ببێتەوە بە خۆڵ**

**بەسەر برینی منداڵییدا بکرێ**

**ژانی بشکێت**

**مەولەوی ئێسکەکانی خۆی بەسەرشاتە بەخشی**

**تا ببێتەوە بە خۆڵ**

**بەسەر برینی منداڵییدا بکرێ**

**ژانی بشکێت**

**منیش ئێسکەکانی خۆم بە دەربەندی گۆم بەخشی**

**تا ببێتەوە بە خۆڵ**

**بەسەر برینی منداڵیمیدا بکەم** (کۆشیعری زێوان/ ل٧٣–٧٤)

لە کۆپلەی شیعریی ژمارە (١,٨)ی نێو کۆشیعری (ساڵی سفر)دا بەکارهێنانی وشەی دایك بۆ چەند واتاو مەبەستێك لەڕێی دووبارەکردنەوە وەك لەم پەرەگرافە دەردەکەوێت :

**زەوی زۆر دەوڵەمەندە**

**کە کانییەکی نەرم و کراوەی چاوی لە ئێمە دەگێڕێ**

**جوانیش لەگەڵی لەدایك دەبێت و دەبێتە دایك**

**بوون بە دایك**

**نامەیەکە خوداوەند پیتەکانی لێکداوە** (کۆشیعری – ساڵی سفر / ل١٣.)

هەروەها لە کۆپلە ژمارە (١١)ی کۆشیعری (ساڵی سفر) ئـەم دووبارەکارییـە بـۆ وشەی (شاژن) کراوە :

**ئەسپ کە لەناو تەمی بەیانییاندا دەڕوات**

**<u>شاژنی</u> ڕۆژە**

**مانگیش <u>شاژنی</u> شەوە** (کۆشیعری – ساڵی سفر / ل٢٧)

هەروەها وشـەی (بیرنەچـوونەوە) لـەکۆتایی هـۆنراوەی (بیرنەچـوونەوە) دووبـارە کراوەتەوە تا هەرسێ ڕەنگی خوداو ئاو و شیعر لەبیر نەکرێت :

**بینیبێت و بیری چووبیتەوە**

**بیرنەچوونەوە بەهەموو ڕەنگەکان خۆی دەنوێنێ**

(کۆشیعری سەدو یەکشەوە / ل١٢٨)

هەروەها لەهۆنراوەی (تۆڕ)دا وشەی (جەنگ) لەنێو سێ دێری هۆنراوەکە دووبـارە کراوەتەوە وەك جەختکردنێك لەسەر واتای کاریگەری ئەم وشەیە :

**جەنگ لە سروودەکانماندایە**

**کوردستان لەناو سروودی جەنگدا**

**شەهیدەکانی ڕووسوورن** (کۆشیعری سەدو یەکشەوە /ل١٢٠)

لە هۆنراوەی (چارەنووس) هەردوو وشەی (ڕنین)و (گیان) لەسێ دێردا بۆ دوو جـار دووبارە کراوەتەوە، بەڵام هەست بە هۆکاری دووبارەکردنەوەکەی ناکرێت :

**شەو وەرزی پێگەیینیتی**

**لە خەون و بێداریمدا دەیڕنم**

**بۆ ڕنین هانا بۆ هێزی گیان دەبەم**

**گیان ماڵێکی تەواوە** (کۆشیعری سەدو یەکشەوە /ل٦٤)

لە هۆنراوەی (سوێسکە) سێ جار وشەی (ژماردن) دووبارە دەکاتەوە بەمەبەسـتی دڵنیابوونی سوێسکەکە لە مانەوە هێلکەکانی :

**سوێسکە هێلکەکانی دادەنێ**

**دەیانژمێرێ و بێ دوودڵی لەسەریان دەکەوێ**

**بۆ ماوەیەك لەبیری هیچدا نابێ**

**تا جووجکەکانی سینگی دەخورێنن**
**دووبارە دەیانژمێرێتەوە**
**لەنێوان هێلکە و جووجکەدا**
**شتێك وا لەناخی دەكات**
**ژماردن دووبارە دەكاتەوە** (کۆشیعری سەدو یەکشەوە /ل١٣)

## ٤- دووبارەکاری بەندی:

ئـەم جـۆرە دووبارەکارییـە پێـشی دەوترێـت دووبارەکردنـەوەی شـێوازی و، لـە زمانی عەرەبیـدا پێـی دەوترێـت (تکـرار اللازمـە) و، بـە ئینگلیـزی پێـی دەوترێـت (Refreindre) کەوا لە وشەی لاتینی (Refirgere) وەرگـیراوە بـە واتـای دووبـارە دەکاتــەوە، بــەواتای دووبارەکردنــەوەی چــەند دەنگێـك، یـان چــەند وشــەیەك. دووبارەکردنەوەی بەندی بریتییە لەوەی دێرێك لە چەند شوێنێکی نێـو هۆنراوەکـە وەکو خۆی دووبارە دەکرێتەوە بەمەبەستی جەختکردن و وەبیرهێنانەوە، چـونکە دووبارەکراوەکــە هـــەڵگری جـــۆرە مەبەســـتێکە بۆیـــە هۆنیـــار لـــەڕێی ئـــەو دووبارەکردنەوە مەبەستی جەختکردنەکەی بـۆ خوێنەرەکـەی ڕادەگـەیێنێت، ئـەم جۆرە دووبارەکردنەوە لـە کۆشـیعری (زێـوان) بەرچـاومان دەکـەوێت کاتێـك (٤٣) جـار (گونـدی گەنجینـەی منـداڵیم) دووبـارە دەکاتــەوە، هــەروەها ســەر لــەنوێ داڕشتنی ئەم هۆنراوەیەو بڵاوکردنەوەی لەنێو کۆشیعری (خەون واخۆی گێڕایەوە) دیــسانەوە ئــەو فرێــزەی (٤١) چــلویەك جــار وەك دووبارەکارییــەکی جــەختی دووبارەی کردۆتەوە بەمەبەستی جەختکردن لەسەر کاریگەری گوندی لـەدایکبوون و ســەردەمی منــداڵی هۆنیــار لەســەر کەســایەتییەکەی. ئــەو گونــدەش گونــدی (دەربەندی گۆم) کەوا سەر بە شارۆچکەی (دووبـز – کـەرکووك)ەو هۆنیـار تێیـدا لــەدایك بــووە، ئــەو شــوێنە دەبێتــە ڕەگــی گەنجینــەی کاریگــەری ســەردەمی منداڵبوونی هەروەك چۆن گۆستاڤ باشلار لە کتێبـی (جوانییـەکانی شـوێن) ئامـاژە بــەوە دەکـات کــەوا (شــوێن ڕەگــی منداڵێتییــە). تەنانــەت هۆنراوەیــەکی بــەناوی

گوندەکەیەوە لە کۆشیعری (شەڕی چل ساڵە) بلاَو کردۆتـەوە گونـدە بـچووکەکەی بە خوای چواندووە تێیدا دەڵێت :

**گوندە بچووکەکەی خوا**

**دەربەند**

**ڕووناك و گەرم بەتریفەی مانگ**

**فێنك بە گەشەی سپیەکانی درەخت و دڵخۆش**

**بەکوڕی یەکەم زگی خۆت من**

**گیا پەخشانی زەوییە**

**کوڕی پێهاتەی سروشتت نووسیویەتی** (کۆشیعری شەڕی چل ساڵە / ل٩٤)

دووبارەکاری بەندی دوو چەشنە : یەکەمیان پێـی دەوترێـت دووبارەکردنـەوەی پێشەوەی، ئەمەیان لەنێو شیعری ئەم شاعیرەدا بەرچاو ناکەوێت. دووەمیان پێـی دەوترێت دووبارەکردنەوەی پاشـکۆیی و، ئـەم جۆرەیـان زۆر بـەکارهێنراوە لـەنێو هۆنراوەکـانی ئـەم هۆنیـارە هاوچـەرخە. بـۆ نموونـە لـە پـەرەگرافی ژمـارە (١)ی هۆنراوەی (سرووش) دا ڕستەی (کتێبی چارەنووس دادەگیرسێ دەروونت دەکا بە درەوشانەوە) چەند جارێك دووبارە کراوەتـەوە بـە مەبەسـتی جـەختکردن لەسـەر ئەوەی کتێبی چارەنووس کاتێك دابگیرسێت ڕۆڵی خۆی دەبێت لـە درەوشـانەوەی دەروونی پەیام وەرگرەکە :

**باز لە گەرمایی ئاگری پیس نەبوو فامی کرد بۆنی ڕیایی لە دەنووکی سڕی**

**پڕە لە سۆز بەتەواوی ڕازەکانی برادەرایەتیت لەگەڵ دەبەستیَ**

**کتێبی چارەنووس دادەگیرسیَ دەروونت دەگا بە درەوشانەوە**

**پڕە لە بێگەرد بەتەواوی ڕازەکانی برادەریەتیت لەگەڵ دەبەستیَ**

**کتێبی چارەنووس دادەگیرسیَ دەروونت دەگا بە درەوشانەوە**

**پڕە لە بەندە ناس بەتەواوی ڕازەکانی برادەرایەتیت لەگەڵ دەبەستیَ**

**کتێبی چارەنووس دادەگیرسیَ دەروونت دەگا بە درەوشانەوە**

**پڕە لە جەربەزە بەتەواوی ڕازەکانی برادەرایەتیت لەگەڵ دەبەستیَ**

**کتێبی چارەنووس دادەگیرسیَ دەروونت دەگا بە درەوشانەوە**

**منداڵی بەرەو ئاگری پیس نەبوو هەنگاومان پێ هەڵدەهێنێ**
**چارەنووس بەرەو ئاگری پیس نەبوو هەنگاومان پێ هەڵدەهێنێ**
**شکۆ بەرەو ئاگری پیس نەبوو هەنگاومان پێ هەڵدەهێنێ**
(کۆشیعری خەون واخۆی گێڕایەوە / ل٥٩)

دووبارەکردنەوەی بەندی هەروەها دوو جۆرە : یەکەمیان بەندی سەقامگیر کەوا بریتییە لە دووبارەکردنەوەی دێر، یان بەیتە شیعرییەکە وەکو خۆی، دووەمیان بەندی خاو کەوا بریتییە لە دووبارەکردنەوەی دێر، یان بەیتە شیعرییەکە پاش هەندێ دەستکاری.

## ٤-١ : دووبارەکاریی بەندیی سەقامگیر :

بریتییە لەوەی دێرەکە، یان بەیتە شیعرییەکە وەکو خۆی دووبارە دەکرێتەوە بێ هیچ دەستکارییەك لەڕووی لابردنی وشەیەك، یان بۆ زیادکردنی وشەیەك. ئەم جۆرە دووبارەکارییە پێشی دەوترێت دووبارەکاری درێژ لەوانەیە جۆرە بێزارییەك لای خوێنەر دروست بکات. ئەم جۆە دووبارەکارییە لەنێو شیعری ئەم هۆنیارەدا بەرچاو دەکەوێت، بۆ نموونە لە پەرەگرافی سێیەمی هۆنراوەی (سرووش)دا دێرە شیعری (لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران) چوار جار بەشێوەی پچڕپچڕ وەکو خۆی دووبارە کراوەتەوە :

**زەبرو زەنگ لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**
**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**
**فرِوفێڵ لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**
**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**
**ڕکو کینە لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**
**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**
**پڕو پاگەندە لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**
**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**
(کۆشیعری خەون واخۆی گێڕایەوە، ل٦٥)

## ٤-٢- دووبارەکردنەوەی بەندیی خاو (مائع) :

بریتییە لەوەی دێرەکە، یان بەیتە شیعرییەکە بەدەستکارییەوە دووبارە دەکرێتەوە لەڕووی لابردنی وشەیەك، یان بۆ زیادکردنی وشەیەك. ئەم جۆرە دووبارەکارییە لەنێو شیعری ئەم هۆنیارە زیاتر لە دووبارەکاریی سەقامگیر بەرچاو دەکەوێت، ئەمیش لەڕووی دەروونییەوە دەلالەتی ناسەقامگیری باری دەروونیی هۆنیار دەخاتە ڕوو لە کاتی بەکارهێنانی ئەم جۆرە داڕشتنە شیعرییە، کەوا لەوانەیە لای خوێنەر بێزاری دروست نەکات. ئەم جۆرە دووبارەکارییە لە هۆنراوەی (سرووش) بارێکی قورس وەردەگرێت کاتێك بەشێوەیەکی بەدوایەکتری ئەستوونی هەمان دەستەواژەی (تارمایی یان خەون یان مرۆڤی ڕوون مانایان بە ژیاندا) چوار جار دووبارە دەکاتەوە لەپێناو جەختکردن بەسەر گومان، یان ڕاڕایی نێو دەروونی :

**تارمایی یان خەون یان مرۆڤی ڕوون مانایان بە ژیان دا**
**تارمایی یان خەون یان مرۆڤی ڕوون مانایان بە جوانی دا**
**تارمایی یان خەون یان مرۆڤی ڕوون مانایان بە زیندووبوونەوە دا**
**تارمایی یان خەون یان مرۆڤی ڕوون مانایان بە نەمری دا**

(کۆشیعری خەون واخۆی گێڕایەوە / ل٦٥)

لە هۆنراوەی (بلیمەت)دا جۆری بەکارهێنانی دووبارەکردنەوە چەشنێکی دیکە وەردەگرێت ئەویش تەنیا دووبارەکردنەوەی فرێزی (کتێبی دایك و باوك) بۆ شەش جار لەچەند شوێنێکی نێو ئەم هۆنراوەیەدا بەم شێوانەی خوارەوەدا:

- نووسەرێکە بەزمانی دایك و باوك دەنووسێ
- کتێبی دایك و باوك تێدا سیمای خۆش بنوێنێ
- ئەو ڕازانەی کتێبی دایك و باوك بانگی کردووم
- دۆستە شیر پاکەکانی بانگ دەکاتە ناو کتێبی دایك و باوك
- زەمینی جوانی کتێبی دایك و باوك
- کتێبی دایك و باوك لەبەرەو سەرەتا بوونەوەدایە

ئەم جۆرە پەرتەوازە بوونەی دووبارە کردنەوەی ئەم فرێز هەمان کاریگەری دووبارە کردۆتەوە پێشووی نییە، کەوا هۆنیار ڕاستەوخۆ بەدوایی یەکتر دووبارەکردنەوەی دێرە شیعرەکەی بەکارهێناوە بۆ ئەوەی کاریگەری خۆی هەبێ لەسەر سەرنجڕاکێشانی خوێنەردا، بەڵام ئەم جۆرە کاریگەرییەی زۆر ناوێت لە پەرتەوازەکردنی دووبارەکردنەوەی نێو شیعردا. ئەم هۆنیارە لە هۆنراوەی (بۆنە)دا دەستەواژەی (ئەو گوڵەی لە....) لە سەرەتایی شەش دێڕی شیعری بەدوایی یەکتر هاتووە دووبارە دەکاتەوە هەر جارێك بۆ بۆنەیەکی تایبەت لە ژیانی خۆیدا تەرخان کراوە، بەم شێوەیە دووبارەکردنەوەکە دەبێتە مایەی نیشاندانی بۆنەکانی پێشکێشکردنی گوڵ لە ژیانی مرۆڤدا:

**سوپاس بۆ گوڵی بۆنەکان**

**ئەو گوڵەی لەیەکەم ڕۆژی لەدایکبوونم پێشکێشم کرا**

**ئەو گوڵەی لە یەکەم ڕۆژی چوونە قوتابخانەم**

**ئەو گوڵەی لە یەکەم ژووانی دڵداریمدا**

**ئەو گوڵەی لە بڵاوکردنەوەی یەکەم شیعرمدا**

**ئەو گوڵەی لە چاپکردنی یەکەم کتێبمدا**

**ئەو گوڵەی لە ڕۆژی زاوایەتیم**

**من لە ژیان بەردەوامم** (کۆشیعری شەڕی چل ساڵە / ل٤٦)

لە پەرەگرافی ژمارەی (١)ی هەمان هۆنراوەدا (هەفتەی ئاسوودەیی) بۆ شەش جار لەناوەڕاستی دێرەکان دووبارە دەکاتەوە:

**مۆزەخانەیەکی لە هەفتەی ئاسوودەیی مەستتر لە ڕابردوو**

**پیاوێکی لە هەفتەی ئاسوودەیی چاو ڕوونتر لە ئاگر**

**گوڵدانێکی لە هەفتەی ئاسوودەیی بەدیدارتر لە پەنجەرە**

**ماسییەکی لە هەفتەی ئاسوودەیی دڵخۆشتر لە ئاو**

**درەختێکی لە هەفتەی ئاسوودەیی بە بەرهەمتر لە دارستان**

**گلۆپێکی لە هەفتەی ئاسوودەیی سەرەتایی تر لە خەون**

(کۆشیعری شەڕی چل ساڵە / ل٤٦)

هەروەها لە پەرەگرافی سێیەمی هۆنراوەی (سرووش)دا دێرە شیعری فرێزی ناوی (لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ)، هەروەها دێری (لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**)** چەند جارێك لەم هۆنراوەدا بەشێوەی دووبارەكردنەوەی بەندیی خاو دووبارە كراونەتەوە :

**زەبرو زەنگ لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**
**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**
**فڕوفێڵ لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**
**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**
**ڕكو كینە لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**
**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**
**پڕو پاگەندە لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**
**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**

(كۆشیعری خەون واخۆی گێڕایەوە / ل٦٥)

لە هۆنراوەیەكی نێو كۆشیعری (سالّی سفر)دا شێوازێكی دیكەی بەكارهێناوە ئەویش لەنێوان دووبارەكراوەكاندا دێرە شیعرێكی جیاوازی بەكارهێناوە، وەكو :

**گولّ خەریكی ژیانی تایبەتی خۆیەتی**
**با خۆڵ نەكاتە چاوی**
**باڵندە خەریكی ژیانی تایبەتی خۆیەتی**
**دەوری هێلانەی بە بەردی بەنرخ و ئەفسانە بچنێت**
**كاتژمێر خەریكی ژیانی تایبەتی خۆیەتی**
**دەستی لەسەر دڵیەتی بۆ ئەوەی درۆزن دەرنەچێ**
**قاوەچی خەریكی ژیانی تایبەتی خۆیەتی**
**لێوی پیاڵەی بەرەو ناسكی و نەرمی ببا**
**كەروێشك خەریكی ژیانی تایبەتی خۆیەتی**
**نازی گیای تەڕو نازی**
**ددان هاتنی بێچووەكان بەراورد دەكات**

(كۆشیعری سالّی سفر / ل١٨٣)

هەندێ جار هۆنیار لەشێوازی داڕشتنی هۆنراوەکەی فرێزی دووبارەکراوەکەی پێش و پاشێکی لێدەکەوێت وەکو :

**من و شیعر گوڵێکین لە دەستی بادا**

**ئەدی ئەی یاری نهێنی**

**ئەو دەستە کێیە لە با وەرمان دەگرێت**

**ئەمسەرو ئەوسەری مەرگت بۆ دەکەم**

**ئەی ژیان و حیکمەتی بەرزبوونەوە تا لای شیعر**

**ئەوسەرو ئەمسەری ژیانت بۆ دەکەم** (کۆشیعری ساڵی سفر / ل١٢٧)

لە کۆپلە شیعری ژمارە (٧٤)ی نێو کۆشیعری (ساڵی سفر)دا وشە دووبارەکراوەکان لە دووەم دووبارە کردندا بە نوقسانی دەبێ :

**چاو و**

**گیان و**

**ناخ و**

**دڵ ماندوو ناکات**

**شنەیەکی نەرم و ئارام هەڵی کردووە**

**دانە مرواری تاسەو گەرمیایی خۆی**

**دەباتە ناو**

**چاوو**

**گیان و**

**ناخ و**

**دڵ** (کۆشیعری ساڵی سفر / ل٩٢)

## ٤-٣- دووبارە کردنەوەی بەندیی تێکەڵ :

ئەم جۆرە دووبارەکارییە بریتییە لەوەی هۆنیار هەردوو جۆری دووبارەکردنەوەی بەندی لە هەمان هۆنراوە بەکاربهێنرێت. بۆ نموونە لە هۆنراوەی (سرووش)دا دەڵێت :

**زەبرو زەنگ لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**
**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**
**فرِوفێڵ لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**
**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**
**ڕکو کینە لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**
**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**
**پڕو پاگەندە لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**
**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**

(کۆشیعری — خەون واخۆی گێڕایەوە، ل٦٥)

لە دێرەکانی (١و٣و٥و٧) دووبارەکردنەوەی بەندی خاوە، کەوا سەرەتای دێرەکان دەستکاری کراوە، بەلاّم دێرەکانی (٢و٤و٦و٨) دووبارەکردنەوەی سەقامگیرە، چونکە هەموو دێرەکە وەکو خۆی دووبارە کراوەتەوە. لێرەدا پێویستە بلّێین ئەگەر بەندە دووبارەکراوەکە یەك وشە، یان دوو وشە بێت ئەوا پێی دەوترێت دووبارەکردنەوەی نادرێژ، بەلاّم ئەگەر دووبارەکراوەکە هەموو دێر، یان بەیتەکە بوو ئەوا پێی دەوترێت دووبارەکردنەوەی بەندی درێژ، چونکە چەندین وشە وەکو خۆی دووبارە دەکرێتەوە. هەرچۆنێك بێت دووبارەکردنەوەی بەندی بەکاری بەستنەوەی دێر، یان بەیتەکانی هۆنراوەکە هەڵدەستێت، جۆرە یەکێتییەك بەبینای هۆنراوەکەو مۆسیقاکەی دەبەخشێت، هەروەها ئەم جۆرە دووبارەکردنەوە پێویستی بە جۆرە شارەزاییەك هەیە بۆ ئەوەی هۆنیار بزانێت لە کوێ بەندەکە دووبارە بکاتەوە، هەروەها دووبارەکردنەوەی خاوی جۆرە چاوەڕوانییەك لای دروست دەکات، کەوا لە جاری تازەی دووبارەکردنەوەکە چ دەسکارییەك دەکرێت، بۆیە پێویستە هۆنیار سووکە دەسکاری بکات، ئەم جۆرە سووکە دەسکارییە لای ئەم هۆنیارە لەو هۆنراوەی سەرەوە بەرچاو دەکرێت.

هەروەها لە پەرەگرافی ژمارە (١)ی هۆنراوەی (سرووش)دا هەردوو جۆری دووبارەکردنەوەی سەقامگیرو خاومان بەرچاو دەکەوێت، چونکە (١٤) جار دەستەواژەی (نووسەری هەموو ژیان) وەك دووبارەکاریی سەقامگیر دووبارە

کراوەتەوەو، بەهەمان شێوە دێری (کتێبی چارەنووس دادەگیرسێ دەروونت دەگا بە درەوشانەوە) دووبارە دەکاتەوە، بەلام لەم هۆنراوەدا هەردوو دەستەواژەی (پڕە لە سۆز بەتەواوی ڕازەکانی برادەرایەتیت لەگەڵ دەبەستێ)و دەستەواژەی (منداڵی بەرەو ئاگری پیس نەبوو هەنگاومان پێ هەڵدەهێنێ) چەند جارێك بە شێوەی دووبارەکردنەوەی بەندیی خاو دووبارە کراونەتەوە، هەرجارێك وشەی سێیەمی هەردوو دەستەواژەکە بە وشەیەکی دیکە گۆڕاوە :

**باز لە گەرمایی ئاگری پیس نەبوو فامی کرد بۆنی ڕیایی لە دەنووکی سڕی**
**پڕە لە سۆز بەتەواوی ڕازەکانی برادەرایەتیت لەگەڵ دەبەستێ**
**کتێبی چارەنووس دادەگیرسێ دەروونت دەگا بە درەوشانەوە**
**پڕە لە بێگەرد بەتەواوی ڕازەکانی برادەرایەتیت لەگەڵ دەبەستێ**
**کتێبی چارەنووس دادەگیرسێ دەروونت دەگا بە درەوشانەوە**
**پڕە لە بەندە ناس بەتەواوی ڕازەکانی برادەرایەتیت لەگەڵ دەبەستێ**
**کتێبی چارەنووس دادەگیرسێ دەروونت دەگا بە درەوشانەوە**
**پڕە لە جەربەزە بەتەواوی ڕازەکانی برادەرایەتیت لەگەڵ دەبەستێ**
**کتێبی چارەنووس دادەگیرسێ دەروونت دەگا بە درەوشانەوە**
**منداڵی بەرەو ئاگری پیس نەبوو هەنگاومان پێ هەڵدەهێنێ**
**چارەنووس بەرەو ئاگری پیس نەبوو هەنگاومان پێ هەڵدەهێنێ**
**شکۆ بەرەو ئاگری پیس نەبوو هەنگاومان پێ هەڵدەهێنێ**
(کۆشیعری خەون واخۆی گێڕایەوە / ل٥٩)

**٥- دووبارەکردنەوەی بەرایی :**

ئەم جۆرە دووبارەکارییە زۆر باوە لەنێو شیعری نوێ و هاوچەرخداو " ئامانجی سەرەکیی دووبارەکاری بەرایی فشارخستنە سەر یەك حاڵەتی زمانی و، دووپاتکردنەوەی بۆ چەند جارێك بە چەند شێوەیەکی هاوچەشن، یان جیاواز لەپێناو گەیشتن بە دۆخێکی شیعریی تایبەت لەسەر دوو بنەمای ڕیتیمی و هێمایی وەستاوە "[٣١].

دووبارەکردنەوەی بەرایی، یان سەرەتایی بریتییە لەوەی وشە دووبارەکراوەکە لە سەرەتای دێرە شیعرییەکان دەبێت، پێشی دەوترێت دووبارەکاری ئەستوونی (التكرار العمودي)، چونکە وشە دووبارەکراوەکە لەسەرەتای دێرە بەدوایەکترەکان دەبێت. ئەم جۆرە دووبارەکارییە زۆر باوە لەنێو شیعری نوێ و هاوچەرخدا، کاریگەریی ئەم جۆرە دووبارەکارییە پابەندە بەتواناو هێزی شێوازی شیعریی هۆنیارەوە، ئەگینا بە کاروکردەوەیەکی شیعریی زۆر سادە دادەنرێت. ئەم جۆرە دووبارەکارییە لە شیعری ئەم شیعرە دەکەوێتە بەرچاو، بەلاّم هەندێ جار بەشێوەیەکی لاواز دێتە بەرچاو، چونکە نەیکردووەتە دەستپێکێکی کاریگەر بۆ پەلکێشکردنی خوێنەر بۆ نێو جیهانی هۆنراوەکە کاتێك لە دوو سێ دێرێکی هۆنراوەکە بەکاری دەهێنێت. بەلای د.ئازاد ئەحمەد مەحموودەوە " ئامانجی سەرەکی ئەم جۆرە گەڕانەوە، بۆ مەبەستی گەیشتن بە بوارێکی شیعریی دیاریکراو، لە چەند داڕشتنێکی هاوشێوە یان جیاوازدا، لەسەر ئاستی ڕیتمی و دەلالی، جەخت لەسەر ورووژاندنی حاڵەتێکی زمان دەکاتەوە "[٣٢].

وشەی (ڕەنگ) لە هۆنراوەی (بیرنەچوونەوە) بووەتە دووبارەکارییەکی بەهێز کاتێك

هەرسێ ڕەنگەکە دەبنە پێکهێنەری خودی هۆنیارەکە :

**ڕەنگی خودا**

**ڕەنگی ئاو**

**ڕەنگی شیعر**

**پێکهێنەری هەرسێکیان منم** (کۆشیعری سەدو یەکشەوە / ل١٢٨)

هەروەها لە کۆشیعری (سەدو یەکشەوە) ئەم جۆرە شێوازەی دووبارەکاری بەرچاو دەکەوێت، بۆ نموونە لە سەرەتای هۆنراوەی (ڕەنگ) دەڵێت :

**بەهار**

**زەمین سەوز هەڵدەگەڕێ**

**هاوین**

**زەمین سوور هەڵدەگەڕێ**

**پایز**
**زەمین زەرد هەڵدەگەڕێ**
**زستان**
**زەمین سپی هەڵدەگەڕێ** (کۆشیعری سەدو یەکشەوە / ل١٤)
لەم دێرانەی سەرەوە وشەی (زەمین) کراوەتە دووبارەکارییەکی بەرایی بێ هێزە.

**٦ – دووبارەکردنەوەی کۆتایی:**

ئامانجی سەرەکیی ئەم جۆرە دووبارەکردنەوە " چڕکردنەوەیەکی هێمایی و ڕیتمییە لە کۆتایی هۆنراوەکە چەقبەست دەبێت "[٣٣] و، ئەم جۆرە دووبارەکارییە بریتییە لەوەی هۆنیار لە کۆتایی هۆنراوەکەی ئەم جۆرە دووبارەکارییە بەکاردەهێنی، هەرچەندە لەم حاڵەتە ژمارەی دووبارەکراوەکە کەم دەبێت بە حوکمی ئەوەی هۆنیار لە دوا هەنگاوەکانی نووسینی هۆنراوەکەیە، بەلاّم لەڕێی ئەم دووبارەکردنەوەیە هۆنیار دەیەوێت شتێك بەخوێنەرەکەی ڕابگەیەنێت. بەلای د.ئازاد ئەحمەد مەحموودەوە " گەڕانەوەی دوایی هەر وەك گەڕانەوەی بەرایی، پانتایی کاریگەربوونی لە چوارچێوەی پێکهاتنی بونیاتی قەسیدەدا ڕۆڵ دەبینێت لەناوەندی خاسیەت زمانی شیعرو دەستوورەکانی زمانەوانی، چەقی دەلالی و ڕیتمی، لە کۆتایی قەسیدە دیاری دەکات و بەربلاّوی ئاسۆکانی واتای دەلالەت و واتای ڕیتمی خەست دەکاتەوە "[٣٤]. لە شیعری ئەم هۆنیارەدا ئەم جۆرە دووبارەکارییە بەرچاومان ناکەوێت.

**٧- دووبارەکردنەوەی بازنەیی :**

بریتییە لەوەی هۆنیار لەسەرەتاو کۆتایی هۆنراوەکە دووبارەکراوەکە بەکاردەهێنێت وەك بازنەیەکی داخراو لە داڕشتنی هۆنراوەکە. بۆ نموونە وشەی (کەڵەباب) لەسەرەتاو کۆتایی کۆپلە ژمارە (٣٢) ی نێو کۆشیعری (زێوان)دا دووبارە کراوەتەوە :
**ئاسمان وەك کەڵەبابی چاوساغی دێ نووستووە**

..........

**کەڵەبابی چاوساغی دێ**

**هەتاو و سێبەرە** (کۆشیعری ساڵی سفر / ل٤٨)

هەروەها لە سەرەتاو کۆتایی کۆپلەی ژمارە (٤٧)ی نێو کۆشیعری (زێوان)دا وشەی (سەرسامبوون) دووبارە کراوەتەوە :

سەیر بوو

**سەرسامبوون** هەمیشە سەیرە

........

نهێنی بە یەکەم **سەرسامبوون** ناو دەنێم

هەموو شتێکیش دەچێتەوە

ناو یەکەم **سەرسامبوون** (کۆشیعری ساڵی سفر / ل٦٣)

ئەم جۆرە دووبارەکارییە بازنەییە لە هۆنراوەی (بیر نەچوونەوە)ش وەبەرچاومان دەکەوێتەوە :

**ڕەنگی خودا**

**ڕەنگی ئاو**

**ڕەنگی شیعر**

**پێکهێنەری هەرسێکیان منم**

.................

**جارێك ڕەنگی خوداو ئاوو شیعری**

**بینیبێت و بیری چووبیتەوە**

**بیرنەچوونەوە بەهەموو ڕەنگەکان خۆی دەنوێنێ** (کۆشیعری سەدو یەکشەوە / ل١٢٨)

## ٨- دووبارەکردنەوەی ڕازێنراو :

ئەم جۆرە دووبارەکارییە پێیشی دەوترێت پەیژەیی، یان هەرەمی و " بە گرنگترین جۆرەکانی دووبارەکارییە لەڕووی هونەرییەوە دادەنرێت، لەبەر

پێویستی بەهەندێ توانای شیعری بۆ دروستکردنی شێوەیەکی ئالۆز ڕێ بۆ هەندێ ئەنجامی شیعریی گرنگ خۆش دەکات، لە پێشەوەیان بەشداریکردنێکی گەورە لە گەشەسەندنی ڕیتیمی هۆنراوەکەو قوولکردنەوەی توانا مۆسیقییەکانی و، ئەم جۆرە دووبارەکارییە دەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی ئەندازەیەك لە سروشتی ئەزموونی هۆنراوەکە هەڵدەقولێت و ئەو شێوازە دووبارەکردنەوەی فەرزی دەکات لەگەڵ واقیع و تایبەتمەندییەکانی بگونجێت "[٣٥]، بەلام ئەم جۆرە دووبارەکردنەوەیە لەشیعری سەباح ڕەنجدەردا زیاتر شێوەی زەخرەف، یان ڕازێنراوی وەرگرتووە، چونکە لەم جۆرە دووبارەکارییەدا جۆرە ڕازانەوەیەك بەشێوە زەخرەفە بۆ تەنیا وشەیەکی تایبەت دەکرێت وەك سەرنجڕاکێشانێك بۆ گرنگی و بەها واتای ئەو وشەیە لە هزرو دەروونی هۆنیاردا. مۆرفێمی (بۆ) وشەیەکی واتادارە وەك ئامرازی پرسیارکردن زیاتر بەکاردێت، هەروەها مۆرفێمی (بۆ) ئەگەر بۆ کات و شوێن بەکار هات ئەوا دەلالەتی کۆتایی شوێن، یان کاتەکە ڕادەگەیەنێت، بۆیە هۆنیاریش ئەم وشەیەی زەقتر کردووە، چونکە مرۆڤی کۆن و هاوچەرخی کورد زۆر بەکاری دەهێنێ لە ژیانی ڕۆژانەیدا. ئەم هۆکارە وای لە هۆنیار کردووە چەندین جار لەنێو شێوەکانی خوارەوە دووبارەی بکاتەوەو، بەمەش ئەرکێکی زەخرەفەو جوانکاریی جوانی بە دووبارەکردنەوەی ئەم وشەیە داوە. ئەم شاعیرەش بەشداری خۆی هەیە لەم جۆرە دووبارەکارییە، ئەویش لەڕێی هەڵبژاردنی وشەی (بۆ) وەك ئامرازێکی پرسیارکردن یا ئامرازێکی پێوەندی و پێشکێشکردنی ئەم شێوە ڕازانەوانەی خوارەوە :

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ
بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ

بۆ

بۆ

بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

(کۆشیعری سالّی سفر / ل١٤٤)

بۆ

بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ

بۆ (کۆشیعری ساڵی سفر / ل١٤٥)

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ

بۆ (کۆشیعری ساڵی سفر / ل١٤٦)

بۆ

بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ بۆ

(کۆشیعری ساڵی سفر / ل١٤٧)

## ٩- دووبارەکاری ئەستوونی :

دووبارەکاری ئاسۆیی بریتییە لەوەی هۆنیار وشەیەك بۆ چەند جارێك لەنێو هەمان بەیت، یان دێڕە شیعرییەکە دووبارە دەکاتەوەو، ئەم جۆرە دووبارەکارییە

لەنێو سەرجەم هۆنراوەکانی نێو کۆشیعرەکانی بەرچاومان نەکەوت. دووبارەکاری ئەستوونی بریتییە لەوەی بۆ چەند جارێك لەنێو بەیت، یان دێڕە بەدوا یەکتر هاتووەکانی هۆنراوەکە دووبارە کراوەتەوە. بۆ نموونە ئەم هۆنیارە لە کۆپلەی ژمارە (٧٢)ی نێو کۆشیعری (سالّی سفر) ئەم کارەی کردووە چاومان بەم جۆرە دووبارەکارییە دەکەوێت کاتێك وشەی (براکوژی) لەسەرەتای سیانزە دێر بەشێوەی ستوونی دووبارەی کردۆتەوە :

**تراویلکەیەکی تەنگ**

**وەك خوری بەرخ لە ناوچەوانی شار درەوشایەوە**

**کێش و سەروای شیعرەکانی تەرازوو کردینەوە**

**براکوژی یەکەم**

**براکوژی دووەم**

**براکوژی سێیەم**

**براکوژی چوارەم**

**براکوژی پێنجەم**

**براکوژی شەشەم**

**براکوژی حەوتەم**

**براکوژی هەشتەم**

**براکوژی نۆیەم**

**براکوژی دەیەم**

**براکوژی یازدەم**

**براکوژی دوازدەم**

**براکوژی سێزدەم**

**کوڕ و کوڕەزام زۆر ماون** (کۆشیعری سالّی سفر / ل٨٩–٩٠)

لە پەرەگرافی (٣)ی هۆنراوە (سرووش) ڕستەی (لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران) بەشێوەی ئەستوونی بۆ چەند جارێك دووبارە کراوەتەوە :

**زەبرو زەنگ لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**
**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**
**فڕوفێڵ لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**
**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**
**ڕکو کینە لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**
**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**
**پڕو پاگەندە لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**
**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**
(کۆشیعری خەون واخۆی گێڕایەوە / ل٦٥)

**١- دووبارەکردنەوەی دەنگ :**

بریتییە لەوەی بۆ چەند جارێك لەنێو بەیت، یان دێڕە بەدوا یەکتر هاتووەکانی هۆنراوەکە دەنگێك بەشێوەی ناوخۆیی، یان دەرەکی دووبارە بکرێتەوە، لێرەدا ئاماژە بەوە دەکەین دووبارەکردنەوەی دەنگی ناوخۆیی لەناو دێرەکانی هۆنراوەکە لەوانەیە عەفەوی بێت، بەڵام لە دووبارەکردنەوەی دەنگی دەرەکی بەئەنقەست دەبێت بۆ پاراستنی سەروای هۆنراوەکە. لێرەدا پێویستە بڵێین دووبارەکاریی دەرەکیی دەنگ لەنێو هۆنراوەکانی ئەم هۆنیارە بەرچاو ناکەوێت، چونکە شیعری عەموودی نانووسێت تا دەنگێك ببێتە سەروای هۆنراوەکەو لە کۆتایی دێرەکان بنووسرێت، بەڵام دووبارەکاری ناوخۆیی دەنگ بەرچاو دەکەوێت کەوا لەنێو وشەکانی دێرێك، یان دێرەکانی هۆنراوەکە دووبارە دەکرێتەوە. بۆ نموونە لە هۆنراوەی (مەشخەڵ) شەش جار دەنگی (گ) بەشێوەیەکی ناوخۆیی دووبارە کراوەتەوە :

**دەموچاوی ژنی دوو گیان ئاگای لە گەشەی گەڵاو گوڵ هەیە**
**بەهار گەنجینەی گەورەو مەشخەڵی**
**دەستی دایە زەمینە** (کۆشیعری سەدو یەکشەوە / ل٩١)

هەروەها لە هۆنراوەی (گەنجینە) پێنج جار دەنگی (گ) دووبارە کراوەتەوە :

**ئەو هاودەنگییانەی**

**لە لێو دەبنە گەنجینەی شار**

دەنگێکە دەنگێکی دیکە دەبێتە هاودەنگی (کۆشیعری شەڕی چل ساڵە / ل٤١)

هەروەها لە هۆنراوەی (مردن) هەشت جار دەنگی (گ) دووبارە کراوەتەوە :

**ڕام گەیاند ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی مێژوو**

**پێشەنگایەك دەکەمەوە**

**تابووتێکی تێدا پێشکێش دەکەم**

**کە یاریی بە هەستەکانی من کردووە** (کۆشیعری شەڕی چل ساڵە / ل٨٣)

لەکۆتایی هۆنراوەی (خۆشحاڵی)دا شەش جار دەنگی (د) لە دوو دێردا دووبارە کراوەتەوە :

**خواوەند جارێك دێتە دیداریمان**

**دیداری دووبارە نابێتەوە** (کۆشیعری سەدو یەکشەوە / ل٧٩)

هەر لە پەرەگرافی (٣)ی هەمان هۆنراوە دوو دێرە شیعر چوار جار دووبارە دەکاتەوە بەدوای یەکتردا تەنیا وشەی یەکەمی سەرەتایی دێری یەکەم لە دووبارەکردنەوەیدا دەگۆڕێت وەکو:

**زەبرو زەنگ لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**

**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**

**فڕوفێڵ لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**

**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**

**ڕکو کینە لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**

**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**

**ڕپو پاگەندە لە هۆشی پیاوی ئەهریمەن نەژاد هاتە دەرێ**

**لە لایەنگریمان بۆ ژیانی ناز پەروەرو شیاو ڕووێندران**

(کۆشیعری خەون وا خۆی گێڕایەوە / ل٦٥)

دەنگی (ك) وەك دەنگێكی سووكی نەبزوێن (١٣) سیانزە جار لەنێو كورتە هۆنراوەی (مردن) دووبارە كراوەتەوە بەشێوەیەك لەهەموو دێرێكی هۆنراوەكە هەبوونی خۆی هەیە :

ڕام گەیاند ڕۆژێك لە ڕۆژەكانی مێژوو

پێشانگایەك دەكەمەوە

تابووتێكی تێدا پێشكێش دەكەم

كە یاریی بە هەستەكانی من كردووە

لەسەر ئەو قوڕەی بۆ دروستكردنی

ئادەم و حەوا خۆش كرا

كتێبی لەبیر نەچوونەوە جێ دەهێڵم (كۆشیعری شەڕی چل ساڵە /ل٨٣)

## ئەنجـــام

١- دووبارەكـاری شـیعری بنەمایـەكی سـەرەكی بنیـادی هونـەری هۆنراوەكـانی سـەباح ڕەنجـدەرە، كـەوا بـە هۆنیـار - شـاعیرێكی نوێخـواز لـە بـواری زمـانی شیعریدا ناسراوە.

٢- لـەنێو هۆنراوەكـانی ئـەم هۆنیـارەدا چـەندین جـۆری دووبارەكـاریی شـیعری بەرچاو دەكەوێت.

٣- ئـەم هۆنیـارە زۆر بـە جـوانی دووبارەكردنـەوەی شـیعری بەچـەند چەشـنێك لـەنێو بەشـێك لـە هۆنراوەكـانی بـەكارهێناوە لـە پێنـاو بەخـشینی جـۆرە كاریگەرییەك بە بەكارهێنانی دووبارە كردنەوە لەنێو دارشتنی شیعریدا.

٤- دووبارەكردنەوەی ڕستەی كـاری كاریگـەرترە لـە دووبارەكردنـەوەی ڕسـتەی ناوی بۆ خستنەڕووی كاریگـەریی دەروونیـی ڕووداوی نێـو بابـەتی هۆنراوەكـە، لەم ڕووەوە دووبارەكاریی ڕستەی كاری زیاتر لەنێو هۆنراوەكانی ئەم هۆنیـارە بەرچاو دەكەوێت، چونكە هەموو یارییەكی نێو زمانی شیعریی هۆنراوەكانی بـۆ بەرجەستەكردنی سروشتی ڕووداوی نێو هۆنراوەكەی بەكاردەهێنێت.

٥- دووبارەكاریی نادرێژ زیاتر لەنێو هۆنراوەكانی ئەم هۆنیارە بەرچاو دەكەوێت، چونكە ژمارەی جاری دووبارەكراوەكە كەمە.

٦- ئـەم هۆنیـارە زۆر جـار دووبارەكـاری بەنـدی (لازمـە)ی بەهـەردوو جـۆری سەقامگیرو خاوی بەكارهێناوە.

# سەرچــاوەکان

**کتێبەکان**

١- أ. د. أمين محمد عطية باشا - التكرار في القصص القرآني - دراسة تطبيقية على قصة موسى عليه السلام)، **لە ئەنتەرنێتەوە وەرگیراوە.**

٢- ئازاد ئەحمەد مەحموود- بونیاتی زمان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا ١٩٨٥-٢٠٠٥، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٩

٣- پەخشان عەلی ئەحمەد- شێوازی شیعری گۆران، نامەیەکی ماستەرە پێشکێشی کۆلێژی زمانی زانکۆی کۆیە کراوە، ٢٠٠٧

٤- حسين على شانوف- شعر الشاعر الكردي المعاصر گوران، ت: شكور **مصطفى**، **مطبعة دار الجاحظ**، بغداد، ١٩٧٥

٥- حوسێن مەحموود عەلی کەلاری- شێواز لە هۆنراوەی فەرهاد شاکەلی دا، نامەی ماستەرە پێشکێشی کۆلیژی زمانی زانکۆی کۆیە کردووە، ٢٠٠٨

٦- دیوانی نالی، مەلا خدری ئەحمەدی شاوەیسی مکایەلی، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و فاتیح عەبدولکەریم، محەمەدی مەلا کەریم ئەندامی یاریدەری کۆڕی زانیاری کورد پیاچووەتەوە، چ/ کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦

٧- سەباح ڕەنجدەر- خەون واخۆی گێڕایەوە - دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤

٨- سەباح ڕەنجدەر- کۆشیعری شەڕی چل ساڵە، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥

٩- سەباح ڕەنجدەر- کۆشیعری مردوویەك ئاگای لە هەموانە، چاپخانەی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٨

١٠- سەباح ڕەنجدەر - کۆشیعری سەدو یەك شەوە، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨

١١- سەباح ڕەنجدەر - کۆشیعری ساڵی سفر، چاپخانەی کەمال، سلێمانی، ٢٠١٠

١٢- السيوطي - الإتقان في علوم القرآن " (٣) طبعة مؤسسة النداء

١٣- د. زهير احمد المنصور - ظاهرة التكرار في شعر ابي القاسم الشابي، www.bwady.com

١٤- د.عشتار داود محمد- تقنية التوازي في الشعر الحديث، **لە** ئەنتەرنیتەوە وەرگیراوە

١٥- عدنان حسين العوادي - لغة الشعر الحديث في العراق، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٥
١٦- کەمال غەمبار- بەرەو جیهانی شیعری چەند شاعیرێك، دەزگای چاپ و بلأوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨
١٧- محمد عبد المطلب - بناء الاسلوب في شعر الحداثة، القاهرة، ١٩٨٨
١٨- نازك الملائكة - قضايا الشعر الحر، دار العلم للملايين /بيروت/ ط٥، ١٩٧٨
١٩- نەجات حەمید ئەحمەد - مێژووی خود لە ناو لەنگەرێك دا، چاپخانەی کریستاڵ، هەولێر، ١٩٩٧
٢٠- یاسین عومەر- شێرکۆ بێکەس- چەپکێك لە هەڤپەیڤین، ئەزموون ١٩٨٥-٢٠٠٠، چاپخانەی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١

## ڕۆژنامەو گۆڤار

١- كمال غمبار- موت المرأة، ت: سامان درزيي، جريده ميديا، ع/١١٨في ٢٠٠٣/٣/٥
٢- کەریم دەشتی- بەشێك لە یاداشتەکانی-با-هەڤپەیڤینی- تەلعەت تاهیر، گۆڤاری ئێستا، ژ/١٢، حوزەیرانی ٢٠٠٦

# پەراوێزەکان

(*) گرووپی پێشڕەوی شیعری لە هەولێردا بریتی بوو لەم هۆنیارانە :(سەباح ڕەنجدەر، جەلال بەرزنجی، هاشم سەڕاج، ئەنوەر مەسیفی، عەباس عەبدوڵلا یووسف، دڵشاد عەبدوڵلا) ·

[١] – نەجات حەمید ئەحمەد – مێژووی خود لە ناو لەنگەریەکدا، چ/ کوردستان، هەولێر، ١٩٩٧، ل١١

(*) ئەوانەی لەبارەی شیعری سەباح ڕەنجدەر بابەتیان نووسیوە، ئەمانەن : (د·محەمەد مەعرووف فەتاح، کەمال غەمبار، د· مارف خەزنەدار، شوکر مستەفا، محەمەد مەولوود مەم، عەبدوڵلا سەڕاج، نەجات حەمید ئەحمەد، د· لەتیف محەمەد حەسەن، د·ئازاد ئەحمەد مەحموود، مەحموود زامدار، ئەنوەر مەسیفی، یووسف حەیدەری، لوقمان مەحموود، ئارام سدیق، سەلاح حەسەن پاڵەوان، حەکیم مەلا ساڵح، نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، د· عەلی تاهیر بەرزنجی، لەتیف هەڵمەت، فەرید زامدار، قادر ئیبراهیم مینە، حەمە مەنتك، عەبدولخالق یەعقووبی، ساڵح سووزەنی، فەرەیدون ئەرشەدی، عەلی قاسمی، محەمەد عەبدولکەریم ئیبراهیم، سەروەر حەسەن محەمەد، نەریمان عەبدوڵلا خۆشناو، پێشڕەو عەبدوڵلا، بەدران ئەحمەد حەبیب، محەمەد ئەمین ئەحمەد، ئاوات محەمەد ئەمین، عەبدولڕەزاق بیمار، د·فوئاد ڕەشید، د·محەمەد بەکر، د·ئازاد حەمە شەریف، بۆتان جەلال، ڕێبین ئەحمەد خدر، ئەحمەد ڕەزا، عەبدوڵلا تاهیر بەرزنجی، د·سەردار ئەحمەد گەردی، سامان دزەیی، د. ئیدریس عەبدوڵلا، د·حوسێن غازی ).

[٢] – السیوطي – الإتقان في علوم القرآن، طبعة مؤسسة النداء، ص٢٨٠، لە ئەنتەرنێتەوە وەرگیراوە ·

[٣] – احمد مطلوب – معجم النقد الادبي، ج/١، دار الشؤون الثقافیة العامة، بغداد، ١٩٩٩، ص٣٧٠

[٤] – د· محمد صابر عبید – القصیدة العربیة الحدیثة ·· حساسیة الانبثاقة الشعرییة الاولی ·· جیل الرواد والستینات، ط/٢، عالم الکتب الحدیث، اربد– الاردن، ٢٠١٠، ص ٢٠٠

[٥] – محمد عبدالمطلب – بناء الاسلوب في شعر الحداثة، القاهرة، ١٩٨٨، ص٣٩٠

[٦] – د. عشتار داود محمد – تقنیة التوازي في الشعر الحدیث، لە ئەنتەرنیتەوە وەرگیراوە.

[٧] – سەباح ڕەنجدەر – کۆشیعری (سەدو یەکشەوە )، چ/ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل٦

[٨] – هەمان سەرچاوە، ل٦

[٩] – سەباح ڕەنجدەر – کۆشیعری (خەون وا خۆی گێڕایەوە )، چ/ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤، ل١٨

[١٠] – د٠ زهـير احمـد المنـصور – ظـاهرة التكـرار في شـعر ابـى القاسـم الـشابي...، www.bwady.com

[١١]– هەمان سەرچاوە

[١٢]– ئەم لێکۆڵەرە لەنێو کتێبەکەیدا (بونیاتی زمان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا ١٩٨٥– ٢٠٠٥ ) تەنیا باسی جۆرەکانی گەڕانەوەی بەرایی و دوایی دەکات، بەڵام لەپەراوێزی (١) لاپەڕە (١٨٠)دا دەڵێت : گەڕانەوە، فرە شێوەی دیکەی هەیە وەك: گەڕانەوەی بازنەیی، گەڕانەوەی پێویست بوون، گەڕانەوەی دەلالی و بونیاتی، گەڕانەوەی هاوسەنگی ٠٠ کە هەر یەکەیان چەند بابەتێك لەخۆ دەگرێت ٠

[١٣] – د٠ئازاد ئەحمەد مەحموود – بونیاتی زمان لە شیعری هاوچەرخی کوردیدا ١٩٨٥–٢٠٠٥، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٩، ل١٦٩

[١٤]– هەمان سەرچاوە

[١٥] – دیوانی نالی، مەلا خدری ئەحمەدی شاوەیسی مکایەلی، لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و فاتیح عەبدولکەریم، محەمەدی مەلا کەریم ئەندامی یاریدەری کۆڕی زانیاری کورد پیاچووەتەوە، چ/ کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦، ل٣٤٦

[١٦] – نازك الملائكة – قضايا الشعر الحر، دار العلم للملايين /بيروت/ ط ٥/ ١٩٧٨، ص٢٨٠

[١٧] – هەمان سەرچاوە، ل٢٨٧

[١٨] – کۆشیعری شەڕی چل ساڵە، چ/وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥، ل٤٦

[١٩] – سەباح ڕەنجدەر – کۆشیعری سەدو یەکشەوە، ل٨

[٢٠] – هەمان سەرچاوە، ل٧

[٢١] – هەمان سەرچاوە، ل٦–٧

[٢٢] د.عدنان حسين العوادى– لغة الشعر الحديث في العراق– دار الحرية للطباعة بغداد، ١٩٨٥، ص٢١

[٢٣] د. عدنان حسين العوادي، لغة الشعر الحديث العراق، ص٣٠.

[٢٤] حسين علي شانوف – شعر الشاعر الكردي المعاصر كوران، ت: شكور مصطفى، مطبعة دار الجاحظ، بغداد، ١٩٧٥، ل١٨١

[٢٥] – حوسێن مەحموود عەلی کەلاری– شێواز لە هۆنراوەی فەرهاد شاکەلی دا، نامەی ماستەرە پێشکێشی کۆلێژی زمانی زانکۆی کۆیە کردووە، ٢٠٠٨، ل٢٣

[٢٦] – یاسین عومەر – شێرکۆ بێکەس– چەپکێك هەڤپەیڤین، ئەزموون، ١٩٨٥–٢٠٠٠، چاپخانەی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠١، ل١٠

[٢٧] – هەمان سەرچاوە، ل١٦٨

[٢٨] – أ. د. أمين محمد عطية باشا – التكرار في القصص القرآني – دراسة تطبيقية على قصة موسى عليه السلام )، لە ئەنتەرنێتەوە وەرگیراوەو لەلاپەڕە (١٩٤)ی كتێبی (المعجزة الكبرى القرآن )ی الشيخ محمد أبو زهرة وەرگیراوە٠

[٢٩] – هەمان سەرچاوە ٠

[٣٠] – سەباح ڕەنجدەر – كۆشیعری (زێوان )، چ/ یاد، چا/٢، سلێمانی، ٢٠٠٩، ل١٨

[٣١] – د٠ محمد صابر عبيد – القصيدة العربية الحديثة ٠٠ حساسية الانبثاقة الشعريية الاولى، ص ٢٠٠

[٣٢] – د٠ئازاد ئەحمەد مەحموود – بونیاتی زمان لە شیعری هاوچەرخی كوردیدا ١٩٨٥–٢٠٠٥، ل١٧٢

[٣٣] – د٠ محمد صابر عبيد – القصيدة العربية الحديثة ٠٠، ص ٢٠٨

[٣٤] – د٠ئازاد ئەحمەد مەحموود – بونیاتی زمان لە شیعری هاوچەرخی كوردیدا ١٩٨٥–٢٠٠٥، ل١٧٦

[٣٥] – د٠ محمد صابر عبيد – القصيدة العربية الحديثة ٠٠، ص ٢١٤

**ملخص البحث**

التكرار الشعري ظاهرة اسلوبية يلجأ اليها الشاعر لتعزيز تأثير المفردة والعبارة الشعرية في ذهنية المتلقي ووجدانه. والتكرار الشعري عبارة عن تكرار في بداية القصيدة أو منتصفها أو نهايتها، وقد يكون التكرار الشعري بصيغة تكرار مفردة بحد ذاتها في أكثر من مكان في القصيدة، أو تكرار عبارة أو جملة شعرية لمرتين أو أكثر بحيث تجلب انتباه القاريء الى سبب لجوء الشاعر الى تكرارها، وما الغاية منها.

وبشكل عام يمكن القول بأن التكرار الشعري ظاهرة اسلوبية نراها في الشعر الكلاسيكي وفي الشعر الحديث ايضا. ومن يقرأ قصائد الشاعر الكردي المعاصر صباح رنجدر سيجد تنوع التكرار الشعري في قصائده ، وبشكل اجاد في منح المفردة والعبارة الشعرية المكررة قوة تأثير ذهنية ووجدانية ونفسية رائعة، وهذا ما حدى بنا لكتابة هذا البحث عن تقنية التكرار في قصائده ٠ يتكون البحث من مقدمة ومبحثين، تناولنا في المبحث الاول مفهوم التكرار الشعري وغاياته، وتناولنا في المبحث الثاني تواجد عشرة انواع من التكرار الشعري في قصائد الشاعر ٠

## Abstract

The poet resorts to use poetic repetition as a stylistic phenomenon to reinforce the effect of the logical items and the poetic expression in the mind of the receptor.

The poetic repetition is to repeat artain expressions of the beginning or end of the poem. Repetition can be in the middle or the end of a paragraph.Repetition can be simple or complex , it can be a word or phrase or a clause. The main function of repetition is to attract attention of the reader as to why the poeat repeats this expression.

Generally speaking , it can be said the repetition as apoetic and stylistic phenomenon can observed in the clasical and modern poetry. Aperson who reads Sabah Rangder poetry will find a lot of repetition kinds of various types. This poet has used successfully this stylistic phenomenon.

# پێگەی بەراورد لە ئەدەبی کوردیدا

نووسینی : ڕێزان سالّح مەولوود
زانکۆی کۆیە : بەشی زمانی کوردی

## پێشەکی

ئەدەبی کوردی لە قۆناغە جیاجیاکانی بەرەو پێشەوەچوونی خۆیدا، بەپێی بارو دۆخی سیاسی و ئابووری و کۆمەلآیەتی و فەرهەنگی ناوچەکە گەشەسەندنی بە خۆیەوە بینیوە.

بۆیە هیچ کاتێك ئەدەبی کوردی لەدەرەوەی ڕەوت و هزرو بۆچوونە جیهانییەکاندا نەبووە، ئەدیبانی کورد لەگەلّ دەرکەوتنی ئامێری چاپ لە کوردستان و بلآوبوونەوەی ڕۆژنامەو گۆڤار لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، هەولّیان دا لەمیانەی تێگەیشتن لە ئەدەبیاتی دەوروبەر دونیابینییە کی تازە بەدەقی ئەدەبی کوردی ببەخشن.

بەو شێوەیە ئەدیبانی کورد چوونە ناو پرۆسەی کاریگەری و کارتێکردن لەگەلّ ئەدەبی بێگانەدا چەندین دەق و چامە ی شیعری جوانیان بەرهەم هێنا، هەبوونی ئەو پەیوەندی کارتێکردنە لەنێوان ئەدەبی کوردی و ئەدەبی بێگانەدا هانی نووسەران و ڕۆشنبیرانی کوردی دا بەراوردی ئەدەبی وەك میتۆدێك لە کوردستاندا پەیڕەو بکەن تاوەکو بتوانێت دەستنیشانی پرۆسەی کارتێکردن ئەنجام بدەن لەنێوان ئەدیباندا ، بەوەش سەرەتاکانی بەراوردی ئەدەبی لە کوردستاندا سەری هەلّدا، هەولّ و کۆششی نووسەرانی پێشەنگ لەم بوارەدا لە

چوارچێوەیەکی بچووکدا مایەوە بەهۆی ڕەوشی سیاسی و فەرهەنگی ئەو کاتەی کوردستاندا .

بەڵام لە ڕووی مێژوییەوە پڕ بەهاو پڕ بایەخە و بۆتە بنەمای سەرهەڵدانی بەراورد لە ئەدەبی کوردیدا . بۆیە ئێمە لێرەدا هەوڵ دەدەین پێگەی بەراورد لە نێو ئەدەبی کوردی دەستنیشان بکەین و بچینە نێو ڕەگ و ڕیشەی مێژووی سەرهەڵدانی ئەو ئەدەبە و گرنگترین ئەو سەرچاوە کتێبانەی تیشکیان خستۆتە سەر ئەو بابەتەو بەوردی شرۆڤەیان بکەین، تاوەکو لە وردەکاری گەشەسەندنی ئەو ئەدەبە تێبگەین کە تا ئێستاش لە کوردستاندا پێگەیەکی دیاری هەیە و ساڵانە چەندین تێزی دکتۆراو ماستەر و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی لەبارەیەوە دەنووسرێت و بڵاو دەکرێتەوە .

## پێگەی بەراورد لە ئەدەبی کوردیدا

ئەدەبی کوردیش وەکو ئەدەبی هەر نەتەوە و میللەتێکی تر لەژێر کاریگەریی ئەدەبی نەتەوە و وڵاتانی دەوروبەری خۆیدا بووە، بە تایبەتیش ئەگەر ئەوە بزانین کە لە سەدەی نۆزدەدا، کوردستان بەسەر هەردوو ئیمپڕاتۆرییەتی سەفەوی و عوسمانیدا دابەشکرابوو، دواتریش لە سەدەی بیستەمدا، بەسەر هەر چوار وڵاتی، عێراق، ئێران، سوریا، تورکیا دابەشکرا. بۆیە لەو دوو قۆناغەدا ئەدەبی کوردی ڕاستەوخۆ لەژێر کاریگەریی ئەدەب و زمانی فارسی و تورکی و عەرەبیدا بوو، ئێستاش بە هۆی گەشەکردنی تەکنۆلۆژیا و چاپ و بڵاوکردنەوەوە، ئەدەبی کوردی کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەدەبی جیهانی بە گشتی و ئەدەبی ئینگلیزی و فەڕەنسی و ئەڵمانی و ڕووسی بە تایبەتی، فاکتەری نزیکی جوگرافی لە قۆناغەکانی ڕابردوودا هۆکاری سەرەکی بوون بۆ کارتێکردنی ئەدەبی کوردی لەگەڵ ئەدەبی فارسی و تورکی و عەرەبیدا. لێرەشدا دەبێ بزانین کە لە بەشێکی زۆری ئەو قۆناغەدا ئەدەبی کوردی کارتێکراو (متـأثر) بوو نەوەکو کاریگەر (تأثير)، تەنانەت ئەم کارتێکردنە، بە ڕوونی لەنێو زاراوە و چەمك و ئامـاژە و هێمای شیعری شاعیرانی قوتابخانەی بابان و کاریگەربوونیان بە ئەدەب و زمان و

فەرهەنگی فارسی و عەرەبیدا دەردەکەوێت. هەروەها حاجی قادری کۆیی لە تورکی و عەرەبی، پیرەمێرد لە تورکیدا شێخ نوری شێخ صالح بە ئەدەبی تورکی کاریگەر بوون. لەم بارەیەوە عەزیز گەردی دەڵێت: "ئەگەر لە ئەدەبی کوردیدا باسی دیاردەی کاریگەریی ئەدەبی نەتەوە دەروجیرانەکانمان بکەین، دەبینین بەخۆشی بێ یا بە خورتی، بەکەمیی بێ یا بە زۆریی، ئەم ئەدەبانە ڕەنگی خۆیان لە سەرو سیمای ئەدەبەکەمان هەڵسویوە و بەدرێژایی لێك نزیکبوونەوەی ئەدەبی ئێمەو ئەدەبی ئەوان تا ڕادەیەکی زۆر کاریان لە ئەدەبەکەمان کردووە، لەوەتی ئەدەبی تۆمارکراومان هەیە، ئەو ئەدەبە مۆرك و شەقڵ و شوونی ئەدەبەکانی تری بە نێو چاوەوە دیارە، هەر لە باباڕوخ و بابەتاهیری هەمەدانییەوە تا مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی و بێسارانی و مەولەوی و حاجی و شێخ ڕەزا و نالی و کوردی و سالم و مەحوی و پیرەمێرد و بێکەس و دڵدار و گۆران و هەموو شاعیرە کۆن و نوێکانی تریشمان، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆبێ یا لابەلا کەوتونەتە بەر زەبری کاریگەریی نووسەرانی تورك و فارس و عارەب و سەراپای جیهان..." [1].

کەواتە حاڵەتی کاریگەری و کارتێکردن حاڵەتێکی ئاساییە لەنێو ئەدەبی گەلاندا و دەبێتە هەوێنی داهێنان و دنیابینیی تازە و نیشانەی زیندوویی و بەتوانایی ئەو ئەدیبانەیە کە توانیویانە سوود لە پێشکەوتنی ئەدەبی وڵاتان وەربگرن و خۆیان لە گۆشەگیری و دوورەپەرێزی لابدەن، لە هەمان کاتیشدا ڕەسەنایەتی ئەدەبی کوردی و گۆشەنیگا و تێڕوانینی کوردییانە بۆ ڕابردوو دیاردە کۆمەڵایەتی و سیاسی و سروشتییەکان بپارێزن. کەواتە ئەدەبی کوردیش هێزی ئەو دینامیکییەتەی تیایە کە بتوانێ لەگەڵ ئەدەبی جیهاندا کارلێك بکات و ئاوێتە ببێت، چونکە هیچ ئەدەبێکی دونیا لە گۆشەگیری و دوورەپەرێزیدا گەشە ناکات و بەرەوپێش ناچێت. "بەدرێژایی تەمەن ئەدەبی بەراورد کۆمەڵێك گۆڕانگاری لە جۆری بابەتەکاندا ڕووی داوە، ئەگەر لەکۆندا خۆی لە چەند بابەت و ڕێبازێك ببینێتەوە بە تایبەتی ئەو بابەتانەی کە دەکەوێتە چەرخەکانی (١٧-١٩)، ئەوا دواتر خۆی لە چەند بابەتێکی تردا دەبینێتەوە، وەکو: زانستی ڕەخنەی بەراورد، زانستی بەراورد، زانستی فەلسەفەی بەراورد، زانستی ئایینی بەراورد، زانستی

شوێنەواری بەراورد، زانستی هونەری بەراورد، زانستی موسیکای بەراورد، زانستی تەکنۆلۆجیای بەراورد، زانستی هەڵوێستە فیکری و ئایدیۆلۆجیای بەراورد..هتد، واتە ئەدەبی بەراورد، ئەمڕۆکە دەتوانێت چارەسەری سەرجەم زانستەکانی ژیان بکات، ڕەنگە هەر لەبەر ئەمەش بێت ئەم زانستە مەترسییەکی دروست کردبێت لەسەر ڕژێمە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فیکرییەکان، چونکە ئەم زانستە تێکڕا لەلایەکەوە لە هەوڵی دۆزینەوەی ڕاستی شتەکان یان ماناکان یان زەمەنەکان یان زمانەکان، ڕۆشنبیرییەکان، کەسایەتییەکاندا، لە لایەکی تریش بەکاری هەڵسەنگاندن هەڵدەستێت، وەك بەراوردی ڕژێمێکی سیاسی یان فیکری بە ڕژێمێکی هاوشێوە. بە مانایەکی تر ئەدەبی بەراورد لە ڕێگەی چەمکە ڕەخنەییەکانەوە دەتوانێت دەستنیشانی توانای دەق و ڕێژەی داهێنان بکات"[٢]. ڕەنگە لە کەم و کوڕییە بەرچاوەکانی ئەدەبی کوردی ئەوە بووبێت کە تا ئێستا بیبلۆگرافیایەکی ڕوونی نییە بۆ دەستنیشانکردنی ئەو نووسەر و دەقانەی لەژێر کاریگەریی زمان و ئەدەبێکی تردا بەرهەم هاتوون، تاوەکو بزانین نەخشەی شێوازی سەرهەڵدان و چۆنیەتی گەشەکردنی ئەدەبی بەراوردکاری لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژووی دوو سەدەی ڕابردوودا دەستنیشان بکەین و بتوانین بگەینە ئەوەی کە نرخی ڕاستەقینەی ئەو ئەدەبە پیشان بدەین و بە پێی میتۆدی بەراوردکاری هەڵسەنگاندنیان بۆ بکەین و بەشێوەیەکی زانستییانە تەماشایان بکەین و بزانین لەکوێدا سەرکەوتوون و لەکوێدا کێشە و گیروگرفتیان هەبووە. عەزیز گەردی لەم بارەیەوە دەڵێت: "ئەگەر بۆ ئەو باسانە بگەڕێینەوە کە لە کوردیدا بەراوردیان تێدا کراوە جا بەراوردەکە هەرچی و چۆنێك بێت، ئەوا پاش بڕکردن و جیاکردنەوەی ئەم باسانە دەگەینە ئەم قەناعەتە کە ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە بەشێوەیەکی گشتی لەم بەشانەی خوارەوە زیاتر ناڕۆن:

١. یا پەرەگراف و ئیشارەتێك بێ بۆ کاریگەریی ئەدەب، جا چ لەناو لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی دوورودرێژ و چ لە پێشەکی کتێبێك و چ لەناو وتارێکی سەرەڕۆدا بێ.
٢. یا وتارێکی بۆ تەرخان کرابێ و لەگۆڤارێ یا ڕۆژنامەیێ بڵاوکرابێتەوە.

٣. یا بەشێکی لە کتێبێك بۆ تەرخان کرابێ.
٤. یا کتێبێکی سەربەخۆ بێ.
٥. یـا باسـێکی زانـستی بـێ و لـە کـۆڕێکی زانیـاری گـەورەدا پێـشکەش کرابێ.[٣]

کەواتـە بـەپێی ئـەم بۆچـوونەی (عـەزیز گـەردی) بێـت تـا ئێـستاش بـە شـێوەیەکی ورد ئێمـە نەبووینەتـە خـاوەنی بیبلۆگرافیـای ئـەدەبی بـەراوردکاری، تـەنیا لـە هەنـدێك حاڵەتـدا ئـەدیبان خۆیـان لـە هەنـدێك شـوێندا کـە زۆر جـار لـە پێشەکی دیوانەکانیان یان لێکۆڵینەوەکانیاندا ڕاستەوخۆ دانیـان بـەوە دانـاوە کـە ئەوان لەژێر کاریگەریی ئـەدەب و نووسـەر و دەقێکـی دیـاریکراودا، ئـەو ئەدەبـەی خۆیان بەرهەم هێناوە، کە بێ گومـان ئەوەنـدەش بـەس نییـە بـۆ هەڵـسەنگاندنی ڕادەی کاریگــەریی و شــێوازی جێبــەجێکردنی ئــەو کاریگەرییــە و پابەنــدبوونی نووسەرەکە بە بنەماکانی ئەدەبی بەراوردکاری و ڕادەی ئاوێتەبوونی لەنێو دونیای ڕەسەنایەتی کوردیدا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو کارانـە بـە هـەنگاوی ئازایانـە و بوێرانـە دادەنرێن لەنێو ئەدەبی بەراوردکاریدا، کردنەوەی دەرگایەکی گەورەیە بۆ ئێمە لـە ئێستادا بۆ ئەوەی بتوانین بچینە نێو دونیای ئەدەبی بەراوردکاری.

لەپاڵ ئـەوەدا هەنـدێك لـە توێـژەر و لێکۆڵـەرەوانی کـورد لـە ناوەڕاسـتی سـەدەی بیـستەمدا هەنـدێك هـەوڵی لابـەلایان هـەبووە، بـۆ ناسـاندنی ئـەدەبی بـەراوردکاری و نموونـەی ئـەو ئەدەبـەیان لـەنێو ئـەدەبی کوردیـدا دۆزیوەتـەوە و دەستنیشانیان کردووە، هەریەکێك بەپێی بۆچوون و تێڕوانین و دونیـابینی خـۆی، بەڵام دیسان نەچۆتە ناو چوارچێوەی کارێکی ڕێکخراوەوە، بەڵکو زیاتر کاریگەریی تاکە کەسی دەگمەن بووە.

لەو توێژینەوانەدا، نووسەرانی کورد هەوڵیان داوە بنەماکانی لێك نزیکی و کاریگـەریی شـاعیر و چیرۆکنووسـانی کـورد لەگـەڵ ئـەدەبی دەوروبـەر و جیهانـدا دەستنیـشان بکـەین، بـێ گومـان هـەر هـەوڵێکی لـەم جـۆرە ئەگەرچـی جێگـای ستایشە، بەڵام مەرج نییە لەلایەنی زانستییەوە سەرکەوتوو بێـت و بتـوانین وەکـو بەهایەکی ئەدەبی لێـی بـڕوانین، بگـرە لەوانەیـە هەنـدێك لـەو لێکۆڵینەوانـە تـەواو

ئامانج و مەبەستی خۆشیان نەپێکابێت، (حسین عارف)ی ڕۆماننووس لە وتارێکدا، کە باس لە سەرهەڵدانی چیرۆکی کوردی دەکات پێی وایە سەرەتای سەرهەڵدانی چیرۆکی کوردی بۆ ئەو کاتانە دەگەڕێتەوە کە نووسەرانی کورد زۆرتر ئاگاداری ئەدەبی بێگانە بوون و ئەو هونەرە نوێیەیان تیادا بینی و هەوڵیان دا لاسایی بکەنەوە، "ئەدیبانی کورد، ئەدەبی بێگانەیان ناسی، بەتایبەتی ئەدەبی گەلانی ڕۆژئاوا، سەیریان کرد چیرۆك لەڕیزی پێشەوەی ئەدەبەکەیانە، بۆیە ئاواتێك لەم بابەتە کەوتە کەللەی ئەمانیشەوە"[٤].

ئەم وتەیەی (حسین عارف) ئەگەر چی تێبینییەکی ورد و زیرەکانەیە بەڵام ناکرێت وەکو هەوڵێکی زانستی بۆ دۆزینەوەی سەرەتاکانی سەرهەڵدانی بەراوردکاری لەنێو ئەدەبی کوردیدا سەیر بکرێت، چونکە نە ئاماژە بە ناوی ئەو نووسەرانە دەکات کە ئەو کارەیان کردووە و نە هاتووە بیبلۆگرافیایەکی مێژوویی دروست بکات و تێیدا چیرۆکەکان و چیرۆکنووسەکان ڕیز بکات، نە توانیویشێتی فۆرمی چیرۆکەکان و شێوازی داڕشتنی چیرۆکەکان بە چیرۆکی بێگانە بەراورد بکات و نە توانیویەتی ڕێڕەوی گەشەکردنی چیرۆکی کوردی دەستنیشان بکات لە ژێر کاریگەریی چیرۆکی بێگانەدا. کەواتە کۆمەڵێك ئاماژە و تێبینی هەن، بەڵام هەوڵێکی جیدی و گەورە لەئارادا نەبوو بۆ دەستنیشانکردنی وردی شێوازی کاریگەریی و کارتێکردن و چیرۆکنووسانی کوردیش چەندە سەرکەوتووبن لەوەرگرتنی ئەو هونەرە نوێیەدا، ئێمە دەزانین سەرەتا کاریگەری ئەدەبی کوردی لە ڕێگەی شیعرەوە بووە و بەشی زۆری شاعیرانی کوردیش بە ئاگایی بووبێت یان بە نائاگایی دانیان پێدانابێت یان نا؟ لەژێر کاریگەریی ئەدەبی بێگانەدا بوون. "بەراورد بە کاری گۆڕینی ئاستەکان هەڵدەستێت وەك گۆڕینی ئاستی توانای تاکەکان بۆ ئاڕاستەیەکی گشتگیری هەروەك چۆن (نالی) ئەنجامی دا لە کاتێکدا لە تاکێکەوە گۆڕا بۆ قوتابخانەیەك کە هاوشێوەی ئەم کارەشمان هەیە لە ئەدەبەکانی تردا نموونەی (البارودي) لە ئەدەبی عەرەبیدا. ئەم کارەش بێ گومان وەك بو ڕۆشنبیرکردنی ئەو تاکانە دێن کە خۆیان لە چەندین سەرچاوەو کاریگەری

دەبیننەوە، ئەمەش هەنگاوێکی باشە بۆ چوونە نێو بازنەیەکی گەورەتر ئەویش ئەدەبی جیهانییە یان بە جیهانبوونی ئەدەبە" [٥].

بەر لەشیعریش دیارە ئەدەبی کوردی نەنووسراو (زارەکی) و فۆلکلۆری کوردی و ئەفسانەی کوردی دابڕاو نەبووە لە ئەدەب و فۆلکلۆر و ئەفسانەی گەلانی ناوچەکە و جیهان بە گشتی، چونکە توێژینەوە ئەنترۆپۆلۆژییەکان لەبارەی سەرهەڵدانی ئەفسانە و میتۆلۆژیای گەلان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە بەشێکی زۆری گەلانی جیهان لە ڕێگەی گێڕانەوەی زارەکیدا بە سوودوەرگرتن لە چیرۆك و ئەفسانەی نەتەوەکانی تر، ڕەنگ و بەرگێکی خۆماڵییانەیان بە بەر ئەو چیرۆکانەدا پۆشیوە و لەگەڵ واقیعی ژیانی کۆمەڵایەتی خۆیاندا گونجاندوویانە، یا بەمانایەکی تر هاتوون چیرۆکی هاوشێوەی خۆیان دروست کردووە و هەوڵیان داوە مۆرکێکی خۆماڵییانەی پێ بدەن، چونکە بەراوردێکی ئەنترۆپۆلۆژییانە لەنێوان چیرۆکی سەرهەڵدانی جیهان لە ماوەی (حەوت) ڕۆژدا دەری دەخات کە لەلای میللەتانی سەرەتایی میزۆپۆتامیا و میسری کۆن و هیند و تەنانەت هۆزە کۆچبەرەکانی ئەمریکای لاتینیش یەك شێواز و فۆرمە بە هەندێك دەستکاری کەمەوە، بۆ نموونە خەیاڵی ئەفسانەیی کوردی لەژێر کاریگەریی قورئان و ئەفسانەی فارسیدا گەشەی کردووە و لەمیانەی چەند کەسایەتییەکی ئەفسانەییدا خۆی بەرجەستە دەکات وەکو هەر میللەتێکی تر، دیارە ئەو کەسایەتییانە ئەگەر مۆرکێکی کوردیشیان پێ بدرێت، بەڵام کەسایەتی جیهانین یان لانی کەم کەسایەتی ناوچەیین و بە تەنیا موڵکی کورد نین. (مەولود ئیبراهیم حەسەن) ئاماژە بۆ مەسەلەی گەڕان بە دوای نەمریدا دەکات ئەمە چۆن لەنێو ئەفسانەی کوردی و فارسیدا ڕەنگی داوەتەوە و کەسایەتییەکانیش دەستنیشان دەکات کە خۆیان لە (خدری زیندە و چارقوڕنەت)دا بەرجەستە دەکەن [٦]. لەگەڵ ئەوەشدا مانای ئەوە نییە کە ئەفسانە کوردییەکان لەژێر کاریگەریی ئەفسانە نەتەوەییەکانی تردا خاوەنی فۆرمێکی کوردەواری و تێڕوانینێکی ڕەسەنایەتی نەبن، ڕاستە سەرچاوەیەکی هاوبەش هەیە بۆ سەرهەڵدانی ئەو ئەفسانانە بەڵام لەکاتی داڕشتنەوەی ئەفسانەکانیشدا خەیاڵی کوردی ئەوەندەی پێ کرابێ

مۆرکێکی کوردانەی بەخشیوەتە ئەفسانەو بۆتە هۆی ئەوەی جۆرێك لە جیاوازیی گەورە لە نێوان کەسایەتییەکاندا دروست بێ لەنێوان خۆی و میللەتاندا، لەبارەی ئەم جیاوازییانەوە مەولود ئیبراهیم حەسەن دەڵێ: "ئەو دەقە ئەفسانەییانەی کە لەنێو ئەفسانە کوردی و فارسییەکان لێرە لەبەر دەستن، چەند خاڵێکی جیاوازیش هەیە لەنێوانیاندا، کە جیاوازییەکەیان یا ئەوەتە جیاوازی تەواوەو لەیەکێکیان هەیە و لەوەی تر نییە! یا ئەوەتە شێوەیان لێك جیایە، ئەم خاڵە جیاوازانەش بۆ هەر یەکێ لە ئەفسانە کوردی و فارسییەکان دەچنە خانەی تایبەتمەندی هەریەکێکیان لەگەڵ ئەوی تر بەو خاڵە تایبەتییانە لێك جیادەبنەوە" [٧]، بەڵام د. ظاهر لطیف پێی وایە لە بەراوردی ئەدەبیدا پێویستە بازنەی بەراوردەکان دیاری بکرێت، بەڵام لە دەقئاوێزاندا دەشێت لە یەك کاتدا چەند دەقێکی جیاواز بەکەسەکان بێنە نێو دەقی ئێستا، بۆیە دەڵێت:" لە ئەدەبی بەراوردا پێویستە بازنەی بەراوردەکان دیاری بکرێت وەك بەراوردی نێوان گۆران و ئۆسکار وایلد بەڵام لە دەقئاوێزاندا ڕێ دەکەوێت کە لە یەك کاتدا چەند دەقێکی جیاواز بە کەسەکان بێنە نێو دەقەکەی ئێستا، ئەوسا نازانین بەراوردەکان لەگەڵ کامیان ئەنجام بدەین، لەگەڵ ئەمەشدا تێبینی ئەوە دەکرێت، هەروەك چۆن لای ئیلیۆت و ادونیس و السیاب دا بەئاشکرا بەدی دەکرێت شاعیرەکان لە یەك دەقیاندا چەندین دەقئاوێزانیشی بەکارهێناوە وەك دەقئاوێزانی ئەفسانەیی، ئایینی ئەدەبی، فۆلکلۆری، مەعریفی و فیکری ..هتد، ئەمەش ڕامان دەکێشێت بۆ مەسەلەیەکی تر ئەویش ئەوەیە کە لە ئەدەبی بەراوردا هەمیشە جەخت لەسەر یارمەتی کاریگەریی یان پەیوەندێتی لەسەر دەقی ئێستا بەتایبەتی لەبازنەی مەرامێتی و مەبەستێتی تێکڕای دەقەکە" [٨]، جگە لەمەش (محەمەد ڕەسول هاوار) لە کتێبی (پیرەمێردی نەمر)دا ئاماژە بەوە دەکات کە پیرەمێرد لە ئەستەمبوڵ ئاگاداری باری ڕۆشنبیری و ئەدەبی تورکی بووە و دۆستایەتی لەگەڵ نووسەران و شاعیران و ڕۆشنبیرانی ئەستەمبوڵ بووە، جگە لەمە ئاگاداری باری ڕۆشنبیری و ئەدەبی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواش بووە لە ڕێگەی زمانی تورکییەوە و بە هۆی ئەو بارودۆخەی ئەو ئەوسا تورکیا تیایدا بوو، هەستی نیشتمان پەروەری و نەتەوایەتی شاعیر

کڵپەی سەند و کاریان لە هەست و دەروونی پیرەمێرد کردبوو، بۆیە دەڵێ: "پیرەمێرد، ئەو سەردەمەی کە لە تورکیا بوو، لەو ماوەیەدا هێزی نەتەوایەتی لە تورکیا جووڵەی تێ کەوتبوو، بەهۆی ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەوە کە لەوێ دەرئەچوو یا لە ڕۆژئاواوە ئەگەیشتە تورکیا و ئەیبیست و ئەیخوێندەوە کە چۆن هەموو نەتەوەکان هەریەکەی لەشوێنی خۆیەوە ڕاپەڕیوە، لاوەکانیان ئاڵای سەربەستی و ئازادییان هەڵکردبوو" [9].

محەمەدی مەلا کەریم لە پێشەکی کتێبی (شیرین و خەسرەو)ی (خانای قوبادی)دا، ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە (خانای قوبادی) کەوتۆتە ژێر کاریگەریی نیزامی گەنجەوییەوە و دەڵێت:" ئەوەی فارسی و گۆرانی بزانێ و بەراوردێکی خوسرەو و شیرینەکەی شاعیری بەناوبانگی دایك کورد، بە باوك ئازەربایجانی و بەزمانی ئەدەبی فارسی (نیزامی گەنجەوی) بکا، لەگەڵ ئەم کارەی شاعیرێکی ناوونیشان کورد کردوویەتی کە بەداخەوە هەر ئەوەندەی لێ ئەزانین پێی ئەڵێن (خانای قوبادی) یاخود وەك خۆی لەشوێنێکی کتێبەکەیا بە خۆی ئەڵێ (خانای خان قوباد)، بۆی دەرئەکەوێ کە کارەکەی (نیزامی گەنجەوی) لەچاو کارەکەی ئەوا وەك ئەسکاڵتێك دێتە پێش چاو (خانا) بە پیشاندانی دیمەنی جوان و وەسفی وردو دەربڕو ڕەوانبێژییانەی گۆشت و دەمارو پێستی پێ پۆشیبێ و خوێنی تێ زاندبێ و گیانی کردبێ بەبەرا، لەگەڵ ئەوەشدا کارەکەی (خانای) (٥٥٢٦) بەیتی و هینەکەی نیظامی (بەگوێرەی چاپی ١٩٦٠ی ئەکادیمی ئازەربایجانی لە باکۆ) (٦١٨٨) بەیتە و بەو پێیە ئەبوو ئەمی نیزامی بالآتر بووایە، چونکە قەوارەی ڕازەکە لای هەردووکیان تێکڕا وەك یەکە" [10].

لە لایەکی تریشەوە محەمەدی مەلا کەریم دەڵێ: "ئەمەی کە ئێستا دەیخەمە بەردەستی خوێنەرانی کورد، ئەگەر بمانەوێ بێ زیادەڕەوی بدوێین، تەنها تێکستی لێکدراو و بەراوردکراوی دوو نوسخەی جیاجیای شیرین و خوسرەوە، لەگەڵ نیمچە هەوڵێکی سەرەتایی ڕاستکردنەوەی بەشی زۆری وشە نەزانراوەکانی" [11].

گۆرانی شاعیر دان بەوەدا دەنێت کە شێوازی نووسینی شیعری گۆڕاوە و کاریگەر بووە بە شاعیرانی تورکی عوسمانی و دەڵێت: "ئەو جۆرە ئوسلوبەیان تیا کراوە بە سەرمەشق کە مامۆستا (م. نووری) و هاوڕێکانی لەئەدیبە تازەکانی عوسمانییان وەرگرت و لە سەردەمێکی سنووردارا (١٩٢٠ – ١٩٣٠) شیعری کوردی ناوچەی سلێمانییان پێ تازە کردەوە" [(١٢)]، دلّداری شاعیر هەر چوار زمانی کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسی زانیوە و توانیویەتی وەستایانە گرنگی و دەوڵەمەندی زمان و ئەدەبی کوردی لەچاو ئەو زمانانە دەستنیشان بکات، جگە لەمەش دلّداری شاعیر ڕاستەوخۆ دانی بەوەدا ناوە کە لەژێر کاریگەریی ئەدەبیاتی بێگانەدا بووە، هەر بۆیە چیرۆکی (قەل و ڕێوی) (لافۆنتین)ی لە زمانی فەڕەنسییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی و بە شیعر دایڕشتۆتەوە، دلّدار شاعیرێکی دەستپاك و جێگای متمانە بووە هەر شتێکی وەرگرتبێ ئاماژەی پێ کردووە ئەوەتا لە سەرەتای شیعرەکەدا نووسیویەتی: "یەك لە پەندە خۆشەکانی (لافۆنتین) شاعیری ئێسك سووکەی فەڕەنسەیە کردوومە بە کوردی"[(١٣)]. بەڵام دیارە کە دلّدار ئاماژەی بۆ ئەوە نەکردووە کە لە چ زمانێکەوە ئەم دەقەی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

د. کەماڵ مەزهەر پێی وایە دەکرێت کاتێ قسە لەبارەی مێژووی ئەدەبی بەراوردکارییەوە بکەین لە کوردستاندا، دەبێت وەکو یەکەم سەرچاوە ئاماژە بە (تێگەیشتنی ڕاستی) بکەین. لەم بارەیەوە دەڵێت: "تێگەیشتنی ڕاستی، یەکەم سەرچاوەی کوردییە کە وردە دەسکاری ئەدەبی بەراوردکار (المقارن)ی کردووە، زۆرجار بەرهەمی شاعیرانی کورد لەگەڵ هی شاعیرانی تری ڕۆژهەلات بەراورد دەکات" [(١٤)]. ئەگەر ئەم بۆچوونەی (کەمال مەزهەر) بە دروست وەربگرین، کەواتە مێژووی ئەدەبی بەراوردکاری لە کوردستان بۆ نزیکەی سەدەیەك پێش ئێستا دەگەڕێتەوە وەکو بەڵگەیەك بۆ توێژەران لەو بوارەدا، بەڵام دەشێت بپرسین ئایا بایەخدانی تێگەیشتنی ڕاستی بە بەراوردی ئەدەبی لە چییەوە سەرچاوە دەگرێت؟ ئایا هۆکارەکانی هاتنی بەریتانیا بوو بۆ کوردستان و پاڵپشتی کردنی

(میجەرسۆن) لە ڕۆژنامەی تێگەیشتنی ڕاستی بۆتە هاندەرێکی سەرەکی بۆ چاوبڕینە دونیاو گەلانی دەوروبەر؟

هەر بە گەڕانەوەمان بۆ سەرەتاکانی سەدەی بیستەم ئەگەر تەماشای (ئەنجومەنی ئەدیبان)ی (ئەمین فەیزی بەگ) بکەین کە لەساڵی (١٩٢٠) لە ئەستەنبۆڵ چاپ کراوە دیسانەوە جۆرێك لە بەراوردکردن بەدی دەکەین، لە چەند شوێنێکدا بۆ نموونە دەنووسێت: "مەولەوی بە موقتەضای ئەو مەوقیعە کە تێدا بووە هیچ چاوی بەشیعری فەرەنگ نەکەوتووە، لە قیطعەیێکدا مەصرەعی ئەوەڵی تەقفیەکراوە لەگەڵ مەصرەعی ثالث و قافیەی مەصرەعی ثانی ڕێك خستووە، لەگەڵ مەصرەعی رابع، ئەو قیطعەیە لە ئاخری ئەم کتێبەدا نوسراوە ئەم ئوصولە خیلافی ئوصولی شوعەرای ئێرانەو مەولەوی لەکەسی نەدیوە، مەخصەت بەو حوسنی طەبیعەتی خۆی موناسبی زانیوەو ئیستیعمالی کردووە، لەمابەینی شوعەرای کوردا (مەولەوی) موقابیل بە (نیظامی)یە" [١٥]. لێرەشدا دەبینین جۆرێك لە بەراوردکاری لەنێوان مەولەوی و نیزامیدا هەیە و چۆن بە هەمان شێوە جەخت دەکرێتە سەر ئەوەی کە مەولەوی ئەگەرچی شیعری فەرەنگیشی نەبینیوە و نەیخوێندۆتەوە بەڵام لەسەر ئوسلوبی ئەوان شیعری نووسیوە و لەنێو کورداندا بە بەراورد لە ئاست نیزامیدایە. هەروەها لە شوێنێکی تردا (ئەمین فەیزی بەگ) لە شێوازی خۆیدا بەردەوام دەبێت و شاعیرانی کورد بەراورد دەکات بە شاعیرانی ئێران و دەنووسێت: "شێخ [١٦] لە هەموو عولومی ظاهیرە و باطینە دا صاحیب ئیقتیدار بووە، هەر لەگەڵ تەدریس و ئیرشاد مەشغول بووە، شیعر نەظم کردنی نەکردووە بە مەسەلەك بۆ خۆی، مەعە هاذا مەرتەبەی شاعیرێتی لەمەرتەبەی حافظ و سەعدی زیاتر نەبێ کەمتر نی یە" [١٧].

د. فەرهاد پیرباڵ ئاماژە بەوە دەکات کە یەکەم کەناڵی بەریەککەوتنی ڕۆشنبیری کوردی بە ئەدەب و کەلتووری دەرەوە، لەڕێگەی زانینی زمانەوە بووە، بە تایبەتیش زمانە زیندووەکانی ئەوروپا کە لە کۆتایی سەدەی (١٩) و سەرەتای سەدەی (٢٠)دا زمانێکی گەشەکردوو بووە و ئەدیبان و نووسەرانی فەڕەنسی لەو کاتانەشدا کاریگەرییان لەسەر دونیای ئەدەبیدا هەبووە، بۆیە دەنووسێت:

"ڕەفیق حیلمی، مەمدوح سەلیم بەگ، میقداد مەدحەت، د. عبداللە جەودەت، حوسێن حوزنی موکریانی، شەریف پاشا، فەڕەنسییان زانیوەو ڕاستەوخۆ سوودیان لەو زمانە بینیوە، عبدالرحیم ڕەحمی هەکاری خۆشی ڕووسی و ئەڵمانی زانیوە، هەڵبەتە کەم تا زۆر توانیویەتی شیعر و ئەدەبیاتی نەوژەنی ئەڵمانی رووسی بەسەر بکاتەوە، کاریگەرێتی ئەدەبیاتی ئەورووپا و سیستەمی مەعریفی ڕۆژئاوا بەسەر نووسەرو ڕووناکبیرانی وەك عبدالرحیم ڕەحمی هەکاری لە ئەستەمبوڵ لە ماوەی چارەگی یەکەمی ئەم سەدەیە نکۆڵی لێ ناکرێت، ئەوەتا گرووپی نووسەرانی (ژین) ئەو گرووپەی کە ناوبراو خۆیشی ئەندامیان بووە، لەژمارە (١)ی گۆڤاری (ژین)دا لە ١٩١٨/١١/٧ لەژێر کاری کولتووری ڕۆژئاواییدا دەڵێت: "ئایدیۆلۆژیەتە کۆمەلایەتی و سیاسییە کۆنەکان، ئەمڕۆ ڕوو لە هەرەسن، ئێمە ئەمڕۆ بەشداری لەسازکردنی چەند ڕێبازو پرەنسیپێکی تازە دەکەین، جگە لەمە ئەو بەڵگەیەش لەبیر نەکەین کە ئەم کاریگەرییە ئەورووپاییە ڕاستەوخۆیە، بۆتە یەکێك لەو هۆکارانەی وایان کردووە کە عبدالرحیم هەکاری — خۆی، بۆیەکەمین جار لەمێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا، فۆرمی جۆرێکی نوێی هونەری بهێنێتە ناو ئەدەبی کوردییەوەو بەکوردانی بناسێنێت، کە ئەویش (شانۆنامە)یەو فۆرمێکی ئەدەبی ڕۆژئاواییە" [(١٨)].

بەشێکی تری ئەدیبان و نووسەرانی کورد لەژێر کاریگەریی زمانی تورکیدا بوون و بەشێکی ژیانی خۆیان لە ئەستەنبوڵدا بەسەر بردووە، کە بۆ ئەو کاتە بۆ شاعیر و نووسەر و ڕووناکبیرە کوردەکان پایتەختی ئەدەبیات و هونەر بووە، بۆیە (فەرهاد پیربال) دەنووسێت: "لەکۆتایی سەدەی ١٩ و سەرەتای ئەم سەدەیەدا، هەرچی بزووتنەوەیەکی ئایدیۆلۆژی و ئەدەبی و هونەری لە ئەورووپا دروست ببوایە، یەکسەر لە ئەستەمبوڵدا دەنگی دەدایەوەو بڵاو دەبۆوە، بێ گومان، ئەو نووسەرە کوردانەی لەو ماوەیەدا لەئەستەمبوڵ ژیاون (پیرەمێرد، عبدالرحیم ڕەحمی هەکاری، مستەفا شەوقی، محەمەد میهری...هتد) کەم تا زۆر هەر دەبێت کەوتبێتنە ژێر زەبری شەپۆڵەکانی ئەو پێشکەوتنە ئەدەبییەی ئەورووپاوە، کە لە ئەستەنبوڵ بەزمانی تورکی دەگەیشتە دەست کوردەکان، جگە لە شەپۆڵی

ئەوروپا، کۆمەڵێك گۆڤاری هونەری و ئـەدەبی و تـورکیش، کـە لـەژێر کاریگـەرێتی قوتابخانەی (ڕیالیستی) و (پەرناس) و ڕێبازە تازەکانی دیکەی ئەوروپا بوون، لەو سەردەمەدا کاریگەرێتی خۆیان بەسەر نووسەرە کوردەکاندا نواند" [١٩].

(ئەحمـەد تاقانـە) لـە توێژینەوەیەکـدا لـەبارەی کاریگـەری شـاعیرێکی نوێخوازی تورکی وەکو (تۆفیق فیکرەت) بەسەر شاعیرانی کوردا، ئاماژە بۆ ئـەوە دەکات کە (فیکـرەت) کاریگـەریی زۆری هـەبووە بەسـەر شـاعیرێکی وەکـو (شـێخ نووریدا) و دەنووسـێت: "لـەنێوان شـیعرەکانی شـێخ نـوری — دا چـوار شـیعرمان بەرچاو دەکەوێت، کە نەك هەر شیعری تۆفیق فیکرەت کاری تـێ کـردوون، بـەڵکو دەگاتە ڕادەی گۆڕینـەوەی دەقـاودەقی زۆر لایـەنی و لێ وەرگرتنـی زەق و دیـار" [٢٠]. بەم شێوەیە (ئەحمەد تاقانە) ئەوە دەخاتە ڕوو کـە (شـێخ نـوری) نـەك هـەر تەنیا لەژێر کاریگەریدا بووە بەڵکو دەقێکی کوردی بەرهەم هێناوە کە پڕاوپـڕە لـە مانا و فۆرمی شیعرێکی تری فیکـرەت. شـیعرەکەی فیکـرەت لـەژێر نـاوی (گەریـەء خەسـران)ە، شـیعرەکەی (شـێخ نـوری)ش لـەژێر نـاوی (گریـانی نـا ئومێـدی)یـە، کاریگەریی تۆفیق فیکرەت لەنێو شاعیرانی کـورددا تـەنیا بەسـەر (شـێخ نـوری)دا نەبووە، بـەڵکو (گـۆران)ی شـاعیریش کەوتۆتـە ژێـر کاریگـەریی شـیعر و شـێواز و زمانی شیعری (تۆفیـق فیکـرەت)ەوە، بۆیـە دەبیـنین (تاقانـە)، ئامـاژە بـۆ ئـەوە دەکات کە سێ جۆر کاریگەری لە شیعرەکانی گۆراندا بەدی دەکەین:

١. سـەرەتای دامەزرانـدنی شـیعر و دەسـتپێکردنی، کـە گـۆران بـە هـەمان شێوەی تۆفیق فیکرەت و بـە هـەمان وشـەکانی ئـەو شـیعری (بـەیان)ی نووسیوەتەوە و هەردووکیان بە (مەلا بانگدان) دەست پێدەکەن [٢١].
٢. لـە مەسـەلەی وەرگرتنـی وێنـەی شـیعری و دەسـتەواژەدا، (گـۆران) کاریگـەریی تۆفیـق فیکرەتـی پێـوە دیـارە، کـە وێنـەی شـیعری و دەستەواژەشی گیانی شیعرن [٢٢].
٣. لە مەسەلەی نوێکردنەوەی شیعردا، ئەویش مەسـەلەی یـەکێتی بابەتـە، کە تەواو وەرچەرخانێکی گەورەیە بەسەر یەکێتی دێڕە شیعردا [٢٣].

کەواتە کاریگەرییەکان زۆر بە ئاشکرا بەسەر سێ لایەنی شیعری گۆرانەوە دیارن، بۆ دڵنیابوونی ئەوەش لەم کاریگەرییانە ئەحمەد تاقانە دەڵێت: "لەشیعری کۆندا (هی هەموو ناوچەکە نەك هەر هی کورد)، لەسەر بنچینەی یەکێتی دێڕ شیعر بنیات دەنرا، بەڵام لەدواییدا و لە سەردەمی تازەکردنەوە بەم لاوە یەکێتی گشتی بابەت بووەتە بناغەی شیعر... جا لەم لایەنەشەوە شیعرەکانی فیکرەت کارێکی چاکی لەشیعری شاعیرە کوردەکان کردووەو مامۆستا گۆران چەند چامەو پارچە شیعرێکی هەیە کە بابەتی ناوەندی و ناوەرۆکەکەی بە دڵنیاییەوە دەتوانم بڵێم لە فیکرەتەوە وەرگرتووە" [٢٤]. لێرەدا بەپێی ئەم قسەیە بێت، (گۆران) سرووشی زۆری لە دەقە شیعرییەکانی (تۆفیق فیکرەت) وەرگرتووە، چونکە لە زۆر لایەندا کاریگەریی هەبووە لەسەر هەندێك شاعیری تری کوردیش، ئەوەش بەشێکە لە پرۆسەی کاریگەری و کارتێکردن لەنێوان ئەدەبی دوو زمانی جیاوازدا. کەواتە پرۆسەی ئەدەبی وەکو پرۆسەیەکی مرۆڤانە لەسەر بنەمای کارلێککردنی دووانە بنیات دەنرێت.

لەلایەکی تریشەوە بۆ هەمان مەبەستی کارتێکردن و کاریگەریی ظاهر لطیف پێی وایە کە "لە ئەدەبی بەراوردا، بەتایبەتی لە ڕوانگەی کارتێکردن و کارتێکراو، کار لەسەر دەستنیشانی سەرچاوە دەکرێت بۆ نموونە ئەدەبی بەراورد هەوڵ دەدات کە سەرچاوەکانی شیعری (ئافرەت و جوانی)ی مامۆستا گۆران دەستنیشان بکات، سەرچاوەی ناوەوەو سەرچاوەی دەرەوە، تا بزانین لە لایەکەوە گۆران چەند توانیویەتی سوود لەو سەرچاوانە وەربگرێت، لەلایەکی تریشەوە چەند توانیویەتی شتی نوێمان بۆ بێنێت کە لە سەرچاوەکەدا نابینرێت، خۆ ئەگەر بەراوردێك بکەین لە نێوان ئەم شیعرە و فەلسەفەی خۆشەویستی (شیللی) ئەوە بە ئاشکرا دەردەکەوێت کە گۆران شتێکی نوێی هێناوە وەك ئەوەی لە شیعرەکەی شیللیدا مەبەستەکە جووتبوونی نێرو مێ بێت، لەوەی گۆراندا یوتوپیا بێت:

What are all these

Kissing worth

If thou kiss not me

بەلاّم تەبیعەت هەرگیزاو هەرگیز
بێ ڕووناکییە بێ بزەی ئازیز " [٢٥].

بە بۆچوونی (د. ظاهر)، ئەوە کاری بەراوردی ئەدەبە لە ڕەگوڕیشە و سەرچاوەکانی سرووشی شیعری بکۆڵێتەوە، بۆ ئەوەی ڕەخنەگر بتوانێت ئەو سەرچاوانە دەستنیشان بکات کە بوونەتە هۆی دروستکردنی سرووشی شیعریی لەلای ئەو شاعیرەدا. کەواتە مەسەلەکە لێرەدا تەنیا دەستنیشانکردنی ڕەگوڕیشە و سەرچاوەکە نییە، بەڵکو تێگەیشتنە لە ئاستی پێگەیشتن و تازەگەریی لەنێو دەقی نوێدا.

## ئەنجام

١- ئەدەبی کوردیش وەکو ئەدەبی هەر نەتەوەیەکی تر کەوتۆتە ژێر کاریگەری ئەدەبی جیهانی بە گشتی .

٢- هەوڵدانی هەندێك لە شاعیرانی کورد بۆ لاساییکردنەوەی هەندێ لە شاعیرە گەورەکانی دونیاو ناوچەکە .

٣- بڕوابوونی شاعیرو ئەدیبانی کورد بە سوود وەرگرتن لە ئیلهام و بەرهەمی بێگانە ، بۆبەدیهێنانی بەرهەمێکی تازەو جوانتر .

٤- زانینی زمانی بێگانە هۆکارێکی سەرەکی بووە، بۆ سەرهەڵدانی بەراوردی ئەدەبی و گەشەسەندنی لەناو ئەدەبی کوردیدا .

٥- مێژووی بەراوردی ئەدەبی لە کوردستاندا ، بۆ نزیکەی سەرەتاکانی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە .

٦- یەکەم سەرچاوەی مێژووی کورد بۆ بەراوردی ئەدەبی لە کوردستاندا بریتییە لە تێگەیشتنی ڕاستی .

# سەرچاوەکان

١- ئەحمەد تاقانە، تۆفیق فیکرەت و شاعیرە نوێخوازەکانی کورد، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠١.

٢- ئەمین فەیزی بەگ، ئەنجومەنی ئەدیبان، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٨٢

٣- حسین عارف، چیرۆکی هونەری کوردی ١٩٢٥-١٩٦٠، لێکۆڵینەوەیەکە لەبارەی چیرۆکی هونەریی کوردییەوە لە سەرەتا و سەرهەڵدانییەوە هەتا نەشونماکردن و پێگەیشتنی، چ. ١، دار الحرية للطباعة، بەغدا ، ١٩٧٧.

٤- خانای قوبادی، شیرین و خوسرەو، ئامادەکردنی، محەمەدی مەلا کەریم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٧٥

٥- عبدالخالق علاءالدین، دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد، دار آفاق عربية للصحافة و النشر، ١٩٨٥.

٦- عەزیز گەردی، ئەدەبی بەراوردکاری، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٧٨.

٧- د. فەرهاد پیربالێ، عبدالرحیم ڕەحمی هەکاری، دەزگاها سپیرێزیا چاپ و وەشانێ، دهۆك، ٢٠٠٢.

٨- د. کەمال مەزهەر، تێگەیشتنی ڕاستی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٨٧

٩- د. کەمال مەعرووف، زانستی ئەدەبی بەراوردکاری، چاپخانەی یاد، چ ١، سلێمانی، ٢٠٠٧

١٠- گۆران، دیوانی گۆران، ئامادەکردنی، محەمەدی مەلا کەریم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٨٠

١١- محەمەد ڕەسول هاوار، پیرەمێردی نەمر، چاپخانەی العاني، بەغداد، ١٩٧٠

١٢- مەولود ئیبراهیم حەسەن، گەڕان بەدوای نەمریدا، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٢

١٣- پ. د. ظاهر لطیف کریم، ئارگومینتی نێوان ئەدەبی بەراورد و دەقئاوێزان (٢ - ٢)، ڕ. کوردستانی نوێ - ئەدەب و هونەر، ژ. (٥٤٥٩)، پێنجشەممە، (٢١ / ٤ / ٢٠١١).

## پەراوێزەکان

١) عەزیز گەردی، ل١٠٩.
٢) پ. د. ظاهر لطیف کریم، ئارگومینتی نێوان ئەدەبی بەراورد و دەقئاویزان (٢ – ٢)، ڕ. کوردستانی نویَ – ئەدەب و هونەر، ژ. (٥٤٥٩)، پێنجشەممە، (٢١ / ٤ / ٢٠١١).
٣) عەزیز گەردی، ل١١١ – ١١٢.
٤) حسین عارف، چیرۆکی هونەری کوردی (١٩٢٥–١٩٦٠)، لێکۆڵینەوەیەکە لەبارەی چیرۆکی هونەریی کوردییەوە لەسەرەتا و سەرهەڵدانییەوە هەتا نەشونماکردن و پێگەیشتنی، چ. ١، دار الحریة للطباعة، بەغدا، ١٩٧٧، ل١١.
٥) پ. د. ظاهر لطیف کریم، ئارگومینتی نێوان ئەدەبی بەراورد و دەقئاویزان (٢ – ٢)، ڕ. کوردستانی نویَ – ئەدەب و هونەر، ژ. (٥٤٥٩)، پێنجشەممە، (٢١ / ٤ / ٢٠١١).
٦) مەولود ئیبراهیم حەسەن، گەڕان بەدوای نەمریدا، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٢، ل١٥٤.
٧) مەولود ئیبراهیم حەسەن، ل٢١٣ – ٢١٤.
٨) پ. د. ظاهر لطیف کریم، ئارگومینتی نێوان ئەدەبی بەراورد و دەقئاویزان (٢ – ٢) ڕ. کوردستانی نویَ– ئەدەب و هونەر، ژ. (٥٤٥٩)، پێنجشەممە، (٢١ / ٤ / ٢٠١١).
٩) محەمەد ڕەسول هاوار، پیرەمێردی نەمر، چاپخانەی العاني، بەغداد، ١٩٧٠، ل٣٥.
١٠) خانای قوبادی، شیرین و خوسرەو، ئامادەکردنی، محەمەدی مەلا کەریم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد،بەغداد، ١٩٧٥، ل٩.
١١) س. پ، ل١٠.
١٢) گۆران، دیوانی گۆران، ئامادەکردنی، محەمەدی مەلا کەریم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٨٠، ل٣.
١٣) عبدالخالق علاءالدین، دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد، دار آفاق عربیة للصحافة و النشر، ١٩٨٥، ل١٩٠.
١٤) د. کەمال مەزهەر، تێگەیشتنی ڕاستی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٨٧، ل١٦٩.
١٥) ئەمین فەیزی بەگ، ئەنجومەنی ئەدیبان، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٨٢، ل٣١.

١٦) مەبەستی لە (شێخ)، حەزرەتی مەولانا ضیاءالدین شێخ خالد لە عەشیرەتی میکائیلییە، کە عەشیرەتێکە لە دەوروبەری سلێمانی گەشت و گوزار دەکەن، لەسەر تەریقەتی نەقشبەندییە.

١٧) ئەمین فەیزی بەگ، ل٣٥.

١٨) د. فەرهاد پیربالّ، عبدالرحیم ڕەحمی هەکاری، دەزگاها سپیرێزیا چاپ و وەشانێ، دهۆك، ٢٠٠٢، ل١٩ — ٢٠.

١٩) د. فەرهاد پیربالّ، ل٢٠ — ٢١.

٢٠) ئەحمەد تاقانە، تۆفیق فیکرەت و شاعیرە نوێخوازەکانی کورد، دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠١، ل٢٥.

٢١) س. پ، ل٤٥.

٢٢) س. پ، ل٤٧.

٢٣) س. پ، ل٥٠.

٢٤) ئەحمەد تاقانە، ل٥٠.

٢٥) پ.د. ظاهر لطیف کریم، ئارگومینتی نێوان ئەدەبی بەراورد و دەقئاوێزان (٢ — ٢)، ڕ. کوردستانی نوێ — ئەدەب و هونەر، ژ. (٥٤٥٩)، پێنجشەممە، (٢١ / ٤ / ٢٠١١).

## الملخص

خلال المراحـل التاريخيـة المختلفـة تطـور الادب الكـوردي بـشكل تـدريجي حـسب الاوضاع السياسية والاقتـصادية والاجتماعيـة والثقافيـة في المنطقـة ، ولهـذا لم يكـن الادب الكردي بعيدا عن الاتجاهات والافكار والمدارس العالمية التي كانـت تظهـر بـين آونـة وأخـرى مـع ظهـور مؤسـسات الطباعـة والنـشر ، وظهـور الجرائـد والمجـلات والمنشورات الكوردية في نهايـة القـرن التاسـع عـشر وبدايـة القـرن العـشرين ، حـاول الادبـاء الكـورد مـن خـلال فهمهـم لـلادب العـالمي وأدب الـدول والاطـراف المحيطـة بكوردستان ، طرح رؤيـة جديـدة مـن خـلال النـصوص الكورديـة بـشكل أن أدبـاء الكورد دخلوا في مشروع التأثير والتأثر مع اللغات والآداب الاجنبية ، واستطاعوا مـن خلال هذا الاختلاط ابداع نصوص غاية في الروعة والجمال .

وجود هذا الاسلوب من التأثير والتأثر بين أدبـاء الكـورد وأدبـاء الاجانـب شـجع المثقفين والكتاب والباحثين الكرد على تبني المقارنة الادبية في كوردستان وتطبيقـه على النصوص الكوردية مـن اجـل فهـم افـضل ورؤيـة أوضـح لتحديـد عمـق التـأثير والتأثر بين الكتاب الكورد والاجانب .

ولهـذا نـرى سـنويا عـددا كـبيرا مـن البحـوث والدراسـات واطروحـات الـدكتوراه والماجستير حول المقارنة الادبية وأهميته في أقليم كوردستان .

**Abstract**

During the different stages of historical development of Kurdish literature gradually as the political, economic, social and cultural rights in the region, and this was not the Kurdish literature away from the trends and ideas, international schools, which used to appear once in a while With the emergence of institutions of printing and publishing, and the emergence of newspapers, magazines and publications Kurdish at the end of the 19th century and the beginning of the 20th century, tried to writers Kurds through their understanding of the literature World Literature states and parties surrounding Kurdistan, introducing a new vision through the word Kurdish is that the writers Kurds entered in the draft impact and affected with foreign languages and literature, and were able through this mixing creativity texts very magnificence and beauty.

The existence of this style of influence and interaction between writers Kurds and writers overseas encouraged the intellectuals, writers and researchers, the Kurds on the adoption of comparative literature in Kurdistan and applied to the texts of Kurdish in order to understand better and clearer vision to determine the depth of impact and affected among writers Kurds and foreigners.

For this we see every year a large number of research studies and doctoral dissertations and master on the comparative literature and its importance in the province of senior Kurdistan.

# شێواز و ئەرکەکانی پەندی پێشینانی کوردی (هەڵبژاردەی پەندە ژن ئامێزەکان)

د. پەخشان سابیر

**دەروازە**

پەند بەشێکی گرنگی ڕۆشنبیریی میللییە، لە ئاکامی تاقیکردنەوەکانی ژیانی مرۆڤ لە قۆناغێکی دیاریکراودا دروست بوون ، بەردەوامی بەکارهێنانیان نیشانەی بەهێزی بیری نێو پەندەکانە، کە سروشتێکی هەمیشەیی لە ناوەوەو چەمکی گەلێك لە پەندەکاندا بەدی دەکرێت ، ئینگلیز لایان وایە

**( پەندی پێشینان درۆ ناکا)** [1].

تا چەند دەتوانرێ ئەم پەندانە وەك ئاکامی تاقیکردنەوەیەکی دیاریکراو لە قۆناغێکی دیاریکراودا ببنە بەڵگە بۆ ژیانی ئێستا ، یا چەمکەکانیان ڕاست بن و بشێن لە سەردەمی ئێستاشدا بەکاربهێنرێن ؟ .

چونکە پەند وەك چەکێکی دوو سەرە یا زیاتریشە، دەشێ مرۆڤ بیخاتە ژێر دەسەڵاتی ئامانجەکانیەوەو بۆ قەناعەت پێهێنانی لایەنە گیانییەکەی بەکاری بهێنێ، ئەمە لەلایەك و بۆ پاڵپشتیکردنی هەڵەیەکی ژیانی لەلایەکی ترەوە، بۆیە لەنێو دەقی پەندەکاندا چەمکی پۆزەتیف و چەمکی نێگەتیف هەن. بەشێوەیەك کە هەندێك پەند لە شوێنی خۆی بەکارنایەت و دەبێتە هۆی بەهەڵە بڵاوکردنەوەی، دەقی ئەم پەندانە بەهەردوو جۆرەکانیەوە دەرهاوێشتەی کۆمەڵگان. بیرەکان لەنێو خوێنی کەسەکانی کۆمەڵگان بەدرێژایی قۆناغە مێژووییەکان هەر لە داب و نەریت و بیرکردنەوەو بیروباوەڕ....هتد. هەموو ئەو ڕەگەزانەی کۆمەڵگا ڕێك دەخەن .

پەند لەسەر سێکوچکەیەکی پتەو و گرنگ دامەزراوە، ئەوانیش ئەرکەکانی پەندن و بریتین لە :

١. ئەرکی پەروەردەیی – رۆشنبیری .

٢. ئەرکی کۆمەڵایەتی .

٣. ئەرکی ئەدەبی و جوانناسی .

دەبێ ئەوەش لەیاد نەکەین کە پەند دوو ئەرکی نێگەتیڤی بۆ هەندێك کەس هەیە، بریتین لە[٢] :

١. کەسانێك کە هەڵە دەکەن پشت بە لایەنی نێگەتیڤی پەندەکان دەبەستن، دەروونیان ئاسوودە دەبێت، بەڵام ئەمە فێڵێکە لە فێڵەکانی ناهەست .

٢.دەبێتە هۆی لەکارخستنی توانای کەسان لە بیرکردنەوەو کاروباری هزری، چونکە قاڵبی ئامادەکراوی بەهێزی وای پێ دەبەخشێ بۆ دیاریکردنی هەڵوێستێکی دیاریکراو، یا بەرەو هەندێ ئاراستەی دەبات، لەوانەیە بەتەواوی گونجاو نەبێت بۆ کاتی ئێستا، واتە کەسەکان بەرەو برێك لە دواکەوتوویی دەبات کە دەبێتە کۆسپێك لەبەردەم پێشکەوتن .

پەندەکان ڕەنگدانەوەیەکی روونی ئەو بیرو باوەڕو نەریتانەیە کە کۆمەڵ باوەڕیان پێی هەیە، پەندەکان ئامرازێکن بۆ دەربڕین و حوکمدان لەسەر بابەتەکان، چونکە چەمکە باو و بڵاوەکان لەبواری پەنددا بەدی دەکرێن . پەند باشترین بەڵگەیە بۆ تێگەیشتن و دیاریکردنی کەلتووری نەتەوە، لەبەرئەوەی جۆرو شێوازی ژیانی میللەتی تێدا بەدی دەکرێت. تەنانەت خوێندنەوەی چین و توێژەکانی کۆمەڵ، پلەی کۆمەڵایەتی و پەیوەندی نێوان ئەم چین و توێژانە بە وردی لە پەنددا بەدی دەکرێت، هەرچەندە بەشێکی زۆری پەندەکان لە ژینگە میللییەکەوە هەڵقوڵاون.بەڵام هەندێکیان دەگەڕێنەوە بۆ ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی بەرز، بۆیە پەندی پێشینان واقیعی کۆمەڵ دەردەخات، نەك بەشداری لە دروستکردنی بکات.

پێویسیتی مێژوویی – رۆشنبیری ئەم پەندانەیان داهێناوە، لە پاڵ ئاراستە کۆمەڵایەتییەکە، لە کۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی تر دەگۆڕێن. لە ئاکامی نزیکی

تاقیکردنەوەکانی نێو کۆمەڵ و بوونی زەمینەیەکی هاوبەشی هەست و سۆزی مرۆڤایەتی کە بۆتە هێڵی سەرەکی کۆکردنەوەی چەمکی گەلێك پەند لە نێوان میللەتەکانی جیهاندا تەنیا لە رووی زمان و داڕشتن و چۆنیەتی داڕشتنەکە گۆڕانیان تێدا بەدی دەکرێت، لەگەڵ پاراستنی تایبەتمەندی هەر کۆمەڵ و زمانێك.

کلتووری ئایینی هاوبەش (پابەندبوون بە داب و رەوشتی ئیسلامی یا گوزارشتکردن لە گیانی ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ)[٣] بەتایبەتی پەندەکانی گەلانی رۆژهەڵات هاوبەشن و لەیەك ئەچن، ژیانی ئەم گەلانە لەزۆر دیمەندا لەیەك ئەچێت لە رووی گۆڕان و بەرەوپێش چوونی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە ئەم گەلانە بەپلەو رژێمی لەیەکچوودا تێپەڕ بوون، پیاوی ژیریان ئەزموونی لەیەکچوویان لەبارەی ژیان وەرگرتووە[٤] .

ئایا هەموو ئەو پەندانەی کە ئاوێنەی کۆمەڵگاو تاقیکردنەوەکانی کۆمەڵگای کوردی بوون، لە قۆناغە مێژووییە جیاجیاکاندا، دەلالەت و واتاو چەمکەکانیان، بۆ هەموو سەردەمەکان دەگونجێن؟ ناکرێ بەم شێوەیە مامەڵە لەگەڵ ئەو پەندانەدا بکرێت، چونکە گەلێك لەو پەندانە پەیوەستن بە سەردەم و رۆشنبیری و شێوازێکی دیاریکراوی ژیان و لەو چوارچێوەیە دەرناچن، بەکارهێنانی ئەو جۆرە پەندانەی کاتیان بەسەرچووەو لەکاتی ئێستادا دەگەڕێتەوە بۆ عەقلیەت و بیرکردنەوەی ئەو کەسانەی هانا بۆ ئەو جۆرە پەندانە دەبەن، چونکە بەکۆتایی پێهێنانی واقعی کاتی پەندەکە، پەندەکەش نامێنێ .

**بەشی یەکەم/ پەندی پێشینان و ڕۆڵی لە فۆلکلۆری کوردیدا.**

**- پەندی پێشینان، چەمك و زاراوە**

پەندی پێشینان یەکێکە لە بەشەکانی فۆلکلۆر و پانتاییەکی فراوانی لە نێویدا داگیرکردووە، لە دوای هەموو پەندێکەوە چیرۆکێك یا بەسەرهاتێك هەیە کە بەشێکە لە کولتوور و ڕۆشنبیریمان، پەندی پێشینان خراوەتە قالبی چەندین بیر و بۆچوون ، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم بەدواوە، کوردناسەکانی ئەوروپا بایەخیان بە ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی داوە بە تایبەتی پەندی پێشینان، لەم ڕووەشەوە کتێبی تایبەتی لەسەر دانەنراوە، بەڵکو لە کتێبی گشتی فۆلکلۆردا باس کراوە[٥]، بەڵام ئێستا لە کتێبی تایبەتدا بە ڕێژەیەکی کەم بەدی دەکرێت، کەچی جگە لە هەندێکیان، تەنیا کۆکردنەوەی پەندەکانن وەك هەنگاوێکی سەرەتایی، نەك شیکردنەوە و پۆلینکردن، دەشێ لە داهاتوودا ئەم کارانە ئەنجام بدرێن.

پەندی پێشینان وەك زاراوە بە گەلێ شێوە بەکار دەهێنرێت بە پێی ناوچە و وڵات و شێوەزاری ئەو شوێنە دەگۆڕێت[٦]، وەك: مەسەلەی پێشینان، بێژوبەند، قسەی باڤان، مەسەلە و مەتەلۆکی، مەسەلەی کوردەواری، مەتەڵی کوردی...هتد. یان (کورد دەڵێ، گەهپیدی باڤان، پێشینان گوتوویانە...هتد)[٧]، هەرچەندە بابەتەکە وەکو زاراوە بەندە بە ڕابردوو بەڵام خودی پەندەکان بە کاتەوە نەبەستراونەتەوە و گەر ڕووداوی هاوشێوە سەری هەڵدا بەکارهێنانی پەندەکەش دەلکێ بەو کاتەوە[*] یا پێویست بە دەستکارییەکی کەم دەکات.

گەلێك جار پەند و حیکمەت بەیەکەوە بەکاردەهێنرێن، بەڵام پەند لە حیکمەت بلاۆترە و پانتاییەکی فراوانتری لە ڕۆشنبیری کۆمەڵگادا گرتووە، بە هۆی سروشتی خودی پەندەکان کە سەرچاوەی دروستبوونیان لە میللەتەوەیە، حیکمەت لە سەرچاوەیەکی ڕۆشنبیری چڕ سەری هەڵداوە و حیکمەتی بلاۆیش وەکو پەندی لێ دێ، بۆیە دەشێ بڵێین هەموو حیکمەتێك پەندە، بەڵام هەموو پەندێك حیکمەت نییە، بەڵکو گەلێك پەند برێك لە حیکمەتیان تێدا بەدی دەکرێت، سەرباری وردبوونەوە لە ئاکامی زانست و خوێندنەوە و بوونی نیازی چاکسازی

تێگەیشتنی پێویستییەکان دەبێت، کەچی پەند بەرهەمی خەڵکانێکی نەخوێندەواری هۆشیاری بیرکراوەیە، هەرچەندە ئەمە نابێتە پێوەرێکی گشتی و گشتگیر، بەلاّم لەوەدا هاوبەشن کە هەردووکیان لە ئاکامی یەکانگیری لەگەڵ خەڵکدا دروست دەبن، هەرچەندە (حیکمەت زانست و لێزانینە)[8]پەندیش یەکێکە لە گرنگترین پێداویستییەکانی خەڵکان و نووسەر و شاعیران چونکە ئاخاوتن چەشنی خشڵ دەرازێنێتەوە و بۆ باشترین پلەکانی چاکسازی بەرزی دەکاتەوە.[9]

پەند بە واتای جیاوازیش دێت وەك: هاوشێوە، سیفەت، ئامۆژگاری، وانەوەرگرتن و بیرهێنانەوە، هۆشیارکردنەوە، ئاگادارکردنەوە،...هتد، لە سەرچاوە ئایینەکانیش پەند بە واتای عیبرەت و هێنانەوەی نموونەیەك تا ببێتە بەڵگەیەکی بەهێز بۆ ڕووداو یا هۆشیارکردنەوەی مرۆڤەکان یا زۆرجار پەندی پێشینان و قسەی نەستەق بەیەکەوە گرێ دەدرێت، یا تەنانەت لەگەڵ فەرموودە و ئایەت و حیکمەت تێکەڵ دەکرێت. هەروەك (ئیبراهیم النظام) کە لە ٣٣١ك. کۆچی دوایی کردووە ئاماژەی بەوە کردووە لە پەندی پێشینناندا چوار ڕەگەزی تێدا کۆدەبێتەوە کە لە هیچ هونەرێکی تردا بەدی ناکرێت، بریتین لە: کورتبڕی، واتاگەیاندن، پێکانی مانا، جوانی لێکچوواندن و چڕی درکە کە لووتکەی ڕەوانبێژییە[10]یا هەندێك وای بۆدەچن کە قسەی نەستەق و پەند زۆر لە مێژینە و کات و شوێن بزرە، هەرچەندە زۆر لە مێژینەیە بەلاّم کات و شوێن بزر نییە، بەڵکو لە ڕێگەی پەندەکانەوە دەتوانرێ سەردەمی پەندەکان دیاربخرێت، لە ڕێگەی زمانەکەشەوە شوێنەکە دیاری دەکرێت[11]. لە ئینسکلۆپیدیای بەریتانیدا هاتووە کە پەند ( وتەیەکی ڕەوانی توندوتۆڵ لە سنوورێکی فراوانی گشتیدا بەکاردەهێنرێ، لە دەستەواژە بلاّوەکانی نێوان خەڵکانە) کەواتا یەکێ لە خەسڵەتە بنچینەییەکانی پەند بریتییە لە فراوانی پانتایی بلاّوبوونەوە، هەروەها قەناتی کوردۆ لە کتێبی (قسەی نەستەق و پەندی پێشینانی ڕۆژهەلاّت)دا ئاماژە بەوە دەکات کە (پەندی پێشینان یەکێکە لە هونەرەکانی خەڵك، بەبێ ئەوەی نووسرابێتەوە ، وتەیەکی کورتە بە زۆری کێش و قافیەی تێدایە)[12]* یا لە پێناسەیەکی تردا هاتووە (پەند ڕستەیەکی کورت یان نیمچە درێژە، بەلاّم پڕ واتا

و مەبەست پێك، بە بۆنەیەکی تایبەتیەوە وتراوە، کە لـە ناوکۆمەڵدا ڕووی دابـێ و چارەسەرێکە بۆی)[١٣]

(فردریـك زایلـەر) لـە پێـشەکی کتێبـە پـڕ بەهاکـەی (زانـستی پەنـدە ئەڵمانیەکان) دەڵێ: (پەند ئەو وتە باوەیە کـە لەسـەر زاری میللەتـە، سروشـتێکی فێرکردنـی تێدایـە و شـێوەیەکی ئـەدەبی تـەواو و بـاڵاترە لـە شـێوە دەربڕینـە ناسراوەکانی تر)[١٤]سروشتی فێرکردنەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بڕە حیکمەتانەی لـە نێو پەندەکاندا هەن و شێوە باڵاکەیشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو چڕی و کورتبڕی و پـڕ واتاییەی لە پەندا بەدی دەکرێت.

زانا فۆلکلۆرناسە ڕۆژئاواییەکان لایان وایـە (پەنـد لـە شـێوە سـەرەکییەکەی گوزارشــت لــە ڕاســتییەکی ڕەوا دەکــات، کــە بــە شــێوازێکی ئاســانی کــورتبڕ دەردەبڕێـت، تـا جـەماوەرێکی فـراوان بـەکاری بهێـنن)[١٥]، پەنـد تاقیکردنـەوە واقیعیەکانی ژیانی میللەتە لە کات و قۆناغێکی دیاریکراودا بەمەبەستی فێربـوون دەریانبڕیوە، لە قاڵبێکی وردی پڕ لە زانیـاری و ڕۆشـنبیری وەك هـەوڵێکی هـزری کـە ڕۆڵێکـی گـەورە لـە ڕۆشـنبیری میللـی دەنـوێنێ. بۆیـە ئـەرکی پەنـد لـە نەخشەکێشانی سیماکانی ژیـانی کۆمەڵایـەتی ناوەسـتێ، بـەڵکو ئـەو سنوورەش دەبـەزێنێ و دەبێتـە نموونەیـەك کـە لاسـایی بکرێتـەوە. هـەروەها (پەنـد سیمای فێرکردن و تایبەتمەندی چڕکردنەوەی تێدایە و هونەرێکە لـە بەرهـەمی داهێنـراوی تاکەکەسییە)[١٦]، خاوەنی یەکەمی هەبووە، بەپێی قۆناغەکان نەماوە و چۆتە نێـو هزری میللەت، بۆیـە ناشـێ پەنـد بەرهـەمێکی کۆمـەڵی نـەبێت. کەواتـە پەنـد دوو خاســیەتی بنــچینەیی هەیــە، ئــەوانیش ســیمایەکی فێرکردنــە وەك بابــەت، کورتکردنەوە و چـڕکردنەوە وەك شـێواز[١٧]کـە بابەتـە ڕەوانبێژییـەکان هۆکـارێکی گرنگ و یارمەتیدەرن بۆ چڕکردنەوەکە. (لەوانەیە لایـەنی نـا فێربـوون لـە پەنـددا، پەنـدەکان بـەرز بکاتـەوە بـۆ ئاسـتێکی ئـەدەبی و هونـەری کـە لایەنـە فێربوونـە ئاشکراکە ئەم ئامانجە ناپێکێ)[١٨]لە کاتێکدا ئەگەر ئامانجی فێرکردنەکە نـەپێکێ، ئەوا لە ئاکامی کورتکردنەوەی تاقیکردنەوە کەسییەکان ڕەخنە لـە ژیـان دەگـرێ، زۆرجار پەنـد هەسـتی ئـەوەمان لـەلا دروسـت دەکـات کەموکوڕییـەك لـە جیهـانی

ڕەوشــتدا هەیــە، ئەمــەش جگــە لــە ڕەنگدانــەوەی ئــەو کەموکوڕییانــەی لــە تاقیکردنەوەکانی جیهانەکەماندا بەدی دەکرێت، شـتێکی تـر نییـە.[19] ئـەم سـیما فێربوونە ڕەوشتییە هۆکارێکە بۆ فراوانـی بڵاوبوونـەوەی پەنـد و زۆربـەکارهێنانی، دەبـێ هـەمان کەشـی جـاران دروسـت بێتـەوە، بـۆ ئـەوەی زەمینـە بـۆ دووبـارە بـەکارهێنانی خـۆش بێـت کـە (گوزارشـتکردن لـە کۆتـایی تاقیکردنەوەکـە واتـای گەڕانەوەیـە بـۆ دواوە تـا سـەرەتاکانی، واتـە جـارێکی تـر لـە نێویـدا دەژیـن، تاقیکردنەوەکەش لە ناوەڕۆکدا ناگۆڕێ، ئەگەر بە شێوەی چـیرۆك یـا قەسـیدە یـا ئەگەر بە پەند دەربڕا)[20].

لـە چوارچـێوەی ئـەدەبیاتی کوردیـدا پەنـد بۆتـە خـاڵی تێـڕوانین و بایـەخ پێدان. (عەلائـەدین سـەجادی) پێـی وایـە (پەنـدی پێـشینان عیبـارەتن لـە چـەند قسەیەکی کورتی کوردی پێکـەوە نووسـێنراون، مەعنایـەکی بـەرزیان تێدایـە، لـە زەمانێکی زۆر کۆنەوە کەوتوونەتە سەر زمانی کوردی، چۆنیەتی ژیان و ڕەوشت و بیروباوەڕیان چ لە بارەی سیاسی و کۆمەڵایـەتی چ لـە بـارەی ڕەوشـتی خێزانـی و کەینوبەینی ژیانی تێکڕایی، چ لە بارەی دەوڵەمەندی و هـەژاری و پایـەی دنیاییـدا پیشان ئەدەن)[21].

واتە پەند ئاوێنەی بیرکردنەوە و چۆنیەتی ژیانی کورد نیشان دەدات، بەڵام چۆنیەتی ژیانەکە لە قۆنـاغی جۆراوجـۆردا، بۆیـە مـەرج نییـە نـاوەڕۆك و چـەمکی هەموو پەندێك بۆ کـاتی ئێـستا بـشێن، سروشـتی پەنـدەکان و توانـا شـاراوەکانی نێویان ئەم بڕیارە دەدات تا چەند توانای مانەوە بەکارهێنانیان هەیە. لای (شـێخ محەمەدی خاڵ)یش (پەنـدی پێـشینان وتـارێکی کـورتی ڕێـك و پێـك و جـوانی بـە تــەوژمی بــەتینی کاریگــەری کــە لــە دڵ و دەروونێکــی ئــاوەدانی و ئاگــاداری پێـشینانەوە هاتۆتـە دەرەوە. لـە پـاش بـەراورد و تاقیکردنەوەیـەکی دوورودرێـژ پەندی پێشینان کەلەپوورێکی ئەدەبییـە باوباپیرمـان لـە هـەزار ساڵەوە بۆیـان بـەجێ هێـشتووین)[22] یـا تەنانـەت لای وایـە کـە پەنـدی پێـشینان وەك سـەربازی نادیار (الجندي المجهول) وایـە.[23]* لەبەرئـەوەی چـەمکێکی قـووڵی هـەڵگرتووە و خاوەنە ڕەسەنەکەی دیار نییە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا پلـە و پایەیـەکی بـە پەنـد

بەخشیوە، چونکە لە پشت دەربڕین و گوزارشتەکان حیکمەت و دانایی بەدی دەکرێت (پەندی کوردی بە پێی ڕووداو و کارەسات گوتراون، لەبەرئەوە ڕووداوی جیاجیای پێچەوانەی یەکترن، بۆیە پەند هەیە پەند ڕەت دەکاتەوە، ئەم دیاردەیە لە ئایینە پیرۆزەکانیشدا هەیە)[٢٤].

پەند لەگەڵ ئیدیۆمیشدا پەیوەندییەکی پتەویان هەیە، (بەشێوەیەك جاری وا هەیە ئیدیۆمەکە، یان خوازەکە لە بنچینەدا پەندە، بەشێك لە پەندەکە کە کرۆکی پەندەکەیە وەردەگیرێت بۆ ئەو مەبەست و مانایە)[٢٥] یا (هەندێك ئیدیۆم وەك پەند دێتە پێش چاو و پەندیش نییە)[٢٦]، ئەمانە پێویستییان بە بەراوردو بژاردن و جیاکردنەوە لە لێکۆڵینەوە و باسی جیادا هەیە.

پەند لە ئاکامی وردبوونەوە سەرهەڵدەدا، لە دووتوێی وتەیەکی سەنگداری کەسێکی خاوەن ئەزموون لە کات و سات و شوێنێکی دیاریکراودا. بناغەکەی لەسەر (لێکچوواندن) یا (نموونە) دەبێت، کە (ابن المقفع) لای وایە (کاتێ قسە دەکرێتە پەند لە لۆژیك ڕوونتر دەبێت و بۆ بیستن خۆشتر و بۆ کۆمەڵی قسەکەرانیش فراوانتر دەبێت)[٢٧] ئەمەش خۆی لە خۆیدا پلە و بایەخی پەند لە چوارچێوەی فۆلکلۆردا دەردەخات.

## - بەها ئەدەبییەکانی پەند

پەند هەڵوێستە، جۆرێکی دیاریکراوی ئەدەبییە کە خاوەن تایبەتمەندی و بەهایەکی ئامانجدارە، چۆنیەتی دارشتن و شێوازی پەندەکان بەهایەکی ئەدەبییان پێ بەخشیوە، هەر ئەم بەهایەیە وای کردووە پەندەکان ببنە سەرچاوەیەکی بەنرخ بۆ شاعیران و نووسەران، بە مەبەستی تەوزیفکردنیان لە چوارچێوەی دەقەکانیاندا .

کورتی و چڕی ڕستەکانی پەند لە ئاکامی بەکارهێنانێکی فراوانی لایەنەکانی ڕەوانبێژییە بەتایبەتیش لێکچوواندن، خواستن، درکە، خوازە، سەروادار، هێنانەوە .. هتد . سیمای نافێربوون لە پەند زیاتر پەندەکان بۆ ئاستێکی هونەریانەتر بەرز دەکاتەوە. لە ڕووی ناوەڕۆکیشەوە، ئەو پەندانە بەهای تایبەتی

خۆیـان هەیـەو دەمێننــەوە، هەرچـەندە لـەڕووی گۆکردنیـان دەگـۆڕێن، بـەڵام لەناوەڕۆکدا یەك دەگرنەوە، چونکە دوو جـۆر بـیر لـەنێو پەنـدی پێـشینانـدا بـەدی دەکرێت کە بەهایان جیاوازە :

یەکـەمیان : دەیـەوێ کۆمـەڵ لەسـەر شـێوەکەی خـۆی بمێنێتـەوە، واتـە پارێزگاری شێوەی گشتی کۆمەڵگا دەکا .

دووەمیان : هەوڵی گۆڕان و بیری نوێی تێدایەو بەشداری لە چالاککردنی بیری نێو کۆمەڵ دەکات .

جگە لەم بەهایانە کە پەیوەندی بە ناوەڕۆك هەیە، بەها ئەدەبییەکەیان زیـاتر پەیوەندی بە ڕوخسارەوە هەیە،گەلێك جار بەهاکەیان لـە سـەرواداربیەکەیانە، کـە ئاوازێکی ڕێك و ئیقاعێك بە بیرەکە دەبەخشێ .

(ابن عبد ربە ) لە بەرهەمەکەی (العقد الفرید) دا لەبارەی بەهای پەند دەڵـێ :
( پەند بە بەراورد لەگەڵ شیعردا زیاتر دەمێنێتەوە و لـە دوانـدەریش باڵـاترە، کـە هـیچ شـتێك لـەوە زیـاتر نەڕۆیـشتووە و لـەو گـشتیتر نـەبووە )[28] هەرچـەندە پەنـدەکان هـەڵقوڵاوی نێـو بـیری خـەڵکانێکی نەخوێنـدەوارن، بـەڵام خـەڵکانێکی خاوەن سەلیقە و چێژێکی هونـەرین، ڕێکخـستنی وشـەکان و خـستنە نێـو قـاڵبی پەندەکان بەڵگەی ئەم ڕاستییەن .

دەسـەڵاتی عـەقڵ و ڕۆشـنبیریی نێـو کۆمـەڵ پـێش بـوونی ئامرازەکـانی ڕاگەیاندن، توانیویانە ئەم بەهایانە بە پەند ببەخشن. بەشێك لە پەندەکان بـەهۆی داڕشتنیان بە دوو نیوە دێر، یا سێ نیوە دێر هۆنراوە لەسەر کێشی پەنجـە وایـان کـردووە بـەهای ئـەدەبی زیاتریـان تێـدا بـەدی بکرێـت[29] . یـا زۆر جـار هـۆنراوەو پەخشان تێکەڵ کراون، جۆری قاڵبەکان، لەپاڵ سروشـتی بابەتەکـەیان کاریگـەری لەسەر فراوانی بەکارهێنانی پەندەکان دروست کردووە .

ڕێکخستنی کەرەسـتەکان لەپەنـدا ڕێکخـستنێکی ئـەدەبی و هونەرییانەیـە، شێوازی شیعر بەسەر بەشێکیان زاڵە، بۆیە پەند دەچێتە قـاڵبێکی خـاوەن بـەهای ئـەدەبی. دەلالـەت لەچـێژێکی ئەدەبییانـە و جوانناسـی دەکـات و ئـەم بـەها

ئەدەبییانــە، لــەپاڵ ناوەڕۆکەکــەی وای کــردووە پردێکــی پتــەو لەگــەڵ وەرگــردا دروست بکات و زووتر لە مێشکیدا قالبێك وەربگرێت .

## - فەلسەفەی پەندی پێشینان

لەبــەر ئــەوەی پەنــدی پێــشینان بەشــێکی زۆری فێرکردنــی تێدایــە، تاقیکردنەوەیــەکی دێرینــی تێــدا چــڕکراوەتەوە، تێڕوانینــی بــۆ ژیــان و کێــشەو ڕووداوەکانی دەخاتە ڕوو، کە پێکهاتەیەکی فەلسەفییانەی تێدا بەدی دەکرێت .

پەنــدو حیکمــەت لــە قۆنــاغی پــێش فەلــسەفە دەرکــەوتوون بــەواتا وردو دیاریکراوەکــەی کــە ئامــانجی ڕێنمــایی کردنــی مــرۆڤ بــووە لــە هەڵــسوکەوت و پەیوەندی نێوانیان و چۆنیەتی کاروباری ژیانیان ئاماژە بەوە کراوە کە ئەم پەنـدو حیکمەتانە لەلایەن حەکیمەکانەوە وتراون و ژمارەیان حەوت بوون.[٣٠]

( ئەفلاتون) لای وابوو تەنیا ئەم حەکیمانــە توانیویانــە ئــەم پەندانــە دروســت بکەن[٣١] ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە دروستکەری پەند دەبــێ خــاوەن هۆشــیارییەکی فراوان و عەقڵیەتێکی فەلسەفییانە بێت . تەنانەت نووسەرە کوردەکان کاتێ باسی فەلسەفە دەکەن، ئاماژە بە پەندی پێشینان دەکەن[*] .

پەندی پێشینان حوکمدانی تێدا بەدی دەکرێت، حوکمدان لەسەر بارودۆخێکی دیاریکراو یــا کردارێکــی تێدایــە، لــەم ڕوانگەیــەوە دەشــێ بڵــێین : پەنــدی کــوردی کورتکراوەی فەلسەفەی کوردە لە ژیاندا و بەڵگەیەکیشە بــۆ زیرەکــی و وردبییــەکی خۆڕسکانەو تێڕوانینێکی فەلــسەفە ئامێزیــان بــۆ ژیــان هــەبووە و لەگــەلێك پەنــددا چڕکراوەتەوە، ئەمــە گوزارشــت لــە ڕادەی بیرکردنــەوەی ئــەم نەتەوەیــە دەکــات . پەند لەلای کورد شوێنی فەلسەفەی گرتۆتەوە، بۆیە وەك شوێنەوارێك بۆ فەلسەفە مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن، فەلسەفە نــەك وەك زانــستێکی ســەربەخۆ، بــەڵکو وەکــو ئــەو ڕێــڕەوە پــڕ حیکمــەت و ژیرییــەی کــە لــە پەنــددا بــەدی دەکرێــت و نزیکــی دەخاتــەوە لـــە فەلــسەفە، وەك خــستنە ڕووی بابەتــەکانی ژیـــان و مـــردن و خۆشەویستی و چــارەنووس و بــەرگری و ئــافرەت و دۆزەکــانی تــری نێــو کۆمــەڵ، زۆرجار تێڕوانینی نێو پەندەکان ڕاستی دەپێکن و تا ئێستاش بەرێژەیەکی فراوان

بەکاردەهێنرێن، بۆیە لای (شێخ محمدی خاڵ) پەندی پێشینان ( فەلسەفەی ژیان و دەنگی تاقیکردنەوەی جیهان و بەری ڕەوانبێژی ڕەوانبێژانە کە باو و باپیرانمان لە هەزاران ساڵەوە بەکەلەپوورێکی وێژەیی بۆیان بەجێ هێشتووین، تا بیان کەین بە ئاوێنەی باڵانما بۆ خۆمان)(٣٢)، ( بەرزی فەلسەفەی پەندی پێشینان لەوەدایە کە کورتە)(٣٣) . کورتییەکەی لە ئاکامی چڕکردنەوەی واتایەکی فراواندا هاتووە، ئەمەش وادەکات کە لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەی زیاتر لەخۆوە بگرێت.

ئەو واتا ڕەوشتی وکۆمەڵایەتییانەی کە بە شێوازێکی جوانکاری ڕازاونەتەوە ، یەکێکە لەو پاڵپشتیانەی وای کردووە پەند زیاتر لە بیرەوەری میللەتی کورد بڵاو بێتەوە کە گوزارشت لە فەلسەفەی ئەم میللەتە لە بارودۆخێکی دیاریکراودا دەکات(٣٤)، لە بەشێکی زۆری پەندەکاندا برێك لە فەلسەفەی ژیان و تێڕوانین بەرامبەر دیاردەکانی ژیان و دەوروبەری تێدا بەدی دەکرێت، ئەم خاڵە وا لەپەند دەکات کە چەند هەنگاوێك لە فەلسەفەدا نزیك ببێتەوە، سەرباری ئەو زانیارییانەی لەپەندا بەدی دەکرێن. دەیانکاتە سەرچاوەیەك بۆ زانینی ژیانی کەسی کوردو جۆری بیرکردنەوەی لەقۆناغی جیاجیادا.

**– ئاڕاستەی پەند**

لە نێو پەندی پێشیناندا ئەرکی ڕاگەیاندن بە ڕوون و ئاشکرایی بەدی دەکرێت، ئاڕاستەکراوی لەگەڵ خودی پەندەکەدا سەری هەڵداوە، چونکە پەندی پێشینان پەیامێکی لەخۆگرتووە،کە ئامۆژگاری و ڕێنمایی کردنی وەرگرە، بەڵام چۆنیەتی ئاڕاستەکردنەکە هەمەجۆرە، ئەوەی بەرچاوە لە ئاڕاستەکردندا بریتییە لە:

١– ئاڕاستەی ڕاستەوخۆ.
٢– ئاڕاستەی ناڕاستەوخۆ.
٣– ئاڕاستەی هەمەلایەن.
٤– ئاڕاستەی نادیار.

لە نێو ئەم ئاڕاستانەشدا نیمچە ئاڕاستە بەدی دەکرێن.

**١ــ ئاڕاستەی ڕاستەوخۆ**

ئـەم جـۆرە ئاڕاسـتەیە بـەبێ هـیچ ناوەنـدێك قـسەکەر و وەرگـر بەیەکـەوە دەبەستێتەوە، ئەمە زیـاتر لـە شـێوازی بـانگکردن بـە مەبەسـتی هۆشـیارکردنەوە بەدی دەکرێـت و پـشت بـە (بیـنین) دەبەسـتێت. دوو ڕێـڕەو لـەم جـۆرەدا مایـەی سەرنجن:

أ– ئەوەیە کە لە بەشێك لە پەندەکاندا بەدی دەکرێت، ئاڕاستەکە خودییـە، واتــە قـسەکەر (خۆیــەتی) و وەرگــر (خودییــەتی) وەك: (قیزاکەرێمـە، ژنـا مێـرێ چێمە)[٣٥] ئەمە ئاخاوتنێکی ناوەکییە و دیالۆگی ناوەوەیە. یـا (ئـەز هۆدکـەم دی دمرت، ئەز هۆدکەم باب دمـرت)[٣٦]کـاتێ مرۆڤەکـە لـە نێـوان دووحاڵـەتی سـامناك دەبێت و سەری لێ دەشـێوێ و نـازانێ چ بکـات ، ئـەم پەنـدە سـەر هەڵـدەدا وەك گوزارشتکردنێك لە بـارە دەروونییەکـەی و لـە چوارچـێوەی کەسـەکە دەرناچـێت، واتە حاڵەتێکی تایبەتە. یا (لێم دەرپەڕی و لێم هەڵپـەڕی)[٣٧] لـە بڕگـەی یەکەمـدا بەشـێکە لـە خـودی خـۆی، بـەڵام کـە لێـی جیادەبێتـەوە، پێـچەوانە دەبێتـەوە و ڕووبەڕووی دەوەستێت، لێرەشدا ئاڕاستەکە لە خۆیەوە بەرەوخۆی دەبێت.

یا (ڕووی خۆمم کـرد بـە بـەرد)[٣٨]کـاتێ بـە ناچـاری داوای شـتێك بکـات ئـەم پەنـدە سـەرهەڵدەدا، (بـەرد) ڕەمـزی ڕەقـی و پتـەوی و قایمییـە، زیـاتریش ژن کەرەستە و شت دەخوازێت. بۆیە ئەمە قسە و ئاخاوتنی ژنە.

یا (شوم کردگە خوەشم بێ)[٣٩] یا(شوم نەکردگە بۆ پینەوپەڕۆ)[٤٠]. دەشێ ئـەم جـۆرە پەندانــە بــە حەشــاردراوی و ئاڕاســتەکە لــە نێــوان خــۆی و خۆیــدا بمێنێتەوە، بەڵام جاری وا هەیە دەشێ ئاڕاسـتەکە بـۆ ئاگادارکردنـەوەی بەرامبـەر بێت تا یارمەتی بدات بۆ بەختەوەری، بە زمانحـاڵی (مـن). یـا (ببیـنم مـەرگم، زاوا نـەکا بـەرگم)[٤١] ئاخاوتنەکـە لەگـەڵ خۆیـەتی و ئاڕاسـتەکە بـەرەو خـود شـۆڕ دەبێتەوە، لێرەدا خۆزگە و پاڕانەوەیەك بۆ بەدیهێنانی خۆزگەکەی بەدی دەکرێت، یا لەگەڵ خودی خۆی قسە دەکات و بە زمانی خودەکە دەڵێ (دایکت بمرێ جـافر، حــەلوا شــیرین، نــەفس کــافر)[٤٢] دایکەکــە هــەرخۆی ئاڕاســتەکە بــەرەو خــۆی دەکاتەوە.

ب– قسەکەر خۆیەتی و وەرگر (تۆ)ی بەرامبەرە بەبێ بوونی هیچ ناوەندێك وەك لە:

١– بانگکردن :کە تێیدا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ دروست دەبێت، وەك (پیرێ جوانییەکی خۆت بە بیرێ)[٤٣]، (پیرێ) بە هۆی (ێ) دەبێتە پاشگری بانگکراوەکە، ڕاستەوخۆ بانگکراوەکە دروست بووە، یا (کابانێ مەکە قرەقرێ، ئەوەندەش دەخورێ و دەبڕێ)[٤٤]، بەهەمان شێوەیە. یا بە هۆی ئامرازی (ئەی) لە پێش بانگکراوەکە بەکاردێ بە مەبەستی هۆشیارکردنەوە و وەبیرهێنانەوە (ئەی بووکەکەی ماڵی مەتێ، سەرت سوورە پات پەتی)[٤٥]. یا بانگکردنەکە سەرباری (ێ) جەختکردنەوەشی تێدا دەبێت وەك (بووکێ لەگەر تۆمە، خەسوو گێت لێ بێ)[٤٦] یا بەهۆی (یا)ی بانگکردن بە مەبەستی پاڕانەوە و دوعاکردن کە لەسەر پیاوچاك و ناسراوەکان ئەنجام دەدرێت وەك (یا باوەگوڕگوڕ، هاتم بۆ جفتێ کوڕ)[٤٧].

یا هەر بە هۆی وشەی بانگکردن وەك (پیاما بکە شووژن، بانگم بکە ئاغاژن)[٤٨]یا (کچم لەگەڵ تۆمە، بووکێ تۆ گوێ لێ بێ)[٤٩]. یا بە هۆی گەورەیی و ڕێزەوە شێوازی ئاخاوتن و ئاڕاستەکە ڕێزی زیاتری لێ بەدی دەکرێت بە تایبەتی پلەوپایەی وەزیفی وەك: (جەنابی قازی، عەقڵی تۆ، عەقڵی گونم، عەقڵی ژنم وەکو یەکن)[٥٠]

٢– بە هۆی ئامرازی پرسیارکردن:ئاڕاستەکە لە (من)ی قسەکەر بۆ(تۆ)ی بەرامبەر، لە پرسیارکردندا پێویست بەبوون و ئامادەیی هەردوولا دەکات، ئەمەش لە سیاقی پرسیارەکە دەردەکەوێت، کە کەسەکان ئامادەییان هەبووە یا نا، وەك (ئەرێ خەسوو قەت بووك نەبووی؟)[٥١]یا (بۆ شووەکەی وەفای نەو، بۆ من ئەیبێ؟!)[٥٢].

٣– بەهۆی ئامرازی نیشانە وەك: (ئەوە خەتی مێردان و ئەوەش خەتی ژنان)[٥٣]یا (ڕۆڵە مەگری، ئەوە مەمك)[٥٤]. کە برگەی یەکەم داخوازییە و لە برگەی دووەمدا نیشانەیە.

٤- بەهۆی فەرمانی داخوازی وەك (ژنی منداڵدار مەیێنە)[٥٥] یا (ژن بدە بە ژن مردوو، گا بدە بە گا مردوو)[٥٦]. یا (بڕۆ ئەو لای کچێ، سبەی مێردی بکەی تەبەق بەترش دێیەوە)[٥٧] یا (ژنی مێردان بە، لە بن بەردان بە)[٥٨]...هتد.

٥- بەهۆی یەکێ لە ئامرازەکانی خۆزی وەك (خۆزگە داکت مارەکی ببایە ئەتۆی نەبایە)[٥٩].

٦- یا بەهۆی (هەر) وەك ئامرازێکی داکۆکیکردن وەك (هەر بڵێ بەربووك لە بووك جوانترە)[٦٠].

٧- بەهۆی شێوازی مەرجی وەك: (ئەگەر نەمدتیبا داکت دەمردم لە عەژمەت بابت)[٦١].

نەمدتیبا داکت --- پرسیاری مەرجە.

دەمردم لە عەژمەت --- وەڵامی مەرجە.

٨- بانگەواز و داوالێکردن ئاڕاستەکەیان ڕاستەوخۆیە وەك:

(بم نوێنن بە جلی گایە، پێم بڵێن ژنی ئاغایە)[٦٢] یا (بەخۆم بڵێن ئاغا، بە ژنەکەشم بڵێن ئاغاژن)[٦٣]

٩- یا هیچ ئامراز و کەرەستەیەکی وا لە پەندەکەدا بەدی ناکرێت، جگە لەوەی کە ئاڕاستەکە یەکسەر و ڕاستەوخۆ بەرەو (تۆ)یە بەهۆی (ت)ی ڕاناوی لکاو بۆ کەسی دووەمی تاك. وەك (لە ماڵی باوان نەتخوارد نان و دۆ، لە ماڵی خەزووران عاجباتیت مەبۆ)[٦٤] ، بەهۆی فەرمانی (نەتخوارد) ئاڕاستەکە دەردەکەوێ، یا (بووکەکەی پەنادیواری، ڕۆژ هەموو ڕۆژ بەتاڵی، بەشەو ناو ماڵ ئەماڵی)[٦٥] .

یا هیچ ئامرازێکی تێدا نییە و لە سیاقی ڕستەکەدا دیارە ئاڕاستەکە بەرەو (تۆ)یە وەك (لەمارە بابان بە دەنگە، لە مارە خەزووران بە ڕەنگە)[٦٦].

**٢- ئاڕاستەی ناڕاستەوخۆ**

لە بواری ناوەند و هۆیەکەوە ئاڕاستەکە سەرهەڵدەدا.

أ/ بەهۆی لێکچوواندن وەك (وەك ژنی سێو لە باغەڵە)٠[٦٧]یا (وەك ماری ژنـان کوشــتی لێ بەســەرهات)[٦٨]لــە بــواری هێنانــەوەی وێنەیــەکی هاوشــێوە بــە ناڕاستەوخۆیی ئاڕاستەکە بەرەو ئەو، پەیامەکەی پشت بە (بیـستن) دەبەسـتێت و ئامادەبوونی ڕاستەوخۆی تێدا نییە.

ب/ بەهۆی ئامرازی نەناسراوی وەك (ژنێ مـارە نـەکریابوو، داوای هەشـتیەکی دەکرد)[٦٩]یا (ژنێ بۆ شووی خوەی وەفای نەوێ، بۆ کەس وەفای نییە)[٧٠].

ج/ بــەهۆی بــەکارهێنانی (تــا) وەك (منــداڵ تــا نــەگریێ شــیر (مــەمك)ی نادەنێ)[٧١]واتە برسێتی دەبێتە مایەی گریان، گریانیش وەك زەنگێکـە بـۆ دایـك و ئاگاداری دەکاتەوە.

**٣ــ ئاڕاستەی هەمەلایەن**

ئەو ئاڕاستەیەیە شوێنێك و لایەنێکی دیاریکراوی نییـە، بـەڵام هـەر لایـەنێك لەگەڵیدا ڕێك کەوت و گونجا دەچێتە ژێر ڕەشماڵی پەندەکەوە بـەبێ دیـاریکردن، گرنگترین جۆرەکانی ئەم ئاڕاستەیە بریتین لە:

أ/ چەمکی گشتێتییان تێدایـە، ئاڕاسـتەکە گشت لایەنـەکان دەگرێتـەوە وەك (ئارد بێژان وگیان کێشان)[٧٢] ئاڕاسـتەیەکی دیـاریکراو لـە چـەمکی ئـەم پەنـدەدا بەدی ناکرێت، ئاڕاسـتەی هـەموو ئـەو کەسـانە دەکرێـت کـە فێـڵ لـە ئیـشەکانیان دەکەن، ئینجا ئەم جۆرە کەسانە کێن؟ نادیارن تا ئاشکرابوونی فێڵەکانیان.

ب/ بەهۆی (ی)ی پەیوەندی نێوان دەرخەر و دیارخەر، بەمە جۆری کەسـەکە دەرخراوە، بەڵام ئاڕاستەکە هەمەلایەنە، وەك:(ژنی کەچەڵ بـە مـووی کـچی خـاڵی دەنازی)[٧٣] بۆ ئەو کەسانەیە خۆیان شتێکیان نەبێت بە دەسەڵات و پلـە و پایـەی کەسانێکی نزیکیان بنازن و شانازی بکەن، هەر ژنێکی لەو چەشـنە دەگرێتـەوە یـا (ژنی جوان دۆستی بۆ ئەبێ)[٧٤]، ئەم جۆرە دەشێ وابێت، بەڵام مەرج نییە هەموو ژنێك بەم شێوەیە بێت.

ج/ پەندی وا هەیە ئیشەکە زیاتر هی پیاوانە، بـەڵام جـاری وا هـەبووە ژنـیش ئەنجامی داوە، ئەویش (ئاش و ئاشەوان)ە، نە ئاش بێ ئاشەوان و نە ئاشەوان بـێ

ئاش دەبێت، بەڵام بۆ جیاوازی بیرو بۆچوون بەکار دەهێنرێت، واتە واتایەکی خوازەیی دەگەیەنێ دەوترێت (ئاش لە خەیاڵێك، ئاشەوان لە خەیاڵێك)[٧٥]دوو ئاڕاستەی پێچەوانەی یەکتر لەم پەندەدا بەدی دەکرێت کە هەریەکە خەیاڵ بەلایەکدا ڕادەکێشێ.

یا (بەسەری پیری چۆتە بەر تەشتی هەویری)[٧٦]، بە تەوسەوە ئاڕاستەکە بەرەو هەموو پیرەکانە، نەك پیرێکی دیاریکراو، ئینجا لە هەر کوێیەك بن. یا (ژنی سەربەخۆ میللەتێکی بێ حکومەتە)[٧٧]هەر ژنێکی سەربەخۆ دەگرێتەوە لەهەر لایەن و شوێنێکدا بێت، بۆیە ئاڕاستەکەی هەمەلایەنە، لەوانەیە پێناسە و بۆچوونی جیاوازیش لە بارەی ژنی سەربەخۆ و دیاریکردنی سیماکەی هەبێت. یا (ژن بێ کەس هار ئەوێ، پیاگ بێکەس هەژار ئەوێ)[٧٨]بەراوردێکە لە نێوان هەردوو ڕەگەز، لە کاتێکدا لە یەك حاڵەتدا کۆکراونەتەوە ئەویش (بێ کەسی)یە، بەڵام ئەنجامەکەیان جیایە.

د/ بەهۆی بەکارهێنانی (کەس) کە هەموو کەس دەگرێتەوە وەك (کەس لە سکی دایکی نەیهێناوە)[٧٩]، هەموو کەس پێویستی بە هەوڵدان لە پێناو بەدیهێنانی خەونەکانی هەیە، یا (کەس بە خۆزییا ناگەهیتە جووتێن کەزییا)[٨٠]یا (هیچ کەس) واتە هەموو کەس، بەڵام کە (هیچ کەس) بەکاردێ لەگەڵ شێوازی نەرێدا دەبێت، وەك: (هیچ کەس بێ ئەجەل نامرێ)[٨١]، ئەرێیەکەی واتە (هەموو کەس بە ئەجەل دەمرێ)، لەم جۆرە پەندانەدا هەر دوو ڕەگەزەکە بەشدارن، ئاڕاستەکە بۆ هەمووانە.

ه/کاتێ (ژن) بە گشتی ئاماژەی پێدەکرێت، وەك وشەیەکی تاك واتای (کۆ) دەگەیەنێ، بە واتای هەموو ژنەکان دێت بەم شێوەیە بن کە لە پەندەکەدا هاتووە، وەك (ژن لە مێرد بسەنرێتەوە، وەرد لە گا ناسەنرێتەوە)[٨٢] یا (ژن پیاوی دەکاتە پیاو و لە پیاوەتیشی دەخات)[٨٣] یا (ژن ماڵە بنیات خانی، مخابن ژنا باش بکەفتە دەستێ نەزانی)[٨٤].

**٤_ئاراستەی نادیار**

ئـەم ئاڕاسـتەیە بـەهۆی نەناسـراوییەوە سـەرهەڵدەدات وەك: (پیاوێـك لـە ژنەکەی ترسا، داخوازی کچەکەی لـە دایکـی ئـەکرێ)[٨٥] بـەهۆی (ێك) ی ئـامرازی نەناسراوی دروست بووە ، هەر پیاوێك دەگرێتەوە ژنەکەی بەسەریدا زاڵ بێـت، یـا بـەهۆی بـەراورد بـە هـۆی (یـا)ی بـەراورد ئاڕاسـتەکە نادیـار دەبـێ، نـازانرێ کـێ هەڵبژێردراوە، بـەلاّم وەك دوو چارەسـەر بـۆ یـەك حاڵـەت خراوەتـە ڕوو، وەك (یـا لەگەڵ دایکی مندالأن، یا لەگەڵ بووکی گەورە مالأن)[٨٦]یا (جێیێ کە ژن لێی حاکم بێ شەیتان نۆکەرە)[٨٧] ئەمەش هەر لە ئاکـامی نەناسـراوییەوەیە، یـا (کـەرەك لـە گاڕانێ، ژنەك لە دیوانێ)[٨٨]

## بەشی دووەم : شێوازو ئەرکەکانی پەند

### ١. ئەرکی پەروەردەیی – ڕۆشنبیری

پێویستی لایەنەکانی کۆمـەڵگاو بـارودۆخ و پێویـستی مێـژوویی – ڕۆشـنبیری پەندی داهێنا، ڕۆشنبیری میللەتانیش لە شوێنێکەوە بۆ شـوێنێکی تـر دەگۆڕێـت، تەنانەت لەنێو یەك نەتەوەشدا گۆڕانکاری لە ڕۆشنبیری و سەرچاوەکانیدا هەن .

ئـەرکی پـەروەردەیی – ڕۆشـنبیری پەیوەسـتە بەئاسـت و پلـەو پایـەی ئـەو کەسـایەتییە مەعنـەوی و ڕۆشـنبیرییەی پەندەکـەی داهێنـاوە . ئـەم ئەرکـە پـەروەردەیی و ڕۆشـنبیرییە لەهـەمان کاتـدا، چـونکە پەنـد باشـترین بەڵگەیـە بـۆ تێگەیشتنی ڕۆشنبیری میللەتان . لەبەرئـەوەی ئـەم پەندانـە لـە بۆشـایی دروسـت نەبوون، بەڵکو چڕکردنەوەی ژیانی خـەڵکانێکی ژیـرە، لـە ئاکامەکـەی ئـەم ڕسـتە کورتە پڕماناییانە ماونەتەوە و بوونەتـە سەرچـاوەیەکی ڕۆشـنبیری، لـەپاڵ لایـەنی پەروەردەیی کە دەبێتە مایەی پەروەردەی دەروونی مرۆڤ .

بەشێکی زۆری پەندەکان بەشـداری لـە تەندروسـتی دەروونـی مـرۆڤ دەکـەن، بۆیە کاتێ **(باس لە بایـەخی پەنـدو ترسـناکی لەسـەرمان دەکـەین تێبینـی ئـەوە دەکەین کە مەسەلەکە لە دوو لا پێك دێت، لەلایەك کاریگەرییەکی شاراوەی لەسەر ڕای گـشتی هەیـە و لەلایـەکی تـرەوە وەك بەڵگەنامـەی بـاوەڕپێکراو ئامـاژە بـۆ**

**نموونـەی بـاڵای كۆمەڵایـەتی و ڕامیـاری و ڕەوشـتی و ئـاینی ئـەو كۆمەڵانـەن كـە پەنـدەكانیان لـەنێو دەركـەوتووەو بڵاوبۆتـەوە)**[٨٩]، كەواتـە پەنـدی پێـشینان سەرچاوەیەكە بۆ فێربوون و (**بەهایەكی پـەروەردەیی چاكسازی گـەورەی هەیـە، بۆیـە هەڵەیـە گـەر تـەنیا وەك شـێوەیەك لـە شـێوەكانی كولتـووری میللـی یـا بەڵگەنامەیەكی وەسفی كولتووری ئاسایی تایبەت بـە بـارودۆخی گـەلان تەماشـا بكرێت)**[٩٠]. هـەر لـە پـەروەردەی منداڵـەوە تاگـەورە، واتـە سـەرتاپای فێركردنـی مرۆڤ، لە پەندا بەدی دەكرێت بەپێی تاقیكردنەوەو ئەزموونی دێرینـەكان بەشـێك تـا ئێـستاش لـە پـەروەردەو دەروونزانـی تێگەیـشتنی پـەروەردە سـوودی لـێ وەردەگرێـت، لەبەرئـەوە ( **پەنـدی پێـشینان بایـەخێكی پـەروەردەیی گەورەشـی هەیە، گەل لـە ڕێگـەی پەنـدی پێـشینانەوە نـەوەكانی خـۆی یـەك لـە دوای یـەك پەروەردە ئەكا** )[٩١]

دێرینــەكان بــەبێ زانینــی دەروونزانــی و كۆمەڵناســی و زانـستەكانی تــری پەیوەســت بەلێكۆڵینــەوەی كۆمــەڵ، لــە هــەموو شــتێك وردبوونەتــەوە و سـەرنجەكانیان لـە پەنـدا چـڕكردۆتەوە . زانیویانـە (**كـەس لـە سـكی دایكـی نەیهێناوە)**[٩٢]. بـەهۆی هاتنـە نێـو ژیـان مـرۆڤ فێردەبێـت و پـەروەردە دەبێـت . سەرچاوەی پەروەردە لـە خێزانەوەیـە، بەتایبـەتی هەمیـشە ( **بـاوك و دایـك حـەز دەكەن منداڵیـان لـە خۆیـان خاسـتر بـێ**)[٩٣]، ئـەم حـەزو ئـارەزووە تـاكو ئێـستا درێژەی هەیە، تا ببنە مایەی سەربڵندی و شانازیكردن . لەگـەڵ ئەوەشـدا زۆرجـار بەپێـچەوانەی ئـەم حـەزە منداڵـەكانیان سـەركەش و یـاخی دەردەچـن . گونـاهی ئەوانی تێدا نابێت . دەشێ هێزێكی گەورەتر كاریگەریی لەسەریاندا هـەبێت، بۆیـە دەڵـێن : ( **ئــەولاد وەختــێ نائــەهل بــوو، دایــك و بــاوك چ بكــەن**)[٩٤]، كەواتـە دەسەڵاتیان نییە، هەر لەبەرئەوە لە بینین و سـەرنجدانی ئـەو حاڵەتانـە دەوترێـت (**بەسەر سفرەی باوك و دایكیەوە گەورە نەوگە**)[٩٥] ئەمە شێوەیەكی خوازەییـە، چونكە لەوان ناكەن و جیاوازن، بۆیە وەك ئەوە وایە ئـەوان بـەخێویان نـەكردبێ و پەروەردەیان نەكردبێ . پێچەوانەی ئەم پەندە هەیە، ئەو پەندە ڕەت دەكاتـەوەو دەڵێ : (**لەسەر سفرەی باوك و دایكیەوە هەڵنەساگە**)[٩٦]، واتە منـداڵ دەچـێتەوە

سەر پەروەردەی دایك و باوك و دەبێتە نموونەیەكی ئەوان، هەرچەندە ئەمە پێوانە نییە، هەروەك لە پەندی یەكەمدا ئاماژەمان پێی دا .

لەكاتێكدا ئەگەر سوودی لە پەروەردەی ئەوان وەرنەگرت، ئەوا قوتابخانەیەكی گەورەتر بەدی دەكرێت، وەك وتراوە (**ئەگەر دایك و باوكت نەت عاملێنن، زەمانە دەت عاملێنیٚ**)[97]، كەواتە زەمانە دەبێتە مامۆستا و فێری دەكات .

هەر لە ئاكامی پەروەردە زیاتر بەندە بە دایكەوە دەوترێت (**سەد ڕەحمەت لەو دایكەی كە شیری پێت داوە**)[98]، چونكە دایك سەرچاوەی فێركردن و بەخشینی ڕەوشتی چاكە بۆ منداڵەكەی و(**خوەشەویستی مناڵ ها بەهۆجەنەی داییكەو**)[99]. بەدەستهێنانی خۆشەویستی دایك هەموو شتێكە و دەبێتە خاڵێكی چاك بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستی باوكیش.

لە ڕووی پەروەردەییەوە دێرینەكان ڕەسەن و ناڕەسەنیان كردۆتە پێوەر، باوەڕێكی زۆریان بە پەروەردە ڕەسەنەكان بەخشیوە، بۆیە وتوویانە (**كەچا ب ئەسڵ ل ناڤ تابورا لەشكەریٚ رومی دەبەژی، كەس پیٚ نكارە**)[100] . ئەمە ئەو پەڕی بڕوابوونە بە كچ و هەڵوێستێكی بەرزە، چونكە نەك لەشكری خۆماڵی، بەڵكو لەنێو لەشكرێكی بێگانەشیان كردۆتە سەرچاوەی ژیان بەمەبەستی تاقیكردنەوە ، كەچی هێشتا لایان وابووە كەس ناتوانیٚ پەی پیٚ ببات .

گەیشتبوونە ئەو قەناعەتەی (**كەنیشك هەر تا دانیشیٚ، بەخت هەڵتێریٚ**)[101] لەڕووی پەروەردەی كۆمەڵایەتییەوە لەگەڵ زوو بەشوودان نەبوون، چونكە كچ چەند بمێنیٚ ئەزموونی زیاتر دەبیٚ و شتی زیاتر فێردەبێت . ئەم فێربوونانە دەبنە مایەی لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی، لەكاتێكدا فێركردن یا پەروەردەكان پەروەردەی گیانیی مرۆڤن و هێزێكی مەعنەوی بەمرۆڤ دەبەخشن .

دەوترێت (**پیاویش هەیە لە ئافرەت ئاوس ببێت**)[102]. شێوازی ئەم پەندە ئاگادارییەكە بۆ زانین و فێربوون . (**ئاوس**) بە واتای (پڕ)دێت. وەكو حاڵەتێكی كۆمەڵایەتی بوونیان هەیە. (**ئاوس**) تایبەتە بە ژن و دراوەتە پاڵ پیاو وەك خوازەیەك بۆ تووڕەیی و ڕق و كینە هەڵگرتن .

لە هەندێ پەنددا ژن بۆ (مامۆستا) خوازراوە، مامۆستاش واتا پەروەردە . وەك (**دەرسی بە شەیتانی دەدات**)[١٠٣]، قوتابییەكە شەیتان بێت، دەرس و وانەكان دەبنە فڕوفێڵ و مەكر، هەرچەندە ئەمە نیشانەیەكە بۆ زیرەكی و لێهاتوویی، بەڵام بە تەوسەوە دەوترێت .

هەر لە ئاكامی پەروەردە كۆمەڵایەتییەكان بە زمانی ژن هەندێ جار وەك دوعالێكردنێك لە كەسایەتییەكی مێژوویی دەوترێت : (**ڕەزاشا تەختت وەرگەڕێ، دوو كوڕم گەورەكرد بە شیری مەڕێ، هاتن بردییان پێی بكەن شەڕێ**)[١٠٤] . ئەم جۆرە پەندانە سەرچاوەیەكی مێژووین، دەكرێ ببنە ڕێ خۆشكەرێك بۆ گەڕانەوە بۆ سەرچاوە مێژووییەكە و چۆنیەتی شەڕ و بەشدارییەكان .

یا (**كیژ قەڵایە ناگیرێ**)[١٠٥] . لەم پەندەدا (**قەڵا**) كچی پێ تەشبیە كراوە سەرچاوەیەكی مێژوویی هەیە . جاران گەلێك لە شارەكان بۆ نموونە (هەولێر) هەمووی تەنیا لەقەڵا پێكهاتبوو، لە ڕووی بەرزی و توندو تۆڵییەوە بەرگەی گرتووە، یا لە ڕووی ڕەوشتەوە دەوترێت ( **برا مرۆڤ زییارەتا خراپ بكە، ناڤێ قیزا خراپ نەكا**)[١٠٦] .

پەندەكان لەپاڵ زانیاری بەخشین و ڕۆشنبیری، گەشە بە ڕەوشتی مرۆڤیش دەدەن، بۆ دووركەوتنەوە لەگەڵ نموونەی خراپ و نالەبار ڕێنماییان دەكەن . وەك ناو و ناتۆرە دروستكردن بۆ كچان بەتایبەتی لەبەرئەوەی كچ چەشنی شووشە ناسكە نەك شكاندن، بەڵكو درزبردنیش بەشداری لە چارەنووسێكی ڕەش و ترسناكیان دەكات، ئەم ڕێنماییكردنە سەرەتا ئاڕاستەی كەسە نزیكەكان، واتە لە چوارچێوەی خێزان دەرنەچووە، چونكە خێزان قوتابخانەی سەرەكی مرۆڤە بەهەردوو ڕەگەزەوە . دێرینەكان زۆر گرنگییان بەم قوتابخانەیە داوەو لایان وابووە تاكە سەنتەری سەرەكی دروستكردنی كەسایەتی مرۆڤە بەگشتی و ژن بەتایبەتی، بۆیە وتوویانە (**ژنی عاقڵ دەرگای بەختەوەری بۆ پیاو دەكاتەوە**)[١٠٧] .یا لەئەنجامی بەراوردكردن وتوویانە (**ژنی خراپ لە كۆڵانان چێترەو ژنی چاك لە دایەو بابان چێترە**)[١٠٨]. جیاوازییان ئاسمان و ڕێسمانە .

لە کۆمەڵی کوردەواری هانی ئەوەیان داوە زوو ژن بۆ کوڕەکانیان بێنن . وەك نەریتێکی ڕەوشتی تا لە زۆر ورووژاندن و بەلاَ دوور بکەونەوە ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریش خۆشیان بەگەنجی دەمێننەوە و منداڵیشیان گەنج دەبێت . دەتوانن ببنە هاوڕێی یەکترو زیاتر لەیەکتری نزیك ببنەوە، لەبەرئەوەی جیاوازی تەمەنیان هێندە نابێت. ئەمەیان لە پەندێکدا چڕکردۆتەوەو دەڵێن **(ژنیٚ بینە ڕویا دا عەیال بگات میا)**[109] . یا کاتیٚ دەڵێن **(گەورە کچ بە ماچیٚ خراپ نابیٚ)** [110] (گەورە) ڕەمزێکە بۆ کەسایەتی و ئەزموون و دەرکەوتوویی کەسەکە. ئەم کەسایەتییانە بە شتێکی کەم لەکەدار نابن، ئەمەش وانەیەکە لە فێرکردنی ڕەوشت بۆئەوەی خەڵکان شتی بچووك گەورە نەکەن، بەتایبەتی (ماچ)یان هێناوەتەوە، چونکە شوێنەواری نامێنیٚ و ڕەمزێکە بۆ شتی بچووکی بیٚ شوێنەوار. یا**(ژنی پیاوی کوێر ئارایشی ناویٚ)**[111]،واتە جوانی گیانی و ناوەڕۆك گرنگترە لە جوانی ڕووکەش. یا (بەرد بۆ ژنی کەس مەهاوە، سەری ژنت ئەشکێنن)[112] لێرەدا (بەرد) بە واتای توانج و پلار و....هتد.دێت لەبەرئەوەی هەرکارێك کاردانەوەیەکی هەیە، لەوانەیە کاردانەوەکە لەکارەکە خۆی مەزنتر بێت. زۆر وردبین و زیرەکانە گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی **(ژنت شەریکی بیٚ، ماڵت شەریکی نەبیٚ)**[113] ، برگەی یەکەمیان یەکێکە لە ئەستەمەکان و ناکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەویان شیاو و لەبارتر داناوە لە هاوبەشی دارایی و ماڵ . دێرینەکان سەرچاوەی پەروەردەو ئاوەدانییان لە ژندا بەدی کردووە، هەروەك لەم پەندەدا ئاماژەیان بۆکردووە **(ئاڤایا مالیٚ دەستیٚ ژنایە)**[114]، یا **(ئاڤاهیا مالیٚ کەبانییە)**[115]، یا **(ژن دکە مال ئاڤایی)**[116] ئاوەدانی ماڵ لەسەر بنەمای هەڵسووڕاندنی ماڵ و پاراستنی دروست دەبێت کە پێویستی بە هۆشمەندی و زیرەکی هەیە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم کارانە .

لە ڕووی پەروەردەییەوە ئەوان لەگەڵ چاکیدا بوون **(ڕەوشت بەرزی)** دروشمی سەرەکییان بووە . لەو ڕەوشت بەرزییەدا هیچ جیاوازییان لەنێوان ڕەگەزەکاندا نەکردووە . ئەوەتا دەڵێن **(ژنا باش ژ هەزار مێریٚ خراب چێترە)**[117] یا **(ژ کوڕی بیٚ خیرەت، قیزەکە کۆر پاکترە)**[118] .

پێشبینییان بۆ چاکسازیش هەبووە (**باب ترن چا دەبێ، داك ترن چانابێ**)[119]. پیاو ئامادەیی گۆڕانی زیاتر تێدا بەدی دەکرێت وەك لە ژن، بۆیە دەڵێن (بەختی پیاوی، ژنی باشە)[120] ژن بنچینەیە گەر باش بوو دەبێتە سەرچاوەیەکی باش بۆ دەوروبەری .

یا (**خەم لۆ پیاوانە، خۆشی لۆ ژنانە**)[121] . لەو ڕوانگەیەی پیاوان ئیش و کاریان سەختترەو بژێوی ژیانی خێزان لەئەستۆی ئەواندایە ، ئەگەرنا ژن بەتەنیا ناتوانێ چێژ لە خۆشی وەربگرێت، ئەگەر بەشداری پیاو نەبێت .

یا (**هەڵمەپەڕە پێش ئەوەی بەماڵی بووکێ بکەوی**)[122] ئەمە دەرسێکی پەروەردەییە گوزارشت لە پەیوەندی نێوان واقیع و وەهم و خەیاڵ دەکات . هەرشتێك تا بە واقیعی و لە واقیعدا بەدیت نەکرد بەسەریدا هەڵنەڵێی و ستایشی نەکەیت .

لە ئەرکی پەروەردەیی – ڕۆشنبیری ئەم خاڵانە مایەی سەرنجن :

١- پەندەکان ڕۆڵێکی دیار لە پەروەردەی بیرو هزری مرۆڤ دەبینن . بەتایبەتی دێرینەکان بەمەبەستی بەشداریکردن لە پێکهاتەی بیرێکی تەندروست، لە هەمان کاتدا بەشداری لە دروستکردنی بیری تەندروست دەکەن.

٢_ لە پەندەکاندا ناکۆکییەك لەنیوان چاکەو خراپەدا هەیە، بەلأم چاکەکان زیاترن .

٣_ بەشداری لە دەروونی تەندروست و خاڵیکردنەوەی دەروون لە گرێ و گرێ کوێرەکان کە لە ئاکامی ژیانی کۆمەڵگاو ئالۆزییەکاندا دروست بوون، دەکات . بۆنموونە (**دایکا کچا خوە نەناسیت، حەفت جارا یا دامان پیسە**)[123]، چونکە وەك چۆن (**کەوش پێستی پێ ئەگرێ، کچ شوێنی دایك**)[124] .

٤_سەرچاوەیەکن بۆ فێربوون، هەرپەندێك وانەیەکی گەورەیە لە ڕستەیەکی بچووکدا، هەمووی خاڵی ئاگادارکردنەوەن، بۆنموونە (**لە سەگی دڕ، لە حاکمی کوڕ، لە ژنی دەم شڕ بترسە**)[125]

## ٢- ئەركی كۆمەڵایەتی

پەنـد سـەرتووی مێژوویـەكی دێـرین و دوور و درێـژە، بایـەخێكی زۆری لـە پێكهاتەی كولتووری كۆمەڵایەتیدا هەیە . لەكاتێكدا ئەدەب وەك هەر دیاردەیـەكی دیكـەی كۆمەڵایـەتی پەیوەسـتە بـە بارودۆخـە كۆمەڵایەتییـەكان و ئـەو گۆڕانكارییانەی كە بەپێی قۆناغە جیاوازەكان سەر هەڵدەدەن، هـەروەك چـۆن لـە ڕابردوودا ژیان و گوزەران جۆرێك بووە . لەگەڵ ئێستادا جیـاواز، بەهـەمان شـێوە ئەدەبیات وەكو پـەیامێكی كۆمەڵایـەتی جیـاواز بـووە . ئـەدەبیش بـەپێی قۆنـاغ، وەك دیاردەیـەكی كۆمەڵایـەتی و پێویـستییەكانی ئەوكاتـە سـەری هەڵـداوە ، ناوەڕۆكی ئەو بابەتانەی هەڵگرتووە كە پەیوەستی بارودۆخەكە بـوون، یـەكێ لـەو بابەتە میللییانەی فراوانترین پانتایی كۆمەڵایەتی داگیركردووە پەنـدە ، ئەگەرچـی ئەو پانتاییە بەهۆی ئامرازەكانی ڕاگەیاندن و تەكنەلۆژیای نوێ كـەمێك تەسـكتر بۆتەوە ، بەڵام هێشتا وەك دیاردەیەك خۆی دەنوێنێ ، بەشێكی پەندەكان هێشتا گوزارشت لەو بابەت و ناوەڕۆكانە دەكەن كە كۆمەڵگا پێی تێپەڕ دەبێت ، تەنانەت پەنـدەكان لـەڕووی كۆمەڵایەتییـەوە بـە مانـا فراوانەكـەی (ئـابووری، ڕامیـاری، ڕۆشنبیری ....هتد) هەموو شتێك بوون .

لەبەرئەوەی تێكستی ئـەم پەندانـە دەرهاویـشتەی كۆمـەڵن، بۆیـە ڕوخـسارو ناوەڕۆكی كۆمەڵیان پێوە دیارە، هەر لە بیركردنـەوەو داب و نـەریت و عەقڵیـەت و چـۆنیەتی مامەڵـەكردن لەگـەڵ ژیانـدا، هەرچـەندە هەنـدێ لـە پەنـدەكان بەهەڵـە گوزارشت لە هەندێ بابەت دەكەن، یا كەشێكی وا دروسـت دەكـەن لەگـەڵ كەشـی گشتی لە بواری خێزان، داب و نەریت....هتد یەك ناگرێتەوە .

ئەم ئەركە لە بـواری ئـەركی پـەروەردەیی – ڕۆشـنبیری سـەری هەڵداوە كـە گـرینگترین ئـەركی پەنـدە، چـونكە یارمـەتی كۆمـەڵ دەدات بـۆ پێـشكەوتن، هەرچەندە گەلێك پەندی نێگەتیڤ هەن دەبنە كۆسپ لەبەردەم پێشكەوتندا، بۆیە دەشـێ پەنـدەكان لـە بەرژەوەنـدی كۆمـەڵ بـن یـا ئـەركێكی قـورس بـن بەسـەر كۆمەڵەوە . بە تایبەتی كە مامەڵەكردنی پیاو لەگـەڵ ژن لـە ئاكـامی زەمینەیـەكی

مێژوویی — کۆمەڵایەتی دروست بووە، لەکاتێکدا مرۆڤ بە پیاو و ژنەوە بەرهەمی ژینگە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و تەنانەت ڕامیاری و ئابووری و....هتدن .

لە کۆمەڵگای کوردیدا پیاو بەو سیفەتە سەرەکییەی لە مەیدانەکانی ژیاندا باڵا دەست بووەو خاوەن ئەزموون و تاقیکردنەوەو هێزێکی بەرەنگاربوونەوە بووە . توانیویەتی تانوپۆی کەسایەتی ژن و هەڵسوکەوتەکانی بچنێ، بەوەی بەشداری لە بەشێکی زۆری دروستکردنی پەندەکانیدا کردووە . بەتایبەتی پێشاندانی لایەنی نێگەتیڤی کەسایەتی ژن و دەرخستنی خەسڵەتە نالەبارەکانی ژن و گەورەکردنیان وەك ئەوەی خۆیان بێ کەم و کورتی بن . هەر ئەو پەندانەش بوون سەنگەری ژیانیان کردۆتە دوو سەنگەر، سەنگەری پیاوان و سەنگەری ژنان .

ئەرکی کۆمەڵایەتی پەند بەپێی بابەتی لێکۆڵینەوەکە، تەنیا بەشدارییەکانی ژن لە چوارچێوەی کۆمەڵگادا و ڕۆڵیان لەلایەنی کۆمەڵایەتی بەپێی ئەو پەندانەی کە تایبەتن بەم بابەتە . وەك (**خزمی ژنی بەرەبەرە، خزمی مێردان دەربەدەرە**)(١٢٦)، بە مەبەستی دروستکردنی پەیوەندی خزمایەتی و نزیکبوونەوەی دوو بنەماڵە، هەرچەندە چەمکی ئەو پەندە ناهاوسەنگی تێدا بەدی دەکرێت، چونکە ناکرێ خزمی مێردیش فەرامۆش بکرێت، بۆیە دەستنیشانکردنی خزم بەندە بەژن و ئاستی هۆشیارییەوە . دەڵێن : (**خزمت کێیە؟ ژنم نەهێناوە**)(١٢٧) ، پەندەکان وێنەی ژیانی کۆمەڵایەتییان کێشاوە و چالاکی ژنیان لە هەموو بوارەکاندا دیاری کردووە .

(**ئاستی فەرهەنگی ژنانی کوردستان زۆر لە ڕادەی پێویست نزمترە، هۆشیاری ئەدەبی و هۆشیاری سیاسی وکۆمەڵایەتی و تێگەیشتن لە خۆشەویستی و سیاسەت و پیاو و تەندروستی و فێربوون زۆر سەرەتاییەو هەندێ جاریش پاشکۆی تێفکرینی پیاوانە**)(١٢٨).ئەمە وای کردووە ژن خۆی نەبێت. لەکاتێکدا ناسینیشی بۆ ڕەگەزی بەرامبەر لاوازو کزە، بۆیە لە رووی کۆمەڵایەتییەوە ئەڵقەیەکی بۆشایی و بەتاڵ لەنێوان ژن و پیاودا هەیە . ئەمەش کاریگەرییەکی زۆری لەسەر لایەنە کۆمەڵایەتییەکان دروست کردووە، بۆیە لە پەندەکاندا دوو سەنگەر دروست بوون. سەنگەرێك خەڵکێکی هۆشیاری تێدایەو هەست بەئازارو

ماندووبوونی ژنـان دەکـەن و دەبنـە پـشت و پـەنا بۆیـان . ئەمـە لـە ئـەنجامی تاقیکردنەوەو ئەزموونی خۆیان پێی گەیشتوون. دەبنە مایەی سەرهەڵدانی ژنانی وشیاری بەرهەمهێنەر وەك (**ژن خاس لە برایێ هاوپشت خاسترە**)[129]، لـە ئاکـامی هەڵسوکەوت و جـۆری بەرهـەم و کەسـایەتییەکەی دەبێتـە مایـەی شـانازی بـۆ بنەماڵەکەیشی. یا (**ژنەك و عەشیرەتەك**)[130] .

ژن لەکۆمەڵی کوردەواری بەچاوی ڕێزەوە تەماشاکراوە، بـەلأم ژنێـك بـەواتای ژنایەتی ژن بێت، چونکە کۆمـەڵگا سـنووری لـەنێوان ژنـی چـاك و خـراپ دانـاوە و پێوەریان ڕەوشت و نەرم و نیانی و جـوانی ڕەفتـارو هەڵسوکەوت و بـەڕێوەبردنی ماڵ بووە، نەك شتێکی تر .

سەنگەرەکەی تر پڕیەتی لە خەڵکانێکی پڕ لە ڕق و کینەو بەسـووکی سـەیری ژن دەکەن . ئەمەش هەر لـەئاکامی تاقیکردنـەوەو ئـەزموونی خۆیـان یـا کوێرانـە تاقیکردنەوەی خەڵکانێکی تر پەیڕەو دەکـەن، بۆیـە ئـەم جـۆرە پەندانـە دروسـت بوون، وەك ( **ئافرەت لە پەراسووی چەپ دروست کراوە، بتەوێ ڕاستـی کەیتـەوە دەشکێ**)[131] یا (**لەو جۆرە ئافرەتانە بـوو، کـە پیـاوی ئـەسمی**)[132] یـا (**وەختـی خودا عەقلێ دا ژن لەورە نەوی**)[133] . بوونی ئەم جۆرانە وایان کـردووە کۆمـەڵگای کوردی بەهەردوو ڕەگەزەکەوە تاڕادەیەك لە بەرامبەر پێشکەوتن و گەشەی کۆمەڵ دەستەوەستان بـن. ( **لـەم بارودۆخـەدا پەیوەنـدی ژن و پیـاو هەمیـشە لاسـەنگ دەبێـت و وەکـو پەیوەنـدی نێـوان بەنـدی و دیکتاتۆرێـك لـە بەرژەوەنـدی هـیچ لایەنێکیانـدا نییـە، هۆشـیاری و دەوڵەمەنـدکردنی کەسـایەتی و بەرزکردنـەوەی ئاستی ڕۆشنبیری چەند مەرجێکی گرنگن بۆ دروستکردنی سیستەمێکی ئـەخلاقی نوێ و مرۆڤ پەروەر، دروستکردنی ئەو سیستەمە ئەخلاقییە بە تەنها ئەرکی ژن یا پیاو نییە، بەڵکو ئەرکی سەرشـانی هەردووکیانـە**)(١٣٤)، بۆیـە دەوترێـت : (**پیـاو تەنیا لاوازە، ژن تەنیا بێ نازە**)[135] هەردوو ڕەگەزەکە تەواوکەری یـەکترن و هـیچ یەکێکیان بێ ئەوی تر نابێت .

(**هەستکردن بە لێپرسراوی بەرامبەر بە بەجێهێنانی ئەم ئەرکە دروست دەبێت کە ژن و پیاو قەناعەت بهێنن کە هیچ کامیان بەبێ ئەوی تر ناتوانێت بـژیت**)[136]،

ژن وەك بوونەوەرێکی پـڕ لـە ئـاڵۆزی و نهێنییـەکی بـوون، بـەڕێڕەوێکی مێـژوویی دوورودرێژدا ڕۆیشتووەو هەڵگری پەیامی دایکایـەتی و پـەیامی ژیـان بـووە، لەبـەر ئەوە بۆتە پێوەرێکی سـەرەکی و بنـچینەیی منداڵـەکانی وەك (**دایکـی بگـرە، کـچ بەدەستەخۆتەوەیە**)[١٣٧] یا (**دایکی دز یا سنگ ئەخوات، یا سنگ ئەکوتێ**)[١٣٨] یـا (**ژنی خراپ منداڵی ڕەسەنی لێ نابێتەوە**)[١٣٩] .

لە ناخی ژندا چەندین دژایەتی بەدی دەکرێت، لە ئاکامی ئـەو مێـژووە پـڕ لـە کێـشەو گرفتانــەی کــە ڕووبــەڕووی بۆتــەوە و هەوڵــەکانی بــە فــێرۆداوە و لــە چوارچێوەی بارودۆخێکی کۆمەڵایەتی تاڕادەیـەك دوور لـە تێگەیـشتن لـە ڕێـڕەوی ژیانـدا هـەنگاوی نـاوە و بەرێوەچـوون و دەسـەڵاتی سـەرەکی بەدەسـت پیـاوەوە بووە. ئەمە زیاتر نامۆی کردووەولە شوێنێکی دیاریکراودا سـووڕاوەتەوە، بەچـاوی بەزەییەوە تەماشایان کردووە، بەتایبەتی لە ڕووی کەسایەتییەوە، بۆیە وتوویانە (**چەکی ژنان جوونە، غیرەتیان گریانە**)[١٤٠] .

لە ڕوانگەی کۆمەڵەوە لە ئاکامی لاوازی ژن بێدەسەڵاتەو تاقە چەکیان جنێو و گریانە، لەوانەیە ئەم تێڕوانینە لە ئەنجامی ئەوەوە دروست بووبێت، لە ناخی ژنـدا هەستکردن بە چەوسانەوەو زوڵم لێکردن پەنگی خواردۆتەوە، بۆیە لـە سـاکارترین کێشەدا ئەم هەستە پەنگ خواردووە دەبێتـە گریـان، تـا ئاسـوودەییەکی کـاتیش بێت بەدەستی بهێنێ .

لەکاتێکـدا لــە زۆربــەی کۆمەڵگاکانـدا جیـاوازی لـەنێوان ژن و پیـاودا بـەدی دەکرێت، بـەڵام ڕێـژەی جیاوازییەکـە هەمـەجۆرەو لـە بـەرزی و نزمیدایـە، بـەپێی پێشکەوتن و هۆشیاری کۆمەڵگاکە دەگۆڕێـت . نـاتوانرێ لـە کۆمـەڵگادا نـە ژن لـە پیاو نە پیاو لە ژن جیا بکرێتەوە، چونکە بەشداری هەردووکیان گەشە بە کۆمەڵگا دەدات . لـە کۆمـەڵگای کوردیـدا هـەموو ڕێگاکـان دەچـنەوە سـەر ژن، تەنانـەت ڕەوشـت لـە کلتـووری کوردیـدا ژنـە، ژنـیش یەکـسانە بـە داوێـن پـاکی . بـەها کۆمەڵایەتییەکان گشتیان خۆیان لە داوێـن پـاکی ژنـدا دەدۆزنـەوە، بـەبێ ئـەوەی وەڵامی ئـەو پرسـیارە بدەنـەوە کـێ داوێنـی ژن پـیس دەکـات و بـەرەو هەڵـدێری دەبات ؟ بۆیە وتوویانـە (**لەشـکری ژنـان وەکـی ڕەوی کێـشکان**)[١٤١] وەك ئـەوەی

لەشکری چاك و ڕێکوپێك لە ژنان دروست نەبێ، یا ژن نەتوانێ لە ژیاندا ڕاستەڕێ بێ. هەروەها وتوویانە (**سەگ وەفای هەس، ژن وەفای نییە**)[١٤٢] ، تەنانەت بەشێکیان سەگ و وەفای سەگیان بە پەسندتر زانیوە، یا ژنیان بەسەرچاوەی ورووژاندن داناوە وەك (**ژن پاژنەیشی دوژمنیەتی**)[١٤٣] .

یا لەڕوانگەی کۆمەڵەوە (**ژن تۆهەدو نۆ ئۆینی شاردیتەوە، یەکەکی ئاشکرایە**)[١٤٤] لایان وابوو ژن بوونەوەرێکی زۆر لاوازو ناسکە تەنانەت (**ژن سەگیش پێی ناوەڕێ**)[١٤٥] .

پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و بیرو باوەڕو داب و نەریتە باوەکانی کۆمەڵ، بەتایبەتی ئەو بابەتە کۆمەڵایەتییانەی پەیوەستن بە ژنەوە. بۆنموونە کاتێ دایکێك کچەکەی بچووك بێت و داواکاری هەبێت لەبری ئەوەی ڕەتکردنەکە بە(نە)ی ڕاستەوخۆ بێت دەڵێ : (**خۆ بن مەمکی نەڕزیوە**)[١٤٦]، واتە منداڵە . هەمان چەمك لە پەندی (**خۆ بەڕوو نییە، لە قەپۆکی دەرچێ**)[١٤٧] .

بۆ هەموو قۆناغ و کاتەکانی تەمەن و بارە جۆراوجۆرەکان پەندی دیاریکراو هەیە ، کە ئەم تەمەنە دەنوێنێ وەك ( **کەنیشك هەروەسە پرد**)[١٤٨] بە خوازبێنی کچەکانیان شادمان بوون، چونکە لایان وابوو کچ وەکو پردێك وایە، پردیش هەمیشە موڵکێکی گشتییە و ناشێ داواکاری خەڵك بکرێت بەسەریدا نەڕۆن، بۆیە داواکردنی کچیش لەلایەن هەرکەسێکەوە بوایە لایان ئاسایی بوو، چونکە دواتر خۆیان خاوەن بڕیار بوون . گوزارشتیان لە گشت وردەکاری هەڵسوکەوت و ڕەفتارو ڕەوشتی ژنان کردووە، وەك (**ساڵێ ماڵ و ساڵێ مناڵ**)[١٤٩] . لە ئاکامی ئەزموون و سەرنجدانیان گەیشتوونەتە ئەو ڕاستییەی کاتێ ژن مناڵی تازەبووی دەبێت زیاتر خەریکی پەروەردەکردنیەتی و زۆر نا پڕژێتە سەر کاروباری ماڵەوە، بەلام دواتر بایەخ بە ڕازانەوەی خۆی و ماڵەکەی دەدات .

بارودۆخە تایبەتییەکانی تری ژنان لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لە نێو پەندا ڕەنگی داوەتەوە . کۆمەڵ هەندێ جار بێ بنەما هەندێ شتی خستۆتە ئەستۆی ژن وەك ئەوەی تەنیا ژن بەم شێوەیە بن . بۆ نموونە زۆر قسەکردنیان کردۆتە یەکێ لە ڕەوشتەکانی ژن لە کاتێکدا پانتایی کات وایکردووە ژنان زیاتر قسە بکەن .

بەتایبەتیش پابەند بوونیان بە ماڵەوە ئەم بارەی دروست کردووە . قسەکردن هەمیشە پێویستی بە قسەکەر و گوێگر هەیە، ئەم هەلە لەبەردەم ژندا کراوەیە، لەبەر ئەوەی قسەکردن پێویستی بە چاندن هەیە کە خاکێکی لەبار لە ئارادا بوو، چاندنەکە بە شێوەیەکی سروشتی ئەنجام دەدرێ . لەوانەیە پیاویش لە شوێنی ژن با بەهەمان شێوە ڕەفتاری کردبا (**دەمی ژن هیچ کات پشوودانی نییە**)[150] ، یا (**ژن قسە ناشارێتەوە**)[151] .....هتد .

ئەم جۆرە پەندانە وەك هەڵەیەکی باو ئێستاش خەڵکانێك لە ئاکامی قاڵبی ئەو پەندانە کە بە ئامادەکراوی لە مێشکیاندا چەسپیوە، دەیڵێنەوە . لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵی کوردەواری وەك کۆمەڵگایەکی عاقڵمەند مامەڵەی لەگەڵ کێشەو گرفت و قسە نەشیاوەکان کردووە بۆنموونە بەمەبەستی ڕەتکردنەوەی ئەو قسەو توانجانەی لە تەماشاکردنی ناهاوسەنگی بەتایبەتیش جوانی لەنێوان بووك و زاوادا یەکسەر بە پەندێکی وەك (**بووك بۆ دڵی زاوایە**)[152] وەڵام داوەتەوە . بۆ دەمکوتکردن و دەست تێوەرنەدانی ژیانی خەڵکانی ترو نەشێواندنی لانەی نوێیان، ئەمە ئەوپەڕی ڕەچاوکردنی تایبەتمەندییەکانی بووك و زاوا و ڕێزگرتنی سەرنج و ڕایەکانیانە، لە ڕووی هەڵبژاردنی یەکترییەوە هەربۆیە وتوویانە (**ئەگەر بەجوانی بێ، دەبێ بووك زاوابێ**)[153] .

لێرەدا مەسەلەی نێرو مێ لە چوارچێوەی کۆمەڵگادا سەری هەڵداوە کە (**هەر لەیەکەم ڕۆژی لەدایکبوونەوە نێرو مێ ڕووبەڕووی بارودۆخێکی کۆمەڵایەتی و کلتوورێکی تەواو جیاواز دەبنەوە . نێر کە پەیوەندی سەرەکی و پلەیەکی لەگەڵ مێیە (واتا دایکی) هەر زوو لەسەر ئەوە ڕادەهێنرێ لە سروشتی خۆی دوورکەوێتەوە و مەرجی کەسایەتییەکی دەستکردی بەسەردا دەسەپێنرێ . ئەم سەپاندنەسەرەش وای لێ دەکات بکەوێتە دژایەتیکردن لەگەڵ ڕەسەن و سروشتی خۆی)**[154]، بۆیە وتوویانە (**پیاوێك پیاو نەبێ ژن هەر ژنە**)[155] . دەسەڵاتی پیاو دەبێ دەسەڵاتێکی ژیرانە بێ و بتوانێ جوان مامەڵە لەگەڵ ژندا بکات ، ڕەسەن و بنچینەی ژنەکە هەر شتێك بێت . دەتوانێ ببێتە یارمەتیدەری و هەڵگری ڕێزو خۆشەویستی بۆی .

لایەنە کۆمەڵایەتییەکان جەختیان لەسەر هەندێ شت کردۆتەوە کە بەشێوازی ڕێنمـاییکردن گوزارشـتیان لێ کـردووە . بەمەبەسـتی خـۆ دوورخـستنەوەو ئاگادارکردنـەوەی بەرامبـەر . وەك (**دەوارا نـەکرە ل نیـسانێ، ژنـا نەبـژێرە ل دیلانێ**)[156] . بۆ جەختکردنەوە لەسەر برگەی دووەم، برگەی یەکەم هێنراوەتەوە، ئەمە پەیوەستە بە کاتەوە، چونکە (**دیلانێ**) کاتێکی ئاسایی نییە، بەڵکو خۆ ئامادەکردنێکی زۆری بۆ کراوەو سروشتی ڕاستەقینەی کەسەکەی شاردۆتەوە . یا (**کچا قەرەج نابت خاتوین**)[157] ، لەو باوەڕەدا بوون ڕەسەنایەتی جێگیرە، ناشێ گۆڕانی بەسەردا بێت .

چین و توێژەکانی کۆمەڵ دیاریکراون . هەندێ حاڵەت گۆڕانیان ئەستەمە، چونکە هەر لەسەر چەشنی ژیانی خۆیان دەمێننەوە، لە ڕووی پلەو پایەی کۆمەڵایەتییەوە دێرینەکان زۆر گرنگییان بە ناوەڕۆکی مرۆڤ داوە، جگە لەوە شتێکی تریان لا گرنگ نەبووە، چونکە پێیان وابووە (**ئیتر لەدایك ناوێتەو**)[158]، واتە ژیان یەکجارەو پێویستە مرۆڤ ژیرانە هەڵسوکەوت بکات و چێژی لێ وەربگرێت. هەربۆیە لە هەڵبژاردنی ژندا هەموو شتێکیان لێك داوەتەوەو دەڵێن : (**جاهێل مەنێرە بۆ تواشای ژن**)[159]. کەسی گەنج بۆ داخوازی ژن مەنێرە، چونکە لێی نازانێ و ئەزموونی نییە .

یا (**خۆت مەگەیێنە ناو داوێ ژن و شوو**)[160]. لێرەدا وەك ناوبژیوان لەوانەیە کەسەکە تەنیا خراپەی بۆ بمێنێتەوە، چونکە هەر ئەوان (ژن و مێرد) نهێنی و ڕازو نیازی خۆیان هەیەو لەیەکتری نزیکترن وەك لە ناوبژیوانەکە، ئەمانە گشت بۆ ڕێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی حیکمەت و وانەن.

یا (**خوا یەکەو شوو یەکە**)[161] . یا (**جوان لە بەر و بێشکەدا بناسە**)[162] . ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ پاراستنی جوانی و ڕێکوپێکی ژن لە دوای منداڵبووندا و دەبێتە پێوەرێك بۆ جوانییەکەی . هەر ئەوە وای کردووە بڵێن (**لە دوای حەفت سك ئەیژێ کەنیشکم**)[163]، وەك ئەوەی هێندە خەریکی خۆی بووبێ، شانازی بەوە بکات کە شان لە شانی کچان دەدات .

لە نێو پەندەکاندا سیستەمێکی کۆمەڵایەتی وردبینانە بەدی دەکرێت، گەلێ دیاردەو بابەتیان بەپەسند نەزانیوە . وەك (**ماڵێ نزیکی ماڵ بابا ، ژنێ خۆلیا بەسەرییە**)[١٦٤]. چوونەوەو سەردانەکان هەرەمەکی دەبێت و هیچ ڕێکخستنێکی تێدا نابێت و ژیان دەشێوێنێ .

یا (**ئەوەی لە ماڵ نەبێ ژنی مارەکرایە**)[١٦٥] . پاراستنی ماڵ یەکێکە لە پێویستییەکان، ئەم پەندە لە سنووری واتاکەی دووردەکەوێتەوە و بۆئەوەش دەگەڕێتەوە ئەوەی لەبەرچاوان نەبێ مافی خوراوە .

لەلایەنی دارایییەوە، بیرێکی ماددی ئەبستراکت ئەوەی داهێناوە (**ئامۆزاو پوورزا قسەی ژنانە، دڵسۆزی باش ئەمڕۆ جزدانە**)[١٦٦] .

یا (**حەردی لێژ، مەڕی گێژ، ژنی درێژ**)[١٦٧]، بۆ ڕەتکردنەوەو ناپەسندی ژنی درێژ، دوو ڕەتکردنەوەی تری هێناوە، بۆ ئەوەی پێمان بڵێ حاڵەتی سێیەم هاوشێوەی حاڵەتی یەکەم و دووەمە (**درێژی**) مەبەست درێژی نائاساییە کە لەلایەن کۆمەڵگاوە بۆ خەسڵەتی ژن پەسند نییە، بۆیە کردوویانەتە هاوچەمکی (زەوی لێژ) لەبەرئەوەی خوارەو جوانی تێدا بەدی ناکرێت . لە پاڵ (**مەڕی گێژ**) واتە (**لێژی و گێژی و درێژی**) پەسەند نین .

یا (**ژنا بێ زار، دڵێ وێ ناشەوتە ماڵێ**)[١٦٨]، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لایەنی دەروونی سەرەکیترین کاریگەری لەسەر ئەم لایەنە هەیە . هەر ماڵێك ناڕێك و ناپوخت بوو نیشانەی ئەوەیە خاوەن ماڵ یا هەڵسووڕێنەری ماڵ کە ژنە ئاسوودە نییە، بۆیە توانای ڕێکخستنی ماڵی نامێنێ، و لایەنەکان تەواوکەری یەکترن .

### ٣- ئەرکی ئەدەبی و جوانناسی

هەرچەندە ئەم ئەرکەی پەند سەرەکی نییە، بەڵام هیچی لە ئەرکەکانی تر کەمتر نییە، بەتایبەتی داڕشتنی پەند لەو قالبە بچووکە پڕ واتایە، کە داڕشتنێکی ڕەوانبێژی و ئەدەبییانەی لەخۆگرتووە، تەنانەت ( ئەوپەڕی ڕەوانبێژی تێدایە . هەر لەبەر ئەو تایبەتیانەی جگە لەو لە هیچ جۆرە ئاخاوتنێکی تردا کۆنابنەوە)[١٦٩]، وا لە پەند دەکەن لەشێوازی شیعر نزیك بێتەوەو پەیوەندییەکی

پتەو بەیەکیان دەبەستێتەوە، بەلاَم ( پەند لە شیعریش بلاَوترە، بۆیە بەپلەی شیعری پەند ئامێز بلاَوتر دەبێتەوە بەهۆی ئەو پەندانەی کە تێیدان)[١٧٠]، بەشێوەیەکی هونەری وشەکان بەکارهێنراون کە لە سەرچاوە زمانییە دیاریکراوەکان دووریان دەخاتەوە ، ئەم وشانە توانیویانە بیرەکان بە پتەوی بەیەك بگەیەنێت .

پەند ئیقاعێکی دیاریکراوی هەیە، ئەم ئیقاعە وادەکات خێراتر بگاتە گوێگر و ئامانجەکەی بپێکێ لەهەمان کاتدا ، لەکاتێکدا لە ڕووی زمانەوە بە زمانی خەڵکی ئاسایی(*) وتراون، بەلاَم زمانێکی ڕەوان و پاراو، (زۆر جار پەندێك لە ناوەڕۆك و داڕشتنەکەیدا لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر کە دیالێکتیان یەکەو لە بێچووەیەکی جیان، وەك موکریانی و سلێمانی و هەولێر (سۆران) کە هەرسێ لا بە کرمانجی خواروو ئەدوێن، بەلاَم هەریەکە لە بێچوویەکن، پەندی پێشینان ئەگۆڕێ وەك (**ئە، دە**)[١٧١] یا ئامرازو وشەی تر . بۆنموونە هەولێر دەڵێن : (ئیشی ژنان سی و چارن، هەر نان و شیو دیارن)[١٧٢]، سلێمانی دەڵێن :( ئیشی ژنان بیست و چوارن، هەر نان و هەویر دیارن)[١٧٣]، ( چار ، چوار)، (شیو ، نان) بەپێی شوێن گۆڕاون، نموونەی لەم شێوەیە لە پەندی پێشیناندا زۆر بەدی دەکرێت، بەتایبەتی گۆڕینی (ل) بە (ڕ) یا گۆڕینی ئامراز یا بەکارهێنانی وشەی دیاریکراو و تایبەت بە شوێنەکە .

لێکچواندن وەك هونەرێکی سەرەکی بەشی یەکەمی ڕەوانبێژی کە ڕەوانکارییە، ڕۆڵێکی گرنگ و بنچینەیی لە لێکچواندندا هەیە لێکچوونی دوو شت دەخرێتە ڕوو بەهۆی هاوبەشی بوونیان لە سیفەتێکدا، بەهۆی بەکارهێنانی ئەوزارێك، یا بێ بەکارهێنانی ئەوزار، لەپاڵ دەرخستنی ڕووی لێکچواندنەکە[١٧٤] .

لێکچواندن لەنێو پەندی پێشیناندا بایەخێکی گەورەی هەیە و بەشداری لەپێکهاتەکانی بەشێکی زۆر پەنددا دەکات وەك (ماری بێ ژن وەکی کاولەئاشییە)[١٧٥]

ماری بێ ژن ———————◄ لێ چووە

وەکی ——————◄ ئەوزارە

کاولە ئاش ⟵ لەوچووە

(چۆلی) ⟵ ڕووی لێکچوواندنە کە دەرنەخراوە .

یا (داریٚ ب تەنیٚ مینا (وەك) مێریٚ ل بەرحوکمیٚ ژنیٚ)[176]

داریٚ ب تەنیٚ ⟵ لیٚ چووە

مینا ⟵ ئەوزارە

مێریٚ ل بەر حوکمیٚ ژنیٚ ⟵ لەوچووە

(چەوسانەوەو تەنیایی) ⟵ ڕووی لێکچوواندنە دەرنەخراوە .

یا ( ژنا بیٚ حەیا وەك گرارا بیٚ خوێیە)[177]

ژنا بیٚ حەیا ⟵ لیٚ چووە

وەك ⟵ ئەوزارە

گرارا بیٚ خویٚ ⟵ لەوچووە، واتە ( برنجی بیٚ خویٚ)

(بیٚ تام) ⟵ ڕووی لێکچوواندنەکە دەرنەخراوە .

ئەم نموونانەی باس کران تەنیا سیٚ بنەڕەتی لێکچوواندنی لەخۆگرتووە ( **لیٚ چوو ، لەوچوو، ئەوزار** ) ئەمە پلەی ناوەنجی لێکچوواندنە ، یا ( کەچك وەك سێڤا دارێیە، هەرکەس کەڤریٚ خوە داڤێژیٚ، کیٚ بخە وی ڕەیە)[178]

کەچك ⟵ لیٚ چووە

وەك ⟵ ئەوزارە

سێڤا داریٚ ⟵ لەوچووە .

یا (کیژ قەلاّیە ناگیریٚ)[179]

کیژ ⟵ لیٚ چووە

قەلاّ ⟵ لەوچووە

(ە) ⟵ لێکدەرە پلەو پایەی ئەوزاری هەیە .

دکتۆرە (شوکریە ڕەسول) لای وایە ئەم پەندانە بەبیٚ لێکدەر مەبەستەکە دەردەخەن[180]، بەلاّم لێرەدا (ە) لێکدەرە شوێنی (وەکو) یا (چەشنی) یا (دەڵێی) دەگرێتەوە، دەشیٚ بڵێین : ( کچ وەکو قەلاّیە ناگیریٚ) یا ( کچ چەشنی قەلاّیە ناگیریٚ) یا ( کچ دەڵێی قەلاّیە ناگیریٚ)....هتد . لەم جۆرە پەندانەدا تەنیا

دوو بنەڕەت ( لێ چوو) و ( لەو چوو) دەهێنرێت ، ئەوەش زیاتر جەختکردنی سیفەتە هاوبەشەکەی تێدا بەدی دەکرێت، بەوەی ( لێ چوو ) و ( لەوچوو ) زیاتر لەیەکتری نزیك دەکرێتەوە، ئەمە جۆری لێکچوواندنی ڕەوانەو بەهێزترین جۆری لێکچوواندنە، بۆشایی لە نێوان (لێ چوو) ، (لەوچوو) ناهێڵێت .

یا (کیژی بێ برا وەك باغی بێ پەرژینە)(١٨١)

کیژی بێ برا ←——— لێ چوو

وەك ←——— ئەوزار

باغی بێ پەرژین ←——— لەوچوو

لێکچوواندنی سێ بنەڕەتە، ئەمە لێکچوواندن وەکو حاڵەت، بەڵام لەنێو لێکچوواندنی ئەم دوو حاڵەتەدا ئەوە بەدی دەکرێت کە:

(کیژ) ←——— لێ چووە

(باغ) ←——— لەوچووە

هەروەها (برا) ←——— لێ چووە

(پەرژین) ←——— لەوچووە

یا (ڕەشبە وەك تاوە، ئەتخوازن بە ناوی باوە)(١٨٢)

تۆ ←—— لێ چووە ( وەك ڕاناو نەهاتووە بەڵام لە سیاقی (ڕەشبە) واتە (ڕەش+ببە) بەهۆی فرمانی داخوازی (بە)

وەك ←——— ئەوزار

تاوە ←——— لەوچوو

ڕەنگی ڕەشی ←——— رووی لێکچوواندنە

یا ( ژن کانییا ژینێیە )(١٨٣)

ژن ←——— لێ چوو

کانییا ژینێ ←——— لەوچووە

جۆرێکی تری لێکچوواندن لە پەندی پێشینانداا بەدی دەکرێت، پەیوەستە بە ( ئێستا ) و بینینی حاڵەتێکی دیاریکراو، چونکە ( لێ چوو ) بەندە بە ( بینین ) ، بۆ مەبەستی بەکارهێنانی ئەم جۆرە پەندانە .

وەك : ( وەك وەوی )[١٨٤] ، واتە وەك بووك .

وەك : ئەوزار

وەوی : لەوچوو

کەواتە ( لێ چوو ) پەیوەستە بە بینینی کەسێکی لەم شێوەیە ڕازاوەو جوان و پۆشتەو ڕێکوپێك بۆ ئەوەی لە بووك کە حاڵەتێکی تایبەتییە ، نزیك ببێتەوە و ڕووی لێکچوواندنەکەش جوانییە ئەویش دەرنەخراوە، چونکە ڕوون و ئاشکرایە .

یا دەوترێت: ( وەك خوشك)[١٨٥]، یا (وەك دایك)[١٨٦] ، یا( وەك شیری دایك)[١٨٧]. لە یەکەمیاندا لەڕووی میهرەبانی و دڵسۆزیەوە و دووەمیان لە ڕووی گیانی قوربانی دان و خۆبەخت کردن . لە سێیەمیاندا لە ڕووی حەلاڵی و پاکییەوە، ئەمە جگە لە پەند لە بابەتی تردا بەدی ناکرێت، چونکە پەند ڕستەیەکی کورتی چڕکراوەیە، بۆیە دەتوانێ ئەم قاڵبانە لە خۆ بگرێت .

(دەڵێی کچە جافی لەبۆ هاتییە)[١٨٨]

| | | |
|---|---|---|
| دەڵێی | ⟵ | ئەوزارە |
| کچە جافی لەبۆ هاتییە | ⟵ | لەوچوو |

(لێ چوو) پەیوەستە بەئێستای قسەکردنەوەو بە کوڕێك دەوترێت کە وەك زاوا بێت لە ڕووی هەڵسوکەوتەوە .

یا ( دەڵێی حەمامی ژنانە)[١٨٩]

| | | |
|---|---|---|
| دەڵێی | ⟵ | ئەوزارە |
| حەمامی ژنان | ⟵ | لەوچوو |

(لێ چوو) پەیوەستە بە ئێستای قسەکردنەوە و بە شوێنێك دەوترێت کە قەرەباڵغی و زۆر دەنگە دەنگی لێوەبێت و پشت بە بینین دەبەستێت .

**گرنگترین خەسڵەتە هونەرییەکانی پەند ( بزووتنەوە ڕێتمی یەکەیەتی، کە بەهۆی کێش و ئیقاعەوە دروست بووە، ئەگەر کێش و قافیە لە شیعردا کە وێنە زمانییە تێکچڕژاوەکان دەخاتە ڕوو، لەگەڵ بزووتنەوە دەرونییەکە بەردەوام دەبێت، ئەوا کێش و ئیقاع ( سەرواداری) لە پەندا دەتوانێ شێوە زمانییەکی داخراو دروست بکات، واتە لەگەڵ تەواوبوونی هەردوو دەستەواژە یەکگرتووەکە و**

**نزیکبوونەوەیان لە کێش و ئیقاعدا کۆتـایی بـە پەندەکـە دەهێـنن)**[190]، وەك دوو دێری (٨) بڕگەیی (بووك نییەتی شیوی شـەوێ، ئەموسـتیلەی لێمـان ئـەوێ)[191]، (ەوێ) سەرواکەی دروست کردووە .

یا (٩) بڕگەیی وەك : (ژنـێکم ئـەوێ زبـان دلێـر، بـاوان خـەزوور بەیەکـەوە نێر)[19]دوو پیتی (ێر) سەرواکەی پێك هێناوە، هەردووکیان سەرواداری کورتن و لە کێشیشدا وەکو یەکن[193] . یا وا دەبێ کێشیان وەکو یەك نییە، بڕگەکانی ڕستەی یەکـەم لـە ڕسـتەی دووەم کـەمترن ، بـەلاّم سـەرواکەیان یەکـە وەك (ژنـی بـەد ژانە،گەر خۆتی لێ دەی ماڵت وێرانە)[194]، ڕستەی یەکەم (٥) بڕگەو ڕستەی دووەم دوو ئەوەندەی ڕستەی یەکەمە واتە (١٠) بڕگەیـەو سـێ پیتـی[*] **(انـە)** سـەرواکەی دروست کردووە، یا ڕستەی یەکەم زیاترە لە هـی دووەم وەك : ( دایك و بـاوك لـە قازییە، منداڵ لە وازییە)[195]، (٨) بڕگە بەرامبەر (٦) بڕگـە و (ازییـە) سـەرواکەی پێکهێناوە .

هەروەها (پاش نۆ بچووکان، دەڕوا وەکی بووکـان)[196] ، ڕسـتەی دووەم یـەك بڕگەی زیاترە لە ڕستەی یەکەم، چوار پیتـی **(ووکـان)** سـەرواکەیەتی، هەرچـەندە ژمـارەی پیتــە هاوبەشــەکان زیـاتربن، ئیقاعەکـە ڕێکـوپێکتر دەبێـت . یـا بــە پێچەوانەوە ڕستەی یەکـەم دوو بڕگـەی زیـاتر دەبێـت لـە هـی دووەم وەك : (ژنـێ بیــنن لــە بنــەماران، خــوارزا دەچــنە ســەر خــاران)[197] ، چــوار پیتــی (اران) سەرواکەیەتی . یا پەندەکە لە سێ بەش یا سێ ڕستە پێکهـاتووە، کێشیان یـەك نییە، بەلاّم لە سەروادا هاوبەشن، نموونەی ( بوار بە باران، گەڕەك بە ژن جوانـان، مێگەل بە نێری و بەرانان)[198]،(ان) لە هەرسـێ ڕسـتەکەدا هاوبەشـن، ئـەم جـۆرە چەمکانە کردارەکەیان شـاراوەیە . واتـە ، بـەهار بـەباران جـوان و دەگەشـێتەوە، ئەمەی بۆ سەلماندنی گـەڕەك بـە ژنـی جـوان دەڕازێتـەوەو مێگـەلیش بـە نێـری و بەران هێناوەتەوە .

لەم جۆرە ڕستانەی کردارەکانیان شاراوەیە، بەهێزترن و وەرگـر دەتـوانێ لـە سـیاقی ڕسـتەکاندا کردارەکـە بدۆزێتــەوە، وەك : (وەفـای مێـردی، سـێبەری بەردی)[199]، ژن لـە ئـەنجامی تاقیکردنـەوە ئامـاژە بەمـە دەکـات، سـێبەری بـەرد

چەند کەم خایەنە، وەفای مێردیش هەر ئەوەندە . ناشێ ئەمە گشتگیر بکرێت، بەڵام نموونەی وا لەوانەیە زۆر بێت . سێ پیتی **(ردی)** سەرواکەی پێکهێناوە، کرداری تێدا نییە .

یا (باخچە بەگوڵان، ماڵ بە کچان)[٢٠٠] دوو پیتی **(ان)** سەرواکەیەتی . هیچ فەرمانێکی تێدا نییە، دەشێ زیاتر لە سیفەتێك دابنرێت وەك ( خۆشە، ئاوەدانە، جوانە،... هتد)، واتە ئاوەڵناوێك + کرداری (ە) ، لەم پەندەدا بە هەمان شێوە کردار لابردراوە ( شەممە بار، شەممە کار، شەممە وەوی مەکە سوار)[٢٠١] برگەکانی ڕستەی سێیەم زیاترە، بەڵام لە سەروادا یەکن، دوو پیتی (ار) سەرواکەی دروست کردووە . فەرمانەکەی دژ یەکە، واتە لە ڕۆژی شەممەدا بارکردن و کارکردن باشە، بەڵام لەم ڕۆژەدا بووك گواستنەوە باش نییە، ئەمە وەك بیرو باوەڕێکی ناو میللەتی کورد ناسراوەو لە ئاکامی تاقیکردنەوە بەم ئەنجامە گەیشتوون ، کردارە لابردراوەکە (بکە)یە، پێچەوانەی کاری ئاشکرای (مەکە).

یا یەك کردار بۆ دوو ڕستە بەکاردەهێنرێت، ئەم کردارە بۆ هەردوو ڕستەکە دەشێت، بە مەبەستی دوورکەوتنەوە لە دووبارەکردنەوە یەکجار ناوی دەهێنرێت . وەك ( یان بەخانی خانان دەبێت، یا بە بووکی بانان )[٢٠٢] . هەمان چەمك دەبەخشێت، هەندێ جار بەهۆی ئامرازی نەرێی **(نە)** ڕێڕەوی ڕستەکان دەستنیشان دەکرێن وەك ( نە ژنی نزیك باوان، نە گوێرەکەی نزیك ئاوەدان)[٢٠٣] دوو پیتی **(ان)** سەرواکەیەتی، یا ( نە سێ ماین لە دۆڵێك، نە سێ ژن لەسەر کەمۆڵێك)[٢٠٤]، چوار پیتی **(ۆڵێك)** سەرواکەیەتی .

یا سێ ڕستە بە( **نە**) نەفی دەکرێن، واتە پەسند نین، یا باش نین ( نە ساڵی دوو بەهار، نە ژنی دوچکدار[*]، نە پیاوی گوێ بە گوار)[٢٠٥] دوو پیتی (ار) سەرواکەیەتی . لەم شێوە پەندانە زۆرن وەك : ( نە پیاوی خنس، نە ژنی چاو نز)[٢٠٦] یا ( نە تفەنگی مەلان، نە مەکری ژنان) یا ( نەکەری گاڕانێ، نەکیژی دیلانێ، نە دەواری کاروانێ)....هتد[٢٠٧] . هەموویان کرداریان نییە، بەڵام بەهۆی **(نە)** ئەم خەسڵەتانە ڕەت کراونەتەوە، لە هەندێ پەندا پێشەکییەك هەیە و

ژمارەی شتەکانیش دیار دەکرێن، ئینجا سەرواداریەکە دروست دەکەن، وەك (سێ شت پەسندن : سێبەری کەڤر، گۆشتی کاڤڕ، ژنی بە گوڕوڤڕ)[٢٠٨] .

پەندی وا هەیە سەرواکەی لە کردارەکەیەو بکەرەکە لابراوە، وەك : (لێم دەرپەڕی، لێم هەڵپەڕی)[٢٠٩] قسەی دایکێکە بە منداڵەکەی دەڵێ، ( پەڕی) سەرواکەیەتی . جاری وا هەیە لە نێو ڕستەی یەکەم و دووەمیشدا سەرواداری هەیە، وەك (وەوی ماڵ ماموان، گوڵی ناو پەموان، وەوی ماڵ میمکان پەلە پیتکان)[٢١٠] . لەڕستەی یەکەمدا چوار پیتی **(موان)** سەرواکەی دروست کردووەو وای لێ هاتووە وەکو پەندێکی سەربەخۆ بێت . لە ڕستەی دووەمدا سێ پیتی **(کان)** سەرواکەیەتی، لە نێوان هەردوو ڕستە سەرەکییەکەدا **(ان)** سەروای گشتی پەندەکەیە . یا تەنیا لە نێو ڕستەکاندا سەرواداری هەیە بەبێ ئەوەی سەروای گشتی هەبێت وەك : ( ئاوێ سار ژنێ هار، ئاوی گەرم ژنێ نەرم)[٢١١] لە ڕستەی یەکەمدا **(ار)** و لە نێو ڕستەی دووەمدا (ەرم) بۆتە سەروا، بەبێ ئەوەی هیچ سەرواداریەك هەردوو ڕستە سەرەکییەکانی پەندەکە بەیەکەوە ببەستێتەوە .

لە هەندێ پەندی تردا کردارەکە لە هەردوو ڕستەکەدا دێن بە هۆی پەیوەستبوونیان بە ناوهێنانی کردار وەك ( خەڵکی بلاوێنن قۆچکە بەسەرێ، ئێمەش بلاوێنین هۆلێ کەرێ)[٢١٢]، سێ پیتی (ەرێ) سەرواکەیان پێکهێناوە و لە هەردوو ڕستەکەدا فرمانی (لاواندن) هاتووە، بۆ جەختکردنەوە لەسەر کارەکان و ئەنجامدانیان، کە زمانی ژنێکی بێ منداڵە، ناڕەزایی بەرامبەر بەم حاڵەتەی دەردەبڕێ و ئیشی خۆی لەگەڵ خەڵکانی منداڵدار بەراورد دەکا . هەست بە بۆشایی نەبوونی منداڵ لە ژیانیدا دەکات .

جگە لە کێش و سەرواداری گەلێك لە پەندەکان سوودیان لە شێوازی دووبارەکردنەوە وەرگرتووە، دووبارەکردنەوە یا دووپاتکردنەوە یەکێکە لە هونەرەکانی جوانکاریی وشەیی و ئامانجێك لە پشتی دووبارەکردنەوەکە بەدی دەکرێت .

یا دووبارەکردنەوەی وشەیەکی دیاریکراو وەك (گا بدە گا مرییا، ژنێ بدە ژن مرییا)[٢١٣]، (مردن) دووبارە بۆتەوە وەك جەختێك بۆ بایەخی ئەو جۆرە کەسانەی

شتێكیان لەدەست داوەو هەست بەو بۆشاییە دەكەن،كە مردنەكە لە ژیانیاندا دروستی كردووە، یا (بە ناڵە ناڵ، بە نووكە نووك، قۆچە دەهۆڵ خۆی كرد بە بووك)[٢١٤]، یا (ژن ژن گۆتی مێر مێر گۆتی)[٢١٥] مەبەست جەختكردنەوەو دیاریكردنە، هەروەها ( شێر شێرە، چ ژن چ مێرە)[٢١٦]، دووبارەكردنەوەی ( شێر) پاراستنی ڕەمزی ئازایەتی و لێهاتوویییە، زۆربەی دووبارەكردنەوەكان لە پەندی پێشیناندا[*] لە ئاكامی بەراوردكردنی دوو شت یا دوو حاڵەت سەریان هەڵداوە، ئەمە بە مەبەستی دەرخستنی ئەو جیاوازی و سنوورانەی كە لە نێوانیاندا هەیە ، وەك (كچم بەخێوكرد كوڕی خەڵك بردی،كوڕم بەخێوكرد كچی خەڵك بردی)[٢١٧] ئەمە جگە لە دووبارەكردنەوەی وشەكانی ( بەخێوكرد، خەڵك، بردی، كچ، كوڕ) دەچێتە نێو هونەری جێ گۆڕكێش كە زیاتر لە شیعردا بەدی دەكرێت، وەك هونەرێكی ڕەوانبێژی و جوانكاری بە ڕستەكان دەبەخشێ، ئەویش جێ گۆڕكێی ( كچ و كوڕ)ە . یا (كولفەت هەیە جەهـ دكە گەنم، كولفەت هەیە گەنم دكە جەهـ)[٢١٨] (گەنم و جۆ) جێ گۆڕكێیان پێكراوە بۆ پێشاندان و خستنە ڕووی هەڵوێستەكان، جگە لەمانە ( كولفەت)، (هەیە)، (گەنم)، (جۆ) دووبارەكراونەتەوە .

دووبارەكردنەوە لە (پاش سەرواداری)یش لە بەشێكی پەندەكاندا بەدی دەكرێن، وەك ( ژنی پیران بە، وەكی میران بە)[٢١٩] كرداری (بە)ی داخوازی دووبارەكراوەتەوە ، پاش سەرواداری ( ی ر ا ن )ەوە هاتووە . (ژنا بێخوە دێ هاردبە، مێرێ بێخوە دێ ژار دبە)[٢٢٠]، (دبە) پاش سەرواداری ( ا ر) دووبارە كراوەتەوە، چونكە هەردوو حاڵەتەكە پێویستی پێیەتی یا ( كراسم جاو بێ، مێردم لاو بێ)[٢٢١]، (بێ) پاش سەرواداری ( ا و) دووبارەكردنەوەیە، یا (داری بێ گەڵا قیمەتی نییە، خوشكی بێ برا زیننەتی نییە)[٢٢٢] ( نییە) پاش سەرواداری ( ە ت ی ) بە مەبەستی ڕەتكردنەوەی هەردوو حاڵەتەكە دووبارە كراوەتەوە ، لە شێوازی ئەم پەندانەدا هونەرێكی تری ڕەوانبێژی بەدی دەكرێت ئەویش ( دژ یەك)ە،و بریتییە لە هێنانی دوو وشەی دژ یەك یا ڕووبەڕووكردنەوەی دوو واتای پێچەوانە، جا یا دژیەكەكە یا هەردووكیان ناو دەبن یا كردار یا بەهۆی پیتی مانا دەبن[٢٢٣]، یا ئاوەڵناو ..... هتد . وەك : ( ژنا چێ مەرڤا دكە وەزیر، ژنا خراپ

مـەرڤان دکـە ڕەزیـل)[٢٢٤]( چـیٚ)و (خـراپ) دژیـەکی ئیجـابن، چـونکە لـە ڕووی ڕەگـەزەوە هـیچ پەیوەندییـەکیان بـە یەکـەوە نییـە، هەریەکـەیان لـە ڕەگـەزێکی سـەربەخۆن[٢٢٥] هـەروەها لـە نێـوان ( وەزیـر)(*) و ( ڕەزیـل) لـە ڕووی واتـاوە دەلالەت لە ( بەرزی) و ( نزمـی) دەکـەن و دژیـەکی ئیجـابن . یـا (کیـژی خانـەدان هێنانیان گرانە، ڕاگرتنیان ئاسانە)[٢٢٦]، ( گـران) و (ئاسـان) دژیـەکی ئیجـابن . یـا (ئاویٚ سار ژنیٚ هار، ئاوی گەرم، ژنی نەرم)[٢٢٧]، (سار) و (گەرم)، ( هار) و (نەرم) دژیـەکی ئیجـابن . یـا ( شـووی کـافر لـە بـرای موسـڵمان خاسـترە)[٢٢٨](کـافر) و (موسڵمان) دژیەکی ئیجابن . یـا ( درێـژە ژن داری لـە لێـریٚ، قایـدە ژن لـە گـوێی زێڕیٚ، کورتە ژن فیتنە دەگێڕیٚ )[٢٢٩] (درێژ) و ( کورت) دژیەکی ئیجابن . یا (هەی پیرەژن سەر وەك جەڕە، قسەی خێریـشت هـەر شـەڕە)[٢٣٠]، (خێـر) و (شـەڕ) دژ یەکی ئیجابن . یا ( ژنی چاك نیعمەتە، ژنی خراپ زیللەتە)[٢٣١]، (چـاك) و (خـراپ) دژیەکی ئیجابن، لەپاڵ ( نیعمەت) و (زیللەت) بەهەمان شێوە دژیەکی ئیجابن .

لەنێو پەندەکاندا جۆرێکی تری دژیـەك بـەدی دەکرێـت، کـە ئـەویش دژیـەکی سەلبە: بریتییە لەوەی ئـەو دوو وشـەیەی دژیەکەکـە دروسـت دەکـەن، دووەمیـان نـەفی یەکـەمیان دەبێـت(*) ، بـە هـۆی بـەکارهێنانی ئـەوزاری نـەفی وەك: نـە، مـە[٢٣٢]، یـا بـیٚ، نـا،....هتـد . وەك (ژنـا بـیٚ عەسـڵ دەردە، ژنـا بـە عەسـڵ دەوڵەتە)[٢٣٣]، (بەعەسـڵ)و(بـیٚ عەسـڵ) دژیـەکی سـەلبن، بـەهۆی ئـەوزاری (بـیٚ) دروسـت بـووە. یـا (سـۆران نـەخوازن سـۆری فـشە، ڕەش ئەسمـەران بخـوازن لـە گڕوجۆشن)[٢٣٤] (بخـوازن) و (نـەخوازن) دژیـەکی سـەلبن، بـەهۆی ئـەوزاری ( نـە) دروست بووە .

لەسەرەتای ئەم پەندانەدا (نـەریٚ)یەکـە هـاتووە، ئنجـا (ئـەریٚ)یەکـە . وەکـو جەختکردنەوەیەکی تەواو لەسەر نەرێیەکـە و ڕەتکردنـەوەی، یـا ( ئـاوی هـەوێیان دەڕوا، هـی هاوگیانـان نـاڕوا)[٢٣٥]، (دەڕوا) و ( نـاڕوا) دژیـەکی سـەلبن بـەهۆی ئەوزاری نەرێی (نا) پێکهاتووە .

یا (ژن بهێنم یا نەهێنم، هەر پەشیمانم)[٢٣٦]، (بهێنم) و (نەهێنم) دژیەکی سەلبن ، یا ( ئەگەر کابان زۆر بوو، چێشت سوێرە یان بێ خوێ)[٢٣٧]، (سوێر) و (بێ خوێ) لە ڕووی واتاوە .

هونەرێکی تر ( **کۆکردنەوە**)یە، کۆکردنەوەی چەند شتێك و سیفەتەکانیان و حوکمدانی یەك فەرمان بەسەریاندا، کۆکردنەوە لە ڕەوانبێژیدا تەنیا چەند وشەیەك کۆدەکاتەوەو یەك حوکمیان بەسەردا دەدات[٢٣٨]، بەڵام لێرەدا فراوانترە، چونکە ئامانج هۆشیارکردنەوەو خۆپاراستنە نەك جوانی وەك لە شیعردا بەدی دەکرێت، وەك ( سێ شت پەسندن : سێبەری کەڤر، گۆشتی کاڤڕ، ژنی بە گروڤڕ)[٢٣٩]، یا (نە سێ ماین لە دۆڵێك، نە سێ ژن لە سەرکەمۆڵێك)[٢٤٠] لێرەدا بەهۆی هێنانەوەی ژمارە (سێ) کۆکردنەوە دروست بووە، هەرچەندە حوکمەکەیان ئاشکرا نەکراوە کە زەرەرمەندییە، چونکە لەبەر قسەکردن ناتوانن کارەکەیان ئەنجام بدەن . یا (لە دیوار شکستەو ژن سەلیتەو سەگ دڕندە خۆت بپارێزە)[٢٤١]، سێ شتی کۆکردۆتەوە، ئنجا ئاگادارکردنەوەی خۆپاراستنی ئاراستەی بەرامبەر کردووە .

هونەرێکی تر کە دەچێتە نێو بەشی یەکەمی جوانکاری، جوانکاری وشەیە . لە نێو بەشێکی زۆر پەنددا بەدی دەکرێت و شێوازی پەندەکانی پێ ڕازاوەتەوە (ڕەگەز دۆز)ییە، هێنانەوەی دوو وشە یا زیاترە یا لە ڕووی ڕوخسارەوە وەك یەك و لە واتادا جیاواز دەبن، بەمەش ڕەگەزدۆزی تەواو دروست دەکەن[٢٤٢]، ئەم جۆرەیان لە پەندەکاندا بەدی ناکرێت، بەڵام ئەوەی زۆر بەکارهاتووە، جۆرەکەی تری ڕەگەزدۆزییە، کە ڕەگەزدۆزی ناتەواوە، ئەگەر هاتوو لە یەکێ لەم چوار شتە:

– ژمارەی پیتەکان --- جۆری پیتەکان
– شێوەی پیتەکان --- ڕیزی پیتەکان

یەك نەبن و لە هەر سێکەی تر یەك بن ئەوکاتە ڕەگەزدۆزی ناتەواو دروست دەبێت، چونکە بەتەواوی هەرچوار مەرجی لێ نەهاتۆتە دی[٢٤٣]. وەك : (مێردم لاو بێ، کراسم جاو بێ)[٢٤٤]، (لاو) و (جاو) تەنیا پیتی یەکەمیان جیایە بۆیە

ڕەگـەزدۆزی ناتـەواو جـۆری جودایـە . یـا ( خـانم بـەو نەرمییـەی، تەنـدوور بـەو گەرمییەی)[٢٤٥]

نەرمییەی ⟵ گەرمییەی بەهـەمان شـێوە ڕەگـەزدۆزی ناتـەواوە، جـۆری جـودا، چـونکە تـەنیا یـەك پیتیـان جیایـە. یـا (ببیـنم مـەرگم زاوا نـەکا بەرگم)[٢٤٦]، (مەرگم ، بەرگم) ڕەگەزدۆزی جودایە .

یا (بووکا چێیە، خاسی دێیە)[٢٤٧]، (چێیە ، دێیە) ڕەگەزدۆزی جودایە .

یا (بووکا ئاپێ کەتە کاپێ، بووکا خالێ دەلالییـا مـالێ)[٢٤٨]، (ئـاپێ ، کـاپێ)، (خالێ ، مالێ) ڕەگەزدۆزی جودان .

یا (ژن هەیە گـولا مێـرێ خوەیـە، ژن هەیـە کـولا مێـرێ خوەیـە)[٢٤٩]، (گـولا، کولا) ڕەگـەزدۆزی جودایـە . یـا (بـووکی مامـان، توولـەی نـەمامان)[٢٥٠]، (مامـان، نەمامان) ڕەگەزدۆزی ناتەواوە جۆری زیادە، دوو پیتی زیادە لە سـەرەتای وشـەی دووەمدا هاتووە . یا: (مەنجەڵ بوو بە مەنجەڵۆکە، ئاغـاژن بـوو بـە جنۆکـە)[٢٥١]، (مەنجەڵ ، مەنجەڵۆکـە) ڕەگـەزدۆزی ناتـەواو جـۆری زیـادە . هـەروەها (قاپۆکـەو مەنجەڵۆکە) ناوی بچووککراوەن بەهۆی پاشگری (ۆکە) .

**هونەرێکی تر کە پەندی ڕازاندۆتەوە، پێچان و کردنەوە (پێـچەو پەخـشە)**یـە هەرچەندە لەم پەندانەدا دەگمەنە، ئەم هونەرە بریتییە لـەوەی لـە ڕسـتەکەدا دوو شـت یـان زیـاتر بێـت و دواتـر بـە ئەنـدازەی ژمـارەی ئـەوان چـەند وشـەیەکی تـر دێنێتـەوە، ئـەم وشـانەی دوایـی لـە ڕووی گـوزارەوە هەریەکـەیان پەیوەسـتە بـە وشەیەکی ڕسـتەی سـەرەتاوە[٢٥٢] . وەك (نـەفس و ژن بـە جـووت بەسـەرتا زاڵـە، ئەوەیان دووپشکەو ئەو زەردەواڵە)[٢٥٣]، سـەرەتا (نـەفس و ژن)ی هێنـاوە، دواتـر (دووپـــشك و زەردەواڵــە) ، ژن بەرامبـــەر بـــە (دووپـــشك) و (نـــەفس) بەرامبـــەر (زەردەواڵە)، پێچان و کردنەوەی ناڕێکە .

زۆر جـار پەنـدی پێـشینانەکە لـە ڕووی ڕوخـسارەوە لـە شـێوەی هـۆنراوەدا دەبێت[٢٥٤] .

دوو دێڕ هۆنراوە، وەك : ( تفوو لە پیاوی بەدخوو

ئەوەی کچی هەیەو نایدا بە شوو)[٢٥٥]

هەرچەندە ژمارەی بڕگەکانی دێری دووەم زیاترە لە هی یەکەم، بەڵام دەکرێ (وو)ەکـانی لـەکاتی خوێندنـەوەدا درێـژتر بکرێتـەوە بـۆ ئـەوەی ئـەم کەلێنـە پڕبکرێتەوە یا (تا دوێتە نەکەت هوری هوری وڕە نێکەت کاری زوری)[٢٥٦]

یا : ( هۆش کوڕی بێوەژنێ لە کرو لە جۆش

گەنمی خاڵێ میکائیلی دەبەی دەفرۆش)[٢٥٧]

یا سێ نیوەدێر[٢٥٨] وەك :

ئاغا ژنێ سەر چەپەرێ پشیلە هات دووگە بەرێ

بێزی نەهات ختە کەرێ

یا (ئۆخەی ئۆخەی لە منێ مێردە وتی چڵمنێ

گاکە دەرکە لە هەرزنێ) .

لەمانەش زیاتر هەیە کە لە چەشنی پارچەیەکی میللیدایە وەك :

ئەی خەسوێ خەسووێ

پیرە بزنێ گرووێ

بریا خەسوو نەبانا

کـورتـەك حـەفت بـەرك بـانـا

دا بووك سەربەخۆ بانا[٢٥٩]

ئەو پەندانەی چەشنی شیعرن کەمن.

بەشێك لە پەندەکان لە دوو ڕستە پێکهـاتوون، ڕسـتەی سـەرەکی و ڕسـتەی لاوەکی بە هۆی (ئەوەی) واتە (ئەو + کەسـەی) ڕسـتە لاوەکییەکـە بـە (ئـەوەی) دەست پێدەکات وەك ( ئەوەی سەر دەپۆشێت، ژێری دەفرۆشێت)[٢٦٠] .

لـەم جـۆرە پەندانـەدا پێکهاتەیـەکی لـۆژیکی هەیـە، ئـەنجام بـە پێـشەکی دەبەستێتەوە، هەرچەندە ئەم پەندە لە ڕستەی لاوەکی و پێشەکی (ئـەوەی سـەر دەپۆشێت)، پێکهاتووە و ئەنجامەکـەی (ژێـری دەفرۆشـێت)، چـەمك و نـاوەڕۆکی ئەم پەندە لە هەر شت و ڕووداوێکەوە سەرچاوەی گرتبێ ، زوڵمێکی زۆری لـە ژن کردووەو ناشێ یەك حاڵەت گەر هەبێت گشتگیر بێت. یا ( ئـەوی لـە ژنـی خۆشـی بترسێت، بە مردی حیسابە)[٢٦١]

ئەوەی لە ژنی خۆشی بترسێ ⟵ ڕستەی لاوەکی / پێشەکی

بەمردی حیسابە ⟵ ئەنجام .

یا (ئەوەی باوەڕ بە ژنێ خۆ دەکا، قوڕی بەسەری خۆدا دەکا)[٢٦٢]

ئەوەی باوەڕ بە ژنێ خۆ دەکا ⟵ ڕستەی لاوەکی

قوڕی بەسەری خۆدا دەکا ⟵ ئەنجام ( دەبێتە ئەنجامی ڕستەی یەکەم ).

یا (ئەوی یارم دەخوازێ، دۆی لە ماران بخوازێ)[٢٦٣]، ڕستەی یەکەم لاوەکییەو ڕستەی دووەم دەبێتە ئەنجام بۆ ڕستەی یەکەم جۆرێك لە دوعا و هەڕەشەی تێدا بەدی دەکرێت .

هەندێ پەند بە ڕستەی مەرجی گوزارشتیان لێ کراوە، بەهۆی (ئەگەر) هەرچەندە (ئەگەر) حاڵەتێکە یا بەدی دێت، یا بەدی نایەت، بۆیە کورد زۆر باوەڕی بە ئەگەر نەبووە و لای وابووە (ئەگەرمان چاند و شین نەبوو)[٢٦٤]. وەك : (ئەگەر دەبی بە ژنە جۆرە، پێت دەدزی ڕیس و گلۆرە، قەبر تەنگە عەزاب زۆرە)[٢٦٥]

ئەگەر دەبی بە ژنە جۆرە ⟵ ڕستەی مەرجی

پێت دەدزی ڕیس و گلۆرە ⟵ وەڵامی مەرج/یەکەم

قەبر تەنگە عەزاب زۆرە ⟵ وەڵامی مەرج/دووەم

هەروەها (ئەگەر دەبی بە مەلاژن، پێ بە خرخار دەست بە بازن، خەرکی نوشتەت لێ دەخوازن)[٢٦٦]

ئەگەر دەبی بە مەلاژن ⟵ ڕستەی مەرج

پێ بە خرخار دەست بە بازن ⟵ وەڵامی مەرج/(یەکەم)

خەرکی نوشتەت لێ دەخوازن ⟵ وەڵامی مەرج/(دووەم)

یا (ئەگەر کەزی سپیت وێناندەوە، شوو بە هەموو کەس مەکە)[٢٦٧]، ڕستەی دووەم وەڵام و ئەنجامی ڕستەی یەکەمە .

لە هەندێ پەندی تردا دوو جار (ئەگەر) بەکارهاتووە، بەهۆی پێویستی واتاو سروشتی دەربڕینەکە، وەك ( ئەگەر مێردە، ئەگەر ژنە، شەرت شەرتی وەخۆکەوتنە)[٢٦٨] لەم جۆرە پەندەدا ناکرێ یەك جار (ئەگەر) بۆ دوو کەسی جیا بەکاربهێنرێت، ئەم جەختکردنەوەیە لەسەر ئەو وشەیەی پەیوەست کراوە بە (ئەگەر)ەکە، ڕستەی دووەم (شەرت شەرتی وەخۆکەوتنە) بۆ هەردوو بڕگەکانی (ئەگەر مێردە) و (ئەگەر ژنە) دەگەڕێتەوە .

یا (ئەگەر ژن خوازی کیژ خواز بە، ئەگەر مەڕکڕی بەردیل کڕ بە)[٢٦٩] . لەم پەندەدا (ئەگەر)ەکان سەربەخۆن و بۆ دوو حاڵەت دەگەڕێنەوە، تاڕادەیەك هاوشێوەی یەکترین، لە موڵکایەتیدا یەك دەگرنەوە (کیژ خوازبە) ئەنجام و وەڵامی (ئەگەر ژن خوازی) بە هۆی فەرمانی داخوازییەوە دەربڕاوە . ڕستەی دووەمیش سەربەخۆیی تەواوی خۆی هەیە، (بەردیل کڕبە) ئەنجام و وەڵامی (ئەگەر مەڕکڕی)یە، لەم ڕستانەدا خستنەڕووی پێشنیاز بۆ بەرامبەرەکە ئەنجامدراوە بەمەبەستی سوود وەرگرتن لە ئاکامی تاقیکردنەوەو ئەزموونی خەڵکانێکدا سەریان هەڵداوە .

لە بەشێکی تری پەندەکانیشدا ڕەگەزی درامی و سیمای گێڕانەوەو حیکایەت بەدی دەکرێت، بەمەش بزووتنەوەیەکی چالاکی لە نێو ئەو پەندانەدا دروست کردووە .

وەك : ( ژن دەڵێ : مێردم کوڕ بێ، با خواردنم قوڕ بێ)[٢٧٠] . هەموو ئەو پەندانەی ( دەڵێ، وتی، ....هتد) دەچێتە ئەم خانەیەوە . یا (بەلکە وتی : خۆمم و ئەم سکمە)[٢٧١]، یا زمان حاڵی ئاژەڵ وتراوە (کتك ئەیژێ : بچمە ماڵێ حەوت جوانی تیابێ)[٢٧٢] . یا ( ئەوی لەمارێ بابت سمیت لێرەت بسمیبوایە، ئەوەی لێرە دەسمی لەوێت بسمیبوایە)[٢٧٣] . یا (ئۆخەی ئۆخەی لە منێ، مێردە وتی چلّمنێ، گا دەرکە لە هەرزنێ)[٢٧٤] . یا (پیاو کە لە ژن بەبیانوو بوو، ئەڵێ : ئارد ئەبێژێ، قنگ ئەلەقێنێ)[٢٧٥]. یا (ئارد چووە هەمانێ، مێردە ئەڵێ هانێ، ژنە ئەڵێ کوانێ)[٢٧٦] . یا ( کچی دەوڵەمەند دەڵێ : کڕینم گرانە، بەخێوکردنم ئاسانە)[٢٧٧] . ڕەگەزی گفتوگۆ پەندەکانی چالاك کردووە ، یا (بە ژنە دۆمیان گوت : بۆ ئەوەندە

ڕەشی، گۆتی خوا هەر ئەوەندەی پێداوم)[٢٧٨]، هەندێ پەند لەشێوەی پرسیارو وەڵامدایە، ئەو جۆرە پەندانە، لەوانی تر پڕ جوولەترن یا بەزمانی دوو کەسە، یا زمانی یەك کەس، یا پرسیارەو وەڵامی نییە[٢٧٩] . بۆ نموونە (خزمت کێیە؟ هێشتا ژنم نەهێناوە)[٢٨٠] . یا (بۆچی بانێکەو دوو هەوایە)[٢٨١] .

(ڕەمز)یش یەکێکە لەو کەرەستەو تەکنیکانەی لە پەنددا سوودی لێ وەرگیراوە، وەك ( لە نێرەکەری وایە ماکەر خاتوونە)[٢٨٢]، لەبەر ئەوەی (خاتوون) تایبەتە بە مرۆڤ، بۆیە (نێرەکەر) هێمایە بۆ ڕەگەزی نێرو ( ماکەر) هێمایە بۆ ژن . یا کەرەستەو بابەتە پەیوەستەکان بە ژن و پیاو وەرگیراون و کراونەتە هێما لەبری ناوهێنانی هەریەك لەم دوو ڕەگەزە بەکارهاتوون وەك (هەرکەزی زەردێ، سمێڵ سورێکی هەیە)[٢٨٣]. یا (هەر مێزەردار ئەچێ بۆلای لەچەکدار)[٢٨٤] یا (یەك کەزیلە نییە و دوو کەزیلەیشی ناوێ)[٢٨٥]، (یەك کەزیلە) هێمایە بۆ ڕاستە ڕێی و چاکیی و ڕەوشت بەرزی ژن ، ( دوو کەزیلە) هێمایە بۆ پێچەوانەکەی واتە خراپی و نالەباری ژن کە لە پەندەکەدا ڕەت کراوەتەوە .

ئەو پەندانەی بەهۆی پێشەکی ( هیچ کەس) گوزارشتیان لێ کراوە واتە (هیچ کەس نییە) یا (هەموو کەسێك بەم شێوەیەیە) لەم جۆرە پەندانەدا هەردوو ڕەگەزەکە بەشدارن، چونکە هیچ نیشانەیەك یا هێمایەکی تێدا بەدی ناکرێت تایبەت بێت بە ڕەگەزێکی دیاریکراو، گشتییە بۆ هەموو مرۆڤێك، وەك (هیچ کەس بە دۆی خۆی نایژێ تورش)[٢٨٦]. یا (هیچ کەس بێ ئەجەل نامرێ)[٢٨٧]، بەڵام پەند هەیە دیاریکراوە وەك( هیچ دایکێ جەرگی نەسووتێ)[٢٨٨]، بەهۆی (هیچ)ەوە دوعای (جەرگ نەسووتان) هەموو ئەوانەی خەسڵەتی دایکایەتییان هەیە دەگرێتەوە ، (جەرگ نەسووتان)یش خوازەیە.

## ئەنجامەکان

١- پەنـدی پێـشینان بـە شـێوازێکی ئـەدەبی دەربـڕاوە، ئـەم شـێوازە ئەدەبییەش خۆی لە سـەروادراری و هێنانـەوەی وشـەکان و ڕێکخستنیان لـە سـەر بنچینەیەکی ڕەوانبێژی و لایەنەکانی ڕەوانبێژی دروست بـووە، هـەر ئـەم شـێوازە سروشتی مانەوەی زیاتری بە پەند بەخشیوە و لە دێری شیعری نزیك خستۆتەوە.

٢- ئاڕاستەی پەندەکان ڕۆڵیان لە چۆنیەتی دەربڕین و داڕشتنی پەندەکانـدا هەیـە بـەوەی بەشـداری لـە لایەنـە ئـەدەبی و ئەرکـە جوانناسـییەکەیدا دەکـەن و چێژێکی ئەدەبی بە پەندەکان دەبەخشن.

٣- ئەرکی سەرەکی پەندەکان هاوبەشیکردنە لە ڕێکخستنی کۆمـەڵگا، واتـە ئەرکی پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی ئامانجن لـە پەنـددا . دواتـر ئـەرکی جوانناسـی بەمەبەسـتی چەسـپاندن و بەخـشینی هێـزی جـوانی و مانـەوە بـە پەنـدەکان و خۆشەویست کردنیان لای کەسەکان سەرهەڵدەدات .

٤- چـڕی بـیرو شـەفافیەتی دەربـڕین لـە بەشـێکی زۆری پەندەکانـدا بـەدی دەکرێت، لە پاڵ بوونی ڕێژەیەکی دیاریکراو لە حیکمەت ، کە بۆتە پاڵپشتییەك بۆ پتەوی پەندەکە .

٥- کورتی ڕستەکانی پەندو ڕازاندنەوەو داڕشتنیان لە قاڵبێکی ئـەدەبی بۆتـە مایەی بەردەوامبوونی و هەروەها بەکارهێنانیان و ئاسانی مانـەوەیان لـە مێـشك و دەروونی ڕۆشنبیری مرۆڤایەتی .

٦- لای کورد پەندو فەلسەفە بەستراون بە یەکەوە و لەیەکتر جیا ناکرێنەوە، بەشێکی زۆری پەندەکان بوونەتـە ڕێبـازی ژیـانی کـوردو پـەیڕەوی ناوەڕۆکەکـەی دەکەن ، یا باوەڕێکی پتەویان بە پەندەکە هەیە و هێزێکـی شـاراوە هەیـە کـورد و پەند بە یەکەوە دەبەستێتەوە .

٧- لایەنەکانی ڕەوانبێژی یارمەتی گەیانـدنی نـاوەڕۆکی پەنـدەکانیان داوە ، لەپاڵ بەشـداریکردن لـە ئیـستاتیکای پەنـد و دەرخـستنی جوانییـەکانی پەنـد کـە خاڵێکی گرنگی زووگەیاندنی پەندەکەیە .

٨- چـێژ وەرگـرتن لـە پەنـد بـە هـۆی ئەرکـە جوانناسـییەکەیەتی و سوودوەرگرتنیش لە ئاکامی ئەرکە پەروەردەیی وکۆمەڵایەتی.

# سەرچاوەکان

## به زمانی کوردی


- ئیدریس عەبدولاّ، جوانکاری لە ئەدەبی کوردیدا، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣ .
- ئیسماعیل حەقی شاوەیس، قسەی پێشینان کۆستاولۆبۆن، گوتەی مەزنان و فلسفی، چاپخانەی ئەیتام، بەغدا ١٩٣٣.
- جەلال محمود عەلی، ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا، مگبعە حسام، بەغداد،١٩٨٢ .
- جەمال بابان، قسە هەزارە دووانی بەکارە، دەفتەری کوردەواری، بەرگی یەکەم، بەغدا، کانونی دووەم، ١٩٧٠ .
- جگەر سۆز پندرۆیی، ٢٠٠٠ پەند ژ جیهانیّ، سپیرێز، دهۆك، ٢٠٠٥ .
- حەمید گەردی، گولێك لە گولّستانی کوردستان، پەندی پێشینان، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر،٢٠٠٢ .
- حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، چاپخانەی ڕۆشنبیری، چ٢، هەولێر،٢٠٠٦.
- خالید جووتیار، دەشتی هەولێر — پەندو زاری شیرین، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر،٢٠٠٥.
- خورشید رەشید ، پەندی پێشینانی کوردی ، گ. (ڕۆشنبیری نویّ) ، ژ:٨٢,١٩٨٠.
- دلّسۆز حەمە، تیشکێك بۆسەر بزووتنەوەی ژنان لە کوردستان، گ. ڕێبازی نویّ، ژ(١)، ١٩٩٥ .
- دیدەوان یەعقوبی، ژن ناسی لە پەندی پێشیناندا، چاپخانەی چوارچرا، هەولێر، ٢٠٠٧ .
- ڕۆهات ئەلاکۆم، د فۆلکلوری کوردی دە، سەردەستەکیەکە ژنان، و: ئازاد عبدالعزیز مزیری، چ٢، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦ .
- ساجید ئاوارە ، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی ، سلێمانی، ١٩٦٧.
- سید عبدالحمید حیرت سجادی، پندپیشینان، جلد أول، انتشارات صلاح الدین ایوبی، چاپ أول، ١٣٦٩ .
- سید عبدالحمید حیرت سجادی، پند پیشینان، جلد دوم، چاپ أول، مرکز نشر وفرهنگ وأدبیات کردی، انتشارات صلاح الدین أیوبی، ١٣٧٨ .
- شوکری فەزلی، پەندی کوردی، و: ئازاد عبدالواحید، گ. (ڕۆشنبیری نویّ)، ژ (١١٢)، کانونی یەکەمی ١٩٨٦.

- شوکریه ڕەسول (د.)، پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردی، ناوەڕۆکی فیکری و ئەدەبی ، وەرگێڕانی (د . شوکریه و جەلال تەقی) لە ڕووسییەوە بۆ کوردی، ، ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان، هەولێر، ١٩٨٤.
- شوکریه ڕەسول (د.)، مێژووی کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردی و هەڵسەنگاندن ..، گ. کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی چوارەم، بەغدا، ١٩٧٦.
- شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان ،چ٢، بەغدا، ١٩٧١ .
- شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، چاپخانەی شڤان، ؟، ٢٠٠٧ .
- نەجم خالد ئەلوەنی، پەندو قسەی نەستەقی کوردی شاری خانەقین (لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری)، چ١، چاپخانەی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٨.
- عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی یەکەم ، ڕەوانکاری، ١٩٧٢ .
- عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی دووەم/جوانکاری، چاپخانەی شارەوانی، هەولێر، ١٩٧٥ .
- عەلائەدین سەجادی، مێژووی ئەدەبی کوردی، چ٢، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٧١ .
- عەلی شارەزووری، پەندی پێشینانی کورد، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی الحوادث، بەغداد، ١٩٨١.
- عثمان شارباژێڕی،گوڵشەن (هەزارو یەك پەند)، چاپخانەی شمال کەرکوك، ١٩٦٩.
- عومەر شێخ اللە دەشتەکی، پەندی کوردی، گ. (ڕۆشنبیری نوێ)، ژ (١١٠) ، حوزەیرانی ١٩٨٦.
- عومەر شێخ اللە، پەندی کوردی، دارالحریة للطباعة، بغداد، ١٩٨٠ .
- عیزەدین مستەفا ڕەسول (د.)، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چ٢، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، ١٩٧٩ .
- قەناتی کوردۆ (کوردۆیڤ) (پ.)،کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری کوردی، پێداچوونەوە / د . ئەوڕەحمانی حاجی مارف، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦ .
- کەریم شارەزا ، پەندی پێشینان لە شیعری کوردیدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦ .
- کەریم شارەزا، چۆن دژایەتی لە واتای وشەدا خۆی لە پەندی کوردیدا نواندووە، گ. ڕۆشنبیری نوێ، ژ (١١٦)، کانونی یەکەمی ١٩٨٧ .

- کـەریم شـارەزا، پەنـدی بـەراوردکاری (لـەنێوان ئینگلیـزی و عـارەبی و کـوردی)، چاپخانەی سمیرأمیس، بەغدا، ١٩٨٣.
- لـەتیف تـەها نێروەیـی، مەتـەڵ، گ. (کەلـەپووری کـورد)، ژ(١١)، بەشـی دووەم، ئەیلولی ١٩٩٧.
- مەعرووف جیاوك، هەزار بێژو بەند (هزار بی ژو بەنـد)، چـاپخانەی نجـاح، بەغـداد، ١٩٣٨ .
- مەلا محمودی دێرشەوی، مـشتاخا چـیا، ژ گـوتنێن پێـشییا، مطبعـة شـفیق، بغـداد، ١٩٨٠ .
- مەهاباد قەرەداغی، لە پێناوی ژیانەوەی ئافرەتدا، بەشی یەکەم، گ. ڕابوون، ژ(١٠ – ١١)، ١٩٩٤ .
- محەمـەدی مـەلا قـادر، پەندنامـەی ئـاوارە، (لـە وتـە بەنرخـەکانی بـاوو بـاپیران)، چاپخانەی خەبات، ١٩٨٥.
- نەزەند بەگی خانی ، چەند سەرنجێك دەربارەی کەسایەتی ژن و پیـاوەکی کـورد ، گ. (ڕابوون)، ژ:٩، ١٩٩٤ .
- هۆشیار نوری لەك،گوڵبژێرێك لە پەندی کوردی، چ١، چاپخانەی چوارچرا، هـەولێر، ٢٠٠٦.
- هۆشـیار نـوری لەك،گوڵبـژێرێك لـە پەنـدی کـوردی، بـەرگی یەکـەم و دووەم، چ٢، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠٠٩ .
- هەژار ، بۆ کوردستان ، چاپخانەی میساقی ، بیروت، ١٩٦٦ .
- هــەردەوێڵ کاکــەیی، داب و نــەریتی کــوردەواری (ناوچــەی گــەرمیان)، مطبعـة الحوادث، بغداد، ١٩٨٩ .
- هەردەوێڵ کاکەیی، پەندی پێـشینان، ئاسـۆی فۆلکلـۆر، ژ (٢٣)، بەشـی پێنجـەم، ٢٠٠٦ .
- هیـوا عومـەر ئەحمـەد، پەنـدی پێـشینانی کـوردی، گ. بـەیان، ژ (٥٩)، شـوباتی ١٩٨٠.
- یاسین حەسەن گۆران، پەندی پێشینان و بەسەرهاتی کوردی، چ١، هەولێر، ٢٠٠٦.

**نامەی ئەکادیمی**

– حـەیات سـەعید عبـدالکریم ، نۆڤلێـت لـە ئـەدەبی کوردیـدا (١٩٧٠ – ٢٠٠٠) نامـەی ماستەر پێشکەشی کۆلێژی پەروەردەی زانستەکان ، زانکۆی سەلاحەدین کراوە ، ٢٠٠٥.

**بە زمانی عەرەبی**


- القرآن الكريم .
- ابي الفضل احمد بن محمد بن ابراهيم الميداني، مجمع الامثال، تحقيق/ محمد ابو الفضل ابراهيم، ج١، ط٢، دار الجيل، بيروت، ١٩٨٧ .
- بدرخان عبدالله السندي (د.)، جمعها وعلق عليها، الحكمة الكردية، جمهرة من الامثال و الحكم الكوردية، دار الثقافة والنشر الكردية، بغداد، ١٩٨٩ .
- سامية علي حسنين (د.)، صورة المرأة في المثل الشعبي ، ط١ ، دار الوفاء الدنيا للطباعة والنشر ، الأسكندرية ، مصر، ٢٠٠٦ .
- علي الجزيري (د.) ، الأدب الشفاهي الكردي ، ط٢، مطبعة أوفسيت هەولێر، ٢٠٠٠ .
- لطفي الخوري ، في علم التراث الشعبي ، الموسوعة الصغيرة (٤٠) ، بغداد، ١٩٨١.
- مجيد حميد عارف (د.)، الاثنولوجيا والفولكلور، مطابع التعليم العالي، بغداد، ١٩٩٩٠ .
- محمد جابر الفياض (د.) ، الأمثال في القرآن الكريم ، ط١ ، دار الشؤون الثقافة العامة ، بغداد، ١٩٨٨.
- مطيع المرابط، امثال دمشق الشعبية، (من الفلكلور الشعبي)، منشورات وزارة الثقافة، دمشق، ١٩٩٥.
- ممدوح حقي (د.) ، المثل المقارن بين العربية والإنكليزية ، بيروت، ١٩٧٣ .
- نبيل عبدالحميد (د.) ، مدخل لدراسة تأريخ الفلسفة اليونانية ، ط١ ، مركز أكد للطباعة أربيل .
- نبيلة ابراهيم (د.)، ا(بلا)، أشكال التعبير في الادب الشعبي، دار نهضة مصر، القاهرة .
- وليد ناصيف، طه عبدالرؤوف، الموسوعة الذهبية لامثال الدنيا، ج١، (الامثال الشعبية المصرية)، دار الكتاب العربي، دمشق – القاهرة، ط١، ٢٠٠٩.
- ياسر خالد سلامة، موسوعة الامثال الشعبية، ط١، دار صفاء للنشر والتوزيع ، عمان، ٢٠٠٣ .


**المجلات**


- صفاء الخلوصي (د.)، الامثال كمصدر لدراسة الفولكلور، مجلة التراث الشعبي، ع (٧)، السنة الاولى، ١٩٦٤.
- عامر رشيد، الامثال الشعبية الفلسطينية والعراقية، مجلة التراث الشعبي، ع (٩)، السنة الثامنة، ١٩٧٧ .

## پەراوێزەكان

(١) عوسمان شارباژێڕی، گوڵشەن، هەزارو یەك پەند، چاپخانەی شمال، كەركوك، ١٩٦٩، ل٣٤.

(٢) د. مجيد حميد عارف، الاثنولوجيا والفولكلور، مطابع التعليم العالي، بغداد، ١٩٩٠، ص ٢٨٠.

(٣) علي الجزيري ، الأدب الشفاهي الكردي ، ط٢ ، مطبعة أوفسيت هەولێر ، ٢٠٠٠ ، ص٣٧ .

(٤) د. عیزەدین مستەفا ڕەسول، لێكۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی، ل١٠٧ .

(٥) جەمال بابان: قسە هەزارە دووانی بەكارە، دەفتەری كوردەواری، بەرگی یەكەم، كانونی دووەمی ١٩٧٠، بەغدا، ل٧٠.

(٦) بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە: د.شوكریە ڕەسول و جەلال تەقی: پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی كوردی، ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان، ١٩٨٤، هەولێر، ل٩. د. شوكریە ڕەسول بە پشت بەستن بە دوو سەرچاوەی ڕووسی لە بارەی پەند و قسەی نەستەق هەوڵی داوە جیاوازی نێوان ئەم دووانە دەربخات، بەڵام هەر لە بارەی پەند دژیەكییەك لە نێوان پێناسەكاندا هەیە ئەمە لە لایەك و لەلایەكی ترەوە ئاماژەی بەو دژایەتی و تێكەڵییە نەكردووە كە لە دوو سەرچاوەكەدا هاتوون، بۆ ئەم مەبەستە د.عیزەدین مستەفا ڕەسول لە كتێبی (لێكۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلكلۆری كوردی) چاپی دووەم، ١٩٧٩، ل١٠٣–١٠٤ دەڵێ (پەندی پێشینان لە ناوەڕۆكدا لە قسەی نەستەقەوە نزیكە، بەڵام هیچیان ناتوانن جێگەی ئەوی تریان بگرنەوە) چونكە هەریەكەیان سیما و تایبەتمەندی خۆی هەیە، دەتوانرێت سنووری نێوانیان دیاری بكرێت. هەروەها بڕوانە: كەریم شارەزا: پەندی بەراوردكاری (لە نێوان ئینگلیزی و عەرەبی و كوردی)، چاپخانەی سمیرامیس، بەغدا، ١٩٨٣، ل٩–١٠.د.شوكریە ڕەسول لای وایە (پەندی پێشینان یەكسەر بیرو واتاكە ڕوون ئەكاتەوە و بە جوانی لە پەندەكە ئەگەین، بەڵام لە قسەی نەستەقدا وانییە، بیرەكە نایەت بەدەستەوە، جاری واهەیە وەك خوازەیە یان وەك دركەیە، هەندێ جاریش چوواندنە، واتا قسەی نەستەق مانای ڕۆشن نییە و لە قسەكەدا دەرناكەوێت. بۆ نموونە: (گلۆڵەی كەوتە لێژی). بڕوانە: پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی كوردی...، گ/كۆڕی زانیاری كورد، بەرگی چوارەم، ١٩٧٦، ل١٥٦. ئەمە لای عومەر شێخ الله دەبێتە مایەی كە (پەند گوتەیەكی ڕێك و ڕەوانی هونەری گشتییە یان تاكە وشەیەكی لێكدراوە شوێنی پەندێك یان قسەیەكی نەستەقی تەواو دەگرێتەوە) بڕوانە: پەندی كوردی، ل٦. واتە وەكو یەكی داناون و جیاوازی نەخستۆتە نێوانیان. لە كاتێكدا هێشتا سنووری نێوان پەند و قسەی نەستەقی كا و پێویستی بە وردبینی و لێكۆڵینەوەی سەربەخۆی تایبەت هەیە. تەنیا

(نەجم خالد ئەلوەنی) لە کتێبی (پەند و قسەی نەستەقی کوردی شاری خانەقین)، ل٦٢-٦٨ هەوڵی داوە. بە هێنانەوەی قسەو ڕا و بۆچونی گەلێ نووسەری کورد و عەرەب و بێگانە ئەم مەسەلەیە یەکلا بکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا لای ئەویش سنوورەکە ڕوون و ئاشکرا نییە.

(٧) نەجم خالید ئەلوەنی: پەند و قسەی نەستەقی کوردی شاری خانەقین (لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری)،چ١،چاپخانەی موکریانی، هەولێر،٢٠٠٨، ل٣٢.

* نەجم خالید لەو سەرچاوەیەی سەرەوە، هەمان لاپەڕە ئاماژەی بەوە داوە کە ئەگەر وتمان پەندی پێشینان واتە ئەم پەندانە تەنیا مۆرکی ڕابردووی پێوە دەلکێت و هیچ بوونێکی کاتی ئێستا و داهاتووی پێوە نامێنێت. ئەم بۆچوونەی نووسەر ڕەت کەینەوە، چونکە یەکێ لە خەسڵەتەکانی خودی پەند ئەوەیە کە پابەند نییە بە کات. گەر پابەند بوایە بەکات، توانای مانەوە و بەردەوامی نەدەبوو و لە شوێن و کاتی خۆیدا دەپووکایەوە، تەنانەت نەدەتوانرا لەسەر بناغەی پەندە کۆنەکان پەندی تازە دروست بکرێت.

(٨) ولید ناصیف، طه عبدالرؤوف: الموسوعة الذهبیة لأمثال الدنیا، ج١، الامثال الشعبیة المصریة، ط٢، دارالکتاب العربي، دمشق، القاهرة، ٢٠٠٩، ص٩

(٩) هەمان سەرچاوە، ل١١.

* بۆ نموونە ((لو أنزلنا هذا القرآن علی جبل لرأیته خاشعاً متصدعاً من خشیة الله وتلك الأمثال نضربها للناس لعلهم یتفکرون )) سورەتی الحشر ، ئایەتی(٢١). هەروەها (ذلك مثلهم في التوراة ومثلهم في الإنجیل )، سورەتی الفتح، ئایەتی (٢٩). یا( ضرب الله مثلاً عبداً مملوکاً )) سورەتی النحل، ئایەتی (٧٥). چەندین نموونەی تریش.

(١٠) د.ممدوح حقي: المثل المقارن بین العربیة و الانگلیزیة، بیروت، ١٩٧٣، ص١٨-١٩.

(١١) حەیات سەعید عەبدولکەریم: نۆڤلێت لە ئەدەبی کوردیدا (١٩٧٠-٢٠٠٠)، نامەی ماستەر پێشکەشی کۆلێژی پەروەردەی زانستەکان، زانکۆی سەلاحەدین کراوە، ٢٠٠٥، ل٢٧.

(١٢) خورشید ڕەشید: پەندی پێشینانی کوردی، گ. ڕۆشنبیری نوێ، ژ٨٢، ١٩٨٠، ل٢٣.

* بەڵام کێش و قافیە بۆ شیعر بەکاردێت، دەبوایە ئاماژە بە سەرواداری پەند بکات. کە چێژێکی ئەدەبییانە و جوانییەکی هونەری پێ بەخشیون.

(١٣) عەلی شارەزووری: پەندی پێشینانی کورد، بەرگی یەکەم، چ١، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٨١، ل٦٥.

(١٤) د.نبیلة ابراهیم: اشکال التعبیر في الادب الشعبي، دار النهضة، مصر، القاهرة، ص١٤٠.

(١٥) لطفی الخوري: في علم التراث الشعبي، الموسوعة الصغیرة (٤٠)، ص١٠٩. هەروەها بڕوانە: الکزاندر هجرتی کراب: علم الفلکلور، ت: رشدی صالح، ص٢٣٤.

(١٦) سەرچاوەی پێشوو.

(١٧) الكزاندر هجرتى كراب: علم الفلكلور، ص٢٣٥

(١٨) د.نبيلة ابراهيم: اشكال التعبير في الادب الشعبي، ص١٤٣ – ١٤٤ .

(١٩) سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٤.

(٢٠) د.نبيلة ابراهيم: اشكال التعبير في الادب الشعبي، ص١٤٣–١٤٤.

(٢١) عەلائەدین سەجادی: مێژووی ئەدەبی کوردی، چ٢، چاپخانەی مەعاریف، بەغدا، ١٩٧١، ل١٢٦.

(٢٢) خورشید ڕەشید: پەندی پێشینانی کوردی، گ. ڕۆشنبیری نوێ، ژ٨٢، ١٩٨٠، ل٢٣.

(٢٣) شێخ محمدی خاڵ: پەندی پێشینان، ل٨.

* ئەم پێناسەیە لەلایەن شێخ محمدی خاڵ لە سەرەتای چاپی یەکەمی پەندی پێشینان لە ١٩٥٧/٩/٩ لە سلێمانی نووسراوە، دانراوە، کەچی (حەمید گەردی) لە (سامان و پەندی گەردی)، چ٢، ٢٠٠٦، ل١٢، هەمان وەسفی داوەتە پاڵ پەندی پێشینان بەبێ ئەوەی ئاماژە بۆ پێناسەکەی شێخ محمدی خاڵ بکات.

(٢٤) عومەر شێخ الله: پەندی کوردی، ل٧.

(٢٥) جەلال مەحمود عەلی: ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا، مطبعة حسام، بەغدا، ١٩٨٢، ل٢٥.

(٢٦) سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦.

(٢٧) ابى الفضل احمد بن محمد بن ابراهيم الميداني: مجمع الامثال، تحقيق/محمد ابوالفضل ابراهيم، ج١، دارالجيل، بيروت، ط٢، ١٩٨٧، ص٨.

(٢٨) د . بدرخان عبدالله السندي، الحكمة الكردية ( جمهرة من الأمثال و الحكم الكردية) ، دار الثقافة و النشر الكردية، بغداد، ١٩٨٩، ص٥.

(٢٩) هیوا عمر ئەحمەد، پەندی پێشینانی کوردی، گۆڤاری بەیان، ژمارە ٥٩ ، شوباتی ١٩٨٠ ، ل٦٧ .، (ساجید ئاوارەش) پەندەکانی لە ڕووی ڕوخسارەوە کردۆتە سێ بەش : (١. ڕستە یا کورت بڕن ، ٢. چەند دێرە هۆنراوەن ، ٣. لە چەشنی پرسیاردان ) بڕوانە : ساجید ئاوارە ، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی ، سلێمانی ، ١٩٦٧ ، بەڵام ئەم دابەشکردنە زۆر هەڕەمەکییە و لەسەر بناغەی پێکهاتەی خودی پەندەکان دانەنراوە ، چونکە خاڵی یەکەم و دووەم بەرهەمی یەکترین ، لەبەر ئەوەی دێری هۆنراوە کورتبڕی تێدایە ، لەکاتێکدا ئەو مەبەستی لە ڕستە، ڕستەی پەخشانین.

(٣٠) د. نبيل عبدالحميد، مدخل لدراسة تاريخ الفلسفة اليونانية، ط١ ، مركز أكد للطباعة، اربيل ٢٠٠٨، ص٤٨ .

(٣١) سەرچاوەی پێشوو، ل٤٩ .

* بـۆ نموونـە عەلائـەدین سـەجادی لـە ( مێـژووی ئـەدەبی کـوردی)دا و لەبابـەتی ( کـورد و فەلسەفە) ل١٣٣ ئاماژە بەوە دەکات، کە ( ئەو قسەو فکرانەی کـە کـوردە دەشـتەکییەکە کردوونـی خـاڵی نـەبوون لـە فەلـسەفە) ، پەنـدی پێـشینان بەشـێکی گرنگـی ئـەو قـسەو فیکرانەیە و ڕێژەیەك لە حیکمەت لە بەشێ لە پەندەکاندا بەدی دەکرێت .

(٣٢) شێخ محمدی خاڵ، پەندی پێشینان، چاپی چوارەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٧ ، ل٨ .

(٣٣) جمال بابان، قسە هەزارە دووانی بەکارە، دەفتەری کوردەواری، بـەرگی یەکـەم، کـانونی دووەم، بەغدا، ١٩٧٠ ، ل٦٥ .

(٣٤) علي الجزيري، الأدب الشفاهي الكوردي ، ط٢ ، ص٩٧ . نووسەر لای وایە وەك چۆن شیعر بۆتە دیوان و ناسنامەی عەرەب ، پەندو حیکمەتیش دیوان و ناسنامەی کوردن .

(٣٥) محەمەدی مەلا قادر: پەندنامەی ئاوارە، ل٢٠١. واتە گرنگ نییە کچی کـێم، لـەوە گـرنگتر ئەوەیە کە هاوسەرەکەم چاکە.

(٣٦) هەمان سەرچاوە، ل٤٢.

(٣٧) عەلی مەعرووف شارەزووری: پەندی پێشینانی کورد، ل٨٥.

(٣٨) هەمان سەرچاوە، ل٥٦.

(٣٩) سيد عبدالحميد حيرت سجادی: پند پيشينان، جلد دوم، ل٣٣٧.

(٤٠) هەمان سەرچاوە.

(٤١) خالید جووتیار: دەشتی هەولێر، ل٣٧.

(٤٢) سيد عبدالحميد حيرت سجادی ، پند پيشينان ، جلد أول ، ١١٧ .

(٤٣) خالید جوتیار: دەشتی هەولێر، ل٤٦.

(٤٤) عومەر شێخ اللە: پەندی کوردی، ل١٥٣.

(٤٥) ئیسماعیل حەقی شاویس: قسەی پێشینان...، ل٢٤.

(٤٦) خالید جووتیار: دەشتی هەولێر، ل٣٩.

(٤٧) سيد عبدالحميد حيرت سجادی: پند پيشينان، جلد دوم، ل٥٩٩. باوەگوڕگوڕ چـاکێکە لـە هەمەدان.

(٤٨) شێخ محمدی خاڵ: پەندی پێشینان، چ٤، ل١١٩.

(٤٩) ئیسماعیل حەقی شاویس: قسەی پێشینان...، ل٤.

(٥٠) حەمید گەردی: سامان و پەندی...، ل٨٦.

(٥١) عومەر شێخ اللە: پەندی کوردی، ل١١٧.

(٥٢) سيد عبدالحميد حيرت سجادی: پند پيشينان، جلد دوم، ل٧٢.

(٥٣) محەمەدی مەلا قادر: پەندنامەی ئاوارە...، ل١٨.
(٥٤) مەعرووف جیاوك: هەزار بێژو بەند، ل٣٨.
(٥٥) هەمان سەرچاوە، ل٤٨.
(٥٦) شێخ محمدی خاڵ: پەندی پێشینان، چ٤، ل٢٣٥.
(٥٧) خالید جووتیار: دەشتی هەولێر، ل٣٨.
(٥٨) هەمان سەرچاوە، ل٦٣.
(٥٩) حەمیدگەردی: سامان و پەندی...، ل١٠١.
(٦٠) هەمان سەرچاوە، ل٢٥٠.
(٦١) خالید جووتیار: دەشتی هەولێر، ل٣٤.
(٦٢) شێخ محمدی خاڵ: پەندی پێشینان، چ٤، ل١٠١.
(٦٣) هەمان سەرچاوە، ل٧٦.
(٦٤) حەمیدگەردی: سامان و پەندی...، ل٢١٤.
(٦٥) ئیسماعیل حەقی شاویس: قسەی پێشینان...، ل٢٤.
(٦٦) حەمیدگەردی: سامان و پەندی...، ل٢١٤.
(٦٧) محەمەدی مەلا قادر: پەندنامەی ئاوارە، ل٢٧١.
(٦٨) هەمان سەرچاوە، ل٢٧٧. هەروەها دەوترێت (بوویتە ماری ژنان کوشتی) بڕوانە: حەمیدگەردی: گوڵێك لە...،ل٤١ وێنەکە نزیکترە چونکە (وەك) لابردراوە.
(٦٩) سیدعبدالحمید حیرت سجادی: پند پیشینان، جلد اول، ل٣٠٤.
(٧٠) هەمان سەرچاوە.
(٧١) حەمیدگەردی: گوڵێك لە...،ل١٢٥. عەرەب دەڵێن:(الولد اذا لم يبك لاترضعه امه) بڕوانە: مطيع المرابط: امثال دمشق الشعبية، ص٢٣٠.
(٧٢) شێخ محەمەدی خاڵ: پەندی پێشینان، چ٤، ل١٤. چیرۆکی ئەم پەندە لە پەراوێزی ژمارە (١٠)ی هەمان لاپەڕەدایە.
(٧٣) دێدەوان یەعقوبی: ژن ناسی...، ل٨. عەرەب دەڵێن: (القرعى تتباهى بضفائر بنت اختها) بڕوانە: مطيع المرابط: امثال دمشق الشعبية، ص٢٣. فەلەستینی (تباهت القرعا بشعر بنت خالتها) عێراقی دەڵێن (تتباهى الگرعة بشعر بنت خالتها) بڕوانە: عامر رشيد: الامثال الشعبية ، التراث الشعبي، ع(٩)، ص١٨٥.
(٧٤) شێخ محەمەدی خاڵ: پەندی پێشینان، چ٤، ل٢٣٧.
(٧٥) شوکری فەزڵی: پەندی کوردی، ڕۆشنبیری نوێ، ژ(١١٢)، ل٣٠١. عەرەب دەڵێن (هوى ناقتي و قدامي الهوى واني واياهما لمختلفان) هەمان سەرچاوە.

(٧٦) ڕێبوار جەمال: پەندی پێشینان...،ل ٥١
(٧٧) هۆشیار نوری لەك: گوڵبژێرێك...، ل١٠١.
(٧٨) سید عبدالحمید حیرت سجادی: پند پیشینان، جلد اول، ل٣٠٢.
(٧٩) عەلی مەعرووف شارەزووری: پەندی پێشینانی کورد، ب١، ل٨٠.
(٨٠) لەتیف تەها نێروەیی: مەتەڵ، گ. (کەلەپووری کورد) ژ(١١)، ١٩٩٧، ل٧٢.
(٨١) سید عبدالحمید حیرت سجادی: پند پیشینان، جلد دوم ، ل٥٩٥.
(٨٢) عەلی مەعرووف شارەزووری: پەندی پێشینانی کورد، ب١، ل٥٩.
(٨٣) هۆشیار نوری لەك: گوڵبژێرێك لە...،چ٢، ل٩٨.
(٨٤) دێدەوان یەعقوبی: ژن ناسی، ل١٠.
(٨٥) هۆشیار نوری لەك: گوڵبژێرێك...، ل٣٦.
(٨٦) شێخ محەمەدی خاڵ: پەندی پێشینان، چ٤، ل٤٥١.
(٨٧) حەمید گەردی: سامان و پەندی گەردی، ل٨٩.
(٨٨) هەمان سەرچاوە، ل١٨٦.
(٨٩) د. صفاء خلوصي، الامثال کمصدر لدراسة الفولکلور، ص٥ .
(٩٠) د. مجید حمید عارف، الاثنولوجیا و الفولکلور، ص٢٧٩ .
(٩١) د. شوکریە ڕەسول، مێژووی کۆکردنەوەو..........، گ. (کۆڕی زانیاری کورد)، ب٤، ١٩٧٦، ل١٥٧ .
(٩٢) عەلی شارەزووری، پەندی پێشینانی کورد، ل٨٠ . عەرەبەکان دەڵێن : ( تحدثني عن بطن امي وقد مکثت فیە تسعة اشهر) . بڕوانە : یاسر خالد سلامة، موسوعة الامثال الشعبیة، ص١٥٧ . ئەمە بۆ ئەوە بەکاردەهێنرێت کە بیەوێ شتێکت فێربکات، یا هەواڵێکت پێ بگەینی، لە کاتێکدا تۆ زانیاریت زیاتر بێ لەو و شارەزاتر بیت .
(٩٣) سید عبدالحمید حیرت سجادی، پند پیشینان، جلد اول، ل٦٢ .
(٩٤)سید عبدالحمید حیرت سجادی، پند پیشینان، جلد اول، ل٢٦ .
(٩٥) هەمان سەرچاوە، ل٩٨
(٩٦) سید عبدالحمید حیرت سجادی، پند پشینان، جلد دوم، ل٤٤٦ .
(٩٧) محەمەدی مەلا قادر، پەند نامەی ئاوارە، ............، ل٤٦ .
(٩٨) هەمان سەرچاوە، ل١٧٦ . عەرەبیش لایان وایە (لبن الام ما یتعوضش ) . بڕوانە : ولید ناصیف، الموسوعة الذهبیة، ص٣٠٩ . چونکە سەرچاوەیەکی بەپیت و بەسوودە بۆ منداڵ و زیاتر بەدایکی دەبەستێتەوە .
(٩٩) سید عبدالحمید حیرت سجادی، پند پیشنان، جلد أول، ل٢١٩ .

(١٠٠) ڕۆهات ئەلاکۆم، دفۆلکلۆریَ کوردی دە، ..............، ل٦٣ .

(١٠١) سید عبدالحمید حیرت سجادی، پند پیشنان، جلد دوم، ل٤٠٢ .

(١٠٢) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل٧٤ . یا بەشێوازی پرسیار دەوترێت (پیاو هەیە لە ژن ئاوسە ؟ ) . بڕوانە : دیدەوان یەعقوبی، ژن ناسی ........، ل١١ . لێرەدا زیاتر جەخت لەسەر هەبوونی ئەم جۆرە کراوەتەوە .

(١٠٣) هەمان سەرچاوە، ل١١٦ . بۆیە دەڵێن (کەس بەشەیتانی نەوێرا، ژن نەبێ) . بڕوانە : عومەر شێخ الله، پەندی کوردی ..........، ل١٥٥ .

(١٠٤) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل١٣٧ .

(١٠٥) هەمان سەرچاوە ، ل١٩١ .

(١٠٦) مەلا مەحموودی دێرشەوی، مشتاخا چیا، ل٦٥ .

(١٠٧) کاروان عوسمان، پەندە باوەکان، ل٧٥ .

(١٠٨) محەمەدی مەلا قادر، پەند نامەی ئاوارە، .........، ل١٦٤ .

(١٠٩) هەمان سەرچاوە، ل١٦٦ .

(١١٠) ئیسماعیل حەقی شاوەیس، قسەی پێشینان، ...............، ل٣٤ .

(١١١) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل٢٣٧ .

(١١٢) مەعرووف جیاوك، هەزار بێژو پەند، ل٢١ .

(١١٣) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل٢٣٦. یا دەڵێن (ژنت بەدەست خەڵقەوە بێ، ماڵت بەدەست خەڵقەوە نەبێ). هەمان سەرچاوە .

(١١٤) ڕۆهات ئەلاکۆم، ڕەوشا ژنان، ئاسۆی فۆلکلۆر (٢٣)، ل١٧ .

(١١٥) ، هەمان سەرچاوە، ل١٨ .

(١١٦) هەمان سەرچاوە، ل١٨ .

(١١٧) ڕۆهات ئەلاکۆم، ڕەوشا ژنان، ئاسۆی فۆلکلۆر (٢٣)، ل٢٠ .

(١١٨) هەمان سەرچاوە، ل٢٠ .

(١١٩) عومەر شێخ الله، پەندی کوردی، ل١٢٣ .

(١٢٠) هەمان سەرچاوە، ل١٢٥ . ئینگلیز دەڵێن (چاکترین سامان بۆ پیاو ژنی چاك و تەندروستییە) . بڕوانە : عوسمان شارباژێڕی، گولشەن ..........، ل٦٦ . لای کورد تەنیا ژنی باشە .

(١٢١) هەمان سەرچاوە، ل١٣٨ .

(١٢٢) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل٢٥٧ .

(١٢٣) دیدەوان یەعقوبی، ژن ناسی ..........، ل٢٠ .

(١٢٤) هەمان سەرچاوە، ل٢٢ .

(١٢٥) هەمان سەرچاوە، ل١٨ .

(١٢٦) ئیسماعیل حەقی شاوەیس، قسەی پێشینان و ........، ل٢٠ .

(١٢٧) هۆشیار نوری لەك، گوڵبژێرێك لە ...، چ٢، ل٥٢ . بەم شێوەیەش هەیە (لەیەکیان پرسی خەڵکی کوێی، وتی هێشتا ژنم نەهێناوە) . بڕوانە : محەمەدی مەلاقادر، پەند نامەی ئاوارە ..........، ل٢٣٩ .

(١٢٨) دڵسۆز حەمە، تیشکێك بۆسەر بزووتنەوەی ژنان لە کوردستان، گ: ڕێبازی نوێ، ژ(٨)، ١٩٩٥، ل٩٩ .

(١٢٩) سید عبدالحمید حیرت سجادی، پند پیشنان، جلد أول، ل٣٠٣ .

(١٣٠) حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی ............، ل١٤٧ .

(١٣١) محەمەدی مەلاقادر، پەندنامەی ...............، ل٤٧ .

(١٣٢) حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی ............، ل١١٨ .

(١٣٣) نەجم خالد ئەڵوەنی، پەندو قسەی نەستەق ...................، ل٧٢ . نووسەر ئاماژەی بەوە کردووە کە لەسەر زاری خەڵکی وەری گرتووە .

(١٣٤) نەزەند بەگی خانی، چەند سەرنجێك دەربارەی کەسایەتی ژن و پیاوی کورد، گ. (ڕابوون)، ژ(٩)، ١٩٩٤، ل٨٧ .

(١٣٥) نەجم خالد ئەڵوەنی، پەندو قسەی ...........، ل٧٤ .

(١٣٦) نەزەند بەگی خانی، چەند سەرنجێك.............، ل٨٧ .

(١٣٧) حەمید گەردی، گوڵێك لە ........، ل٦٢ .

(١٣٨) هەمان سەرچاوە، ل٦٢ .

(١٣٩) هەمان سەرچاوە، ل١٤٧ .

(١٤٠) عومەر شێخ الله، پەندی کوردی، ل١٣٦ .

(١٤١) محەمەدی مەلاقادر، پەند نامەی ئاوارە، ..............، ل٢٤١ .

(١٤٢) سید عبدالحمید حیرت سجادی، پندپیشینان، جلد دوم، ل٣٢٧ .

(١٤٣) دیدەوان یەعقوبی، ژن ناسی .......، ل٦ .

(١٤٤) هەمان سەرچاوە .

(١٤٥) هەمان سەرچاوە، ل٧ .

(١٤٦) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل١٧٦ .

(١٤٧) هەمان سەرچاوە .

(١٤٨) سید عبدالحمید حیرت سجادی، پندپیشینان، جلد دوم، ل٤٠٢ .

(١٤٩) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل٢٣٩ .

(١٥٠) کاروان عوسمان، پەندە باوەکان، ل٦٠ . یا دەوترێ (وتە بۆ ئافرەت و کردەوە بۆ پیاو). بڕوانە : عوسمان شارباژێری، گوڵشەن ............، ل٦١ . یا یابانی دەڵێن : (شیری ئافرەت زمانیەتی، بۆیە ناهێڵێ ژەنگ بهێنێ) . هەمان سەرچاوە، ل٩٩ . یا ئەڵمانی دەڵێن : (درک تیژە، زمانی ئافرەت تیژترە) . هەمان سەرچاوە، ل٤٧ .

(١٥١) سید عبدالحمید حیرت سجادی، پندپیشینان، جلد أول، ل٣٠٣ .

(١٥٢) محەمەدی مەلاقادر، پەند نامەی ئاوارە، ....، ل٧٠ . لە کرمانجی سەرووشدا هەیە (بویك ب دلی زاڤێیە) . بڕوانە : مشتاخا چیا، ل٤٨ .

(١٥٣) هەمان سەرچاوە، ل٣٤ . لە ئاکامی سەرلێشێواندن و جیاکردنەوەی شتەکان دەوترێت (بووکی لە پەردەدا لێ بووە بە نێر) . بڕوانە : ڕێبوار جەمال، پەندی پێشینانی پشدەر، ل٦٩ .

(١٥٤) نەزەند بەگی خانی، چەند سەرنجێك....، ڕابوون(٩)، ل٨٥ . من لەگەڵ بیرو ڕای (نەزەند بەگی خانی) نیم کە لای وایە (کەسایەتی ژن ناچارناکرێ بکەوێتە ناو دژایەتیکردن لەگەڵ سروشتی خۆی و مەرجی کەسایەتی دەستکردی بەسەردا ناسەپێندرێت) . هەریەکێ لەو خاڵانەی ناچاری دەکات کەسایەتی خودی پیاو خۆیەتی کە شتی بەسەر چەسپێنراوە هەر ئەوە دەبێتە کاردانەوەیەك بۆئەوەی ژن ناچاربکات ئەمیش وابێت . سەرباری هەموو ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی کۆمەڵگا بۆ مێ هەر لەسەرەتای فامکردنییەوە (زۆر پی مەکەنە، مەڕۆ، ئاقڵ بە، وامەکە............هتد) . لەگەڵ بیروڕاکەی (مەهاباد قەرەداغی)یم کە لە نووسینی (لە پێناوی ژیانەوەی ئافرەت)دا دەڵێ : (ئافرەت بە سیفەتی ژنێتییەوە لە دایك نابێ، بەڵکو لە یەکەم ساتیەوە بەو پەروەردەو ڕەفتارەی لەگەڵیدا دەکرێ چۆن سیفەتی ژنێتی هەڵگرێ . هەروەکو چۆن واش لە کوڕێك دەکرێ و فێردەکرێ سیفەتی پیاوێك هەڵگرێ) .

* ئەم نووسینە لە گۆڤاری ڕابوون، ژ(١٠-١١)، ١٩٩٤، ل٨٣- ٩٧ ، بلاوکراوەتەوە، ئەم پەڕەگرافە لە (ل٨٦)دایە .

(١٥٥) محەمەدی مەلاقادر، پەند نامەی ئاوارە ......، ل٨٩ .

(١٥٦) مەلا محمودی دێرشەوی، مشتاخا چیا ، ل١١٩ .

(١٥٧) هەمان سەرچاوە، ل٢٣٠ . عەرەبەکان پێچەوانەی ئەم پەندە دەڵێن : (القرج خاتونة المحلة) . بڕوانە : نبهیة أحمد الزبیدي، الامثال الشعبیة و ....، التراث الشعبي، ع(٢)، ١٩٧١، ص١٤ . ئەمە بە تەوسەوە بە کەسێك دەڵێن کە شایەنی ئەو پلەو پایەو ڕێزە نەبێت کە تێیدایە .

(١٥٨) سید عبدالحمید حیرت سجادی، پندپیشینان، جلد أول، ل٤٨ . هاوچەمکی ئەم پەندەش هەیە دەوترێت (هیچ کەس دوو دەفعە نایەتە دنیا) . بڕوانە : سید عبد الحمید حیرت سجادی، پندپیشینان، جلد دوم، ل٥٩٥ .

(١٥٩) هەمان سەرچاوە، ل١٤١ . یا دەوترێت (پیر مەنێرە بۆ کەر سەندن، جوان مەنێرە بۆ ژن پەسەنکردن) . بڕوانە : هەمان سەرچاوە، ل١٣٢ . چونکە ئەمیان هێزی باش هەڵسەنگاندنی نییەو ئەوی تریشیان ئەزموونی نییە، کارەکە سەرکەوتوو نابێت .

(١٦٠) هەمان سەرچاوە، ل٢١٦ . چونکە (شەڕی مێردو ژنان هەتا مار نوستنان) . بڕوانە : عومەر شێخ الله، پەندی کوردی، ل١٥٠ .

(١٦١) هەمان سەرچاوە، ل٢١٦ .

(١٦٢) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل١٤٦ .

(١٦٣) سید عبدالحمید حیرت سجادی، پندپیشینان، جلد دوم، ل٤٤١ . یا دەڵێن : (پاش نۆ بچووکان، دەڕوا وەکی بووکان) . بڕوانە : عومەر شێخ الله، پەندی کوردی، ل١٢٩ .

(١٦٤) محەمەدی مەلاقادر، پەند نامەی ئاوارە، ل٢٥٨ .

(١٦٥) هەمان سەرچاوە، ل٣٠ .

(١٦٦) محەمەدی مەلاقادر، پەند نامەی ئاوارە، ل٤٦ .

(١٦٧) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل٩٧ .

(١٦٨) ڕۆهات ئالاکۆم، ڕەوشا ژنان، ئاسۆی فۆلکلۆر، ژ(٢٣)، ل١٧ .

(١٦٩) د. محمد جابر الفیاض، الامثال في القرآن الکریم، ط١، دار الشؤون الثقافة العامة، بغداد، ١٩٨٨، ص٨٧ .

(١٧٠) د. صفاء خلوصي، الامثال کمصدر لدراسة الفولکلور، مجلة التراث الشعبي، ع (٧)، السنة الاولى، ١٩٦٤، ص٤ .

* شوکری فەزلی دەڵێ : (زمانی ئەو پەندانە، زمانی میللەتی کوردە، کە ڕۆژانی ژیانیان لە دڵی وڵاتی کورد دەپێچنەوە، تاکو زمانەکەیان لە زمانی تورك و عەجەم دوور بێت) . بڕوانە : شوکری فەزلی، پەندی کوردی، ڕۆشنبیری نوێ، ژ(١١٢)، ل٣٠١ .

(١٧١) د. عزەدین مستەفا ڕەسول، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی، چ٢، ل١٠٩ .

(١٧٢) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، چ٢، ل٤٣ .

(١٧٣) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل٦٥ .

(١٧٤) عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی یەکەم، ڕەوانکاری، ل٢٢-٢٣ .

(١٧٥) عومەر شێخ الله، پەندی کوردی، ل١٦٥ .

(١٧٦) قەناتی کوردۆ، کۆمەڵە تێکستی کوردی......، ل٢٣٢ .

(١٧٧) مەلا مەحمودی دێرشەوی، مشتاخا چیا، ......، ل١٩٢ .
(١٧٨) مەلا مەحمودی دێرشەوی، مشتاخا چیا،......، ل٦٥ .
(١٧٩) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل١٩٥ .
(١٨٠) د.شوکریە ڕەسول، پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردی ......، ل١١٧ .
(١٨١) عومەر شێخ الله، پەندی کوردی، ل١٥٦ .
(١٨٢) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل٢٢٠ .
(١٨٣) ڕۆهات ئەلاکۆم، ڕەوشا ژنان...، ئاسۆی فۆلکلۆر، ژ(٢٣)، ل١٦.
(١٨٤) سید عبدالحمید حیرت سجادی، پند پیشنان، جلد دوم، ل٥٥٥، ئەم پەندە بەم جۆرەش بلاْوە : ( دەڵێی بووکە ) .
(١٨٥) سید عبدالحمید حیرت سجادی، پند پیشنان، جلد دوم ل٥٤٠ .
(١٨٦) هەمان سەرچاوە، ل٥٤١ .
(١٨٧) هەمان سەرچاوە،، ل٥٤٦ .
(١٨٨) حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی،....، ل٦٩ .
(١٨٩) هەمان سەرچاوە، ل٦٦ .
(١٩٠) د. نبیلة ابراهیم، اشکال التعبیر في الادب الشعبي، ص١٤٦ .
(١٩١) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل١٠٦ .
(١٩٢) هەمان سەرچاوە، ل٢٣٧ .
(١٩٣) بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی سەروادار بڕوانە : عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، ب. دووەم، جوانکاری، چاپخانەی شارەوانی، هەولێر، ١٩٧٥، ل٣٦ — ٣٩ .
(١٩٤) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل٢٣٦ .
* ئیدریس عەبدولاّ لە کتێبی (جوانکاری لە ئەدەبی کوردیدا)، چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل٣٩ . جۆرە دابەشکردنێکی تری بۆ سەروادار کردووە بەپێی ژمارەی ئەو پیتانەی کە سەرواکە دروست دەکەن، ئەمە لە بەرهەمەکەی عزیز گەردیدا بەدی ناکرێت .
(١٩٥) هۆشیار نوری لەك، گوڵبژێرێك لە............، چ٢، ل٦٦ .
(١٩٦) عومەر شێخ الله، پەندی کوردی، ل١٢٩ .
(١٩٧)عومەر شێخ الله، پەندی کوردی، ڕۆشنبیری نوێ، ژ (١١٠)، ١٩٨٠، ل٢١٣ .
(١٩٨) عومەر شێخ الله، پەندی کوردی، ل١٢٨ .
(١٩٩) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل٤١٦ .
(٢٠٠) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل٤٦ .

(٢٠١) سيد عبدالحميد حيرت سجادى، پند پيشينان، جلد دوم، ل٣٤١ .
(٢٠٢) حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی......، ل١٤٣ .
(٢٠٣) شێخ مەحەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل٤٠٧ .
(٢٠٤) هەمان سەرچاوە .
* دوچکدار / کلکدار ، واتە ژنێك پێشتر شووی کردبێ و لە شووەکەی منداڵی هەبێ .
(٢٠٥) هەمان سەرچاوە .
(٢٠٦) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل٢٣٧ .
(٢٠٧) هەمان سەرچاوە .
(٢٠٨) هەمان سەرچاوە، ل١٦١ .
(٢٠٩) عەلی مەعرووف شارەزووری، پەندی پێشینانی کورد، ل٨٥ .
(٢١٠) سيد عبدالحميد حيرت سجادى، پند پيشينان، جلد دوم، ل٥٥٦ .
(٢١١) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل٢٠ .
(٢١٢) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل١٦٦ .
(٢١٣) قەناتی کوردۆ، کۆمەڵە تێکستی ...، ل٢٤٣ . هەروەها دەڵێن ( ژنی بدە ژن مردییان، دابنێ لە جێی حۆرییان) بڕوانە : شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی ....، چ٤، ل٢٣٦ .
(٢١٤) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل٨٩ .
(٢١٥) ڕۆهات ئەلاکۆم، ڕەوشا ژنان، ......، ئاسۆی فۆلکلۆر، ژ(٢٣)، ٢٠٠٦، ل٢٠ .
(٢١٦) هەمان سەرچاوە.
* مەبەست سنووری ئەو پەندانەیە کە ئەم لێکۆڵینەوەی بۆ تەرخان کراوە و باس لە کەسایەتی و ڕۆڵی ژن دەکەن، لەوانەیە بابەتی تر هەبێت، بەڵام ناکەونە نێو سنوری ئەم بابەتە .
(٢١٧) عەلی مەعروف شارەزووری، پەندی......، ل٧٤ .
(٢١٨) مەلا مەحمودی دێرشەوی، مشتاخا چیا، ل٧٨ .
(٢١٩) حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی .....، ل١٤٧ .
(٢٢٠) مەلا مەحمودی دێرشەوی، مشتاخا چیا، ل٧٨ .
(٢٢١) عومەر شێخ الله، پەندی کوردی، ل١٥٥ .
(٢٢٢) هۆشیار نوری لەك، گوڵبژێرێك لە ........، چ٢، ل٥٧ .
(٢٢٣) عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا، بەرگی دووەم، ل٦٨ — ٦٩ .
(٢٢٤) ڕۆهات ئەلاکۆم، د فۆلکلۆرا کوردی دە.........، ل٦٣ .

(٢٢٥) عەزیز گەردی سەرچاوەی پێشوو، ل٧٠ . ئیدریس عەبدولاّ لە کتێبی ( جوانکاری لە ئەدەبی کوردیدا) ل٧٩ . دژیەکی ئیجابی بە دژیەکی فەرهەنگی ناوبردووە، چونکە پەیوەندی نێوان دوو وشەکان پەیوەندییەکی سروشتییە، نەك پەیوەندییەکی دروستکراو .

* وەزیر، مانای دروستی ناگەیەنێ کە پلەو پایەو وەزیفەیەکی دیاریکراوە، بەڵکو بەرزکردنەوەی پیاو دەگەیەنێ، واتایەکی خوازەیی هەیە .

(٢٢٦)خالید جووتیار، دەشتی هەولێر........، ل٧٢ .

(٢٢٧) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل٢٠ .

(٢٢٨) سید عبدالحمید حیرت سجادی، پند پیشینان، جلد دوم، ل٣٣٨ .

(٢٢٩) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل١٢٨ . ئەمە لە عەرەبیدا دەڵێ : ( کل قصیر مکیر، و کل طویل هبیل، ولید ناصیف، الموسوعة الذهبیة، ص٣٠٩ . گشتی ترە لە پەندە کوردییەکەو تەنیا ژن ناگرێتەوە .

(٢٣٠) نەجم خالید ئەلوەنی، پەندو قسەی نەستەقی......، ل٥٥ .

(٢٣١) حەمید گەردی گوڵێك لە............، ل١٤٨ .

** ئەم دیاردەیە زیاتر لە پەنددا بەدی دەکرێت، چونکە پەند ئامۆژگاری و حیکمەت و هۆشیارکردنەوەیە .

(٢٣٢) عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی لە...............، بەرگی دووەم، ل٧٠-٧١ .

ئیدریس عەبدولاّ لە (جوانکاری لە ئەدەبی کوردیدا)، ل٨١ . ناوی لە دژیەکی سەلب ناوە دژیەکی نافەرهەنگی کە پەیوەندییەکی دروستکراوی لەسەر بنەمای ئەرێ و نەرێیە، بنچینەی وشەکان یەکن، بەلاّم بەهۆی ئەو زارەکانەوە دژیەکەکە دروست دەبێ .

(٢٣٣) قەناتی کوردۆ، کۆمەڵە تێکستی فۆلکلۆری........، ل٢٣٧ .

(٢٣٤) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی ..........، ل١٥٠ .

(٢٣٥) هۆشیار نوری لەك، گوڵبژێریك لە .........، ل٨ .

(٢٣٦) دیدەوان یەعقوبی، ژن ناسی لە ............، ل٨ .

(٢٣٧) حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی .........، ل٢٠ .

(٢٣٨) عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی لە ئەدەبی ..........، بەرگی دووەم، ل١٠٧ .

(٢٣٩) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل١٦١ .

(٢٤٠) هەمان سەرچاوە، ل٢٣٧ .

(٢٤١) سید عبدالحمید حیرت سجادی، پند پیشینان، جلد دوم، ل٤٤٣ . پەندێکی تشیکی هەیە دەڵێ : ( لاتستند الی الجدار المائل ولا الی المرأة) ئەنتەرنێت . لەڕووی چەمکەوە نزیکە لەپەندە کوردییەکە .

(٢٤٢) عەزیز گەردی، ڕەوانبێژی لە ئەدەبی ..........، بەرگی دووەم، ل٧ .
(٢٤٣) هەمان سەرچاوە، ل١٥ .
(٢٤٤) خالید جووتیار، دەشتی هەولێر ............، ل٨٤ .
(٢٤٥) هەمان سەرچاوە، ل٥٥ .
(٢٤٦) هەمان سەرچاوە، ل٣٧ .
(٢٤٧) مەلا مەحمودی دێرشەوی، مشتاخا چیا ، ل٧٦ .
(٢٤٨) هەمان سەرچاوە، ل٦٨ .
(٢٤٩) ڕۆهات ئەلاکۆم، دفۆلکلۆرا کوردی ...........، ل٦٣ .
(٢٥٠) عومەر شێخ الله، پەندی کوردی، ل١٢٨ .
(٢٥١) هەمان سەرچاوە،
(٢٥٢) ئیدریس عەبدولاّ، جوانکاری لە ئەدەبی کوردیدا، ل٨٨ .
(٢٥٣) حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی ..........، ل١٢٩ .
(٢٥٤) د. عزەدین مستەفا ڕەسول، لێکۆڵینەوەی ئەدەبی فۆلکلۆری ........، ل١٠٥ .
(٢٥٥) هەردەوێڵ کاکەیی، پەندی پێشینان، بەشی پێنجەم، ئاسۆی فۆلکلۆر، ژ(٢٣)، ٢٠٠٦، ل٦٥ .
(٢٥٦) هەمان سەرچاوە، ل٦٣ .
(٢٥٧) یاسین حەسەن گۆران، پەندی پێشینان و بەسەرهاتی کوردی ......، چ١، هەولێر، ٢٠٠٦، ل٩٢ .
(٢٥٨) هیوا عومەر ئەحمەد، پەندی پێشینانی کوردی، گ. (بەیان)، ژ٥٩، ١٩٨٠، ل٦٧، دواتر لەبەشی دووەمدا ئاماژە بە (هۆنراوە پەخشان) دەکات، بەلاّم هەمووی دەچنە نێو بەشی پەخشانی سەروادار، چونکە ئەم نموونانەی ئاماژەیان پێکردووە لە گەلێك شوێندا پارچەی کۆتاییەکەی ئەو دەیخاتە نێو پەخشان لەگەڵی نییە، بۆیە هەر سەرواداریەکەن نەك هۆنراوە، تەنانەت ئەم نموونانەی سەرەوەش لەگەڵ شوێندا بەچەشنی ڕستە نووسراون نەك هۆنراوە، بەلاّم چونکە کێشیان وەکو یەکە دەچنە نێو خانەی هۆنراوە .
(٢٥٩) عومەر شێخ الله، پەندی کوردی، ل١٢٣ .
(٢٦٠) حەمید گەردی، گوڵێك لە گوڵستانی ........، ل٢٧ .
(٢٦١) عومەر شێخ الله، پەندی کوردی : چیرۆکەکەی، ل١٤ .
(٢٦٢) حەمید گەردی، سامان و پەندی گەردی، ل٣٥ .
(٢٦٣) عومەر شێخ الله، پەندی کوردی، ل١٢٢ .

(٢٦٤) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل٣٥ . هەروەها دەگوترێ (ئەگەریان دا بە مەگەر، کورێکیان بوو ناویان نا کاشکێ) هەمان سەرچاوە، چونکە ئەم وتانە بێ ئەنجامن.

(٢٦٥) عومەر شێخ الله، پەندی کوردی، ل١١٩ .

(٢٦٦) عومەر شێخ الله، پەندی کوردی ، چیرۆکەکەی، ل١٤ .

(٢٦٧) عومەر شێخ الله، پەندی کوردی، ل١١٩ .

(٢٦٨) سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٠ .

(٢٦٩) هەمان سەرچاوە، ل١١٩ .

(٢٧٠) کەریم شارەزا، چۆن دژایەتی ......، رۆشنبیری نوێ،ژ١١٦، ١٩٧٢، ل١٣٤ .

(٢٧١) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل٩٤ .

(٢٧٢) سید عبدالحمید حیرت سجادی، پند پیشنان، جلد دوم، ل٣٧٤ .

(٢٧٣) عومەر شێخ الله، پەندی کوردی، ل٧٢ . خەزوور بە بووکەکە دەڵێ . لەکاتێکدا (خەزوور) وەك کەسایەتییەکی نێو کۆمەڵگای کوردی زۆر کەم و دەگمەن لە نێو پەنددا بەدی دەکرێت . بەتایبەتی دەستێوەردان لەم بابەتە تایبەتییانە بە ژن زیاتر (خەسوو) رۆڵی تیادا دەنوێنێ، دەچێتە نێو پەندی کراوە.

(٢٧٤) شێخ محەمەدی خاڵ، پەندی پێشینان، چ٤، ل٢٥ .

(٢٧٥) هەمان سەرچاوە، ل١٢٠ .

(٢٧٦) هەمان سەرچاوە، ل١٤ . بەیەکێك دەوترێ هەرشتێکی بۆ بکەیت دیارنەبێ و بایەخی پێ نەدات .

(٢٧٧) رێبوار جەمال، پەندی پێشینانی پشدەر، ل٥٠ .

(٢٧٨) محەمەدی مەلاقادر، پەند نامەی، ل٦٤ .

(٢٧٩) بۆزیاتر زانیاری بڕوانە : جەمال بابان، قسە هەزارەو دووانی بەکارە، دەفتەری کوردەواری، بەرگی یەکەم، ل٦٤ .

(٢٨٠)هۆشیار نوری لەك، گوڵبژێرێك لە....، ل٤٩ .

(٢٨١) هەمان سەرچاوە

(٢٨٢) حەمید گەردی، گوڵێك لە ....، ل١١٧ .

(٢٨٣) عەلی شارەزووری، پەندی پێشینانی کورد، ل١١١ . واتە هیچ ئافرەتێك بێ دالّدە نییە .

(٢٨٤) هەمان سەرچاوە، ل١١٢ . ، (مێزەردار) و (لەچکدار) وەك دوو سیفەت هێمان بۆ هەردوو رەگەزەکەو تایبەتمەندی هەریەکەیانن.

(٢٨٥) هەمان سەرچاوە، ل١١٧ .لە عەرەبیدا دەوتێت (بنت الحصیرة ما نریدها، و بنت السجاد ما بتریدنا )، یاسر خالد سلامة، موسوعة الأمثال الشعبیة، ص٢٠٩

(٢٨٦) سيد عبدالحميد حيرت سجادی، پند پيشينان، جلد دوم، ل٥٩٤ .

(٢٨٧) هەمان سەرچاوە، ل٥٩٤ .

(٢٨٨) سيد عبدالحميد حيرت سجادی، پندپيشينان، جلد دوم، ل٥٦٤ .

(جەرگ سووتان) یا ( سك سووتان) تەنیا بۆ ژن بەكاردەهێنرێ، چونكە مندالّ لە سكی دایكیدا دەبێت، بۆیە دەوترێ : (سكی سووتاوە) بڕوانە : شێخ محەمەدی خالّ، پەندی پێشینان، چ٤، ل٢٥٤ . بە ژنێك دەوترێ منالّی مردبێ . ئەم دەستەواژانە هیچ كات بۆ پیاو بەكارناهێنرێن، بەلاّم لەبەرامبەر ئەمە بۆ پیاو دەوترێ (پشتی شكاوە) ئەگەر منداڵێكی لە دەست بدات، چونكە مندالّ لە پشتی پیاوە

## ملخص البحث باللغة العربية

تبرز قيمة الأمثال الشعبية بمقارنتها بالأنواع الأدبية الفولكلورية الاخرى، وذلك لأهميتها وكثرة الأهتمام بها لكونها ثروة قومية وخزيناً شعبياً وكثيرة الشيوع بين المجتمعات وقصيرة الجمل وذات قيمة أدبية . فضلاً عن ان الأمثال تعبر عن التجارب والأحداث التي دارت في المجتمع، فهي مرآة تعكس جميع الجوانب الإجتماعية والفكرية والنفسية والدينية...الخ . وخير دليل للإحاطة بأوضاع المجتمع وتحديد السمات القومية لهُ وقراءة طبقات المجتمع والدرجة الاجتماعية وطبيعة العلاقات القائمة بين الافراد .

يتناول هذا البحث (أسلوب الأمثال الكوردية ووظائفها ) وطبيعة موضوع هذا البحث اقتضت الأعتماد على مجموعة مناهج مختلطة، وقد ارتكن البحث الى المنهج التحليلي الى جانب المنهج الوصفي . فضلاً عن ان نوعية المادة الدراسية تطلبت الأستعانة بالمنهج المقارن، وصولاً الى الأهداف المنشودة من اجراء هذا البحث . وقد قسم البحث الى فصلين، يصدرهما مدخل عام بشأن الأمثال الشعبية وطبيعة هذا البحث. وتضمن الفصل الأول المعنون بـ( **الأمثال الشعبية ودورها في الفلكلور الكردي**) يتكون هذا الفصل من أربعة مواضيع هي ( **الأمثال الشعبية / المضمون والمصطلح**) و (**القيمة الأدبية للأمثال** ) و (**فلسفة الأمثال**) و (**توجه الأمثال**)، ويتألف الفصل الثاني المعنون بـ(**اسلوب الأمثال الكوردية و وظائفها**) من ثلاثة مواضيع هي (**الوظيفة التربوية والثقافية**) و(**الوظيفة الإجتماعية**) و(**الوظيفة الأدبية والجمالية**). واختتمت هذه المواضيع كلها بأهم الاستنتاجات التي توصل اليها الباحث في نتائج البحث.

# Abstract

Proverbs are an important part of any nation's culture that are made as a result of the humanities experiences throughout an specific period of time. Proverb is made three important bases that are also the tasks of proverbs:

1. Educational task
2. Social task
3. Literary task

## The importance of the Thesis

The importance of this thesis is that many of the Kurdish proverbs. The varieties of the proverbs go back to the different roles that women hold in the society .

## Approach

For the nature of the thesis some different approaches are mingled beside the use of the descriptive approach. The thesis depends on the explanative approach; also the subject of the thesis is in need of the comparative approach beside the other ones.

# بە کام ئەلفوبێ بنووسین؟
# لێکۆڵینەوەیەکی دەنگســـازییە

پ.ی.د. عەبدوڵڵا حوسێن ڕەســول
زانکۆی سۆران - فاکەڵتیی ئاداب
بەشی کوردی

## پێشەکی

گومان لەوەدا نییە، گرنگترین بنەمای هەر نەتەوەیەك زمانە، بەڵام لە نـاو کورددا زمانی کوردی هۆی هەرە سەرەکی مانەوەی نەتـەوەی کـوردە و مانـەوە و لەناونەچوونی گەلی کورد بەندە بە مانەوە و پاراستنی زمانی کوردی[1].

سەرباری نەبوونی ستانداردێك لە زمانی کوردیدا کـە هـەموو دیالێکتـەکان پێـی ڕازی بـن، ئەلفوبێیـەکی یەکگرتووشـی نییـە. هەنـدێکیان بـە ئـەلفوبێی هاوشـێوەی عـەرەبی و هەنـدێکیان بـە ئـەلفوبێی هاوشـێوەی لاتـینی دەنووسـن، گرفتەکە لەوەش گـەورەترە، کـە لەسـەر ژمـارە و جـۆری پیتـەکانی هەریـەك لـەو ئەلفوبێیانەش هاوڕێك نین[2].

کەتواری کورد ئەوەی بەسەردا سەپاندووە، لە دابەشـبوون و پارچـەبوون (پشکی شێر)ی بەرکەوتووە. کورد لـە ڕووی زمـان و خـاك و سیاسـەت و ....هتـد پارچە پارچە بـووە، هـەر پارچـەیەکیش خـۆی بـە پەسـەندتر دەزانـێ و ملکەچـی پارچـــەیەکی تـــر نـــابێ. لـــە هـــەموویان مەترســـیدارتر پارچـــەبوونی زمانـــە و یەکخستنەوەی زمانیش لە هەموو لایەنەکانی تر گرانترە. ئەم باسە هەوڵێکە بۆ خستنەڕووی چەند ڕایەکی زانستی و پێشکەشکردنی چـەند پێـشنیارێکی گونجـاو بەرەو لەیەکتر نزیککردنەوەی نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی هاوشێوەی عەرەبی و

لاتینی و بۆ لەیەك نزیككردنەوەی پارچەكان (دیالێكتەكان)ی زمان، بە هیوای ببێتە سەرەتا و یارمەتیدەرێك بۆ یەكخستنەوەی لایەنەكانی تریش.

هەڵبەتە زمان پێكدێ لە (دەنگ) و (واتا) و تاكە دەنگەكان جیاكەرەوە و تێكڕاش هەڵگری واتاكانن، هەموو زار و زمانەكان لە واتاكان جیاوازیی ئەوتۆیان نییە[3] و ئەوەی لە یەكیان جیادەكاتەوە دەنگەكانن. كەواتە،نزیككردنەوە و یەكخستنەوەی دەنگەكان، كە لە نووسیندا بە پیت خۆیان دەنوێنن[4]، ئاسانترین و گرنگترین قۆناغی سەرەتایە بەرەو نزیككردنەوەی دیالێكتەكان و یەكەم هەنگاو دەبێ بەرەو دروستبوونی زمانی ئەدەبیی یەكگرتوو.

لێرەدا پرسیارێك دێتە ئارا: ئایا لە نێوان بوونی دوو ئەلفوبێی نووسین و بوونی جیاوازی و گرفتی زۆر لەناو خۆیاندا و لە نێوانیاندا، دەرفەت دەدەن بە كەلێنێكی نزیكبوونەوە یان یەكخستنەوەی سەرجەم شێوازەكانی نووسین؟

لە وەڵامدا دەڵێین، بەڵێ، بەو مەرجەی هەموو پارچەكان دەست لە پەسەندی و پیرۆزیی لایەنی خۆیان هەڵگرن و خاڵە جیاوازەكان لابدەن و بخەنە لاوە و تەنیا كار لەسەر ئەو خاڵانە بكەن كە تیایاندا هاوبەش و هاوڕێكن. واتە، بگەڕێنەوە بۆ ڕەسەنایەتیی زمانی كوردی نەك زار و شێوەزار، ئەو پیتانە بەكاربێنن كە لەسەریان كۆكن و پیتە كێشەدارەكان فەرامۆش بكەن و ئاسانترین فۆڕم و كەمترین ژمارەی پیتەكان بەكاربێنن. ئەمەش ڕێگە لەبەردەم نزیكبوونەوە و یەكخستنەوە و تەنانەت فێربوونی مناڵی كوردیش ئاسان و واڵا دەكا.

بە مەبەستی وەدەستهێنانی گونجاوترین و ئاسانترین ئەلفوبێی كوردی، كە لەگەڵ هەموو دیالێكتەكان بگونجێ و منالّی كورد زووتر و ئاسانتر فێری ببێ و گرفتی تیادا نەبێ، باسەكە بەم شێوە ڕێكخراوە:

لە بەشی یەكەمدا بە ناونیشانی (گرفتەكانی نووسین بە ئەلفوبێی عەرەبی و لاتینی): لیستێكی گشتیی سەرجەم پیتە باوەكان بە هەردوو شێوە (كە لە ٣٥ دەنگ پێكهاتووە) بەرامبەر یەك ڕیز كراون و بە پێی پیتەكانی هاوشێوەی عەرەبی ڕیزبەندییان بۆ دانراوە، ئینجا بە پێی ڕیزبەندییەكە بە پیتەكاندا هاتووینەتە

خوارەوە و هەر دەنگێك (پیتێك) گرفتی هەبێ خراوەتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە و پاڵپشت بە بنەما دەنگسازییەکان پێشنیاری گونجاو پێشکەش کراون.

لە بەشی دووەمدا بە ناونیشانی (ئاسانترین ئەلفوبێی کوردی): لە ژێر تیشکی دەرئەنجامەکان و پێشنیارەکانی بەشی یەکەم لیستێکی سادە و ئاسان لە پیتە کوردییەکان خراوەتە ڕوو و لەگەڵ دوا پێشنیار و سێ دەقیش وەك نموونە بە پیتەکانی لیستی کۆتایی نووسراونەتەوە.

لەکۆتاییدا سەرباری ئەنجامەکان پوختەی باسەکە بە عەرەبی و ئینگلیزی پێشکەش کراون و لیستی سەرچاوەکانیش خراوەتە ڕوو.

## (بەشی یەکەم)

## ((گرفتەکانی نووسین بە ئەلفوبێی عەرەبی و لاتینی))

سەرباری کێشەی نەبوونی زمانی ستانداردی کوردی و دابەشبوونی زمانی کوردی بەلای کەمەوە بەسەر چوار دیالێکتی سەرەکی،کورد لە کێشەی نەبوونی ڕێنووسێکی یەکگرتووش ڕزگاری نەبووە. ئەگەرچی وتار و نووسینی زۆر لەم بارەیەوە نوسراون[٥]، بەلام زۆربەیان لە خەمخۆری نووسەرەکانیان هەست و بۆچوونی تایبەتی خۆیان بەکارهێناوە بۆ چارەسەری ئەو گرفتانە و ڕێژەیەکی کەمیان پێوەرەکانی زانستی زمانیان بەکارهێناوە، پتر پشتیان بە لاساییکردنەوەی ئەلفوبێی عەرەبی بەستووە. زۆربەیان (فۆن و فۆنێم[٦]) یان (دەنگ[٧] و پیتیان) لەیەك جیا نەکردۆتەوە[٨]، بۆیە هەندێ پیتی سەرباریان بۆ نووسینی کوردی زێدە کردووە و لە ئەنجامدا گرفتێکی گەورەیان بۆ ئەلفوبێی کوردی دروست کردووە و بە سڕینەوەی ئەو پیتانە لەسەر بنەڕەتێکی زانستی زۆربەی گرفتەکان چارەسەر دەبن. لەم خشتەیەی خوارەوە توێژەر بە ئەنفەست و بە مەبەست پەیڕەوی تەواوی ئەلفوبێی باوی لاتینی نەکردووە و هەوڵی داوە ئەلفوبێی هاوشێوەی عەرەبی بە ئەلفوبێی هاوشێوەی لاتینی بنووسێتەوە، بۆ

نموونە بزرۆکە (i) فەرامۆش کراوە و بۆ دەنگی (ی)ی بزوێن و نەبزوێن تەنیا (y) دانراوە و بۆ (و)ی بزوێن و نەبزوێن هەر (W) دانراوە ....هتد.

| nmûne[9] | pyt | نموونە | پیت | ژ |
|---|---|---|---|---|
| åazad, ĕåre, åestĕre, , åwmĕḓsåy | å | ئازاد، ئێرە، ئەستێرە، ئیش، ئومێد | ئ | -١ |
| ewan, were, derewe | e | ەوان، وەرە، دەرەوە | ە | -٢ |
| aw, mastaw, awarekan | a | او، ماستاو، اوارەکان | ا | -٣ |
| bax, berdbaran, nayab | b | باخ، بەردباران، نایاب[١٠] | ب | -٤ |
| perdax, kepr, top | p | پەرداخ، کەپر، تۆپ[١١] | پ | -٥ |
| trĕ, temate, awat | t | ترێ، تەماتە، ئاوات | ت | -٦ |
| cwceĭe, cĕbecĕkrdn, bac | c | جووجەڵە، جێبەجێکردن، باج | ج | -٧ |
| c̭aw, kewc̭k, xac̭ | c̭ | چاو، کەوچك، خاچ | چ | -٨ |
| ħ̈esanewe, ħ̈ewt, ħ̈ewanewe | ħ̈ | حەسانەوە، حەوت، حەوانەوە | ح | -٩ |
| xwda, xwrma, bax | x | خودا، خورما، باخ | خ | -١٠ |
| dar, berd, bax | d | دار، بەرد، سەردان | د | -١١ |
| trĕ, petate, serdan | r | ترێ، پەتاتە، مزگەوت | ر | -١٢ |
| ĕr̂baz, pr̂ĕew, per̂ | r̂ | ڕێباز، پێڕەو، پەڕ | ڕ | -١٣ |
| zozan, zryze, r̂ez | z | زۆزان، زریزە، ڕەز | ز | -١٤ |
| jwan, jwjk, kej | j | ژوان، ژووژك، کەژ | ژ | -١٥ |

| ١٦- | س | سێو، دەرسیم، ئاراس | s | sĕw, dersym, aras |
|---|---|---|---|---|
| ١٧- | ش | شەو، پەشێو، شەش | ş̮ | ş̮eş̮w, ş̮ew, peĕş̮ |
| ١٨- | ع | عەلیشیش، عەرد، باعەباع | u | uelyş̮yş̮, uerd, bauebau |
| ١٩- | غ | غاردان، غەمبار، داغ | ẍ | ẍardan, ẍembar, daẍ |
| ٢٠- | ف | فێنك، سەفین، كەف | f | fĕnk, sefyn, kef |
| ٢١- | ڤ | ڤیان، بێریڤان، سۆلاڤ | v | vyan, bĕryvan, solav |
| ٢٢- | ق | قەرەج، قەرەبوو، بۆق | q | qerec, qerebw[12], boq |
| ٢٣- | ك | كورد، كەركووك، بووك | k | kwrd, kerkwk, bwk |
| ٢٤- | گ | گەلاوێژ، بەرگری، مەرگ | g | gelawĕj, bergry, merg |
| ٢٥- | ل | لاواز، كولله، سەرپەل | l | lawaz, kwlle, serpel |
| ٢٦- | ڵ | گولاڵە،قەڵەو، ساماڵ | ĭ | gwĭaĭe, qeĭew, samaĭ |
| ٢٧- | م | میوان، شەماڵ، شەرم | m | mywan, ş̮amaĭ, ş̮erm |
| ٢٨- | ن | نەورۆز، پەنیر، سامان | n | newroz, penyr, saman |
| ٢٩- | ه | هەواڵ، بەهرە[١٣]، | h | hewaĭ, behre |
| ٣٠- | و | وریا، تەون، خاو | w | wrya, tewn, xaw |
| ٣١- | وو | فەرموون، كووڕ، دوو | û | fermûn, kr̂û, d û |
| ٣٢- | ۆ | ۆمەر، دەهۆڵ، دۆ | o | omer, dehoĭ, do |
| ٣٣- | ی | یاری، یەریڤان، دیاری | y | yary, yeryvan, dyary |
| ٣٤- | ێ | ێرە، هەولێر، دێ | ĕ | ĕre, hewlĕr, d ĕ |
| ٣٥- | 00 | من، گرتن، ورد[١٤] | i | min, girtin, wird |

**یەکەم ـ گرفتی دەنگی هەمزە (ئـ):**

| ١- | ئـ | **ئازاد، ئێرە، ئەستێرە، ئیش، ئومێد** | å | åazad, ĕåre, åestĕre, åyș, åwmĕd |
| --- | --- | --- | --- | --- |

**دەنگی هەمزە (ئـ) لەو کاتانەدا پەیدا دەبێ، کە دەنگێکی بزوێن (ا، ۆ، ێ، ە، ی، و) دەکەوێتە سەرەتای وشەیەك، چونکە لە کاتی گۆکردنی دەنگە بزوێنەکاندا، دەم کراوەیە و هەوا بەبێ هیچ بەربەستێك لە دەمی مرۆڤ دێتە دەرەوە. هەموو بزوێنەکان دەنگی گڕن و تاڵە ژێیەکان دەلەرێنەوە، بەڵام ئەم لەرینەوەیە هیچ بەربەستێك لە ڕێی دەرچوونی هەوا دروست ناکا. بۆیە کاتێ دەنگێکی بزوێن دەکەوێتە سەرەتای وشە، پێویستی بە بەربەستێك دەبێ تاکو هەواکە بگرێتەوە و ڕێگە نەدا هەر دەم کرایەوە هەوا بێتە دەرەوە. ئەگەرنا پێش ئەوەی قسەکەر دەست بە گۆکردنی ئەو وشەیە بکا کە بە بزوێن دەست پێدەکا، زۆربەی هەوای پەنگ خواردووی سییەکانی دێتە دەرەوە و وشەکەی پێ تەواو ناکرێ و بەم پێیە کرداری ئاخاوتن زۆر گران دەبێ. ئەم دیاردەیەش فۆنەتیکییە و نەك هەر لە زمانی کوردی لە زمانەکانی تریشدا هەیە[١٥].**

**هەڵبەتە ڕێژەی بەهێزی دەنگە بزوێنەکان جیاوازە و بە پێی ڕێژەی کرانەوەی دەم دەگۆڕێ. (ڕێژەی کرانەوەی دەمیش لە دەنگێك بۆ دەنگێك دەگۆڕێ و ئەمەش وای کردووە، کە دەنگەکان دابەش بن بۆ بزوێن و نەبزوێن و بە هۆی بە دوای یەك هاتنیان میکانیکییەتی ئاخاوتن بەردەوام دەبێ. بۆ نموونە دەتوانرێ، بە شێوەیەکی گشتی بەم شێوەیە دابەش بکرێن[١٦] :**

| جۆری دەنگ | دەنگەکان | ڕێژەی کرانەوەی دەم |
|---|---|---|
| بزوێنەکان | ا | کرانەوەی زۆر |
| | ۆ ێ | کرانەوەی ناوەندی |
| | ە | کرانەوەی ئاسایی |
| نیمچەبزوێن | ی و | نیمچەکراوە |
| نەبزوێن | س،ش،ف،ڤ،م،.. | نیمچەداخراو |
| | ب،پ،د،ك،گ،.. | داخراو |

بەم پێیە ڕیزبەندیی پیتە بزوێنەکان بەم شێوەیەیە: (ا، ۆ، ێ، ە) و ڕیزبەندیی پیتە نیمچە بزوێنەکان بەم شێوەیەیە: (ی، و). هەریەك لە پیتە بزوێنەکان بکەوێتە سەرەتای وشە دەنگی هەمزە بۆ خۆی دروست دەکا، بەم شێوەیە:

١- پیتە بزوێنی (ا):

| بزوێن | | نموونە بە پیتی هاوشێوەی عەرەبی | بە پیتی هاوشێوەی لاتینی | نموونەی ئینگلیزی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ا | (ئ)اش، (ئ)او، (ئ)اوس | aş, aw, aws , | Are/ɑ:/, Ash/æʃ/ |

٢- پیتە بزوێنی (ۆ):

| بزوێن | | نموونە بە پیتی هاوشێوەی عەرەبی | بە پیتی هاوشێوەی لاتینی | نموونەی ئینگلیزی |
|---|---|---|---|---|
| ٢ | ۆ | (ئ)ۆ، (ئ)ۆمەر، (ئ)ۆکتۆبەر | o, omer, oktober | O, October /okt∂ʊb∂/ |

**٣- پیتە بزوێنی (ێ):**

| بزوێن | | نموونە بە پیتی هاوشێوەی عەرەبی | بە پیتی هاوشێوەی لاتینی | نموونەی ئینگلیزی |
|---|---|---|---|---|
| ٣ | ێ | (ئـ)ێرە، (ئـ)ێستە،(ئـ)ێش | ĕre, ĕste, ş̆ĕ | Egg/eg/, earn/ɜ:n/, |

**٤- پیتە بزوێنی (ە):**

| بزوێن | | نموونە بە پیتی هاوشێوەی عەرەبی | بە پیتی هاوشێوەی لاتینی | نموونەی ئینگلیزی |
|---|---|---|---|---|
| ٤ | ە | (ئـ)ەو، (ئـ)ەنجام، (ئـ)ەستور | ew, encam, estûr | Abet /∂bet/, ago /∂g∂ʊ/ |

کاتێ پیتێکی نیمچە بزوێنیش (ی، و) بکەوێتە سەرەتای وشە و ببێتە بزوێن، واتە پیتێکی بزوێنی لە دوا نەبێ، ئەوانیش دەنگی هەمزەیان پێویست دەبێ. بەم شێوەیەی خوارەوە:

**٥- پیتی نیمچە[١٧] بزوێنی (و):**

| بزوێن | | نموونە بە پیتی هاوشێوەی عەرەبی | بە پیتی هاوشێوەی لاتینی | نموونەی ئینگلیزی |
|---|---|---|---|---|
| ٥ | و | (ئـ)وتو، (ئـ)ومێد، (ئـ)وتێل | wtw, wmĕd, wtĕl[18] | *نموونەی ئینگلیزی لەم جۆرە نییە* |

**٦- پیتی نیمچە بزوێنی (ی)[١٩]:**

| بزوێن | | نموونە بە پیتی هاوشێوەی عەرەبی | بە پیتی هاوشێوەی لاتینی | نموونەی ئینگلیزی |
|---|---|---|---|---|
| ٥ | یـ | (ئـ)یش،(ئـ)یدی،(ئـ)ینگلیز | yş̆, ydy, ynglyz | *Ear/Iə(r)/, English/IŋglI∫* |

کەواتە، (کاتێ پیتێکی بزوێن بکەوێتە سەرەتای وشە، لە بەر ئەوەی دەمی مرۆڤ کراوەیە و بۆ گرتنەوەی هەوا بەربەستێك لە ڕێی دەرچوونی هەوا نییە، بە ناچاری دەنگی هەمزە (ئ) وەکو دەمگر(صمام/valve)ێك دروست دەبێ و تاکو قسەکەر تانێکی تێ نەداو نەیکاتەوە، ڕێگەی هەوا نادا لە خۆیەوە و بێ سوود بێتە دەرەوە، بۆ ئەوەی هەواکە پاشەکەوت بێ بۆ گۆکردنی وشەکە و بەشی ئاخاوتنەکە بکا. چەند بەڵگەیەکی بەهێزیش هەیە بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییانە:

١ـ تەنیا لە کاتێکدا بزوێن لە سەرەتا بێ ئەم (ئـ) هەمزەیە پەیدا دەبێ و ئەگەر بزوێنەکان لە سەرەتای وشە نەبوون، پێویست بەم دەنگە ناکا و نەبزوێنەکان ڕۆڵی ڕێکخستنی تەوژمی هەواکە دەبینن و چۆنیەتی دروستبوون و گۆکردنی ئەوان دەسەڵات بە سەر چاودێریکردنی ڕەوگەی هەواکە پەیدا دەکا، هەر بۆیەش کاتێ هەمان وشەی هەمزەدار فۆڕمێکی تری بکەوێتە پێش، بزوێنەکە پێویستی بە هەمزەکە نامێنێ ، بێ ئەوەی کار لە واتا بکا:

| | بزوێنی سەرەتای هەمزەدار | هەمان وشە لە دوای فۆڕمێك |
|---|---|---|
| ا | (ئ)او ، (ئ)اش ، (ئ)ا | ماستاو، باراش ، نا |
| ۆ | (ئ)ۆ ، (ئ)ۆمەر | دۆ، مامۆمەر |
| ێ | (ئ)ێرە ، (ئ)ێش | لێرە، سەرێشە |
| ە | (ئ)ەنجام ، (ئ)ەستوور | دەرەنجام، ورگەستوور |
| و | (ئ)وتو، (ئ)ومێد، (ئ)وتێل | قوتوو، ناومێد، موتێل |
| ی | (ئ)یش، (ئ)یدی، (ئ)یتر | پرِیش، چیدی، چیتر |

٢ـ پەیدابوونی هەمزە (ئـ) لە دەسپێکی بزوێنی سەرەتا، لە زمانەکانی تریشدا هەیە و دیاردەیەکی فۆنەتیکییە، نەك فۆنۆلۆجی، (بڕوانە نموونە ئینگلیزییەکانی سەرەوە). ئەگەر نموونە کوردییەکانیش بە پیتی لاتینی

بنووسرێنەوە، پێویست بە هەمزە ناکا، (بڕوانە نموونە کوردییەکانی سەرەوە بە پیتی لاتینی، لە هەمان خشتەدا).

٣ـ دانان و دانەنانی ئەم هەمزەیە (ئـ)[٢٠] لە نووسیندا، کار لە چۆنیەتی دەربڕینی وشەکە و لە واتای وشەکەش ناکا، کەواتە ئەم دەنگە فۆنێم نییە و تەنیا ئەرکی فۆنەتیکی هەیە، چونکە فۆنێم کورتترین دەنگە کە واتا دەگۆڕێ ، بەم جۆرە ئەگەر فۆنێم نەبێ ڕەوا نییە لە نووسیندا هێمایەکی وەکو پیتی بۆ دابنرێ)[٢١] .

**(ئەنجام و پێشنیار)**

١- هەموو بەڵگەکان دەیسەلمێنن کە هەمزە (ئـ) فۆنێم نییە لە زمانی کوردیدا، کەواتە پێویست ناکا نرخێکی بۆ دابنرێ و پیتێکی بۆ تەرخان بکرێ. بۆیە وا ڕاستترە لە نووسیندا نەنووسرێ. ڕەنگە ڕاهاتن لە سەر نەنووسینی ئاسان نەبێ، چونکە بە نووسینی ڕاهاتووین، بەڵام نەنووسینی گرفتێکی ڕەنووسمان چارەسەر دەکا.

٢- دەبێ بەو بڕیارەدا بچینەوە، کە دەڵێ: بڕگەمان نییە بە بزوێن دەست پێ بکا، یان بڕگەمان نییە تەنیا لە بزوێنێک پێکهاتبێ ، وەك لەم دەقە دەردەکەوێ:

(مناڵ): باوکە جلەکانت بۆ هێنام؟

(باوك): (ئـ)ـا.

(دایك): نەچی ئەمانەش پیس بکەی!.

(منال): (ئـ)ێ ، (ئـ)ێ !.

دووەم ـ گرفتی دەنگی (ح) و (ع):

| ħesanewe, ħewt, ħewanewe | ħ | حەسانەوە، حەوت، حەوانەوە | ح | ٩- |
|---|---|---|---|---|
| ulysys, uerd, bauebau[22] | u | عەلیشیش، عەرد، باعەباع | ع | ١٨- |

ئەگەر سەرنجێکی زمانە هیندۆئەوروپییەکان بدەین، بەتایبەتی زمانەکانی ڕۆژاوا دەبینین: ئەم پیتانە لە نووسین بە پیتی لاتینیدا نین و تەنانەت لەو زمانانەی بەو پیتانەش دەنووسن لە ئارادا نین[٢٣]. ئەم سەرنجە پرسیارێکمان لا دەوروژێنی: ئایا ئەم دوو دەنگە لە زمانی کوردیدا فۆنێمن، یان نا؟

هەروەها دیاردەی ئاڵوگۆڕکردن و تێکەڵکردنی هەردوو دەنگی ( ح ) و (ع) لە ئاخاوتندا بەتایبەتی لە ناوچەی شێوەزاری سۆرانی لە دیالێکتی ناوەڕاستدا[٢٤]. ئەمەش پرسیارێکی تر دەوروژێنێ: ئایا ئەم دوو دەنگە لە زمانی کوردیدا دوو ئەلۆفۆنی هەمان فۆنێمن، یان دوو فۆنێمی جیان؟، دیسان ئایا وشەی کوردی ڕەسەنمان هەیە، ئەم دوو دەنگەی تیادا بێ؟ .

ئەگەر بە شێوەیەکی وردتر ئەم دوو دەنگی (ح) و (ع) بخەینە ژێر تیشکی لێکۆڵینەوە، دەگەینە ئەم تێبینییانەی خوارەوە :

١ـ لەوە دەچێ دەنگی (ح) و دەنگی (ع) دوو دەنگی ڕەسەنی کوردی نەبن و بە کاریگەری زمانی عەرەبی لە سەر زمانی کوردی هاتبنە ناو زمانی کوردییەوە، بە بەڵگەی ئەوەی لەو زمانە هیندۆ ـ ئۆروپییانەدا بەدی ـ ناکرێن کە نەکەوتوونەتە ژێر کاریگەری زمانی عەرەبی، بە تایبەتی گەلە هیندۆ ـ ئۆڕوپییە ناموسوڵمانەکان، جگە لەمەش ئەو وشە کوردییانەی یەکێ لەم دوو دەنگەیان تیادا بێ زۆر دەگمەنن و ئەوانەش کە لە ئارادان گومانی ڕەسەنایەتی و خۆماڵییان لێ دەکرێ.

ئەو وشانەی دەنگی (ح)یان تیادا بێ وەك: (حەفتە/هەفتە، حەوت/حەفت، حەفتا) دەشێ لە هەفتەوە وەرگیرابن، واتە، (هـ) گۆڕابێ بۆ (حـ). هەرچی (حەوانەوە) و (حەسانەوە)ن، ئەمانەش لەوە دەچێ لە (احتواء) و (أحسن)ی عەرەبییەوە وەرگیرابن. ئەو وشانەی دەنگی (ع)یان تیادا بێ وەك: (باعەباع، عەلیشیش). جگە لەمانە بە دەیان وشەی عەرەبی بە تایبەتی ناوەکان هاتوونەتە ناو زمانی کوردی، بێ گومان بۆ زاڵبوونی هەر زمانێك، قۆناغی هاتنی وشە، پێش قۆناغی دەنگە. بەم پێیە بە وردبوونەوە لە زمانی ڕەسەنی کوردی بۆمان دەردەکەوێ چەند وشەیەکی ڕەسەن بە هەر یەکێ لەم دوو دەنگە لە زمانی کوردیدا نین.

٢ـ ئاڵوگۆڕکردنی ئەم دوو دەنگە لە زمانی کوردیدا (بە تایبەتی لە شێوەزاری سۆرانیی دیالێکتی ناوەڕاستدا) نابێتە هۆی گۆڕانی واتا، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەکی وەك: نارەسەنی ئەم دوو دەنگە لە زمانی کوردیدا و دروستبوونیان لە هەمان شوێنگەی قوڕگدا، ( تەنیا جیاوازییان لەوەدایە: دەنگی (ح) کپە و دەنگی (ع) گڕە)، هەرچەندە تێکەڵکردنیان لە ناو چینی ڕۆشنبیران زۆر دەگمەنە. ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ لە زمانی کوردیدا دەتوانرێ، بە پێوەری زمانەوانی بە ئەلۆفۆنی یەکتر دابنرێن.

٣ـ لە نووسینی کوردی بە پیتی لاتینی ئەم دوو دەنگە نرخیان بۆ دانەنراوە و هیچ هێمایەکیان بۆ نەکراوە بە پیت، ئەوەی بۆیان دانراوە وەك (ḧ=ح) و (ü=ع) هەوڵ و بۆچوونی تایبەتی و تاکەکەسین و جێی خۆیان لە سەرجەم نووسینەکان بە لاتینی نەکردۆتەوە و پێچەوانەوە تا ئێستا (ه) لە بری (ح) دەنووسرێ و لە بری (ع)یش یا ئەو بزوێنە دەنووسرێ کە بە دوایەوە دێ، واتە وەك هەمزە نرخی نەدراوەتێ، یان دەکرێتە (ه).

٤ـ لە لایەکی تر دەنگی (ح) لە زۆربەی وشەکاندا ئاڵوگۆڕی شوێن لەگەڵ (ه) دەکا و لەو شوێنانەدا دەبنە ئەلۆفۆنی یەکتر و دەنگی (ع)یش لە زۆربەی وشەکاندا ئاڵوگۆڕی شوێن لەگەڵ هەمزە (ء) دەکا و خۆی نامێنێ و لەشوێنی ئەو وەستانێك دروست دەبێ و بزوێنەکەی دوای ئەو هەمزەیەك دروست دەکا، وەك لەم خشتەیەی خوارەوە:

| ه ↔ ح | ع ↔ (و) |
|---|---|
| هەفتە ↔ حەفتە | عاسمان ↔ (ء)اسمان |
| هەتا ↔ حەتا | عەرد ↔ (ء)ەرد |
| هیشك/هشك ↔ حشك (دیالێکتی ژووروو) | قوڕعان ↔ قوڕ(ء)ان |
| هەسار ↔ حەسار | عومەر ↔ (ء)ۆمەر |

| | |
|---|---|
| **هەرەکەت ↔ حەرەکەت** | **عێل ↔ (ء)ێل** |
| **هەرد ↔ حەرد** | **عەزیزم ↔ (ء)ەزیزم** |
| **هەمی ↔ حەمی (دیالێکتی ژووروو)** | **عەول ↔ (ء)ەول (أول) (دیالێکتی ژووروو)** |
| **گوناهە ↔ گوناحە** | **عەیش/عیش ↔ (ء)یش** |
| **تەهها! ↔ تەححا!** | **عافەرین ↔ (ء)افەرین** |
| | **عارەق ↔ (ء)ارەق** |

**ئەنجام و پێشنیار:**

لە بنەڕەتدا هەردوو دەنگی (ح، ع) کوردی ڕەسەن نین و لە عەرەبی هاتوونەتە ناو زمانی کوردی و تا ئێستا وشەی ئەوتۆیان پێ دروست نەبووە کە ئاڵوگۆڕیان ببێتە هۆی واتا گۆڕان. دەشێ دەنگی (ه) لە شوێنی (ح) دابنرێ بێ ئەوەی واتا بگۆڕێ و هەمزە (و) کە لە کوردیدا فۆنێم نییە، شوێنی (ع) دەگرێتەوە بێ ئەوەی کار لە واتا بکا. جگە لەمەش بە پیتی لاتینی هێمایان بۆ نەکراوە. دەشێ هەردووکیان لە ڕیزبەندیی پیتەکان بسڕێنەوە.

سێیەم ـ گرفتی دەنگی (خ) و (غ):

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١٠- | خ | **خودا، خورما، باخ** | x | xwda, xwrma, bax |
| ١٩- | غ | **غاردان، غەمبار، داغ** | ẍ | ẍardan, ẍembar, da ẍ |

لە ئاخاوتنی کوردیدا زۆر وشە هەن کە هەرجارەی بە یەکێ لەو دوو دەنگە دەبیسرێن یان دەنووسرێن، بێ ئەوەی کار لە واتایان بکا. بۆ نموونە وەك: ( خەم / غەم ، خونچە / غونچە ، باخ / باغ ، داخ / داغ ، خیرەت / غیرەت ، دۆزەخ / دۆزەغ ، .......... ). ئایا کامەیان ڕاستە ؟ یان ڕەسەنە ؟ ئایا ئەم دوو دەنگەش ئەلۆفۆنن یان نا؟.

چەند سەرنجێك دەربارەی دەنگی ( خ ) و دەنگی ( غ ) :

١ـ ئەگەر سەیری دیوانە كۆنەكانی شاعیرە كلاسیكییەكان بكەین، دەبینین زۆربەی ئەم جۆرە وشانە بە پیتی (غ) نووسراون، بەڵام بە تێپەڕبوونی كات بەرە بەرە تا بەرەو سەردەمی نوێ بێین، ڕێژەی بەكارهێنانی پیتی (خ) زۆرتر دەبێ بەرامبەر پیتی (غ). دەشێ ئەمەش بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دەنگی (خ) لە گۆكردندا سووكترە لە دەنگی (غ)، چونكە دەنگی (خ) كپە و دەنگی (غ) گڕە، ئەگەرچی هەردووكیان لە هەمان شوێنگەی قورگ و بە هەمان چەشن دروست دەبن.

٢ـ لە كۆمەڵێ وشە لە شوێنی یەكتر بەكاردێن و كار لە واتای وشەكە ناكا، بە تایبەتی دەنگی (خ) دەتوانێ لە هەموو وشەیەك لە شوێنی دەنگی (غ) بە كاربێ، بەڵام دەنگی (غ) لە هەموو وشەیەك لە شوێنی (خ) بەكار نایێ، وەك لەم وشانە نەبینراوە (غ) لە شوێنی (خ) بەكاربێ: (خودا، خورما، خاڵ، خاوێن، خراپە، خوشك، خوێ، خێرا، ئۆخەی، خەون، خەو، خەریك، خانوو، خەستەخانە، ......)، ئەگەرچی هەندێ وشەش هەیە، بە زۆری هەر (غ) بەكاردێ، بەڵام ئەم وشانە هەر لە بنەڕەتدا لە عەرەبییەوە بە (غ) دابەزیون بۆ كوردی، وەك: (غیرەت، غاردان، غەریب ...).

٣ـ بە گەڕان بە ناو دیالێكتەكانی زمانی كوردیدا، دەتوانین وشە بدۆزینەوە، بە ئاڵوگۆڕی (خ) و (غ) واتایان بگۆڕێ، وەك: ( خار = دڕك )، ( غاردان = ڕاكردن)، بەڵام (خار) لە دیالێكتی خواروو (شێوەزاری لوڕی ..) واتای (دڕك) دەبەخشێ و (غاردان) لە دیالێكتی ناوەڕاست (شێوەزاری سۆرانی)، هەروەها (غار) بە تەنیا بەكار نەهاتووە و لەگەڵ چاوگی (دان) لێكدراوە، دیسان لە دیالێكتی خواروو لە بری (غاردان) چاوگی (دەوكردن) بە كاردێنن و لە دیالێكتی ناوەڕاستیش لە بری (خار) وشەی (دڕك) بەكاردێنن، واتا، هەردوو فۆڕمەكە لە هەمان دیالێكت نین.

**ئەنجام و پێشنیار:**

لەم سەرنجانەی سەرەوە دەردەکەوێ، دەتوانرێ دەنگی (غ) بە ئەلۆفۆنێکی (خ) دابنرێ و دەشێ پیتی (خ) لە بری (غ)یش بنووسرێ و ئەمەش نابێتە هۆی واتا گۆڕین، لەم بارەشدا ئارەزووی چۆنیەتی گۆکردنی بۆ قسەکەر دەمێنێتەوە[٢٥].

چوارەم ـ گرفتی دەنگی (و) و (وو):

| -٣٠ | و | وریا، تەون، خاو | w | wrya, tewn, xaw |
|---|---|---|---|---|
| -٣١ | وو | فەرموون، کووڕ، دوو | û | fermûn, kr̂û, d û |

تا ئێستا زۆر لە نووسەران گرفتی نووسینی یەك ( و ) و دوو ( و )یان هەیە، تەنانەت هەندێ جار لە هەمان نووسیندا چەندین وشە بە هەردوو شێوە دەبینرێن، وەك: ( ولآت / وولآت، وشە / ووشە، نووسین / نووسین، جوتیار / جووت، چوون / دەچوین، بووك / بووکێنی، سووك / سوکایەتی، پەڕتووك / پەڕتوکخانە ......(گەلێك لەو وشانەی دەنگداری ((و=u))ی کورتیان تێدایە کردوویانە بە دەنگداری ((وو= û))ی درێژ. ئەمە گێرەشێوێنییێکە لە ئیملا و ڕاست نووسینی زمانی کوردیدا. ئەم هەڵانە گەلێ زۆرن لە نووسینی بڵاوکراوەدا.)[٢٦].

ئەو سەرنجانەی دەربارەی دەنگی ( و ) یا ( وو ) تێبینی دەکرێن :

١ـ دەتوانرێ شوێنی ( و )ە کورتەکان و ( و )ە درێژەکان، بەم شێوەیەی خوارەوە، دەستنیشان بکرێن:

أـ **ئەگەر (و) لە سەرەتای بڕگەبێ کورتە:**

واتا، وازی، واژە، والآ، وانە، وەچە، وەرین، وەرز، وەرگرتن، وەرد، وەرە، وەرزێر، وەستان، وەنەوشە، ورتە، وریا، ورچ، وردە، ورشە، وشك، ولآت، وتار، ولآخ، وێران، وێنجە، وێژە، وێنە، ویستن، ...

ب ـ **ئەگەر (و) لە ناوەڕاستی بڕگە بێ کورتە:**

جوان، چەوت، حەوت، خەوت، دووان، ڕوان، ژوان، شوان، گوان، لوان، ... خوڕ، دووڕ، شوڕ، کوڕ، گوڕ، لوڕ، هوڕ......

**بەڵام ئەگەر لە ناوەڕاست بێ و یەکێ لەم سێ پیتەی (ر، ك، ن) بە دوادا بێ درێژ دەبێتەوە:**

پوور، توور، دوور، زوور، ژوور، سوور، .... بووك، پووك، تووك، سووك، نووك، ....بوون، چوون، ڕوون، ...

ج - **ئەگەر (و) لە کۆتایی بڕگە بێ و نەبزوێن بێ، (واتە، بزوێنێکی لە پێشدا هاتبێ) کورتە:**

ئاو، ئەو، چاو، جاو، خەو، خاو، خێو، دێو، ڕاو، زیو، سێو، شێو، شیو، لاو، لێو، مێو، ناو،........

**بەڵام ئەگەر (و) لە کۆتایی بڕگە بێ و بزوێن بێ، (واتە، بزوێنێکی لە پێشدا نەهاتبێ) کورتە:** بوو، تو، جو، چو، خو، دوو، ڕو، زو، شو، مو، ...

٢ـ دەنگی ( و ) بە پێی کەوتگەی لە بڕگەدا کورتی و درێژییەکەی دەگۆڕێ، واتە، پتر لە ئەلۆفۆنێکی هەیە، هەرچەندە کورت و درێژیی پیتەکە دەسکاری و ئاڵوگۆڕ بکرێ، واتای وشەکە ناگۆڕێ، جگە لە وشەی (کوڕ)، لە درێژ کردنەوەی (و)دا واتای دەگۆڕێ و دەبێتە (کووڕ)، واتە، ئەم وشەیە لە گریمانەکە ناوێزە دەردەچێ و دەشێ ئەم تاکە وشەیە بە دوو (و) بنووسرێ، واتە، وشەی (کوڕ) سێ فۆنێمە: (ك+و+ڕ)، بەڵام وشەی (کووڕ) چوار فۆنێمە: (ك+و+و+ڕ).

٣ـ لە چاوگە (و)یەکاندا گرفتی یەك (و) و دوو (و) پتر ئاشکرا دەبێ، چونکە لە هەشت چاوگە (و)یەکەی شێوەی نووسینی ناوەڕاستدا، دوو چاوگ، یەك (و)یان هەیە، کە مۆڕفیمی کاتی ڕابوردووە و شەش چاوگ، دوو (و)یان هەیە: یەکێکیان لەگەڵ ڕەگی کارەکە دایە و یەکێکیان مۆڕفیمی کاتی ڕابوردووە، وەك لەم خشتەیەدا دیارە:

| چاوگ لە شێوەی نووسیندا | چاوگ لە هەندێ شێوەزاری تردا | ڕەگی چاوگ | مۆرفیمی کاتی ڕابوردوو | (ن)ی چاوگ |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| بوون | بین | بـ | و / یـ | ن |
| چوون | چین | چ | و / یـ | ن |
| جوون | جوین/جاوین | جو | و / یـ | ن |
| دروون | دروین/دوورین | درو | و / یـ | ن |
| سوون | سوین/سوان | سو | و / یـ / ا | ن |
| فەرموون | فەرموین | فەرمو | و / یـ | ن |
| گروون | گروین/گروان | گرو | و / یـ / ا | ن |
| هەنوون | هەنوین | هەنو | و / یـ | ن |

٤ـ تێبینی ئەوە دەکرێ، دەنگی (و) زۆر جار لە دیالێکتی ژووروودا دەبێتە (ڤ)، وەك: (چاو/چاڤ)، (سێو/سێڤ)، (نووسین/نڤیسین)، (نوستن/نڤستن)، (ئەوین/ئەڤین)، (وڕەوڕ/ڤڕەڤڕ)، (سووڕایەوە/ڤەسڕا/ڤەزڤڕا)....هتد. لێرەدا مەبەست ئەوە نییە کامە دەنگ ڕەسەنترە، بەڵام مەبەست ئەوەیە لە دیالێکتی ژووروو و ناوەڕاستدا لەم جۆرە وشانە دەبنە ئەلۆفۆنی یەکتر، بەڵام گرفتەکە لەوەدایە لە هەندێ وشەدا هەرگیز (و) نابێتە (ڤ)، وەك لە (وەرە، کوشتن، ....)، هەروەها (و)ی درێژ نابێتە (ڤ)، یان لە هەندێکیان (ڤ) نابێتە (و) وەك لە (مرۆڤ، ڤیان،....). لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا دەتوانرێ دەنگی (ڤ) بکرێتە ئەلۆفۆنێکی دەنگی (و)، چۆنیەتی گۆکردنەکەشی بە پێی وشەکە دەگۆڕێ، هەروەکو ئەم دیاردەیە لە زمانی فارسیدا زۆر باوە. ڕێژەی بەکارهێنانی دەنگی (ڤ) لە دیالێکتی ناوەڕاستدا زۆر دەگمەنە، بەڵام لە دیالێکتی ژووروودا زۆرە، بۆیە ئەو پێشنیارە پتر تایبەتە بە دیالێکتی ژووروو. بەڵام ئەگەر ئەوە بکرێ دەبێتە هەنگاوێکی مەزن بەرەو پتر نزیکبوونەوەی هەردوو دیالێکتەکە. بەم شێوەیە ئەم وشانەی وەکو

(کەو، شەو، چاو، لێو، سڵاو، ئەوین، ناو، سوڕان، نوستن، شوان .......هتد)، لە ناوەڕاست بە (و) دەخوێنرێنەوە و لە ژووروویش بە (ڤ) دەخوێنرێنەوە.

**ئەنجام و پێشنیار:**

لە کوردیدا دەنگی (و) کورت بێ یا درێژ، یەك فۆنێمە و پێویست بەوە ناکا بە دوو شێوە بنووسرێ، چونکە واتا ناگۆڕێ، تەنیا وشەی (کووڕ) پێویستە بە دوو (و) بنووسرێ، لەگەڵ ڕەچاوی چاوگە (و)یەکان، وەك لە خشتەی سەرەوە. هەروەها دەشێ دەنگی (ڤ)ش بە ئەلۆفۆنێکی (و) دابنرێ.

پێنجەم ـ گرفتی دەنگی یەك (ی) و دوو (یی):

| yary, yeryvan, dyary | y | یاری، یەریڤان، دیاری | ی | ٣٣- |
|---|---|---|---|---|

نووسینی پیتی (ی) بە تایبەتی ئەگەر لە سەرەتای وشە بێ، گرفت پەیدا ناکا، بەڵام گرفتەکانی نووسینی (ی) لەم دۆخانەدا پەیدا دەبێ:

١ـ کاتێ ناوێك کۆتایی بە پیتی (ی) هاتبێ و بەهۆی (ی) ئامرازی پەیوەندییەوە بە ناوێکی تر ببەسرێتەوە، پێویستە ڕەچاوی ئەوە بکرێ، کە سەرجەم دەبێتە دوو (ی)، وەك:

- ئازادیی کوردەکان، بە ڕادەی ڕۆشنبیریی گەلانی دەوروبەرەوە بەندە.
- شانۆگەریی ـ یاریی منداڵان ـ پەریی خوشکم ئامادەی کردبوو.

لە گۆکردندا ئەم دوو (یی)ە وەك یەك (ی) گۆ دەکرێن، چونکە دەکەونە یەك بڕگە و دەنگی (ی)ـە بزوێنەکە دەنگی (ی)ـە نەبزوێنەکە خامۆش دەکا.

٢ـ کاتێ ناوێك کۆتایی بە پیتی (ی) هاتبێ و ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاك یان کۆی (دەستەی خاوەنی)ی بە دوادا بێ، دەبێ ڕەچاوی ئەوە بکرێ، دەبێتە دوو (ی)، وەك:

- کوردەکان ئاشتی خوازن، ئازادییان لێ زەوت مەکەن.
- ئەو قوتابیە زۆر زیرەکە، دیاریی پێ بدەن.

٣ـ کاتێ ناوێك کۆتایی بە دوو پیتی (یی) هاتبێ و بەهۆی (ی) ئامرازی پەیوەندییەوە بە ناوێکی تر ببەسرێتەوە، یان ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاك یان کۆی (دەستەی خاوەنی)ی بە دوادا بێ، پێویستە ڕەچاوی ئەوە بکرێ، کە لە رووی تیۆرییەوە سەرجەمیان دەبێتە سێ (ی)، وەك:

- **شاییی** دووانە، گڕ لە هەمووانە.
- لە بۆ**شاییی** ئاسمان کێشی مرۆڤ کەم دەبێتەوە.
- **شاییيان** لێ مەکەن بە شین.
- بۆ**شاییی** بۆ بە جێ بهێڵە.

بەڵام لە ڕووی پراکتیکییەوە، نووسینی سێ (ی) ئاسان نییە و لە ڕووی گۆکردنیشەوە، هەروەك دوو (ی) گۆ دەکرێن، بۆیە وا پەسەند دەکرێ کە هەر بە دوو (ی) بنووسرێ.

٤ـ لە کاتی نووسینی کاری ڕابوردوو لە چاوگە (ی)یەکاندا، کارەکە کۆتایی بە (ی)ی مۆرفیمی کاتی ڕابوردوو دێ، بۆیە دەبێ ڕەچاوی بە دوادا هاتنی ئەو ڕاناوە لکاوانە بکرێ، کە یەکەم پیتیان (ی)ـە، وەك:

- من فڕیم ، تۆ فڕ**یی** ، ئەو فڕیØ ، ئێمە فڕ**یی**ن ، ئێوە فڕین ، ئەوان فڕین.
- من خزیم ، تۆ خز**یی** ، ئەو خزیØ ، ئێمە خز**یی**ن ، ئێوە خزین ، ئەوان خزین.
- من کڕیم ، تۆ کڕیت ، ئەو کڕ**یی** ، ئێمە کڕیمان ، ئێوە کڕیتان ، ئەوان کڕ**ییان**.
- نووسیم ، نووسیت ، نووس**یی** ، نووسیمان ، نووسیتان ، نووس**ییان**.

٥ ـ کاتێ دەنگێکی بزوێن بە تایبەتی (ـە) بە دوای دەنگی (ی)دا دێ، ئایا دەبێ بە دوو (ی) یان نا؟. لەم بارەدا لە بەر ئەوەی (ی) نیمچە بزوێنە دەشێ بە پێی دابەشی بڕگەکان، بزوێن بێ یا نەبزوێن. واتە: ئەگەر دەنگی (ی) و دەنگی (ـە) هەردوویان بە بزوێن دابنرێن و هەر یەکە لە بڕگەیەك دابنرێن، ئەوا پێویستییان بە (ی)ێکی ناوبڕی نەبزوێن دەبێ، بەڵام ئەگەر هەردوویان لە یەك بڕگە کۆ بکەینەوە، ئەوا دەنگی (ی) دەبێتە نەبزوێن و پێویست بە (ی) ناوبڕی نەبزوێن ناکا، وەك:

| ئەگەر (ی) بە نەبزوێن دابنرێ (یەك بڕگە) | ئەگەر (ی) بە بزوێن دابنرێ (دوو بڕگە) |
|---|---|
| ئەم بابەتە دەنگ/سا/زیە. یان دەنگ/ساز/یە.<br>ئەم هەژارە پارەی /نییە/.<br>ئەم بۆ/شای/یا/نە پڕ بکەوە.<br>دیار/یێ/کی بۆ بنێرە. | ئەم بابەتە دەنگ/سا/زی/یە.<br>ئەم هەژارە پارەی /نی/یە/.<br>ئەم بۆ/شا/یی/یا/نە پڕ بکەوە.<br>دیا/ری/یێ/کی بۆ بنێرە. |

ئاشکرایە، جۆری یەکەم ئاسانتر و بێ گرفتترە، لە ڕووی پڕاکتیکییەوە.

**ئەنجام و پێشنیار:**

ئەو وشانەی کۆتاییان بە یەك پیتی (ی) یان دوو پیتی (یی) دێ و پاشگرێکیان بە دوادا دێ، کە بە پیتی (ی) دەست پێ بکا، پێویستە لە نووسیندا فەرامۆشی هیچیان نەکرێ، ئەگەر لە گۆکردنیشدا دەرنەکەون. هەروەها ئەگەر دەنگی (ی) بزوێنێکی بە دوادا هات وا ئاسانترە، هەردووکیان لە بڕگەیەکدا کۆ بکرێنەوە، تاکو پێویست بە (ی)ێکی تری ناوبڕ نەکا.

# بەشی دووەم

## (تەوەری یەکەم)

## ((گرفتەکانی نووسین بە ئەلفوبێی هاوشێوەی لاتینی))

**پێشەکی:**

لێرەدا بە پێویست نازانرێ باسی مێژووی نووسینەوەی ئـەلفوبێی کـوردی بە هاوشێوەی عەرەبی یان لاتـینی بکـەین، چـونکە مەبەسـت ئەوەیـە کـورتترین و ئاسانترین ئەلفوبێ بخرێتە ڕوو کە بە شێوەیەکی گشتی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستان بە ئاسـانی پێـی بنووسـێ و بـە شـێوەیەکی تایبـەتیش ئاسـان بـێ بـۆ هەموو منداڵانی کورد بە ئاسانی فێری ببن و پێی بنووسن.

لە بەشی یەکەمدا زۆربەی گرفتەکان بە پیتی هاوشـێوەی عـەرەبی خرانـە ڕوو. هەڵبەتــە ئــەم گرفتانــە نووســینی کــوردی بــە پــیتی هاوشــێوەی پیتــە لاتینییەکانیش دەگرێتەوە، بۆیە بە پێویستی نازانین لێرەدا دووبارەی بکەینەوە. تەنیا ئەو گرفتەی لە بەشی یەکەمدا باس نەکراوە گرفتی دەنگی بزرۆکـە(i)یـە کـە لە نووسین بە پیتی هاوشێوەی عەرەبی دەرناکەوێ، بۆیە لەم بەشەدا تەنیا باسـی ئەو گرفتە دەکەین:

گرفتی دەنگی بزرۆکە (i):

| min, girtin, wirid | i | من، گرتن، ورد | 00 | -٣٥ |
|---|---|---|---|---|

چەند سەرنجێکی گرنگ دەربارەی بزرۆکە تێبینی دەکرێن:

١ـ بزرۆکە (کسرة مختلسة) ئـەو کورتـە دەنگەیـە، کـە دەکەوێتـە نێـوان دوو نەبزوێن، واتە، لە ئەنجامی گواستنەوەی شوێنی دروستبوونی نەبزوێنی یەکـەم بـۆ نەبزوێنی دووەم لە ناو دەمدا، نەختێك هـەوا دەردەچـێ و ئـەم بزرۆکەیـە دروسـت دەکا. بۆ نموونە: لە وشـەی (مـن)دا، هـەردوو دەنگـی (م) و (ن)دا هـەوا لـە لـووت دەردەچێ، بەڵام لە (م)دا جووتبوونی لێوەکان ڕێگە لە هـەوای دەم دەگـرێ و لـە (ن)دا جووتبـوونی پێـشەوەی زمـان و پێـشەوەی مەڵاشـوو ڕێگـەی هـەوای دەم

دەگرێ، بەڵام تا قسەکەر لێوەکان لێك دەکاتەوە و پێشەوەی زمانی بەرز دەکاتەوە بۆ پێشەوەی مەڵاشوو، نەختێ هەوا لە میانی ئەو کرداری ڕاگوێزانە دزە دەکا و لە دەم دەچێتە دەرەوە، بەم برە هەوایە بزرۆکە دروست دەبێ. ئەم برە هەوایەش ئەگەر لە نێوان دوو دەنگی کپ بێ، وەك: ( خت، کش، چك، پف، کپ ...) بە کپی دەردەچێ و ئەگەر لە نێوان دوو دەنگی گڕ بێ بە گڕی دەردەچێ، وەك: ( من، ژن، گف، بن، بف، گن ...)، بەڵام لە نێوان گڕێك و کپێك یان بە پێچەوانە، ئەوا خۆیشی بە ڕێژەی کاریگەریی هەر یەکێك لە دوو دەنگەکە گڕ و کپی تێ دەکەوێ. ئەم سیمایەش لە دەنگەکانی تر بەو ڕێژەیە نییە کە کپی و گڕیان بە تەواوی بگۆڕێ.

٢ـ دانان و دانەنانی، واتە، نووسین و نەنووسینی نابێتە هۆی تێکدان یان گۆڕینی واتای وشەکە، وەك: (مـiـن، کورiد، جـiـوان ... / من ، کورد ، جوان ...)، کەواتە: ئەم دەنگەش پێناسەی فۆنێمی بە سەردا ناسەپێ و فۆنێم نییە و دیاردەیەکی فۆنەتیکییە.

| Texts/teksts/, Actions/ækʃns/ | Min,Kurid,Ciwan | مـiـن، کورiد، جـiـوان |
|---|---|---|

٣ـ ئەم دیاردە فۆنەتیکییە لە زمانی تریشدا هەیە، وەك لە هەندێ وشەی ئینگلیزیدا پتر لە سێ کۆنسونانت بەدوا یەکدا دێن و دیاردەکە بە هێشووە کۆنسونانت (Consonant Cluster) ناو دەبەن وەك لە (/Texts/teksts تێکستس)، (/Actions/ækʃns ئەکشنس)، (Students/stju:dnts ستیودنتس ...).

ئایا بۆ لە زمانێکی تری هیندۆـ ئەوروپی ئەبێ چوار نەبزوێن بە دوای یەکدا بێن و لە کوردی نابێ؟ جگە لەمەش بە پێوەری ئێمە بێ، لە نێوان هەموویان ئەم بزرۆکە هەیە.

٤ـ لە بڕگەکاریدا هەندێ جار (i) دەنگێکی ئارەزوومەندە، واتە، پەیدا دەبێ یان پەیدانابێ، بە تایبەتی لە پێش بڕگەی (وان)دا. بۆ نموونە: ئەگەر هەر یەك لەم

وشانە ( /شوان/ ، /جوان/ ، /ژوان/ ...) بە بڕگەیەك دابنێین، ئەوا بزرۆكە پەیدا نابێ، بەڵام ئەگەر بە دوو بڕگەیان دابنێین، ئەوا بزرۆكە پەیدا دەبێ ( /شـ i/وان/ ، /جـ i/وان/ ، / ژ i/وان/ ...). ئەمەش لەگەڵ سیمای فۆنێم ناگونجێ.

**ئەنجام و پێشنیار:**

ئەگەرچی بزرۆكەش وەكو هەمزە ناتوانرێ نكوڵی لە بوونی بكرێ، بەڵام پەیدا بوونی دیاردەیەكی فۆنەتیكییە نەك فۆنۆلۆجی و نووسینی و نەنووسینی نە واتا دەگۆڕێ و نە واتا تێك دەدا، كەواتە: فۆنێم نییە و پێویست ناكا نرخێكی بۆ دابنرێ و پیتێكی بۆ تەرخان بكرێ. بەمەشدا دەبێ بە یاساكانی بڕگەكاریدا بچینەوە و بڕگەی فۆنەتیكی و بڕگەی فۆنۆلۆجی لە یەك جیا بكەینەوە و دان بەوەدا بنێین بڕگەی فۆنەتیكیمان هەیە كە فۆنێم یا پیتی بزوێنی لە نێواندا نییە، وەك: (من، ژن، گڤ، بن، بڤ، گن، خت، كش، چك، پف، كپ ...) كە ڕەنگە دەنگی نێوانیان گڕ یا كپ بێ. هەروەها دەبێ دان بە بوونی ( هێشووە كۆنسونانت) بنێین لە زمانەكەماندا، هەڵبەتە لێرەدا پێویست دەكا بە یاساكانی بڕیار لەسەردراو بۆ بڕگەی كوردیدا بچینەوە و وەكو یاساكانی بڕگەی زمانە هیندۆ–ئەوروپییەكان ڕاستیان بكەینەوە نەك بە پێوەری بڕگەسازی زمانی عەرەبی بیپێوین.

## (تەوەری دووەم)

## (( پێداچوونەوەی بڕگەسازیی كوردی ))

زۆر لە شارەزایانی بڕگە سازیی كوردی ئەو سیستەمەی لەسەری ڕاهاتوون لە بڕگەسازی كوردی دەكەن بە بیانوویەك بۆ بۆچوونی ئەوەی نابێ پیتە كوردییەكان دەسكاری بكرێن، چونكە سیستەمی بڕگەسازیی كوردی تێكدەچێ، بۆ نموونە لەو سیستەمەدا هاتووە كە بڕگەی كوردی هەرگیز بە بزوێن دەست پێ ناكا، یان بڕگەمان نییە یەك پیت، یەك بزوێن یان یەك نەبزوێن بێ ....هتد. لە ڕاستیدا ئەم بڕیارانە هەر لە توێژەرانی تروەوە هاتوونەتە خوارەوە و سیمای پیرۆزییێكی

پەروەردگارییان پێوە نییە تاكو نەگۆڕێن یان دەسكاری نەكرێن و هیچ زانستێك نییە گۆڕانی بەسەردا نەیێ.

لە ژێر تیشكی ئەم دەسكارییانەی پێشتر خرانە ڕوو، سیستەمی بڕگەسازیی كوردیش گۆڕانی بەسەردا دێ و لە سیستەمی ڕەسەنی گرووپی زمانەكانی هیندۆئوروپی نزیك دەبێتەوە و بە پێچەوانەش لە سیستەمی گرووپی زمانە سامییەكان دەردەچێ. بەم پێیە سیستەمی بڕگەسازیی كوردی بەم شێوەیە دەبێ:

(/C/= نەبزوێن / كۆنسونانت)، (/V/= بزوێن / ڤاول).

| | | | |
|---|---|---|---|
| ١ | **پ: نان دەخۆی؟. و:** /a/ا/، /ە/خۆم /e/xom | V | **دایك: وەرە ژوورەوە. منالّ:** /ێ/ێ/ê/ê/ ...... |
| ٢ | /تۆ/ /to/، /نا/ /na/،/نۆ/ /no/،...... | C V | /دا/دە/ /da/de/، /با/بە/ /ba/be/..... |
| ٣ | /او/ /aw/، /اش/ /as̱/، /ەو/ /ew/،.... | V C | /ای/ /ay/، /ۆی/ /oy/، /ەز/ /ez/....... |
| ٤ | /مەڕ/ /r̂/me/، /كەڕ/ /r̂/ke/، /سەر/ /ser/ | C V C | /كەف/ /kef/، /شەو/ /ŝew/، /سێو/ /sêw/ |
| ٥ | /برا/ /bra/، /خوا/ /xwa/، /خوێ/ /xwê/ | CC V | /ترێ/ /trê/، /درۆ/ /dro/، /شلە/ /ŝle/... |
| ٦ | /ەرك/ /erk/، /ەشك/ /eŝk/، /ەسپ/ /esp/ | V CC | /ەرد/ /erd/،...... |
| ٧ | /شوان/ /ŝwan/، /ژوان/ /jwan/، | CC V C | /جوان/ /cwan/، /دووان/ /dwan/،...... |
| ٨ | /دەست/ /dest/، /دەشت/ /deŝt/، | C V CC | /هەشت/ /heŝt/، /خەست/ /xest/، /ڕاست/ |
| ٩ | **پ: دەچی بۆ بازاڕ؟ و:** /چ[٢٧]/، /ب/ناڤێ خودێ... | C | /ل/اسمانێ /b/navê xwdê/l/asmanê |

| /مل//ml/، /دز//dz/، /کڕ/r̂/k/، /سك/... | C C | /من//mn/، /ژن//jn/، /کل//kl/، /شل/ | ١٠ |
|---|---|---|---|
| /سرك//srk/، /وشك//wŝk/، /پشت/..... | C C C | /پرچ/ĉ/pr/، /مرد//mrd/، /گرد//grd/ | ١١ |

(دەشێ بڕگەکانی زنجیرە (٦، ٧و ٨) بە پێی پێویستی شیعرەکە دابەشی دوو بڕگە بکرێن)

## (تەوەری سێیەم)

## (( چەند نموونەیەك لە ئەلفوبێی هاوشێوەی لاتینی ))

لێرەدا چەند نموونەیەك لە ئەلفوبێی هاوشێوەی لاتینی دەخەینە ڕوو کە تا ڕادەیەك جیاوازییان هەیە و تا ئێستا لە لایەن سەرجەم نووسەر و سەنتەرەکانی نووسین و دەزگاکانی ڕاگەیاندنی بینراو بە تەواوی پەیڕەو ناکرێن.

١ـ (لە ساڵی ١٩٢٠دا مامۆستا موحەممەد زەکی و میرزا موحەممەد باشقە ئەلفوبێیەکی کوردییان بە پیتی لاتینی بڵاوکردەوە، بە ناوی ((کتابی اولمینی قرائەتی کوردی))یەوە لە چاپخانەی حکومەت لە بەغدا چاپیان کرد)[٢٨]:

| ك | k | ج | j | ی | i | گ | g | ف | f | ه | e | د | d | س | c | ب | b | ا | A |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| وو | u | ت | t | س | s | ر | r | ق | q | پ | p | ۆ | o | ن | n | م | m | ل | l |
| ژ | zh | پ | th | ش | sh | خ | kh | غ | gh | ژ | dh | چ | ch | ز | z | یی | y | و | w |

٢ـ (حاجی جندی لە ساڵی ١٩٣١دا، قرائەتی ((کتێبا ئەلفبا)) ی بە لاتینی ـ ڕووسی ـ فەرەنسی دانا)[٢٩]:

| ژ | [illegible] | ز | z | ر | r | د | d | ج | c | خ | x | ح | h | ت | t | ب | b | ا | A |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| وو | u | و | y | ێ | e | چ | ç | ه | ə | بزرۆکە | ɓ | یی | i | ۆ | o | ی | j | پ | p |

٣- (تۆفیق وەهبی بەگ، لە ساڵی ١٩٣٣دا، قرائەتێکی کوردی ((خوێنـدەواری باو)) بە پیتی لاتینی)[٣٠]:

| ر | r | د | d | خ | x | ح،ه | h | چ | ch | ج | c | ت | t | پ | p | ب | b | ا | A |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ك | k | ق | q | ڤ | v | ف | f | غ | gh | ش | sh | س | s | ژ | j | ز | z | ڕ | rh |
| ێ | ê | ی | y | ۆ | o | وو | u | و | w | ن | n | م | m | ڵ | lh | ل | l | گ | g |
| | | | | | | | | | | | | | | ه | e | بزرۆکە | i | یی | iy |

٤- (کامەران عالی بەدرخان لە ١٩٣٨دا، لە شام ((ئـەلفابێیا مـن))ی بـە پـیتی لاتینی - فەرەنسی ئامێز بڵاوکردەوە)[٣١]:

| ر | r | د | d | خ | x | ح،ه | h | چ | ç | ج | c | ت | t | پ | p | ب | b | ا | A |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| گ | g | ك | k | ق | q | ڤ | v | ف | f | غ | ẍ | ش | s̭ | س | s | ژ | j | ز | z |
| ی | î | بزرۆکە | i | ێ | ê | ه | e | ۆ | o | وو | u | و | w | ن | n | م | m | ل | l |

٥ـ (جـەمال نەبـەز لـە سـاڵی ١٩٥٧دا لـە ژێـر نـاوی ((نووسـینی کـوردی بـە لاتینی)) قرائەتێکی دانا)[٣٢]:

| ه | h | گ | g | ف | f | ێ | ê | ه | e | د | d | چ | ç | ج | c | ب | b | ا | A |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ۆ | o | ن | n | م | m | ڵ | Ï | ل | l | ك | k | ژ | j | ی | î | بزرۆکە | i | ح | ḧ |
| ڤ | v | وو | ü | و | u | ت | t | ش | s̭ | س | S | ڕ | ȑ | ر | r | ق | q | پ | p |
| | | | | | | | | | | ز | z | ێ | y | غ | ẍ | خ | x | وێ | w |

٦ـ موقەدەم عەزیز ئاکرەیی لە ساڵی ١٩٦٧دا بە کوردی لاتینی پـەڕتووکێکی وێنەداری بە ناوی ((فێربوونا زمانێ کوردی ب لاتـینی)) لـە چـاپخانەی کوردسـتان چاپ کردووە[٣٣]:

| A | ا | b | ب | c | ج | ç | چ | d | د | e | ە | ê | ێ | f | ف | g | گ | h | ھ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| i | بزرۆکە | î | ی | j | ژ | k | ك | l | ل | m | م | n | ن | o | ۆ | p | پ | q | ق |
| r | ر | r̂ | ڕ | s | س | s̭ | ش | t | ت | u | ع | û | وو | v | ڤ | w | و | x | خ |
| y | ی | z | ز | | | | | | | | | | | | | | | | |

٧ـ (گیو موکریانی لە ساڵی ١٩٧٢دا بە کوردی لاتینی ئەلفوبێیەکی وێنـەداری لە شکلی قرائەتدا بڵاوکردۆتەوە)[٣٤]:

| A | ا | b | ب | c | ج | ç | چ | d | د | e | ە | ē | وێ | ê | ێ | f | ف | g | گ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| g̱ | گی | h | ھ | ḧ | ح | i | ی | î | یی | j | ژ | k | ك | k̲ | کی | l | ل | Ï | ڵ |
| m | م | n | ن | o | ۆ | p | پ | q | ق | r | ر | r̈ | ڕ | s | س | s̭ | ش | t | ت |
| u | و | û | وو | v | ڤ | w | و | x | خ | ẍ | غ | y | ی | z | ز | | | | |

٨ـ د.بائیز عومەر ئەحمـەد، لـە سـاڵی ٢٠٠٧ لـە وتـارێکی بـە نـاوی (ئـەلفبێی یەکگرتووی کوردی بـە تیپـی لاتـینی)[٣٥]، سـی و یـەك پـیتی هاوشـێوەی ئەلفبێیـە دەسکاریکراوەکەی جەلادەت بەدرخانی[٣٦] بۆ زمانی کوردی داناوە:

| A | ا | b | ب | c | ج | ć | چ | d | د | e | ی | é | ێ | f | ف | g | گ | h | ھ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| h′ | ح | i | بزرۆکە | j | ژ | k | ك | l | ل | m | م | n | ن | o | ۆ | p | پ | q | ق |
| r | ر | s | س | ś | ش | t | ت | u | ئ | v | ڤ | w | و | x | خ | ẋ | غ | y | ی |
| z | ز | | | | | | | | | | | | | | | | | | |

## (تەوەری سێیەم)

## (( ئاسانترین ئەلفوبێی کوردی ))

لەم ڕۆژگارە ناسك و هەستیارەی نەتەوەی کورد پیایدا تێدەپەڕێ، کە پارچە پارچەیی هەموو لایەنەکانی خاك و زمان و ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتیی گرتۆتەوە، زۆر پێویستی بە هەنگاو و کرداری خۆنەویستانە و هەماهەنگی و یەکانگیرییە. پێویستی بە وەلانانی خاڵە ناکۆك و کێشەدارەکانە و تێکەڵبوونەوەیە لەسەر بنەڕەتی خاڵە هاوبەش و بێ گرفتەکان.

تا ئێرە لە ڕووی دەنگسازییەوە گرفتی دەنگە کێشەدارەکان باس کرا و ئەنجام و پێشنیارەکان خرانە ڕوو. کە گەیشتینە ئەم ئەنجامانە:

١ـ دەنگی هەمزە (ئـ): دەنگێکە و هەوای بزوێنەکانی سەرەتای بڕگە دەگرێتەوە و فۆنێم نییە و نابێ پیتی بۆ دابنرێ.

٢ـ دەنگی (ح) دەنگێکی ڕەسەنی کوردی نییە و دەتوانرێ بە ئەلۆفۆنێکی دەنگی (هـ) دابنرێ و بە فۆنێم دانەنرێ و لە لیستی پیتەکان بسڕێتەوە.

٣ـ دەنگی (ع) دەنگێکی ڕەسەنی کوردی نییە و دەشێ بکرێ بە هەمزە و وەکو هەمزە مامەڵەی لەگەڵ بکرێ و لە لیستی پیتەکان لابدرێ.

٤ـ دەنگی (غ) دەنگێکی ڕەسەنی کوردییە، بەڵام بەرەو لەناوچوون دەچێ و دەگۆڕێ بۆ (خ). دەشێ بە ئەلۆفۆنێکی فۆنێمی (خ) دابنرێ و لە لیستی پیتەکان بسڕێتەوە.

٥ـ دەنگی (وو) بە هەر شێوەیەك بنووسرێ کار لە گۆکردنی ناکا و زۆر ئاساییە ئەگەر لە لیستی پیتەکان نەمێنێ و بە ئەلۆفۆنێکی (و) دابنرێ.

٦ـ دەشێ دەنگی (ڤ) بە ئەلۆفۆنێکی فۆنێمی (و) دابنرێ.

٧ـ دەنگی بزرۆکە (i) هەر لە بنەڕەتدا فۆنێم نییە و نووسین و نەنووسینی کار لە هیچ وشەیەك ناکا و پێویستە لە لیستی فۆنێمەکان نەمێنێ.

هەرچەندە لە ڕووی دەنگسازی و فۆنۆلۆجی کوردی، سڕینەوەی (٦) پیتی کێشەدار لە ئەلفوبێی کوردی کارێکی شیاوە و سەرجەم گرفتەکانی

نووسینمان بۆ چارەسەر دەکا، بەڵام ڕەنگە بەهۆی ڕاهاتنمان لەسەر نووسینیان نەختێ ئاسان نەبێ. بۆیە لێرەدا پێویستە ڕەچاوی سوودەکانی بکەین:

١- یەکگرتنەوەی نووسینی کوردی لە سەرجەم پارچە و دیالێکتە کوردییەکان. بەتایبەتی ئەگەر بە پیتەکانی هاوشێوەی لاتینی بنووسرێن.

٢- لادانی ئەم پیتانە دەمانگێڕێتەوە بۆ ڕیزبەندی خێزانی زمانە هیندۆ ئەورووپییەکان، کە خەریکە لەو خێزانە دوور دەکەوینەوە. بەتایبەتی ئەگەر بە پیتەکانی هاوشێوەی لاتینی بنووسرێن. بە پێچەوانەش هەنگاوێك لە کلتووری هەندێ نەتەوەی کۆنەپەرستی داگیرکەری کوردستانیش دوور دەکەوینەوە.

٣- منداڵانی کورد لە هەموو دیالێکت و پارچەکانی کوردستان زۆر بە ئاسانتر فێری خوێندنەوە و نووسین دەبن و هاوهەست و هاوسۆزییەکی زیاتریش لە نێوانیان دروست دەبێ.

٤- ئێستا ڕۆژگاری ئامێرە ئەلکترۆنییەکان و شارستانییەتی ئینگلیزی زمانەکانە، نووسینی کوردی بە پیتە لاتینییەکان زیاتر نزیکمان دەکاتەوە لەو ئامێرانە و سیستەمی نووسین لە مۆبایل و کۆمپیوتەر و سەتەلایت و ...هتد بەو پیتانە زیاتر کاراسانیمان بۆ دەکا.

٥- لیستی ئەم پیتانە هانی خوێندەواران دەدا وشەی بێگانە بەکار نەهێنن و بگەڕێنەوە بۆ وشە کوردییە ڕەسەنەکان، بۆ نموونە لە جیاتی وشەی (شیعر) وشەی (هۆنراوە/هۆزان)، لە جیاتی وشەی (غەریب) وشەی (نامۆ) بەکاربێنن،...هتد.

٦- دەتوانرێ لەو پیتانەی وەك (چ، ش، ێ، ڵ، ڕ) کاتێ بە پیتەکانی هاوشێوەی لاتینی دەنووسرێن، هەر جۆرە سەر و ژێرێکیان بۆ دابنرێ دەگونجێ، بۆ نموونە بۆ پیتی (ش)، دەشێ بە هەر یەکێك لەم شێوانە بنووسرێ (ŠŜŚŞ)، بەڵام بۆ یەکخستن وا باشترە هەشت بن و لەسەرەوە بن.

لە ئاکامدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە سادەترین و ئاسانترین ئەلفوبێی کوردی، ئەو ئەلفوبێیەیە کە کەمترین ژمارەی فۆنێم یان پیتی هەبێ و پیتی کێشەدار و بە گرفتی تێدا نەبێ. هەروەها بە جۆرە پیتێك بنووسرێ کە لای هەموو ئەندامانی نەتەوەکە ناسراو بێ و لای هیچیان نامۆ نەبێ و سیما و ئەدگاری

جیهانی پێوەبێ، ئەویش پیتەکانی هاوشێوەی لاتینین، کە زۆربەی وڵاتانی جیهان بەکاری دەهێنن یان پێی نامۆ نین.

کەواتە لەسەر ئەو دەرەنجامە دەتوانین لیستی ((ئاسانترین ئەلفوبێی کوردی)) بەم شێوەیە ڕێك بخەین:

| nmwney r̂sta | nmwne | pyt | پیت | ژ |
|---|---|---|---|---|
| emr̂o ewen hatne êre. | ewan, were, derewe | e | ە | ١ |
| awarekan ger̂anewe. | aw, mastaw, awarekan | a | ا | ٢- |
| baran debarê, ba bĉyne jwrewe. | bax, berdbaran, nayab | b | ب | ٣- |
| perdaxêky pr̂ awm bo bêne. | perdax, kepr, top | p | پ | ٤- |
| êsta katy temate w trêye. | trê, temate, awat | t | ت | ٥- |
| le cejny hacyyan cly cwan depoŝyn. | cwceÎe, cêbecêkrdn, bac | c | ج | ٦- |
| ĉayxaney ĉawy ĉawm ĉay xoŝy heye. | ĉaw, kewĉk, xa ĉ | ĉ | چ | ٧- |
| bo ŝkandny r̂ojw xwardny xwrma xêre. | xwda, xwrma, bax | x | خ | ٨- |
| Dary azady be xwên aw dedrê. | dar, berd, bax | d | د | ٩- |
| pêrê ĉwme serdany braderany hewlêr. | trê, petate, serdan | r | ر | ١٠- |
| topêky westa r̂eceb le r̂wandz mawe. | êr̂baz, pr̂êew, per̂ | r̂ | ڕ | ١١- |
| zozan zryzeyeky zr̂êy le ml krdbw. | zozan, zryze, r̂ez | z | ز | ١٢- |
| (jnekey krd be jwany jwjkan.) pendy kwrdy | jwan, jwjk, kej | j | ژ | ١٣- |
| (sery leber hataw spy krdwe.) pendy kwrdy | sêw, dersym, aras | s | س | ١٤- |
| ŝeŝ honrawey peŝêwm | ŝew, peŝêw, ŝeŝ | ŝ | ش | ١٥- |

| xwêndewe. | | | | |
|---|---|---|---|---|
| (pŝtt sefyn bê tf le asn ke.) pendy kwrdy | fênk, sefyn, kef | f | ف | -١٦ |
| (qazancy qerec le geȓandaye.) pendy kwrdy | qerec, qerebw, boq | q | ق | -١٧ |
| kerkwk dÎy kurdstane. | kwrd, kerkwk, bwk | k | ك | -١٨ |
| pêŝmerge bergry le gely xoy deka. | gelawêĵ, bergry, merg | g | گ | -١٩ |
| lale w lempe hawwatay yektrn. | lawaz, kwlle, serpel | l | ل | -٢٠ |
| gwÎaÎe w bêxaÎ  xuŝky ŝamaÎn. | gwÎaÎe, qeÎew, samaÎ | Î | ڵ | -٢١ |
| merywan mywey bo mn hêna. | mywan, ŝamaÎ, ŝerm | m | م | -٢٢ |
| newroz cejny kurdane. | newroz, penyr, saman | n | ن | -٢٣ |
| behre w herêm hawêȓy hawarn. | hewaÎ, behre | h | ه | -٢٤ |
| (xwa le swÎtan mehmwd gewretre) p. k. | wrya, tewn, xaw | w | و | -٢٥ |
| le ŝndoxa le dhok doy xoŝ heye. | omer, dehoÎ, do | o | ۆ | -٢٦ |
| ŝwan dyaryêky cwany daye bêrywan. | yary, bêrywan, dyary | y | ی | -٢٧ |
| hewlêr paytexty herêmy kurdstane. | êre, hewlêr, dê | ê | ێ | -٢٨ |

بەم شێوەیە دەبینە خاوەنی (٢٨) پیت، کە هێشتا دوو پیتی لە زمانی ئینگلیزی زیاترە، کە ئێستا خەریکە دەبێتە زمانی ستاندەری جیهانی.

شایانی باسە بوونی دوو جۆرە پیتی گەورە (capital) و بچووك (small) كێشەیەكی تر دروست دەكا، بە پەسەند دەزانرێ تەنیا جۆری بچووكەكە هەبێ و خۆمان لەو گرفتە بپارێزین كەی بە گەورە و كەی بە بچووك بنووسین؟.

## (( ئەنجامەکان ))

١ـ دەنگی هەمزە (ئـ) لەو کاتانەدا پەیدا دەبیّ، کە دەنگێکی بزوێن (ا، ۆ، یّ، ە، ی، و) دەکەوێتە سەرەتای وشە، چونکە لە کاتی گۆکردنی دەنگە بزوێنەکاندا، دەم کراوەیە و هەوا بەبیّ هیچ بەربەستێك لە دەمی مرۆڤ دێتە دەرەوە. کەواتە فۆنێم نییە و پێویست ناکا نرخێکی بۆ دابنریّ و پیتێکی بۆ تەرخان بکریّ.

٢ـ هەردوو دەنگی (ح، ع) کوردی ڕەسەن نین و لە عەرەبی هاتوونەتە ناو زمانی کوردی و تا ئێستا وشەی ئەوتۆیان پیّ دروست نەبووە کە ئالۆگۆڕیان ببێتە هۆی واتا گۆڕان. دەشیّ دەنگی (ح) بکریّ بە ئەلۆفۆنی (ھ) و دەنگی (ع)یش لەبەر ئەوەی وشەی ئەوتۆی کوردی پیّ دروست نەبووە، دەشیّ بسڕێتەوە.

٣ـ دەتوانریّ دەنگی (غ) بە ئەلۆفۆنێکی (خ) دابنریّ و دەشیّ پیتی (خ) لە بری (غ)یش بنووسریّ.

٤ـ لە کوردیدا دەنگی (و) کورت بیّ یا درێژ، یەك فۆنێمە و پێویست بەوە ناکا بە دوو شێوە بنووسریّ، چونکە واتا ناگۆڕیّ. هەروەها دەشیّ دەنگی (ڤ)ش بە ئەلۆفۆنێکی (و) دابنریّ.

٥ـ پەیدابوونی دەنگی بزرۆکە (İ) دیاردەیەکی فۆنەتیکییە نەك فۆنۆلۆجی و نووسینی و نەنووسینی نە واتا دەگۆڕیّ و نە واتا تێك دەدا، کەواتە: فۆنێم نییە و پێویست ناکا نرخێکی بۆ دابنریّ و پیتێکی بۆ تەرخان بکریّ.

٦ـ سادەترین و ئاسانترین ئەلفوبێی کوردی، ئەو ئەلفوبێیەیە کە کەمترین ژمارەی فۆنێم یان پیتی هەبیّ و پیتی کێشەدار و بە گرفتی تێدا نەبیّ و بە جۆرە پیتێك بنووسریّ کە لای هەموو ئەندامانی نەتەوەکە ناسراو بیّ و لای هیچیان نامۆ نەبیّ ئەویش پیتەکانی هاوشێوەی لاتینین.

## سەرچاوەکان

١- ئەوڕەحمانی حاجی مارف، (گیروگرفتەکانی ڕێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی)، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عیراق "دەستەی کورد"، ب ٩، ١٩٨٢.

٢- ئەوڕەحمانی حاجی مارف، (نووسینی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی)، هەولێر، ١٩٨٥.

٣- بائیز عومەر ئەحمەد،(ئەلفبێی یەکگرتووی کوردی بە تیپی لاتینی)، گۆڤاری ئەکادیمی، کۆڕی زانیاری کوردستان، ژمارە ٥، ٢٠٠٧.

٤- حامید فەرەج،(ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا)، بەغدا، ١٩٧٦.

٥- عەزیز ئاکرەیی،(فێربوونا زمانێ کوردی ب لاتینی)، چاپخانەی کوردستان، ١٩٦٧.

٦- عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسول، (چەند پیتێکی کێشەدار لە نووسینی کوردیدا)، گۆڤارا زانکۆیا دهۆك، پەڕبەندا -٧-، هژمارا -١-، تیرمەهـ ٢٠٠٤.

٧- مارف خەزنەدار، (پاراستنی ئەدگاری نەتەوەیی لە وشەی فەرهەنگی زمانی نووسینی کوردیدا)، گۆڤاری ئەکادیمی، کۆڕی زانیاری کوردستان، ژمارە ٤، ٢٠٠٦.

## پەراوێزەكان

١ باسی داستانە پڕ سەروەرییەكانی كورد كەوتنە لاپەڕەكانی مێژوو و باسی سنوورە كۆنەكانی كوردستان كەوتنە لاپەڕەكانی جوگرافیا. با ڕاگەیاندن هەر هاوار بكا هەمەدان (ئەگباتان) پایتەختی ئیمپراتۆریەتی میدیا بوو و كەركووك (دڵ) یان (قودس)ی كوردستانە، بەڵام ئەمڕۆ داتاكان و ئامارەكان ڕۆڵی یەكلاكەرەوە دەبینن و لەسەر بنچینەی ڕێژەی كوردەكان لە هەر بستە زەوییەكی كورد بە موڵكی خۆی دادەنێ، بڕیاردەدرێ كە ئەم شوێنە كوردستانە یان نا. ئەمەشە وای لە داگیركەران كردووە هەموو جۆرە سیاسەتێك پیادە بكەن بۆ توانەوەی كورد و هەموو هەوڵێك دەدەن بۆ بە عەرەبكردن و تورككردن و فارسكردن.

٢ تۆفیق وەهبی لە ساڵی ١٩٢٩ ژمارەی پیتە كوردییەكانی بە (٤١) پیت داناوە، لە ساڵی ١٩٣٣ كردوویەتی بە (٣٨) پیت. سەعید سیدقی كابان (٣٧) پیتی بۆ كوردی دەستنیشان كردووە. ئێرنست مەكارەس پیتەكانی كوردی بە (٤٢) پیت داناوە.

٣ وشەی (گوڵ) و (وردە) و (Flower) هەمان واتان بەڵام دەنگەكانیان جیاوازن.

٤ (وەك ئاشكرایە (دەنگ) لە ڕێگای ئەندامەكانی ئاخاوتنەوە دەردەبڕێت و بە هۆی بیستنەوە هەستی پێ دەكرێ. (پیت) وێنەی دەنگە، بە نیشانە لە نووسیندا دیاركراوەو بەهۆی بینینەوە وەردەگیرێ.) (د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف _ گیروگرفتەكانی ڕێنووسی كوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی_ گۆڤاری كۆری زانیاری عیراق "دەستەی كورد"، ب ٩، ١٩٨٢، ل١٦).

٥ بڕوانە (گۆڤاری كۆڕی زانیاری عیراق "دەستەی كورد"، ب ٩، ١٩٨٢) كە تایبەتە بەم گرفتەی زمانی كوردی.

٦ (فۆنێم بەو دەنگانە دەوترێ كە لە زماندا وشە پێكدەهێنن و بە گۆڕان و لاچوونیان واتا دەگۆڕێن). (د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف _ گیروگرفتەكانی ڕێنووسی كوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی_ گۆڤاری كۆڕی زانیاری عیراق "دەستەی كورد"، ب ٩، ١٩٨٢، ل١٧).

٧ ("دەنگ" لە ڕێگای ئەندامەكانی ئاخاوتنەوە دەردەبڕێت و بە هۆی بیستنەوە هەستی پێ دەكرێ. "پیت" وێنەی دەنگە، بە نیشانە لە نووسیندا دیاركراوەو بە هۆی بینینەوە وەردەگیرێ). (هەمان سەرچاوە، ل١٦).

٨ ("فۆنێم" لە "دەنگ" گرنگترە، چونكە جیاوازی دەخاتە نێوان وشەوە. هەموو فۆنێمێك دەنگە، بەڵام هەموو دەنگێك فۆنێم نییە.). (هەمان سەرچاوە، ل١٧).

٩ ئـەم لیـستە بـە ئـەلفوبێی لاتـینی بـاو نەنووسـراوەتەوە، بـەڵکو تـەنیا هەڵبـژاردنی پیتێکـی لاتینییە بەرامبەر پیتێکی ئەلفوبێی عەرەبی. هەر بۆیەش بزرۆکە فـەرامۆش کـراوە، کـە لـە نێوان دوو نەبزوێنی تەك یەك دەردەکەوێ، جگە لـە هەنـدێ دەنگـی وەسـتاوی وەك (/ت/، /د/) لە کۆتایی وشەی یەك بڕگە وەك (kurd, kird, girt, wird). لە بنەڕەتـدا لەمانەشـدا هەیە، بەڵام هێندە کورتە دەرناکەوێ، چونکە شوێنی دەرچـەی ئـەم دەنگانـە زۆر لـە یـەك نزیکن.

١٠ هەر وشەیەك کۆتایی بە پیتی (ب) هاتبێ، گومانی لێ دەکرێ لە بنەڕەتدا کوردی بێ.

١١ ئەو وشانەی کۆتاییان بە پیتی (پ) دێ، لە کوردیدا کەمن.

١٢ ئـەم لیـستە بـەو مەبەسـتەی توێژینەوەکـەی لـە پێنـاودا کـراوە، بـە ئـەلفوبێی لاتـینی بـاو نەنووسراوەتەوە، بـەڵکو تـەنیا هەڵبـژاردنی پیتێکـی لاتینییـە بەرامبـەر پیتێکـی ئـەلفوبێی عەرەبی. بۆ نموونە لە بەرامبەر پیتی (و) هەر جۆرێك بێ، تـەنیا (W) بـەکاردێ و بەرامبـەر پیتی (ی) بە هەر جۆرێك بێ، تەنیا پیتی (y)ی لاتینی بەکاردێ.

١٣دەنگی (ه) ئەگەر لە پێشان لە کۆتایی وشـەکان هـەبووبێ، ئێـستا ئـەو دەنگـە لـە کۆتـایی سواوە و نەماوە، وەك لە (ڕێگاه، نیگاه، لە ڕاهی خوا، جێگاه، ڕەواه ← ڕێگـا، نیگـا، لـە ڕای خوا، جێگا، ڕەوا.....هتد).

١٤ کـاتێ دەنگـی (ت) یـان (د) بـە دوای دەنگـی (ر)دا دێـن، بزرۆکـە دروسـت نـابێ، چـونکە سوێنگەی دروستبوونیان زۆر لەیەك نزیکە و بواری دەرچوونی هەوا نامێنێ.

١٥ (چەند پیتێکی کێشەدار لە نووسینی کوردیدا)، د. عەبدوڵلا حوسێن ڕەسول، گۆڤارا زانکۆیا دهۆك، پەرپەندا -٧-، هژمارا -١-، تیرمەه ٢٠٠٤، ل٢.

١٦ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٣.

١٧هەردوو دەنگی ( و ) و (ی )، نیمچە بزوێنن، چونکە لە کاتی گۆکردنیـان ڕێـژەی کرانـەوەی دەم لە نێوان بزوێن و نەبزوێنەکاندایە، واتە" لە چوار بزوێنە سەرەکییەکە ( ا ، ێ ، ۆ ، ە) کەمتر کراوەیە و لە نەبزوێنەکان پتر کراوەیە، بۆیە ئەگـەر لـە بڕگەیەکدا یـەکێ لـەم چـوار بزوێنە سەرەکییەیان لە پێش یا لە دوا هات، خۆیـان بـە نـەبزوێن دادەنـرێن، بـەڵام ئەگـەر یەکێ لەم بزوێنانەیان لە تەك نەهات، ئەوا خۆیان دەبن بە بزوێن. ئەم دوو دەنگە لە نێـوان خۆشیاندا کامەیان لە سەرەتای بڕگە بێ نەبزوێنە ( وی ، یو ).

١٨ وشەی (ئوتوو=مکوی) لە شـێوەزاری سـۆرانی دەبێتـە (ئـوتی) و ئەگـەر بـەراوردی بکـەین لەگەڵ وشەی (وتی=قال) دەبینین دەنگی (و) لە (ئوتی=مکوی) بزوێنە بۆیە (ئـ) هـەمزەی بۆ دروستبوە، بەڵام لە (وتی=قال) نەبزوێنە و هەمزەی بۆ دروست نەبووە.

١٩ ژمارەی ئەو وشانەی دەنگی ( و ) یان ( یـ )ی نەبزوێنیان لـە سـەرەتا هـاتبێ زۆرن ، بـەڵام ژمارەی ئەو وشانەی ( و ) یان ( یـ )ی بزوێنیان لە سەرەتا هاتبێ زۆر دەگمەنن و ئەوانەش کە هەن زۆربەی لە بنەڕەتدا کوردی نین. هەروەها وشەی ڕەسەنی کوردی، دەنگـی ( ۆ )ی لە پێشەوە بێ ، دیسان زۆر کەمن:

| (یـ)ی بزوێن | (یـ)ی نەبزوێن | (و)ی بزوێن | (و)ی نەبزوێن |
| --- | --- | --- | --- |
| ئـیش (عـیش)، ئینجا(إن جاء)، | یەزدان ، یـار ، یـاری ، یان ، یانزە ، یاد ، یاسا ، یاسـاخ ، یانـە ، یەك ، | ئوتی ، ئوتێل ، ئومێد ، (زۆر جار دەنگی (هـ) لـە جیـاتی دەنگی (ئـ) بەکار دێ، دەشێ دەنگی (هـ) بنەڕەت بێ). | وریـــا ، وەرە ، ورچ ، وشە ، وشـتر ، وازی ، وێران ، وانـە ، ویـستن ، وشك |

٢٠ ئەم دەنگە لە سەرەتادا نەدەنووسرا، لە نووسینەکانی پێش ساڵی ١٩١٩ نیگاری هەمزە (ئـ) نابینرێ، بەڵام لە دواییدا بە لاساییکردنەوەی سەر و ژێـر و بـۆر (فتحـە، کسرە و چـمە)ی عەرەبی، یەکەم جار لە شێوەی (أ) و دواییش لە شێوەی (ئـ) لە نووسـینی کوردیـدا پەیـدا بووە. لە زمانی عەرەبیدا هەمزە فۆنێمێکە لادانـی دەبێتـە هـۆی واتـاگۆڕین . هەنـدێ جـار دەنگی هەمزە (و) دەکەوێتە کۆتایی ئەو وشانەی کۆتاییيان بـە بـزوێنی (ە) هـاتووە، وەك لە وەڵامدانەوە بە نەرێ: ( نەو، بەو )، ئەمەش دیسان بۆ گرتنەوەی هەواکە بە کار دێ.

٢١ (چەند پیتێکی کێشەدار لە نووسینی کوردیدا)، د. عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسول، گۆڤارا زانکۆیا دهۆك، پەڕبەندا –٧–، هژمارا –١–، تیرمەه ٢٠٠٤، ل٤.

٢٢ لە ڕێنووسی ئەم باسەدا وەکو پێشتر لە هەندێ پەراوێزدا ئاماژەی پێکرا، بـۆ هەنـدێ پـیتی ڕێنووسی هاوشێوەی عەرەبی پیتی ئینگلیزی لە بەرامبەریان هەڵبـژێرراون و بـۆ پـیتی (ع) پیتی ئینگلیزی (u) هەڵبژێرراوە.

٢٣ ئەم پیتانە (ح، ع) لەوە دەچن دوای هاتنی ئاینی ئیسلام و بە کاریگەریی زمانی عەرەبی لە سەر گەلانی ڕۆژهەڵات دروست بووبن، ئەگەرچی زۆربەی ئەو گەلانـەی کەوتونەتـە ژێـر ئـەو کاریگەریە تـا ئێـستاش نـاتوانن وەکـو خۆیـان گـۆ بکـەن، وەك گـەلانی فارسـی، بلـووجی، ئەسـیتی، پـشتو ....هتـد، زۆربـەیان (ح) دەکـەن بـە (ه) و (ع) دەکـەن بـە هـەمزە. وەك (محەممەد) دەبێتە (مهەممـەد) و (عـەلی) دەبێتـە (ئـەلی). لـە هەنـدێ ناوچـەی باشـووری کوردستانیش وەك پارێزگای هەولێر لای نەخوێندەواران ئاڵوگۆڕ یان تێکەڵ دەکرێن.

٢٤ ئەم دیاردەیە لای نەخوێندەواران زۆرە، بەڵام لە نووسیندا بە دەگمەن ڕوودەدا، بە تایبـەتی لای چینی ڕۆشنبیر، هەڵبەتە چینی نەخوێندەواریش بۆ لێکۆڵینەوەی وەسـفی شـیکاری بـە کەرەسە و سەرچاوەی پەسەندتر دەزانرێ لە چینی خوێندەوار کە دیاردە شارسـتانییەکان کاریگەریی زۆرتریان کردۆتە سەر شێوەی ئاخاوتنی خوێندەوار و ڕۆشنبیرەکان.

٢٥ (چەند پیتێکی کێشەدار لە نووسینی کوردیدا)، د. عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسول، گۆڤارا زانکۆیا دهۆك، پەڕبەندا -٧-، هژمارا -١-، تیرمەه ٢٠٠٤، ل١٠.

٢٦(پاراستنی ئەدگاری نەتەوەیی لە وشەی فەرهەنگی زمانی نووسینی کوردیدا)، مارف خەزنەدار، گۆڤاری ئەکادیمی، کۆڕی زانیاری کوردستان، ژمارە ٤، ٢٠٠٦، ل٢٠.

٢٧ ئەم پیتە بە پێچەوانەی هەموو پیتەکانی تر دوای نیمچە داخستنی دەم هەوا لە دەرەوە دەچێتە ژوورەوە.

٢٨ (ڕێنوسی کوردی لە سەدەیەکدا)، حامید فەرەج، بەغدا، ١٩٧٦، ل١٥.

٢٩ هەمان سەرچاوە، ل٢٥.

٣٠ هەمان سەرچاوە، ل٢٣.

٣١ هەمان سەرچاوە، ل٢٧.

٣٢ ڕێنووسی کوردی لە سەدەیەکدا)، حامید فەرەج، بەغدا، ١٩٧٦، ل٣١-٣٢.

٣٣ (فێربوونا زمانێ کوردی ب لاتینی)، موقەدەم عەزیز ئاکرەیی، چاپخانەی کوردستان، ١٩٦٧، ل٧-٩.

٣٤ (ڕێنوسی کوردی لە سەدەیەکدا)، حامید فەرەج، بەغدا، ١٩٧٦،ل٣٧-٣٨.

٣٥ (ئەلفبێی یەکگرتووی کوردی بە تیپی لاتینی)، د.بائیز عومەر ئەحمەد، گۆڤاری ئەکادیمی، کۆڕی زانیاری کوردستان، ژمارە ٥، ٢٠٠٧، ل٢٢٣.

٣٦ هەمان سەرچاوە، ل٢٢٧.

## ملخص البحث

تناول العديد من المقالات والبحوث كيفية كتابة الأبجدية الكوردية من حيث وجود الإختلاف في عدد الحروف و إختيار الأبجدية الشبيهة بالأبجدية العربية أو اللاتينية. ولكن للباحث آراء مختلفة جديدة بخصوص بعض الأصوات العلُ، مثل: (إ) الكسرة المختلسة، و (وو) الواو الطويلة. وبعض الأصوات الصحيحة، مثل: (أ) الهمزة الكوردية، ( ح ، ع ) الحاء والعين، ( خ ، غ ) الخاء والغين. وتمت دراسة كل حرف من هذه الحروف في محور خاص، وفي نهاية كل محور يقدم الباحث استنتاجاته بخصوص ذلك الحرف مع الإقتراحات التي يراها مناسبة لكتابة اللغة الكوردية بالحروف الغير السائدة المشابهة للحروف اللاتينية.

وفي النهاية قدم الباحث قائمة أبسط وأسهل أبجدية لكتابة اللغة الكوردية بالحروف الشبيهة بالأبجدية اللاتينية، حيث تتألف من (٢٨) حرفاً.

والبحث بصورة عامة يتألف من فصلين، يتناولان المشاكل المتعلقة بالأبجدية الشبيهة بالأبجدية العربية واللاتينية مع عرض الحلول والآراء المقترحة لكل منهما. إضافة إلى المقدمة يتضمن البحث ملخصاً باللغة العربية والإنكليزية مع قائمة المصادر المستعملة في البحث.

# Abstract

## ((Which Alphabet to Write?))

## Introduction

No doubt, one of the most important basics of any nation is language. Concerning Kurdish nation, Kurdish Language has been the most important factor behind its survival, and its existence is bounded by the existence and protection of Kurdish Language.

In addition to the lack of an agreed upon standard variety of Kurdish on the side of all speakers, it also has no unified system of writing. Some use Arabic scripts and others use Latin. The problem is even bigger than this, which is the disagreement about the number and type of letters in each system of alphabet.

This has been imposed by the reality of Kurdish issue due to the separation and division which has affected the demography and policy of all parts. Each part considers itself superior and does not follow any other part. The threatening problem is language and its unification is the most challenging.

This study is an attempt to introduce some scientific views and present some suggestions to unify the dialects hoping that it serves as an introduction to the unification of other aspects. Obviously, language is a combination of sound and meaning, i.e., the sounds carry meaning. The dialects and varieties are to some extent similar in meaning; what make them different are sounds. So the unification of sounds that represented by letters in writing is the easiest and most important and introductory step towards bringing the dialects together and consequently the first step towards the birth of a unified literary language.

The question here is that “Does the existence of two alphabetical systems each with differences and problems let any attempt be appropriate to the unification of all writing systems?” The answer is “yes” if all parts leave all biases and work on the

shared and approved aspects, which are by resorting to the origin rather than different varieties and dialects by adopting the shared and minimum possible number of letters accepted by all. This paves the way towards the unification and also easier child language acquisition.

In order to have the best and adoptable alphabet with easiest degree of acquisition, the study is organized as in the following:

The first section which is about the problem of writing with Arabic and Latin alphabet includes a list of all used 35 letters in both systems. They are sorted according to Arabic sequence of letters. Then, the problems or difficulties of any letter is dealt with according to the phonological rules the appropriate suggestions are given.

The second section is entitled the simplest Kurdish alphabet. On the light of the conclusions and suggestions of the first section, in this section there is a simple and easy list of Kurdish letters with some final suggestions. There are three texts as examples written according to the final list. Finally, in addition to the results and conclusions the research presents the summary in Arabic and English followed by the list of bibliography.

# دەڤەری ماردین لەچەند کتێبێکی (یاسین عومەری) دا

## توێژینەوەیەکی مێژوویی شرۆڤەکاری بەراوردکارییە

پ.ی.د.سەعدی عوسمان هەروتی
زانکۆی سەلاحەدین – هەولێر

### پێشـــەکی

دەڤەری ماردین بەدرێژایی چوار سەدەی حوکمڕانی عوسمانی چەندین هـەوراز و نشێوی بەخۆوە بینی و بەپێی سەنگ و ڕۆڵی خۆی چـەندین لاپـەڕەی لەمێـژوودا نەخشاند. هەندێ لەو لاپەڕانەی مێژووی ماردین لەلایەن مێژوونووسە عێراقییەکانی سەردەمی عوسمانی تۆمارکراون. بەتایبەتی یاسین عومەری (١٧٤٥– ١٨١٦)، کـە کتێبە مێژووییەکانی لەم لایەنەوە دەوڵەمەند و پڕلەزانیارین. بـەجۆرێك دەتـوانین بڵێین ئەم کتێبانە بەسەرچاوەی ڕەسەن و بەبایەخ دادەنرێن بـۆ مێـژووی دەڤـەری ماردین. چـونکە لەلایـەك ئـەم مێژوونووسـە هاوچـەرخی قۆنـاغێکی مێـژوویی ئـەم دەڤەرەیە کە پڕ بوو لەڕووداو و گۆڕانکاری. لەلایەکی تریش نیشتەجێی موسڵ بوو کە وەك ئاشکرایە لە ماردینەوە نزیکە.

لەم توێژینەوەیە هەوڵ دەدەین ئەم زانیارییانەی کە تایبەتن بەمێژووی ماردین لەسەردەمی عوسمانیـدا لەکتێبـەکانی عومەریـدا دەستنیـشان بکـەین، بەتایبـەتی لەکتێبەکانی: (الآثار الجلية في الحوادث الارضية) و (غرائب الأثر في حوادث ربع القرن الثالث عشر) و (غاية المرام في تأريخ محاسن بغداد دارالسلام)، کـە لـەم بارەیـەوە بەکـەلکن. ئنجـا ئـەم زانیارییانـە بـەپێی پەیوەنـدییان بەلایەنـەکانی ئاوەدانی و کارگێڕی و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایـەتی، دەخەینـەڕوو. بۆئـەوەی شـیکردنەوەیان بـۆ بکـەین. هـەروەها بـەراوردیان بکـەین لەگـەڵ زانیارییـەکانی سەرچـاوە مێژووییـەکانی تـر، بەتایبـەتی سەرچـاوە عێراقییـەکانی هاوچـەرخی

عومــەری وەك (دوحــة الــوزراء في تــاريخ وقــائع بغــداد الــزوراء– رســول حــاوي الكركوكلي) و( مطالع السعود بطيب اخبار الوالي داوود– عثمان بن سند البصري). هەندێ جاریش پـەنا دەبەینەبـەر گوزارشـی گەشـتیار و گەڕیدە بیانییـەکانی وەك (ئۆلیڤیێ) و (ابي طالب خان) کە لەم ماوەیەدا سەردانی ناوچەکەیان کـردووە. بـێ گومان سەیری هەندێ ژێدەری نوێش دەکـەین بەتایبـەتی (اربعـة قـرون مـن تـاريخ العراق الحديث– لونكريك). لەکۆتاییدا مەبەستمان ئەوەیە لەڕێگای سـاغکردنەوەی ئـەم زانیارییانـەوە بـارودۆخی ئـەو سـەردەمەی مـاردین وێنـا بکەینـەوە، ئـەویش لەگۆشەنیگای مێژوونووسێکی عیراقی موسڵییەوە.

**دەروازە: سەرنجێکی گشتی لەبارەی دەڤەری ماردین:**

شاری ماردین کە دەکەوێتە (٩٠) کیلۆمـەتری باشـووری ڕۆژهـەڵاتی دیاربـەکر، لەدامێنی باشووری چیای قەرەداغ (یان: قەرەجەداغ)دا هەڵکەوتووە. بەشی هـەرە زۆری شارەکە لەسەر تەپۆلکەیـەکی گـەورەدا بنیـادنراوەو بـەرەو باشـوور بەسـەر دەشتێکی پان و بەریندا دەڕوانـی. بەشـەکەی تریـشی لـەخوار ئـەم تەپۆلکەدایـە. قەڵایەکی قـایم و پتـەو لای سـەرەوەی شـارەکە هەیـە.[1] قـایمی شـاری مـاردین و قەڵاکەی بووەتە جێگـەی سـەرنجی گەڕیدەو گەشـتیارەکان و بەشـێوەی جیاجیـا باسـی کـراوە. گەڕیـدەی عوسمـانی (ئـەولیا چـەلەبی) لەناوەڕاسـتی سـەدەی حەڤدەمدا زۆر بەم قەڵایـەدا هەڵدەدا و دەڵێ: "ئـەم قەڵایـە ئەوەنـدە بـەرزە کـە دیواری بورجەکانی ژوور هەورەکان دەکەون بۆیە هەتا لای نیـوەڕۆ کـە هـەورەکان نەڕەونەوە لەخوارەوەڕا لای ژووروی نابیندرێ. مـن لەگەشـتەکانی خۆمـدا گـەلێك قــەڵای بــەرزو گــەورەو بــەناوبانگم دیــوە بــەڵام هیــچیان ناگەنــە ئــەم قــەڵای ماردینە...بەئاشکرا دەتوانم بڵێم گرتنی ئەم قەڵایە لەتوانینی بەشەردا نییە مەگـەر دانیشتوانی لـەتاوی برسـێتی خۆیـان بەدەسـتەوە بـدەن".[2] هـەروەها گەڕیـدەی هیندی بەڕەچـەڵەك فارسـی (ئـەبو تالیـب خـان)یـش لەسـاڵی ١٨٠٢دا دەنووسـێ: "ماردین لەقەدپاڵی شاخێکی ڕك هەڵکەوتووە، و شوورەیەکی تۆکمەو پتەو دەوری داوە. لەترۆپکی بەرزاییەکە قەڵایەکی قایم هەیە...، لەبەرئەوەی بۆ گەیشتن پێـی

پێویست بەسەرکەوتنی تاشەبەردو بڕینی ڕێگەی تەسك و دژوار دەکا، بۆیە بەسەختترین قەلاّ قایمەکانی ئەم بەشەی زەوی دادەنرێ". [٣]

ڕاستی ئەم گوتەیەی سەرەوە لەڕووداوە مێژووییەکاندا دەبینین، ئەوەتا لەسەروبەندی ململانێی عوسمانی– سەفەوی، عوسمانییەکان دوای سەرکەوتنیان لەشەڕی چالّدێرانی ساڵی ١٥١٤ هەوڵیان دا هەژموونی خۆیان بەسەر ڕۆژهەلاّتی ئەنادۆڵ و ناوچە کوردییەکاندا بسەپێنن. [٤] لەم چوارچێوەیەدا هێزە سەربازییەکانی عوسمانی لەگەڵ هێزەکانی میرە کوردەکان لەساڵی ١٥١٥دا توانییان بەشێوەیەکی ئاشتییانە بچنە نێو شاری ماردینەوە. بەلاّم هێزێکی سەفەوی لەنێو قەلاّی ماردیندا خۆی قایم کرد و قەلاّکەی بەدەستەوە نەدا. خەسرەو پاشای فەرماندەی عوسمانی بۆ ماوەی ساڵێك ئابلّووقەی ئەم قەلاّیەی دا، بەلاّم ئابلّووقەدراوان بەردەوام بوون لە بەرگری. تا سوڵتان سەلیمی یەکەم (١٥١٢– ١٥٢٠) دوای داگیرکردنی شام لەساڵی ١٥١٦ لەشکرێکی گەورەی بەسەرکردایەتی محەمەد بێقلی پاشا هەنارد و دوای شەڕێکی خوێناوی ئنجا قەلاّکە کەوتە دەست عوسمانییەکان. [٥]

ماردین کە ئەم هەڵکەوتە نایابەی هەیە، لەهەمان کاتیشدا لەڕووی دانیشتوانەوە بارێکی تایبەتی هەیە. ئەوەتا شاری ماردین و هەروەها هەموو دەڤەرەکەش لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەمدا لەڕووی ئایین و ئاینزاوە گرووپی جۆراوجۆری دانیشتوانی لەخۆ دەگرت. کە بریتی بوون لەموسڵمان وکریستیان و جوولەکەو ئێزیدی. بەهەمان شێوە نەتەوەی جیاوازیشی تێدا ئاکنجی بووە، بەتایبەتی کورد و تورك و عەرەب و چەرکەس و ئەرمەنی وکلدانی و ئاسووری وجوولەکەو قەرەج. [٦] دیارە لە سەدەکانی پێشتریش ئەم هەلومەرجە لەئارادا بووە، چونکە لەناوەڕاستی سەدەی حەڤدەمدا ئەولیا چەلەبی سەبارەت بەدەسەلاّتداری دەڤەرەکە دەڵێ: "پیاوی دڵنەرم و لەسەرخۆ بۆ ئێرە دەست نادا، چونکو لایێکی کوردە پرچنەکانن [مەبەستی ئێزیدییەکانە] و لایێکی دی کوردەکانی (شقاقی) و(ئاشدی)یە ودەشتەکانیشی خێڵی (کوچبوو)ی تورکمانی تێدایە، نەختێ لەولاتر هۆزی عەرەبی (تەی) کۆچەر هەن...". [٧] لەکۆتایی

سەدەی هەژدەمیش (ئۆلیڤیێ) لەبارەی دانیشتوانی ماردین دەنووسێ: " نزیکەی سێ هەزار کورد و پێنج هەزار یان شەش هەزار عەرەب و تورکی تێدایە، لەگەڵ هەزارو پێنج سەد ئەرمەنی یەعقوبی. نزیکەی هەمان ژمارەش لە نەستوورییەکان (کلدانەکان)...هەروەها لەماردین نزیکەی بیست ماڵباتی جوولەکە هەیە، کەرمەلیەکانیش دێرێکیان لەوێدا هەیە".[8] گەڕیدەو ڕۆژهەلاتناسانی تریش ئاماژە بەم تێکەڵاوی ڕەگەزییەی دەڤەری ماردین دەکەن.[9]

لەلایەکی تر ماردین بایەخێکی بەرچاوی هەبوو لەڕووی ئابوورییەوە بەتایبەتی بەهۆی بەپیتی خاکەکەی و فرەیی بەروبوومە کشتوکاڵییەکانی. سەردەمانێك پیشەسازیشی لەئاستێکی باشدا بوو.[10] هەروەها کەوتبووە سەر ڕێگایەکی بازرگانی سەرەکی کە ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ و وڵاتی شامی بەکوردستان و عیراق گرێ دەدا.[11] زۆر لەکاروانە بازرگانییەکان وگەڕیدەو گەشتیارەکان بەڕێگای دیاربەکر– ماردین– موسڵەوە دەهاتنە کوردستانی باشوور وشارەکانی عیراق.[12]

ماردین دوای ئەوەی بوو بە بەشێك لە ئیمپراتۆریای عوسمانی –وەکو پێشتر باسمان کرد– دەسەلاتی عوسمانی تێدا دامەزرا. ئەولیا چەلەبی دەڵێ سوڵتان سلێمانی قانوونی (١٥٢٠–١٥٦٦) لە هەڵمەتەکەی ساڵی ١٥٣٤ بەرەو بەغدا، ماردینی کردە (سەنجەق)[13] و بارەگای بەگ.[14] بەپێی دەستنووسێکی مێژووییش ماردین لە سەرەتای حوکمڕانی عوسمانیدا سەربە ویلایەتی[15] دیاربەکر بوو، بەلام لەکاتێکی نادیار خراوەتە سەر بەغدا. ئنجا دووبارە لەساڵی ١٦٤٨ بەدیاربەکر گرێ دراوەتەوە.[16] بەلام کە سەیری هەندێ لیستی سەنجەقەکانی ئیالەتی دیاربەکر دەکەین لەم ماوەیەدا، ناوی ماردین نابینین و لەجیاتی ئەو سەنجەقی نسێبین هەیە کە لەنزیك ماردینە.[17] کەواتە نسێبین مەڵبەندی سەنجەق بوو، لەوانەیە ماردینیش سەربەم سەنجەقە بووبێ لەم ماوەیەدا. یان ماردین لەڕووی کارگێڕییەوە هەلومەرجێکی تایبەتی هەبووە. ئەمەش لەڕاستی بەدوور نییە، چونکە دواتر هەر بایەخ و هەڵکەوتەی نایابی شارەکە وادەکا کە سەردارەکەی پلەی (وەیۆدە – voyvoda) ی هەبێ و تەنانەت لەکۆتاییەکانی سەدەی هەژدەمدا دەبینین دەسەلاتی بەسەر ناوچەکانی دەوروبەری (لەنێویاندا:

نسێبین و ناوچەی کوردە ئێزیدییەکانیش) رادەگا.[18] (وەیۆدە) دەسەڵاتدارێکە پلەکەی لە موتەسەللیم[19] بەرزترەو لەپاشای پلە دوو نزمترە، بەزۆری حوکمڕانی هەرێمێکی بچووك یان شارێکی دەکرد کە بەشێك نەبوو لەهیچ ویلایەتێکدا، هەندێ جار ڕاستەوخۆ سەربە پایتەخت بوو. (وەیۆدە) هەموو جیاوکەکانی پاشای پلە دووی هەبوو بەڵام لەڕووی جۆرەوە لەو کەمتر بوو.[20] (لۆنکریك) وەیۆدە بە"حکومەتێکی سەربەخۆ" دادەنێ.[21] دیارە مەبەستی ئەوەیە کە سەربەهیچ ویلایەتێك نەبوو.(ئۆلیڤیێ)ش ئاماژەیەکی لەم جۆرە دەدا کاتێ دەڵێ: "ئەم شارە پێشتر سەردارێکی هەبوو کە سوڵتان ساڵانە دایدەنا، بەڵام ئەمڕۆ [واتە ساڵی ١٧٩٤] سەربە پاشای بەغدایەو ئەو موتەسەللیمی بۆ دادەنێ".[22]

سەرەتای ئەم پاشکۆیەتییەی ماردین بۆ بەغدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی حەسەن پاشای والی بەغدا (١٧٠٤– ١٧٢٣). ئەم والییە کە لەهەوڵی فراوانکردنی دەسەڵاتیدا بوو، بەبایەخەوە سەیری ماردینی دەکرد. بەو پێیەی وێستگەیەکی گرنگە لەسەر ڕێگای هاتوچۆی نێوان بەغدا و ئەستانبۆڵ. هەروەها دەکرێت ببێتە بنکەیەك بۆ لێدان وکۆنترۆڵکردنی کوردە ئێزیدییە هەمیشە یاخییەکانی دەڤەری شنگار.[23] لەئەنجامدا توانی ماردین بخاتە ژێر هەژمونی ئیالەتەکەی.[24] هەروەها لەسەردەمی ئەحمەد پاشای کوڕی حەسەن پاشا دا (١٧٢٣– ١٧٤٧) ماردین هەر سەربە بەغدا بوو.[25] بۆیە وەیۆدەی ماردین لەساڵی ١٧٣١ لەسەروبەندی شاڵاوی دەوڵەتی عوسمانی بۆ ئێران، لەژێر فەرمانی والی بەغدا دابوو.[26]

دیارە ئەم پەرەسەندنەی دەسەڵاتی بەغدا لەلایەك پەیوەندی بەتواناو کەسایەتی حەسەن پاشاو ئەحمەد پاشاوە هەبوو، لەلایەکی تریش گەرموگوڕبوونی ململانێی عوسمانی– ئێرانی لەم ماوەیەدا وای پێویست کردبوو بەرەیەکی بەهێز لەسنووری ڕۆژهەلاتی دەوڵەتدا پێکبهێنرێ. بۆیە دەسەڵاتدارانی دەوڵەت دوای مردنی ئەحمەد پاشا لەساڵی ١٧٤٧دا ماردین لەئیالەتی بەغدا دادەبڕن وخۆیان سەرداری بۆ دادەنێن.[27] بەڵام لەسەردەمانی والییەکانی دواتری بەغدا بەتایبەتی سلێمان پاشای گەورە (١٧٨٠–١٨٠٢) دووبارە دەبێتەوە پاشکۆی بەغدا لەڕووی کارگێڕییەوە.[28] تا لە ساڵی ١٨٣٥ بەیەکجاری لێی

دادەبڕێ.[٢٩] دیارە پاشکۆیەتی ماردین بۆ بەغدا لەجیاتی دیاربەکر زۆر جێگەی سەرسوڕمان بووە بۆ هەندێ گەڕیدەی بیانی، لەبەرئەوەی دووری نێوان بەغداو ماردین زۆر زیاترە بەبەراورد لەگەڵ ماردین و دیاربەکر.[٣٠] لەکاتێکدا دیاربەکریش ناوەندی ئیالەتێکی گرنگی عوسمانی بوو بایەخیشی لەبەغدا کەمتر نەبوو.

**یاسین عومەری و نووسینەکانی:**

لەماوەی سالآنی ١٧٢٦–١٨٣٤دا بنەماڵەی جەلیلییەکان دەسەلآتی موسڵیان قۆرخ کردبوو، بەجۆرێك کە لەکاتی وەرگرتنی پۆستی والی موسڵ و بەبێ ئەویش هەر خۆیان حوکمڕانی ڕاستەقینەی شارەکە بوون.[٣١] لەژێر سایەی ئەم بنەماڵەیەدا باری ڕۆشنبیری و زانست لە موسڵ بەرەوی پێدرا و بەهاندان و بەخششی جەلیلییەکان چەندین زانا و ئەدیب و مێژوونووس دەرکەوتن و دەیان کتێب لەبوارە جۆربەجۆرەکانی زانستی ئەو سەردەمە نووسران و وەرگێڕدران.[٣٢]

لەم هەلومەرجەدا عومەرییەکان وەك بنەماڵەیەکی زانا و ئەدەبدۆست لەشارەکەدا بەدیارکەوتن و لەنێو ئەم بنەماڵەیەشدا یاسین کوڕی خەیروڵلآی خەتیبی عومەری لەهەموویان زیاتر ناوبانگی پەیداکرد. بەوپێیەی یەکێك بوو لەنووسەرە هەرە بەرهەمدارەکانی سەردەمی خۆی.[٣٣] یاسین عومەری لەکۆتایی تەموزی ١٧٤٥ لەموسڵ لەدایك بووە. هەر لەوێ دەستی بەخوێندن کردووەو لەکۆتاییدا لەسەر دەستی زانای بەناوبانگی ئەو سەردەمەی شارەکەی (عەبدولقادر ئەربیلی) زانستی فیقهی خوێندووەو لە تەمەنی ٤٦ ساڵیدا ئیجازەی زانستی وەرگرتووە. یاسین خاوەن ڕۆشنبیرییەکی فراوان بووە ئەگەرچی بیرکردنەوەی زۆر قووڵ نەبووە. لە زۆربەی ماوەی تەمەنیدا بژێوی ژیانی لە نووسین ودانان پەیداکردووە. لەڕێگای ئەوەی کە کتێب و نووسینەکانی دەکردە دیاری بۆ دەسەلآتدار و پیاوە دیارەکانی موسڵ تا لەبەرامبەردا پاداشت وەرگرێ. بەمەش توانیویەتی زۆربەی کاتی بۆ زانست و نووسین تەرخان بکا. ناوبراو وەك زانا و نووسەرانی سەردەمی خۆی تەنیا لە یەك بواردا نووسین و دانانی نەبووە، بەڵکو

لەپاڵ مێژوونووسین، لە بوارەکانی ئـەدەب و شـیعرو ئـایین و بـاوەڕ و تەسـەوف و تەنانەت پزیشکیش بەرهەمی هەبووە.(٣٤)

سـەرەڕای ئـەوەش یاسـین عومـەری زیـاتر وەك مێـژوونووس دەرکـەوتووەو ناوبانگی پەیداکردووە. چونکە لەم بوارەدا نزیکـەی حەڤـدە کتـێبی هەیـە، کـە بـۆ چەندین شێوازی مێژوونووسی پۆلین دەکرێن: لەنێویاندا کتـێبی بیـۆگراف (تـراجم) هەیە، وەك:(السیف المهند في مناقب من سمي احمد) و (الروضة الفیحاء في تـواریخ النساء). هەروەها لەبارەی مێژووی بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانیـشی نووسـیوە، وەك: (عنـوان الاعیـان في ذکـر تـواریخ ملـوك الزمـان). هەندێکیـشیان مێـژووی هـەواڵین (التأریخ الاخباري) بەتایبـەتی (غرائـب الأثـر في حـوادث ربـع القـرن الثالـث عـشر). ژمارەیـەك لەکتێبەکانیـشی لەشـێوەی کرۆنۆلۆژیـان واتـە تۆمـاری ڕووداوگـەلی ساڵەکانن، وەك: (الدرّ المکنون في المـآثر الماضـیة مـن القـرون) و (الآثـار الجلیـة في الحوادث الارضیة). هەروەها لەنووسینی مێژووی ناوچەییش بەرهەمی هەیـە، وەك: (غایة المرام في تاریخ محاسن بغداد دار السلام) و( منیـة الادبـاء في تـأریخ الموصـل الحدباء).(٣٥)

لەلایـەکی تـر ئـەوەی یاسـین عومـەری لەمێژوونووسـانی سـەردەمی خـۆی (بەتایبەتی عێراقییەکان) جیادەکاتەوە ئەوەیە کـە ئـەو تـەنیا مێـژووی ئەیالـەتێك یان دەسەڵاتدارێکی نەنووسیوە، بەڵکو ئـەو هـەوڵی داوە مێـژووی هـەموو ناوچـەو وڵاتانی دەوروبەر تۆمار بکا. هـەروەها کتێبـەکانی تـەنیا بایـەخ بەشـەڕ و ڕووداوە سیاسییەکان نادەن، بەڵکو ئەو زانیاری لەبارەی ڕەوشی ئابووری و کۆمەڵایـەتی و تەندروسـتی و زانـستی و لایـەنی تـر دەخاتـەڕوو.(٣٦)سەرچـاوەی زانیارییـەکانی عومـەری بـۆ ڕووداوەکـانی پـێش سـەردەمی خـۆی بریتییـە لەکتێبـەکانی مێژوونووسانی پێشوو. بـەڵام بـۆ ڕووداوەکـانی سـەردەمی خـۆی زیـاتر پـشتی بـە بینینەکانی خۆی وگێڕانەوەی هاوچەرخەکانی بەستووە. هەرچەندە خۆی لەموسڵ و ناوچەکانی دەوروبـەری زیـاتری نـەبینیوە، بـەڵام سـۆراخی ناوچـەکانی تـری لـە بازرگان و ڕێبوار و کاروانـچییەکان دەسـتکەوتووە. بـێ گومـان سـەیری بەرهـەمی هەندێ لە مێژوونووسەکانی هاوچەرخی خۆشی کردووە.(٣٧)

بەڵام ئەوەی وەك خاڵێکی نێگەتیڤ لەسەر عومەری تۆمار دەکرێ ئەوەیە کە ئەو وەك "مێژوونووسی دەربار" وابوو.[٣٨] بۆیە بێ لایەنانە ڕووداو و پێشهاتەکانی نەنووسیوە. ئەو لەبەرئەوەی لەژێر سایەی جەلیلییەکان دەژیا و سوودی لە بەخشش و چاودێری ئەوان دەبینی، هەوڵی دەدا خۆی لەوان ڕەپێش بکا و بەدڵی ئەوان بنووسێ. ئەمەش هەندێ جار وای لێ دەکرد کە لەڕاستی دووربکەوێتەوەو بەخراپ لەسەر دوژمن و نەیارانی جەلیلییەکان بنووسێ، جا چ کەسایەتی بن یان گرووپ و قەوارەی سیاسی و نەتەوەیی. وەك ئەوەی زۆرجار لەبەرخاتری ئەوان هێرش دەکاتە سەر میرەکانی بادینان و خەڵکی بادینان. هەربەوەش ناوەستێ و هەموو کورد بەخووی نەشیاو وەسف دەکات و لەنرخیان کەم دەکاتەوە.[٣٩] سەرەڕای ئەمەش کتێبەکانی عومەری بەسەرچاوەی زۆر بەنرخ دادەنرێن بۆ نووسینەوەی مێژووی عیراق بەتایبەتی و ناوچەکانی دەوروبەری بەگشتی، ئەمەش بەهۆی دەوڵەمەندی نووسینەکانی و ئەو وردەکارییانەی کە تێیاندا هەن.

**کتێبەکانی یاسین عومەری وەك سەرچاوە بۆ مێژووی دەڤەری ماردین:**

ئەوەی لێرەدا لەنووسینەکانی عومەری پشتیان پێ دەبەستین بریتین لە سێ کتێب، ئەم سێ کتێبە چاپ کراون و بڵاوکراونەتەوە، بەپێچەوانەی کتێبەکانی تری کە زۆربەیان دەستنووسن و لەئەرشیفی دوورەدەست پارێزراون و وابەئاسانی دەست ناکەون. هەر ئەم سێ کتێبەش زانیاری زیاتریان لەبارەی دەڤەری ماردین تێدایە و بۆ ئەم توێژینەوەیە گرنگن. ئەوانیش ئەمانەن:

**١- غاية المرام في تاريخ محاسن بغداد دارالسلام:** وەك لەناونیشانەکەی ڕادیارە، ئەم کتێبە بۆ مێژووی بەغدا تەرخان کراوە. بەڵام کە سەیری ناوەڕۆکی دەکەین دەبینین تەنیا باسی بەغدا و ناوچەکانی دەوروبەری لەخۆ ناگرێ، بەڵکو زانیاری لەبارەی هەموو ئەو شارو ناوچانەش دەخاتەڕوو کە لەڕووی کارگێڕی و مێژووییەوە سەربە بەغدا بوون. دیارە ئەم شارەش لەو سەردەمە ناوەندی ئیالەتێکی گەورە بوو کە زۆربەی ناوچەکانی عیراقی ئێستا و هەندێ ناوچەی

دەرەوەی عیراقیشی لەخۆدەگرت.[40] ئیتر عومەری ڕووداو و پێشهاتەکانی ئەم شار و ناوچانە لەسەرەتای سەپاندنی دەسەلاتی عوسمانی بەسەر بەغدا (ساڵی١٥٣٤) تا ساڵی ١٢٢٠ك/ ١٨٠٥ز دەنووسێتەوە. هەروەها باسی ئاووهەواو باری ئاوەدانی و بەروبوومی ئابووری و زانا و ئەدیب و ناودارانیشیان دەکات.[41]

٢- **الآثار الجلية في الحوادث الارضية:** لەم کتێبەدا یاسین عومەری مێژووی عیراق و ولاتانی دەوروبەری بەتایبەتی ناوچەو هەرێمەکانی ئیمبراتۆریای عوسمانی و ئێرانی لە ساڵی یەکەمی کۆچییەوە تا ساڵی دانانی کتێبەکە (١٧٩٤) ساڵ بەساڵ نووسیوەتەوە. ناوبراو هەر تەنیا بایەخی بەلایەنی سیاسی و کردە سەربازییەکان نەداوە، بەڵکو زۆربەی کارەساتە سروشتی و تەنگژە ئابوورییەکانیشی تۆمارکردووە. وەك زەمین لەرزەو بڵاوبوونەوەی پەتا وگرانی. بایەخی ئەم کتێبە لەوەدایە کە نووسەر خۆی شایەدحاڵی هەندێ لەم ڕووداوانەیە کە نووسیویەتی، بەتایبەتی ئەم کارەساتانەی دوایی.[42]

٣- **غرائب الأثر في حوادث ربع القرن الثالث عشر:** ئەمەش لەسەر شێوەی کتێبەکەی پێشووەو بایەخی لەو کەمتر نییە. دیارە مەبەستیشی ئەوەبووە کە ببێتە تەواوکەری ئەو. لەناونیشانی کتێبەکە ڕادیارە کە دەیەوێ ڕووداوەکانی ساڵانی ١٢٠٠- ١٢٢٥ك تۆماربکا، بەڵام سەرەتا وەکو زەمینەسازییەك کورتەی گرنگترین ئەو کارەساتە سروشتییانەی خستۆتەڕوو کە لەساڵی ٢٤٠ك (٨٥٤- ٨٥٥ز) یەوە ڕوویان داوە. لەبەرئەوەی عومەری خۆی هاوچەرخی ڕووداوەکانی ئەم (٢٥) ساڵە بووە کەکتێبەکەی بۆ تەرخان کردووە، بۆیە وردەکاری زۆرمان دەداتێ بەتایبەتی سەبارەت بەو ئاژاوەو نەهامەتی وکارەساتە سروشتییانەی کە لەموسڵ وناوچەکە بەگشتی ڕوویان داوە.[43]

بەسەیرکردن و وردبوونەوە لەزانیارییەکانی ئەم کتێبانەی یاسین عومەری سەبارەت بەماردین و ناوچەکانی دەوروبەری، دەتوانین لەم لایەنانەی خوارەوە چەند تێڕوانینێکمان سەبارەت بەمێژووی دەڤەری ماردین دەستکەوێ.

**یەکەم: باری ئاوەدانی:-**

یاسین عومەری لەکتێبی (غایة المرام)دا کە باسی شارو ناوچەکانی سەر بەئیالەتی بەغدا دەکا ئاماژە بە (ماردین) یش دەکا و دەڵێ: "قەڵایەکی بەناوبانگە لەسەر شاخێك کە دەڕوانێتە شاری دنیسر و شاری دارا و شاری نسێبین، لەبەردەمیشیدا ئاوەدانییەکی گەورە هەیە کە بازاڕێك وکاروانسەراو قوتابخانە (مەدرەسە)ی زۆر لەخۆدەگرێ خانووەکانیان وەکو پلیکانە وایە خانوو لەسەر خانووە تا دەگاتە قەڵاکە و دێهاتێکی زۆریشی هەیە".[٤٤]

ئەگەر دێری سەرەتای ئەم دەقە بەسەرپێیی بخوێنینەوە وادەزانین (عومەری) وەسفێکی وردی ماردین دەکاو خۆی شارەکەی بینیوە. چونکە ئەولیا چەلەبیش لەناوەڕاستی سەدەی حەڤدەمدا دەڵێ: "لەبورجەکانی قەڵاوە هەتا مەودای چوار قۆناغ بەهەر چوار لای خۆیدا دەبینەدرێ. لەم قەڵایەوە قەڵاکانی نەسێبین و شەنگار و چیای شەنگار و دەشتە پان و بەرینەکەی دیارە".[٤٥] بەڵام ئەگەر بەباشی لێی وردبینەوە دەزانین کە (عومەری) ئەم وەسفەی لە جوگرافیناسانی سەدەکانی ڕابردوو وەرگرتووە و خۆی شوێنەکەی نەبینیوە. چونکە خۆی دەڵێ کە ئەو لەموسڵ دوور نەکەوتۆتەوە.[٤٦] هەروەها ئەو ناوی (شاری دارا) دێنێ و وادەزانێ هەرمابوو، لەکاتێکدا لەو سەردەمەدا تەنیا کەلاوە بووە، بەڵام لەنزیکیدا گوندێکی ئاوەدان هەبوو.[٤٧] خۆ ئەولیا چەلەبیش لەدەقەکەی پێشوودا دەڵێ لە ماردینەوە نسێبین و شنگار دیارن، بەڵام ئاماژە بەهەردوو شاری دارا و دنیسر ناکات. ئەمەش لەبەرئەوەی نەمابوون.

سەبارەت بەبەشی دوایی وەسفەکەشی، دەکرێ لەو بازرگان و گەشتیارانەی وەرگرتبێ کە سەردانی ماردینیان کردووە. چونکە ئەمانە یەکێك بوون لە سەرچاوەکانی زانیارییەکانی، وەك پێشتر گوتمان. بەڵام هەرچەندە ئەم وەسفەی عومەری بۆ شارەکە لەڕاستی نزیك بێ، ناکرێ ئەو ڕاستییە فەرامۆش بکەین کە خودی شاری ماردین لەو سەردەمەدا لە بارێکی باشدا نەبووە. ئەوەتا گەڕیدەی فەرەنسی (ئۆلیڤیێ) کە هاوچەرخی (عومەری) بوو، سەبارەت بەم لایەنە دەنووسێ: "بێ گومان قەڵاو شوورەکانی پێشتر لەبارێکی باشدا بوون، هەروەها

دانیشتوانیشی پێشتر زۆر لەمڕۆ زۆرتر بوون. ماردین سەرەڕای فراوانی، زیاتر لەگوندێك دەچێ نەك لەشار". [٤٨]

بێ گومان ئەم ئاژاوەو شەڕانەی کە لەدەڤەرەکەدا ڕوویان دەداو هەروەها ئەو گرانی و پەتایانەی کە تێیدا بڵاو دەبوونەوە کاریگەرییان هەبوو لەسەر باری ئاوەدانی شارو دەڤەرەکە، وەك دواتر بۆمان دەردەکەوێ.

## دووەم: لایەنی کارگێڕی:-

پێشتر باسمان کرد کە سەرداری ماردین نازناوی (وەیۆدە)ی هەبوو، کە پلەیەکی کارگێڕی تایبەت بوو. هەروەها لەڕووی کارگێڕیشەوە لەزۆربەی ماوەکانی سەدەی هەژدەو نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە ئەم سەردارە سەربە والی بەغدا بوو. ئەم دوو ڕاستییە لەکتێبەکانی یاسین عومەریدا ڕەنگیان داوەتەوە. ئەوەتا لەچەند شوێن ناوی سەرداری ماردین لەگەڵ نازناوی (وەیۆدە) دەهێنێ، بەڵام بەشێوە عەرەبییەکەی واتە (ویوضة). بێ گومان ئەمەش سەرنجی وردی عومەری دەسەلمێنێ لە بەکارهێنانی پلە کارگێڕییەکان. ئەمەش لەلایەك ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە لەو سەردەمانەش سەردارەکانی ماردین ئەم پلەو نازناوەیان هەرمابوو، لەلایەکی تریش بەم هۆیەوە ناوی هەندێ لە سەردارەکانی ماردین دەزانین. بۆ نموونە لە ڕووداوەکانی ساڵی ١٢٠٧ك (١٧٩٢/ ١٧٩٣ز) باسی (وەیۆدەی ماردین عیسا ئاغا) دەکا. [٤٩] هەندێ جاریش نازناوەکە لەدوای ناوەکە دادەنێ. وەك ئەوەی لەڕووداوەکانی ساڵی ١٢٠٥ك (١٧٩٠– ١٧٩١ز) ناوی (ئیبراهیم ئەفەندی وەیۆدە) دەهێنێ. [٥٠] ئەگەر ئەمانەی ناومان هێنان (ئاغا) و (ئەفەندی) بن یەك لەدوای یەك، ئەوا هەندێکیشیان (بەگ) بوون، وەك (نەجم بەگ) کە لەساڵی ١٢٠٨ك (١٧٩٣– ١٧٩٤ز) کرایە وەیۆدەی ماردین. [٥١] بێ گومان ئەمەش ئەوە پیشان دەدا کە ئەم سەردارانەی ماردین لەبنەڕەتدا لەئاست و پێگەی کارگێڕی و کۆمەڵایەتی جیاواز بوون. چونکە هەریەك لەم نازناوانە واتای تایبەتی خۆیان هەبوو لەم سەردەمەدا. [٥٢] نابێ ئەوەش لەیادکەین کە دانانی سێ

سەردار لەماردین لەم ماوەیە کەمەدا –وەك لەم ساڵانەی سەرەوەدا دیارە– بەڵگەی نائارامی ڕەوشی کارگێڕی دەڤەرەکەیە.

بەهەمان شێوە وابەستەبوونی ماردین بەئیالەتی بەغدا لەڕووی کارگێڕییەوە، لەکتێبەکانی عومەریدا بەڕوونی دیارەو لەدەم و ساتی جیاجیادا ئاماژەی پێدەکرێ. هەر بۆ نموونە لەکتێبی (غایة المرام) دا کە شارو ناوچەکانی سەربە بەغدا دەژمێرێ و بەکورتی باسیان دەکا، ئاماژە بە (ماردین) یش دەکا. بەو پێیەی لە سەروبەندی دانانی کتێبەکە (ساڵی ١٨٠٥ز) ئەویش بەشێك بوو لەم ئیالەتە.(٥٣) هەروەکو لەسەرچاوەی تریش ئەمە دووپات دەکرێتەوە.(٥٤)

هەژموونی کارگێڕیی ئیالەتی بەغدا بەسەر ماردیندا، لەنووسینەکانی عومەریدا بەشێوازی جیاجیا و لەڕووداوی جۆربەجۆردا دەردەکەوێ: هەندێ جار لەهەوڵی والی بەغدا بۆ سەپاندنی سەقامگیری لەدەڤەری ماردیندا خۆی دەنوێنێ. وەك ئەوەی لەساڵی ١٢٢٥ك (١٨٠٩– ١٨١٠ز) دا هێزێکی هەنارد بۆ لەناوبردنی ئاژاوەی هۆزەکانی ماردین.(٥٥) بەڵام زۆر جاری تر ئەم هەژمون و دەسەڵاتەی والی بەغدا لەلابردن و دانانی سەرداری ماردیندا بەرجەستە دەبوو. بەڵام ئەم کردارانە هۆکار و شێوازی جیاوازیان هەبوو. هەندێ جار ئەم لابردن و دانانە لە چوارچێوەی جێگۆڕکێی دەسەڵاتدارانی سەربە ئیالەتەکە بوو. ئەوەتا سلێمان پاشای گەورەی والی بەغدا لە ساڵی ١٨٠١ز دا کاتێ ویستی موتەسەللیمی بەسرا سزا بدا، بڕیاریدا لەگەڵ نەجم بەگی وەیۆدەی ماردین جێگۆڕکێیان پێ بکا.(٥٦) لەشوێنێکی تردا عومەری سەرەتا باسی لێخستنی نەجم بەگ دەکا، ئنجا باسی گۆڕینەوەی پۆستەکەی لەگەڵ موتەسەللیمی بەسرا دەکا. بەڵام لەهەردوو باردا دیارە کە مەبەست سزادانی موتەسەللیمەکە بووە. چونکە تەنیا دەست بەسەر سامانی ئەو داگیراوە.(٥٧)

لەبارێکی تردا دەبینین ئەحمەد ئاغای وەیۆدەی ماردین کە ناسرابوو بە (ئەبو دبسی بەغدادی) لەساڵی ١٢٢٣ك (١٨٠٧– ١٨٠٨ز) لەلایەن والی بەغداوە لێدەخرێ و لەشوێنی ئەو یەکێکی تر دادەنرێ، چونکە ناتوانێ کۆنترۆڵی ئەو ئاژاوەیە بکا کە لە ماردین سەری هەڵدا.(٥٨)

ئەمەش دەخرێتە چوارچێوەی بەرپرسیارییەتی والی بەغدا لەبەرقەرارکردنی ئاسایش لە دەڤەری ماردین، وەك دەڤەرێکی سەربە ئیالەتی بەغدا. هەر لەزانیارییەکانی عومەرییەوە دەزانین کە سەردارەکانی ماردینیش لەسزادان و بەندکردن لەلایەن والییەوە بەدوورنین. ڕووداوێکی لەم جۆرە لە ساڵی ١٧٩١ لە سەروبەندی شالاًوەکەی والی بەغدا بۆ سەرکوتکردنی بزووتنەوەی تەیمور پاشای مللی،[٥٩] دەبینین. ئەویش خۆی لە ڕووداوی لادانی ئیبراهیم ئەفەندی وەیۆدە دەبینێتەوە، کە عومەری هەرجارەی بەشێوەیەك باسی دەکا. لەکتێبی (غاية المرام) دا باس لەوە دەکا کە والی بەغدا وەیۆدەی ناوبراوی دەستگیر کردووەو نزیکەی (٥٠) کیس[٦٠] پارەی لێ سەندووە، ئنجا لێی خستووە و عیسا ئاغای لەشوێنی ئەو داناوە.[٦١] بەلاًم لەکتێبێکی تردا دەڵێ والی چۆتە ماردین و عیسا ئاغای کردۆتە سەرداری ئەوێ و ئیبراهیم ئەفەندیشی دەستگیر کردووەو بەندکردووە بەهۆی هەندێ کار کە کردوویەتی.[٦٢] واتە لێرە هۆکارەکەی ئاماژە پێدەکا بەلاًم بەشێوەیەکی تەمومژاوی. لەشوێنێکی تریشدا لادان و بەندکردنەکەی باس دەکا بەلاًم بڕە پارە دەست بەسەرداگیراوەکە دەبێتە (٢٥) هەزار قرش.[٦٣] واتە هەمان بڕە پارە باس دەکا بەلاًم بەشێوەیەکی تر، چونکە وا باو بوو کە هەر کیسێك (٥٠٠) قرشی تێدابێ.[٦٤] دیارە والی بەغدا هێشتا دەستی لەسەر ئەم وەیۆدەیە هەڵنەگرتووە، چونکە کاتێ دوو ساڵ دواتر دەچێتە موسڵ والی ناوبراو فەرمان بەوالی موسڵ دەکا کە دەستگیری بکا. ئەویش ئەم کارە دەکا بەلاًم دواتر والی ڕازی دەکا کە ئازاد بکرێ.[٦٥] شایانی باسە هەندێ سەرچاوەی تری عیراقی هاوچەرخ کە باسی ئەم هەڵمەتەی والی بەغدا دەکەن بۆ ناوچەکە لەدژی تەیمور پاشای مللی، ئاماژە بەم کردەوانەی والی ناکەن لەهەمبەر سەرداری ناوبراوی ماردین.[٦٦] بەلاًم لۆنگریك دەڵێ وەیۆدەی ماردین گومانی لێ کراوە بۆیە سزای دارایی دراوەو لێخراوە.[٦٧] لەمەشدا بۆمان دەردەکەوێ کە عومەری بەتەنگ ئەوەبووە زانیارییەکان بەوردەکارییەوە تۆمار بکا نەك بەکورتی. لێرەش نزیکیی موسڵ لەماردین لەڕووی جوگرافییەوە (بەبەراورد لەگەڵ ناوچەکانی تری عیراق) یارمەتی داوە کە ئەو لەڕووداوەکان نزیکتر بێ و وردەکاری زیاتری دەستکەوێ.

هەندێ جار ئەم فەرمانانەی والی بەغدا وا بەئاسانی بەسەر ماردیندا تێناپەڕێ و لەلایەن خەڵکی شارەکە بەرپەرچ دەدرێتەوە. بەمەش دەسەڵاتی کارگێڕی بەغدا بەسەر ئەم دەڤەرە دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە. چونکە ئەم هەڵوێستەی خەڵکی ماردین ئەگەرچی بەشێکی پەیوەندی بەڕەفتاری خراپی سەردارەکەیانەوە هەبوو، بەڵام بەشێکی گرنگیشی لەدژی سەپاندنی سەردارەکانە لەلایەن والی بەغداوە. چونکە کاتێ خەڵکی ماردین لە ساڵی ١٢٠٨ك (١٧٩٣– ١٧٩٤ز) بەیەك دەست لەهەمبەر زۆرداری عیسا ئاغای سەرداری شارەکەیان ڕاپەڕین وکوشتیان، دواتر سێ سەرداری تریان یەك لەدوای یەك ڕەتکردەوە کە والی بەغدا بۆ ماردین داینابوون. تەنانەت ڕێگەی هەندێکیان نەدا بچنە شارەکە و پۆستەکە وەربگرن. تا لەدوای سێ ساڵ ئنجا سەرداری چوارەم بەزەبری هێز خۆی بەسەریاندا سەپاند. عومەری ئەم ڕووداوانەی بەوردەکارییەوە تۆمار کردووەو بێلایەنانە نووسیویەتی، بەتایبەتی لەکتێبی (غرائب الأثر) دا.[٦٨] لەکاتێکدا لەزۆربەی سەرچاوە عیراقییەکانی تری ئەم ماوە مێژووییە، زانیاری ئەوتۆمان لەم بارەیەوە دەست ناکەوێ.[٦٩]

هەر سەبارەت بەلایەنی کارگێڕی، لەزانیارییەکانی عومەری تێبینی ڕووداوێك دەکەین کە تیایدا یەکێك لە وەیۆدەکانی ماردین لەساڵی ١٢٠٧ك (١٧٩٢– ١٧٩٣ز) دا هەوڵی ئەوە دەدا کە دەسەڵاتی لەدەرەوەی دەڤەرەکەی خۆی پیادە بکا، ئەویش عیسا ئاغایە (پێشتر ناومان برد) کە دەست دەخاتە نێو کاروباری ناوچەی شنگار و هێرش دەکاتە سەر کوردە ئێزیدییەکان، بەڵام شکست دەخوا. جێگەی سەرنجە عومەری لەکتێبی (زبدة الآثار) دا ئاماژە بەوەدەکا کە لەم کردە سەربازییەدا کوردە مللیەکان بەشی سەرەکی هێزەکەی ماردینیان پێکدەهێنا. بەڵام لەکتێبی (غرائب الأثر) دا ئەمە نابینین.[٧٠] هەر چۆنێك بێ دیارە ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە لەم ماوەیەدا وەیۆدەی ماردین دەسەڵاتی بەسەر ئەم هۆزە گەورەیەشدا دەشکا. لەکاتێکدا ئەمانە هەمیشە بەهۆزێکی یاخیبوو لەقەڵەم دەدران.[٧١] لەسەرێکی ترەوە ئەمە بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کە مێژوونووسی ناوبراو ڕووداوەکان بەهەمان شێوە لەهەموو کتێبەکانی دووبارە

ناکاتەوە. بەڵکو بەدرێژتر یان کورتتر و هەندێ جار جیاوازتر دەیانخاتە ڕوو. ئەمەش پەیوەستە بەدەم و ساتی نووسینی ڕووداوەکان و هەروەها ڕاددەی دڵنیابوون لەزانیارییەکان سەبارەت بەم ڕووداوانە.

**سێیەم: ڕەوشی سیاسی:-**

هەرچەندە یاسین عومەری لەکتێبەکانی خۆیدا زانیاری هەمەلایەنەی سەبارەت بەزۆربەی ناوچەکان تۆمارکردووە، بەلاّم گومان لەوەدانییە کە زانیارییەکانی تایبەت بەلایەنی سیاسی لەهەموو لایەنەکانی تر زیاترن. ئەمە بۆ دەڤەری ماردینیش هەر ڕاستە، وەك لێرە بەدوا دەبینین:

لە ڕووداوەکانی ساڵی ١١٨٨ك (١٧٧٣- ١٧٧٤ز) دا عومەری ئاماژە بەوە دەکا کە والی بەغدا هەڵمەتێکی سەربازی ئامادەکرد لەدژی محەمەد پاشای میری بابان،[٧٢] کە ملکەچی ئەیالەتی بەغدا نەدەبوو. والی لەگەڵ ئەم هەڵمەتە حاجی سلێمانی وەیۆدەی ماردینی هەنارد. کاتێ ئەم هێزانە بەرەو قەلاّچوالانی پێگەی میری بابان کشان، محەمەد پاشا بەرەو ئێران ڕایکرد. بەلاّم دواتر بەیارمەتی سەربازییەوە لەئێران گەڕایەوەو هێزەکانی ئەیالەتی بەغدا لە شەڕێکدا ڕووبەڕووی بوونەوەو تێکیان شکاند.[٧٣] بەلاّم لەڕاستیدا ئەم ڕووداوە هیچ پەیوەندی بەماردینەوە نییە وعومەری لێرەدا هەڵەی کردووە کە ئەم حاجی سلێمانەی بە وەیۆدەی ماردین داناوە. چونکە هەر خۆی دواتر لەکتێبێکی تردا هەڵەکە ڕاست دەکاتەوەو دەڵێ (حاجی سلێمان) کەتخودای[٧٤] والی بەغدایە.[٧٥] لە سەرچاوەی تریشدا دەبینین کە والی ئەم هێزانەی لەگەڵ کەتخودای خۆی هەناردووە بۆ سەر محەمەد پاشای میری بابان. بەهیچ شێوەیەکیش ناوی ماردین و وەیۆدەکەی لەم ڕووداوە نایێت.[٧٦] لە هەندێ سەرچاوەی تردا هاتووە کە ئەم (حاجی سلێمان) ـە موتەسەللیمی بەسرا[٧٧] یان موتەسەللیمی پێشووی بەسرایە.[٧٨] بێ گومان ئەمەش هیچ لە ڕاستییەکە ناگۆڕێ.

ڕووداوێکی تر کە عومەری باسی دەکا و پەیوەندی بە دەڤەری ماردینەوە هەیە، بریتییە لە هەڵمەتە سەرکوتکارییەکەی سلێمان پاشای گەورەی والی بەغدا

بۆ سەر هۆزی مللی کە لەژێر سەرکردایەتی تەیمور پاشای مللی دابوون. بەو پێیەی ئەم هۆزە لە دەوروبەری ماردین لە ناوچەکانی تورعابدین (میدیات) و قەرەجەداغ دادەنیشتن.[79] ئەم هەڵمەتە کە لە ڕووداوەکانی ساڵی ١٢٠٥ك (١٧٩٠–١٧٩١ز) یە لەکتێبی (غایة المرام) بەکورتی و لەهەردوو کتێبی (زبدة الآثار) و (غرائب الأثر) دا بەدرێژتر دەخرێتە ڕوو. عومەری ناوی سەرۆکی هۆزی مللی بە "تەمەر پاشای مللی"[80] و "تەمەر پاشای میری مللی" دەهێنێ.[81] ئەمەش لەبەرئەوەیە کە ناوی (تەیمور) لەنێو کوردانی ناوچەکە بە (تەمەر) بانگ دەکرا. بەلاَم لە سەرچاوە عیراقییەکانی تر بە (تەیمور) نووسراوە.[82] سەبارەت بەهۆکارەکانی هەڵمەتەکەش بۆ سەر ئەم هۆزە، عومەری جارێك دەڵێ "دەستوەشاندنەکانی تەمەر پاشا زیاد ببوو".[83] جارێکی تریش دەڵێ: "هێز و دەسەلاَتی مەزن ببوو".[84] لە هەردوو باریشدا هەر ڕاستە چونکە ئەم هۆزە لەژێر سەرکردایەتی تەیمور پاشا، لەم ماوەیەدا هێز و توانای زیادی کردبوو بەجۆرێك ملکەچی والی و دەسەلاَتدارانی ناوچەکە نەدەبوون و مەترسییان لەسەر دەسەلاَتی دەوڵەت لەو دەڤەرانە دروست کردبوو.[85]

عومەری باس لەوە دەکا کە ئەم هەڵمەتەی والی بەغدا لەسەر فەرمانی خودی سوڵتان سەلیمی سێیەم (١٧٨٩– ١٨٠٧) بووە.[86] ئەمە لەسەرچاوەی تریشدا دووپات دەکرێتەوە.[87] بەلاَم عومەری ئەوەش زیاد دەکا کە لەهەمان کاتدا سوڵتان والی ئۆرفەی ڕاسپاردووە کە بەشداری لەم هەڵمەتەدا بکات.[88] بەلاَم والی بەغدا هەر بەوە نەوەستاوەو هێزێکی زۆرتری لەمیر ودەسەلاَتداران وهۆزەکانی ژێر دەسەلاَتی کۆکردۆتەوە کە نزیکەی (٣٠) هەزار جەنگاوەر دەبوون. ئنجا بەرەو دەڤەری ماردین کەوتۆتە ڕێ.[89] لە یەکێ لەکتێبەکانیدا عومەری ناوی ئەو میرو دەسەلاَتدارانەش دەهێنێ کە هاتوونەتە پاڵ هەڵمەتەکە. ئەوانیش: عەبدولڕەحمان پاشا و ئیبراهیم پاشای بابان، فەتاح پاشای سەرداری زەهاو، سەرۆکی هۆزی مونتەفیك لە خوارووی عیراق، لەگەڵ والی موسڵ بوون.[90] ئەمە لەکاتێکدایە کە سەرچاوەکانی تر نەك هەر ئەم ناوانەمان نادەنێ، بەڵکو ژمارەی بەشداربووانی هەڵمەتەکەشمان بۆ ئاشکرا ناکەن. تەنیا باس لەزۆری ژمارەی ئەو هێزانە دەکەن

کە والی بەغدا کۆی کردوونەتەوە بۆ ئەم هەڵمەتە.[91] بەلاَم لەجیاتی ئـەوە هەنـدێ لە سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن کە تەیمور پاشا (١٥) هەزار شەرکەری هـەبووە کـە ئامـادەی بـەرگری بـوون.[92] هەرچۆنێك بـێ ئـەم زانیارییانـە بەڵگـەن لەسـەر گەورەیی ئەو مەترسییەی کە مللیەکان بۆ دەوڵەتی عوسمانییان دروست کردبوو.

بـەپێی زانیارییـەکانی (عومـەری) تـەیمور پاشـا توانـای بـەرەنگاریی هێـزە هێرشبەرەکانی لەخۆ را نەدیتووە و رایکردووە. لەئەنجامدا ئەم هێزانەی هێرشـیان هێنابوو بۆ دەڤەرەکە کەوتوونەتە وێزەی پاشماوەی هـۆزی مللـی و دەسـتیان لـێ نەپاراستوون. دوای شەرو کوشتارێکی زۆر، تالاَنێکی گەورەیان لـێ کـردوون. دوای ئەوە والی بەغدا چووە ماردین و کاروباری ئەم دەڤەرانـەی رێکخستەوەو ئیـبراهیم ئاغای برای تـەیمور پاشـای کـردە سـەرۆکی هـۆزی مللـی و هەنـدێ دەسـەلاَتداری ناوچەکەشی سزا دا ئنجا گەرایەوە بەغدا.[93] لێرەدا پێدەچـێ عومـەری مەبەسـتی بووبێ باسی ئەم رووداوە لەکورتی ببرێنێتـەوە.[94] یـان هـەر ئەوەنـدە زانیارییـەی دەسـتکەوتووە. چـونکە لـە سەرچـاوەیەکی تـری نزیـك لـە رووداوەکـان بۆمـان دەردەکەوێ کە تەیمور پاشا سەرەرای خۆدزینەوەی هەندێ لـە لایـەنگرانی، دوای ئەوەی چەند جارێك لەنزیك ئۆرفە شەری لەگەڵ هێزەکانی دوژمنی کـردووە، ئنجـا لەکۆتاییدا ناچاری راکـردن و رەڤـین بـووە.[95] بـەلاَم لەسـەرێکی تـرەوە عومـەری هەندێ ژمارەمان لەبارەی تالاَنەکان دەداتێ و باسی هەزاران مـەرومالاَت دەکـا کـە سەربازان لەهۆزی مللییان بردووە. بەلاَم ئـەم ژمارانـە لەهـەموو کتێبـەکانی وەکـو یـەك نـین. هـەروەها دواتـر زانیـاری زۆر لـەبارەی چارەنووسـی تـەیمور پاشـا و جموجۆڵـەکانی لەناوچـەکە تۆمـار دەکـا.[96] کـە بـۆ توێژینەوەکـەی ئێمـە گرنگـی ئەوتۆیان نییە.

بـێ گومـان ئـەم رووداوە زیـانی گیـانی و مـاددی زۆری بەدەڤـەری مـاردین و دانیـشتووانەکەی گەیانـدووە. سـەرەرای ئەمـەش نەبووەتـە هـۆی گێرانـەوەی سـەقامگیری بـۆ دەڤەرەکـە. بـەڵکو بەپێـچەوانە، دوای چـەند سـاڵێکی کـەم لـەم رووداوە رەوشی ئاسایش خراپتر تێکچووەو ئاژاوە شـاری ماردینیـشی گرتۆتـەوە، بـەجۆرێك دەسـەلاَتدارانی ناوچـەکەش وابەئاسـانی رەوشـەکەیان پـێ هـێمن

ناکرێتەوە. لەئەنجامدا دەڤەرەکە کاولکاری و نەهامەتی زیاتر بەخۆوە دەبینی.[97] یاسین عومەریش کە لە موسڵ دادەنیشت نزیك بوو لەم ڕووداوانە، بۆیە جیا لەمێژوونووسە عیراقییەکانی تر زانیاری باشی دەستکەوتووەو ساڵ بەساڵ بەوردی لەکتێبەکانی تۆماری کردووە، وەك لێرە بەدوا دەبینین.

دیارە عیسا ئاغا، کە لە سەروبەندی شالأوەکەی سەر هۆزی مللی لەلایەن سلێمان پاشای گەورەی والی بەغداوە کرابووە وەیۆدەی ماردین، ڕۆڵی هەبوو لە بەرپابوونی ئەم بارگرژییە. چونکە لەلایەك لەسەردەمی ئەودا ڕەوشی ماردین تێکچوو، لەلایەکی تریش ئەو سیاسەتێکی خراپی لە ناوچەکە پەیڕەو دەکرد. یەکێك لەهەنگاوە چەوتەکانی (کە لەلاپەڕەکانی پێشوو باسمان کرد) ئەوەبوو لەساڵی ١٢٠٧ك (١٧٩٢–١٧٩٣ز) هەوڵی دا لاسایی والی موسڵ بکاتەوەو ئەویش لەسەر حیسابی کوردە ئێزیدییەکان دەستکەوت و تالأنی دەستکەوێ. بەلأم کاتێ هێرشی کردە سەر باکوری چیای شنگار، ئێزیدییەکان بەرەنگاری بوونەوەو چواردە کەسیان لەهێزەکانی کوشت و ناچاریان کرد بگەڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی لێی هاتووە.[98]

ئەم وەیۆدەیە سوودی لە هەڵەکانی خۆی وەرنەگرت، بۆیە لەساڵی دواتر تووشی کارەساتێکی گەورەتر بوو، ئەمجارەیان سەری خۆشی لەسەر دانا. عومەری لە ڕووداوەکانی ساڵی ١٢٠٨ك (١٧٩٣–١٧٩٤ز) باسی ئەوە دەکا کە "ستەم و زۆرداری عیسا ئاغای وەیۆدەی ماردین و یوسف ئاغا مەهمەدی میری کورد[99] زیادی کرد بۆیە خەڵکی ماردین لەدژیان وەستان و هەردووکیان کوشت. ئنجا بۆ والی بەغدایان نووسی و سکالأیان لەدژی عیسا ئاغا کرد. ئەویش داواکەیانی قبوڵ کرد و نەجم بەگی برای عیسا ئاغای کردە سەرداری ماردین. بەلأم دوای ماوەیەك شەڕیان لەگەڵ ئەویشدا کرد و لە ماردین بەدەریان نا. دوای ئەوە میر ساری محەمەد ئاغای کردە سەرداریان".[100] عومەری ئەم ڕووداوە لەشوێنێکی تر بەکورتتر دەنووسێ.[101]

لۆنگریك ئەم ڕووداوە دەخاتە چوارچێوەی ململانێی گرووپ و کەسایەتییەکانی شاری ماردین و دەڵێ هەر ئەم ئاژاوەیە وای کرد کە لەساڵی

١٧٩٦ سەرکردەی تفەنگداران (تفەنگچی باشی) لە شارەکە ڕابکات.[١٠٢] بەڵام دەکرێ گوتەکانی عومەری بەڕاستتر بزانین کاتێ بەئاشکرا دەڵێ ئەم ئاژاوەیە بەهۆی ستەم و زۆرداری دەسەڵاتدارانی ماردینەوە بەرپابووە، وەك لەدێرەکانی پێشوو ئاماژەمان پێدا. چونکە ئەو هاوچەرخی ئەم ڕووداوانەیەو لەڕووی جوگرافیشەوە لێیان نزیك بوو. لەوانەیە ئەو زانیارییەکانی لەکەسانی نزیکتریش وەرگرتبێ، چونکە یەکێ لەسەرچاوەکانی زانیارییەکانی ئەو بازرگان وڕێبوارانە بوو کە هاموشۆی موسڵیان دەکرد. بێ گومان هاموشۆکردنیش لەنێوان ماردین و موسڵ گەرموگوڕ بوو.

سەبارەت بەڕاکردنی تفەنگچی باشیی ماردینیش، عومەری هەواڵی وردمان دەداتێ کاتێ لە ڕووداوەکانی ساڵی ١٢١٠ك (١٧٩٥–١٧٩٦ز) باسی ئەوە دەکا کە ئەم کەسایەتییە بەهۆی زۆرداری و ستەمکردنی لەخەڵك پەنای بردۆتەبەر ئیبراهیم ئاغای مللی. بەڵام وەیۆدەی ماردین (ساری محەمەد ئاغا) بەفێڵ بانگی کردۆتە (قۆچ حەسار)ی نزیك ماردین و لەوێ کوشتوویەتی وسەری بۆ بەغدا هەناردووە. دیارە وەیۆدەی ناوبراویش لەلایەن خەڵکی ماردینەوە نەویستراو بووە بۆیە کە گەڕاوەتەوە بارەگای خۆی، ئەویشیان دەرکردووە.[١٠٣] لۆنگریك دەڵێ دوای ئەمە یەکێ لە پاڵێوراوانی جەماوەری هەڵچوو لەشوێنی ئەو داندراوە.[١٠٤] بەڵام پێناچێ ئەمە تەواو ڕاست بێ، چونکە بەپێی گوتەی عومەری سەرەتا لەویش یاخی بوون، بەڵام دواتر لەگەڵی ڕێککەوتوون. کەچی دوای مانگێك بەرپرسان ئەم سەردارەیان لێخستووەو نەجم بەگیان لەجیاتی ئەو داناوە. بەمەش سەرلەنوێ نائارامی دەستی پێکردۆتەوە. چونکە ئەم سەردارە نوێیە هەرچەندە یارمەتی سەربازی لەموسڵ و هۆزی (تەی) عەرەبی لەلایەن والی بەغدا بۆ دابین کراوە، بەڵام نەیتوانی بەسەر بەرگریی خەڵکی ماردین زاڵبێ و بچێتە نێو شارەکە. دواتر هێزێکی بابانیش بەهانای نەجم بەگەوە هاتووە ئنجا لەساڵی دواتر دوای درێژەکێشانی ئابلۆقەی سەر ماردین، خەڵکەکە بەناچاری دەروازەی شارەکەیان لەبەردەم سەرداری ناوبراو واڵا کردووە. ئەویش هێشتا وازی لە دڵڕەقی نەهێناوەو دوای چوونە نێو شارەکە، سێ کەسی لێیان کوشتووەو هەڵواسیوە.[١٠٥] پێدەچێ

ئەم دڵڕەقییەی نەجم بەگ بەرامبەر خەڵکی ماردین بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە عیسا ئاغای برای لەلایەن ئەوانەوە کوژرابوو.

ئەم ڕووداوەی پێشوو سیاسەتی چەوتی والی بەغدا لەهەمبەر ماردین پیشان دەداو ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە ئەویش ڕۆڵی هەبوو لە نائارامبوونی دەڤەرەکە. چونکە کاتێ خەڵکی شارەکە هیچ کێشەیەکیان لەگەڵ سەردارەکەیان (عەلی بەگ) نەبوو، ئەو ئەم سەردارەی لێخست و نەجم بەگی لەشوێنی دانا، کە پێشتر لەلایەن خەڵکی ماردین ڕەت کرابۆوە. کاتێکیش ئەمەی دوایی خەریك بوو بەهەر شێوازێك بێ پێگەی خۆی لەوێ بەهێز دەکرد، والی بڕیاری دا لەگەڵ موتەسەللیمی بەسرا جێگۆڕکێیان پێبکات، وەك پێشتر باسمان کرد. یاسین عومەری جیا لەمێژوونووسە عیراقییەکانی تر ئەم ڕووداوەی نووسیوە کە لەساڵی ١٢١٦ك (١٨٠١– ١٨٠٢ز) بوو. هەروەها ئەوەشی بۆ تۆمارکردووین کە ئەم بڕیارە مەترسی لای نەجم بەگ دروست کردووە بۆیە ئەم کەسەی کە ئەم بڕیارەی لەبەغداوە بۆ هێناوە لەگەڵ سەرۆکی هۆزی تەی بەندکردووەو خۆشی بەماڵ و منداڵیەوە بۆ لای یەکێ لەهۆزەکان ڕای کردووە. بەڵام دواتر پەنای بۆ والی موسڵ بردووەو بەتکای ئەو والی بەغدا لێی خۆش بووەو بانگی کردۆتە بەغدا. لە ئەنجامدا عەبدوڵلا ئاغای موتەسەللیمی بەسرا کراوە بە سەرداری ماردین(١٠٦) و نەجم بەگیش بووە بە موتەسەللیمی بەسرا.(١٠٧)

لە ڕووداوەکانی ساڵی ١٢٢٣ك (١٨٠٧– ١٨٠٨ز) عومەری بەدرێژی باسی ئەوە دەکا کە ماردین بەدەست هەندێ خەڵکی ئاژاوەچی شارەکەو هۆزەکانی دەوروبەر تووشی تالان و کاولکارییەکی یەکجار زۆر بووە. لەئەنجامدا وەیۆدەی ماردین لەلایەن سلێمان پاشای بچووکی والی بەغدا (١٨٠٨–١٨١٠) گۆڕدراوەو (٦٠) کەس لەئاژاوەچییان کوژراون ئنجا بارودۆخ هێمن بۆتەوە.(١٠٨) هەر ئەم والییەی بەغدا لەساڵی دواتر خۆی ئاژاوەیەکی زۆری لەم دەڤەرە ناوەتەوە.کاتێ بەبیانووی بەرقەرارکردنی ئاسایش هەڵمەتێکی سەربازی دەباتەسەر ناوچەکانی باکوری ئیالەتەکەی. عومەری بەوردی هەواڵی ئەم هەڵمەتەی نووسیوەو لە سەرەتادا دەڵێ: "سلێمان پاشای والی بەغدا بڕیاری دا بەرەو ماردین بچێ و فەرمانی

بەهێزەکان دا لەپێش ئەودا برۆن بۆ ڕاستکردنەوەی ڕژێمی ئەم ولاتە".[109] بـەلام هەندێ سەرچاوەی تر ڕاشکاوانەتر دەڵێن والی بۆ تەمبێکردنی هـۆزە عەرەبـەکانی (آل الظفير و عنزة) و کوردە ئێزیدییەکان ئەم هەڵمەتەی بردووە.[110]

دەڤەری ماردین بووە پێگەی سەرەکی ئەم هەڵمەتـەو والـی هێزەکـانی کۆیـەو کەرکوك و موسڵ و هەولێر و مەندەلی و زەهـاب و تکریـت و هـۆزە عەرەبییـەکانی لەم دەڤەرە کۆکردەوەو بەشێکی گرنگـی پێکدادانـەکانیش هـەر لـەوێ ڕوویـان دا. لەئەنجامدا گوندەکانی ماردین تووشی تالانکردن بـوون. سـلێمان پاشـا هـەر بـەوە نەوەستا و لەدرێژەی ئەم هەڵمەتەدا دەسـتدرێژی کـردە سـەر ناوچـەکانی سـەربە ئیالەتی دیاربەکریش. بۆیە سکالاکان لـەدژی زێـدە بـوون و دواتـر لـە سـاڵی ١٨١٠ لەپۆســتەکەی خــرا. ســەبارەت بــەهۆکاری لێخــستنەکەی، عومــەری ئامــاژە بــەکردەوەکانی والــی نــاوبراو دەکــا کــە بــریتین لــە: "ســتەمکاری وگەنــدەڵی و پەرتــەوازەکردنی خــەڵك لــە دیاربــەکرو موســڵ و مــاردین".[111] کەواتــە ئــەم دەستدرێژییانەی کە کراونەتە سەر دەڤەری ماردین یـەکێك بـووە لـە هۆکارەکـانی لێخرانی ئەم والییە. شایانی باسە هەندێ سەرچاوەی تریش ئاماژە بـەوە دەکـەن کە دەڤەری ماردین ناوەندی زۆربەی ڕووداوەکانی ئەم هەڵمەتە بووە.[112]

هەرچــەندە زۆری نــەبرد ئــەم هەڵمەتــەی والــی بەغـدا تــەواو بـوو، بــەلام نەهامەتییەکانی دەڤەری ماردین هەر کۆتایی نەهات. مەسـەلەیەکی بەڵگەنەویسـتە کە توندوتیژی دەبێتە هۆی توندوتیژی زیاتر. چونکە ئەو خەڵکانـەی کـە سـامان و هۆیەکانی بەردەوامی ژیانیـان بـەتالان دەچـێ، ناچـارن ئـەوانیش بـۆ پەیـداکردنی بژێوی خۆیان خەڵکی تر تالان بکەن. لەئـەنجامی ئەمـەدا لـەماوەی دوای هەڵمەتـە سەربازییەکە دەبینین دەڤەری ماردین بەدەست شالاوی تالانکـاری و دەسـتدرێژی هۆزەکــان دەنــاڵێنێ. عومــەری لــە ڕووداوەکــانی ســاڵی ١٢٢٥ك (١٨١٠ز) ئــەم بارودۆخەی دەڤەری ماردین وێنا دەکات و ئامـاژە بەکاردانـەوەی نادروسـتی والـی بەغدا دەکا لە هەمبەریدا. چونکە دەڵـێ والـی نـاوبراو (بەرلـەوەی لـە پۆسـتەکەی بخرێ) هێزێکی لەگەڵ دەروێش ئاغای کوڕی حاجی سلێمانی وەیـۆدە نـاردووە بـۆ دەڤەرەکە کە لەچەند هۆزێکی عەرەبی پێکهـاتبوو. ئـەم هۆزانـە بـوێریی ئـەوەیان

نەبووە لەماردین نزیك ببنەوە بەلاّم لەدەوروبەری نسێبین دەستیان کرد بە کۆکردنەوەی پارە و سامان لە هۆزەکانی ئەم ناوە.[113]

لەئەنجامی ئەم تالاّنی و ڕێگرییانە، ڕێگای نێوان ماردین و موسلّ کە شادەمارێکی بازرگانی بوو لەناوچەکە، بەتەواوی لە مەترسیدا بوو. بەتایبەتی لەدەست کوردە ئێزیدییەکانی دەڤەری شنگار، کە چەندین باندی چەتەگەرییان لەم ڕێگایە بلاّوببۆوە.[114] بۆیە بازرگان وگەشتیارەکان بەبێ کاروانێکی گەورە بەم ڕێگایەدا نەدەڕۆیشتن. بەم شێوەیەش هەر دەستیان لەسەر دڵیان بوو، چونکە ڕووداوی ڕووتکردنەوەیان لەم ڕێگایە بیستبوو.[115] عومەریش نموونەیەکمان لەم بارەیەوە دەداتێ کاتێ لە ڕووداوەکانی ساڵی ١٢٢٥ك (١٨١٠– ١٨١١ز) دەنووسێ: "کاروانێك لە شاری حەڵەبەوە هات وکاتێ لە ماردین نزیك بۆوە ڕێگرانی خەڵکی شنگار لێی پەیدابوون وکاروانەکەیان تالاّن کرد و خەڵکەکە بایی سەد هەزار قرش جگە لە حوشتر و ئەسپ و ولاّغی لەدەست دا".[116] هەموو ئەم ڕووداوانە بەڵگەن لەسەر بێ توانایی بەرپرسانی دەڤەرەکە لەهەمبەر تێکچوونی ڕەوشی ئاسایش و بلاّوبوونەوەی نائارامی، کە ڕەنگدانەوەی خراپی بەسەر سەرجەم بوارەکانی ژیانی دانیشتوان هەبوو.

**چوارەم: بارودۆخی ئابووری و کۆمەلاّیەتی:-**

بێجگە لەهەندێ کارەساتی ئابووری و تەندروستی، عومەری لەکتێبەکانی خۆی زانیاری تری ئەوتۆ نادا کە تایبەت بێ بەبارودۆخی ئابووری و کۆمەلاّیەتی دەڤەری ماردین. بۆ نموونە ئەو باسی دابونەریت و هەروەها ژمارەو گرووپەکانی دانیشتوان و کارو پیشەی خەڵك و بابەتی لەم جۆرە ناکا. بەلاّم لەنێو ڕووداوەکانی تردا کە باسیان دەکا، ئاماژەی باش لەبارەی ڕەوشی ئابووری وکۆمەلاّیەتی دەڤەرەکە دەست دەکەوێ. لەلاپەڕەکانی پێشوو بینیمان کە بەهۆی شەڕو شالاّوەکانی والی و دەسەلاّتدارانی عوسمانی لەناوچەکە چەندین جار دەڤەرەکە تالاّن وکاولکاری بەخۆوە بینی. هەر بۆ نموونە لە شالاّوەکەی سلێمان پاشای گەورەی والی بەغدا بۆسەر هۆزی مللی لەساڵی ١٧٩١ز، هێزە هێرشبەرەکان

بەپێی گوتەی عومەری "نزیکەی دە هەزار سەر مەڕومالاَت و نزیکەی سێ هەزار حوشتر و چێلّ و گا" یان لە مللییەکان بەتالاَن بردووە.(١١٧) بێ گومان مللییەکان یەکێك بوون لەهۆزەکانی سەربە ماردین. لە هەلّمەتەکەی سلێمان پاشای بچووکیش گوندەکانی ماردین تالاَن کران.(١١٨)

بێ گومان ئەم ڕووداوانە بەکارەساتی ئابووری دادەنرێن بۆ خەلّکی دەڤەرەکە، چونکە کاریگەری خراپیان دەبوو لەسەر ڕەوشی ئابووری و بژێویی ژیانی دانیشتوان، وەك دواتر دەبینین. هەروەها شالاَوە تالاَنکارییەکانی هۆزەکان وکردارەکانی چەتەگەری و ڕێگری لە دەڤەرەکە، کە عومەری باسیان دەکاو لەلاپەڕەکانی پێشوو خرانەڕوو، بەلّگەی ئاشکران لەسەر خراپی هەلومەرجی ئابووری وکۆمەلاَیەتی دەڤەرەکە لەکۆتاییەکانی سەدەی هەژدەو سەرەتاکانی سەدەی دواتر. بێ گومان ئەم ڕەوشە ناسەقامگیرەی کە لەئەنجامی ئەم کردارانە دروست دەبوو، نەك تەنیا کاریگەری نەگەتیڤی لەسەر بژێوی دانیشتوان بەجێ دەهێشت، بەلّکو دەبووە هۆی سست بوونی چالاَکییە ئابوورییەکان و لەئەنجامدا لایەنی ئابووری لە دەڤەرەکە دوادەکەوت.

ئەگەر بێینەسەر ئەو ڕووداوانەی کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بەلایەنی ئابووری وکۆمەلاَیەتی دەڤەری ماردینەوە هەیە، دەبینین عومەری چەند زانیارییەکی کەم لەکتێبەکانیدا باس دەکا. بەلاَم ئەم زانیارییانە بایەخێکی زۆریان هەیە، لەبەرئەوەی زۆربەیان لەسەرچاوەی تردا دەست ناکەون. بەتایبەتی بەم وردەکارییەو بەو شێوەیەی کە ئاماژەیان لەبارەی ماردین تێدابێ. ڕووداوەکانیش ئەمانەن:

لە ڕووداوەکانی سالّی ١١٨٣ك (١٧٦٩–١٧٧٠ز) دا ئاماژە بەوە دەکا کە بۆ ماوەی هەفتەیەك سەرماوسۆلّەکی زۆر سەخت ماردینی گرتۆتەوە، بەجۆرێك کەس نەیتوانیوە لە مالّەکەی دەربچێ.(١١٩) هەرچەندە ئەو باسی ئاکامەکانی ئەم سەرماوسۆلّە ناکات، بەلاَم لەوانەیە کاریگەری خراپی لەسەر بەروبوومی کشتوکالّی دەڤەرەکە هەبووبێ.

هەروەها لەکتێبی (الآثار الجلیة) دا هاتووە: کە لە ساڵی ١١٨٥ك (١٧٧٠-١٧٧١ز) دا تاعوونێکی گەورە ماردین و نسێبین و جزیرەی گرتۆتەوە ئنجا گەیشتۆتە موسڵ و قوربانییەکی زۆری لێ کەوتۆتەوە.[١٢٠] لەکتێبی (منیة الأدباء)یشدا ئاماژە بەم پەتایە دەکا، بەڵام هەر لەچوارچێوەی موسڵدا کە بابەتی سەرەکی کتێبەکەیە. بۆیە لێرەدا باسی ماردین ناکا.[١٢١] لەهەندێ سەرچاوەی تریش زانیاری لەسەر ئەم ڕووداوە دەست دەکەوێ، بەڵام باسی ماردینی تێدا نییە.[١٢٢] شایانی باسە ئەم پەتایە دواتر تەشەنەی کردووەو تاساڵی ١٧٧٣ زۆربەی ناوچەکانی کوردستان و بەغدا و بەسراشی گرتۆتەوە. لەئەنجامدا هەزاران کەسی لەناوبردووە.[١٢٣]

لە ڕووداوەکانی ساڵی ١٢١٤ك (١٧٩٩-١٨٠٠ز) ئاماژە بە تاعوونێکی ترسناکتر دەکا کە لەهەندێ ناوچەی ئەنادۆڵ بڵاوبۆتەوە ئنجا بەتوندی دیاربەکر و ماردین و شاری جزیرەشی گرتۆتەوە. سەبارەت بەکاریگەری ئەم پەتایە ترسناکە لە ماردین، عومەری دەڵێ: "زۆرینەیان مردن و کەمینەیان مانەوە، هەرچی گوندەکانیانە ئەوا زۆر بەکەمی ڕزگاریان بوو تەنانەت مەڕومالآت و وڵاغەکانیان بێ شوان مانەوە".[١٢٤] دواتر نەخۆشییەکە لەوێوە پەڕیوەتەوە بۆ موسڵ و لەوێ کارەساتێکی ترسناکی ناوەتەوە.[١٢٥] ئەم کارەساتە هەر بەوە نەوەستاوەو لە ناوچەکانی باشووری کوردستان و هەروەها بەغدا ش بڵاوبۆتەوە.[١٢٦] شایانی باسە هەندێ سەرچاوەی تریش باسی بڵاوبوونەوەی ئەم پەتایە دەکەن لە ناوچەکەدا، بەڵام زانیاریمان لەبارەی ماردین نادەنێ.[١٢٧] تەنانەت خودی یاسین عومەریش لە شوێنێکی تر باسی ئەم ڕووداوە دەکا بەڵام ئاماژە بە ماردین ناکا.[١٢٨]

بەپێی گوتەی عومەری دوای تێپەڕبوونی پێنج ساڵ بەسەر ئەم کارەساتە تەندروستییە، گرانی و قاتوقڕی چەندین ناوچەی ئیالەتەکانی ڕۆژهەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی گرتۆتەوە. ئەم تەنگژە ئابوورییە لەهەر ناوچەیەك هۆکاری خۆی هەبوو. سەبارەت بە ماردین، عومەری هۆکارەکەی دەگێڕێتەوە بۆ خراپەکاری هۆزەکان و کەمیی بەروبوومی کشتوکاڵی. بۆ (نسێبین)یش تێکچوونی ڕەوشی ئاسایش

بەهۆکار دادەنێ.[١٢٩] هەر لەڕێگەی زانیارییەکانی ئەم مێژوونووسەوە دەزانین کە لەساڵی ١٢٢٤ك (١٨٠٨-١٨٠٩ز) گرانییەکی زۆر دژوار لە ماردین لەئارادا بوو بەجۆرێك دەستکەوتنی کەلوپەلی خۆراکی زۆر سەخت بوو. ئەمەش بەهۆی ئاژاوەو شەڕی هۆزەکان لەگەڵ یەکتر و تاڵانکردنی بەروبوومی ناوچەکە لەلایەن هێزەکانی بەغدا.[١٣٠] لەم زانیارییانەی عومەری دەردەکەوێ کە ئەم نائارامی وئاژاوانەی لەم ماوەیەدا لەدەڤەرەکە بەرپا ببوون کارەساتی ئابووری ترسناکیان لێ کەوتۆتەوە. ئەم هەڵمەتە سەربازییەی سلێمان پاشای بچووکی والی بەغداش کە بەبیانووی گێڕانەوەی سەقامگیری کرایە سەر دەڤەرەکە، ڕەوشەکەی بەئاقارێکی خراپتردا برد.

بەر لەوەی کۆتایی بەم باسە بێنین دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە لە ساڵانی ١٧٥٦-١٧٥٧ دا لەئەنجامی هەندێ هۆکاری سروشتی کارەساتێکی مرۆیی کەم وێنە لەناوچەکەدا ڕووی دا. ئەم کارەساتە کە خۆی لەبرسێتی و قاتوقڕییەکی ترسناکدا دەبینییەوە، لەناوچەکانی دیاربەکرەوە تا موسڵ و دەوروبەری گرتەوە.[١٣١] کەواتە ئاساییە کە ماردینیش تووشی ئەم کارەساتە بووبێ، وەك لەهەندێ سەرچاوەدا بەڕوونی ئاماژەی پێدەدرێ.[١٣٢] بەڵام جێگەی سەرسوڕمانە کە عومەری ڕاستەوخۆ ئاماژە بەدەڤەری ماردین ناکا، هەرچەندە لەچەند کتێبێکیدا باسی ئەم کارەساتە دەکا.[١٣٣] بێ گومان ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە بەپێی زانیارییەکانی ئەم مێژوونووسە دەڤەری ناوبراو دوور بووە لەم کارەساتە، چونکە عومەری لەسەرەتای باسکردنی ڕووداوەکە دەنووسێ: "کارەساتەکە دژوار بوو، لێقەومانەکە مەزن بوو، گرانی عەجەم و عەرەب و هەموو وڵاتانی گرتەوە".[١٣٤] کەواتە ئەو بەشێوەیەکی گشتی ئاماژەی بەناوچە تووشبووەکان داوەو لەبەر فراوانی ناوچە جوگرافییەکە بەپێویستی نەزانیوە کە شار بە شار و ناوچە بە ناوچە ناویان بهێنێ.

## پوختـــەی توێژینەوەکە :

یاسین کوڕی خەیروڵلای عومەری (١٧٤٥-١٨١٦) کە خەڵکی (موسـڵ) ــە، لەو مێژوونووسە عیراقییـە دەگمەنانـەی سـەردەمی عوسمانییـە، کـە کتێبـەکانیان گشتگیر و پڕ لە وردەکارین. ئەم مێژوونووسە لەکتێبە مێژووییـەکانی، بەتایبـەتی (غرائب الأثر) و(الآثار الجلیة) زانیاری زۆری لەبارەی وڵات و ناوچـەکانی دەوروبـەر تۆمـار کـردووەو تـەنیا بایـەخی بـەڕووداوەکانی موسـڵ یـان ئەیالەتـەکانی عـیراق نەداوە، هەروەکو زۆربەی مێژوونووسە عیراقییەکانی ئەم سەردەمە وایـان دەکـرد. لە ئەنجامـدا عومـەری کەرەسـتەیەکی بەکـەلکی جـێ هێـشتووە بـۆ نووسـینەوەی مێژووی ئەیالەتە عوسمانییەکان لە زۆربەی لایەنەکانەوە.

ڕووداوەکـانی دەڤـەری (مـاردین) یـش جێگـەی سـەرنجی عومـەری بـوون، بەتایبەتی کە ئەم دەڤەرە لە موسڵ نزیکە و لە ڕووی کارگێڕیشەوە لـەم ماوەیـەدا سەر بـە ئیالـەتی بەغدا بـوو. بۆیـە کتێبـەکانی عومـەری بەتایبـەت (غایـة المـرام) هەندێ زانیاری تێدایە سەبارەت بەباری ئاوەدانی ماردین. هەر ئـەم کتێبـە لەگـەڵ هەردوو کتێبی (غرائب الأثر) و(الآثار الجلیة) هـەواڵی زۆریـان تێدایـە لـەبارەی ئـەو گۆڕانکارییـــە کارگێڕییانـــەی کـــە والـــی بەغـــدا لـــە پۆســـتی ســـەرداری مـــاردین (Voyvoda) دەیکـرد. هـەروەها ئـەو ئـاژاوە ناوخۆییانـەش لـەخۆ دەگـرن کـە بـەهۆی ڕاپـەڕینی دانیـشتووان لـەدژی سـەرداری دەڤەرەکـەیان، یـان لەئـەنجامی هێرشە سـەربازییەکانی ئەیالەتـەکانی دەوروبـەر و دەسـتدرێژی هۆزەکـان ڕوویـان دەدا. عومەری باسی هەندێ کارەسات و قـەیرانی ئـابووری و تەندروسـتیش دەکـا کە دەڤەری ماردینیان گرتۆتەوە لەم ماوەیـەدا. بەتایبـەت گرانـی و بڵاوبوونـەوەی پەتای تاعوون. ئەمانە لەگەڵ زانیاری جۆراوجۆری تر، کە زۆربەیان لە سەرچاوەی تردا نابینرێن، هەموویان پێکەوە سیمای مێژوویی دەڤەری ماردین بەدیار دەخـەن لە گۆشەنیگای مێژوونووسێکی عیراقی موسڵییەوە.

## ( لیستی سەرچاوەکان )


**یەکەم: بەڵگەنامەی بڵاوکراوە:**

-Ayni Ali Efendi (Defteri Hakani Emini-1018/1609):Osmanli Imparatorlugunda Eyalet Taksimati, Toprak Dagitmi ve Bunlarin Mali Gucleri, Bu gunkudile Ceviren:Hadiye Tuncer, Gursoy Basmevi-Ankara 1964.

**دووەم: دەستنووس:**

- جبرائيل حنوش اصفر، منتجع المرتاد في تاريخ بغداد/ او مختصر المستفاد في تأريخ بغداد، (مخطوط) دار العراق للمخطوطات، برقم ١١٠٤.

**سێیەم: کتێب:**

**أ- بەزمانی تورکی:-**

- شمس الدين سامي، قاموس الاعلام ، مهران مطبعه سي، مج٣، استانبول ١٣٠٦، مج٦، استانبول ١٣١٦رومي.
- هاممەر، دولت عثمانية تاريخي، مترجمي: محمد عطا، ج٤، استانبول ١٣٣٠ رومي.

**ج- بەزمانی کوردی:-**

- ئەولیا چەلەبی، کورد لەمێژووی دراوسێکانیدا (یان - سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی) و: ناکام، بەغدا ١٩٨٨.
- كلوديوس جيمس ريج، رحلة ريج في العراق عام١٨٢٠، ت: بهاءالدين نوري، ج١، بغداد ١٩٥١.

**ب- بەزمانی عەرەبی:-**

- ابي طالب خان ، رحلة ابي طالب خان الى العراق واوروبا، ت: مصطفى جواد، دار الوراق للنشر، ط١، بغداد ٢٠٠٧.
- اوليفييه، رحلة اوليفييه الى العراق ١٧٩٤-١٧٩٦، ت: د. يوسف حبي، بغداد ١٩٨٨.
- بيرسي كيمب، الموصل والمؤرخون الموصليون في العهد الجليلي/١٧٢٦-١٨٣٤، ت: محب احمد الجليلي و غانم العكيلي، مراجعة الترجمة: صلاح سليم علي، مركز دراسات الموصل، جامعة الموصل ٢٠٠٧.

- جعفر الخياط، صور من تأريخ العراق في العصور المظلمة، ج١، ط١، دار الكتب، بيروت ١٩٧١.
- جعفر الخياط، مشاهدات جون أشر في العراق، فصل ضمن كتاب (رحالة اوروبيون في العراق)، دار الوراق للنشر، لندن ٢٠٠٧.
- حسين ناظم بيگ، تاريخ الامارة البابانية، ت: شكور مصطفى و محمد الملا عبدالكريم المدرس، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، اربيل ٢٠٠١.
- دومنيكو لانزا، الموصل في القرن الثامن عشر حسب مذكرات دومنيكو لانزا، ت: القس روفائيل بيداود، ط٢، الموصل ١٩٥٣.

رسول حاوي الكركوكلي، دوحة الوزراء في تأريخ وقائع بغداد الزوراء، ت: موسى كاظم نورس، مطبعة كرم، بيروت (د.ت).

- ريجارد كوك، بغداد مدينة السلام، ت: فؤاد جميل والدكتور مصطفى جواد، ج٢، ط١، بغداد ١٩٦٧.
- ستيفن همسلي لونكريك، اربعة قرون من تاريخ العراق الحديث، ت: جعفر الخياط، دار الرافدين للنشر، ط٥، بيروت ٢٠٠٤.
- د. سعدي عثمان حسين، كوردستان الجنوبية في القرنين السابع عشر والثامن عشر/ دراسة في علاقتها الادارية والسياسية والاقتصادية مع ايالتي بغداد والموصل، مطبعة سيما، السليمانية ٢٠٠٦.
- د. سعدي عثمان هروتي، كوردستان والامبراطورية العثمانية/ دراسة في تطور سياسة الهيمنة العثمانية في كوردستان (١٥١٤-١٨٥١)، مؤسسة موكرياني- اربيل، مطبعة خاني، دهوك ٢٠٠٨.
- سليمان فائق بك، تاريخ المماليك "الكوله مند " في بغداد، ت: محمد نجيب ارمنازي، مطبعة المعارف، بغداد ١٩٦١.
- سهيل قاشا، الموصل في العهد الجليلي ١١٣٩-١٢٥٠هـ/ ١٧٢٦-١٨٣٤، التنوير للطباعة والنشر، ط١، بيروت ٢٠١٠.
- صديق الدملوجي، امارة بهدينان الكردية أو امارة العمادية، ط٢، مراجعة وتقديم: د.عبدالفتاح علي يحيى، اربيل ١٩٩٩.

عباس العزاوي، تأريخ العراق بين احتلالين، مج٦، شركة التجارة والطباعة المحدودة، بغداد ١٩٥٤.

عبدالعزيز سليمان نوار، داود باشا والي بغداد، دار الكاتب العربي للطباعة والنشر، القاهرة ١٩٦٨.

عثمان بن سند الوائلي البصري، مطالع السعود بطيب اخبار الوالي داود/ تأريخ العراق من سنة ١١٨٨ الى سنة ١٢٤٢هـ (١٧٧٤-١٨٢٦م)، تحقيق: د. عماد عبدالسلام رؤوف وسهيلة عبدالمجيد القيسي، دار الحكمة للطباعة والنشر، الموصل ١٩٩١.
- كارستن نبيور، رحلة نيبور الى العراق في القرن ١٨، ت: محمود حسين الامين، بغداد ١٩٦٥.
- محمد امين بن خيرالله الخطيب العمري، منهل الاولياء ومشرب الاصفياء من سادات الموصل الحدباء، ج١، تحقيق: سعيد الديوهجي، مطبعة الجمهورية، الموصل ١٩٦٧.
- محمد امين زكي، مشاهير الكرد وكردستان، ج٢، الآثار الكاملة للمؤلف، اعداد: رفيق صالح، السليمانية ٢٠٠٥.
- ياسين بن خيرالله الخطيب العمري ، زبدة الاثار الجلية في الحوادث الارضية ، انتخب زبدته: د. داود الجلبي، تحقيق: عماد عبدالسلام رؤوف، مطبعة الآداب، النجف ١٩٧٤.
- ياسين العمري، غاية المرام في تاريخ محاسن بغداد دارالسلام، مطبعة دار البصري ، بغداد ١٩٦٨.
- ياسين بن خيرالله الخطيب العمري، غرائب الاثر في حوادث ربع القرن الثالث عشر، مطبعة ام الربيعين، الموصل ١٩٤٠.
- ياسين بن خيرالله الخطيب العمرى ، منية الادباء في تأريخ الموصل الحدباء، تحقيق ونشر: سعيد الديوهجي، مطبعة الهدف، الموصل ١٩٥٥.

**چوارەم: وتار و توێژینەوە:**

د. سەعدی عوسمان هەروتی، تەنگژە ئابووری و تەندروستییەکانی کوردستان لە سەردەمی عوسمانیدا، (زانکۆ) گۆڤاری زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر، ژ (٤٢) ٢٠٠٩.
- جعفر الخياط، مشاهدات الدكتور ايفز بين بغداد وكركوك والموصل، الاقلام (مجلة) ج (١٢) س (٢) آب ١٩٦٦، بغداد.
- Percy Kemp, Mosuli Sketches of Ottoman history, Middle Eastern Studies, vol.17, no.3, (jul.1981).

# پەراوێزەکان

(١) شمس الدين سامي، قاموس الاعلام ، مـج٦، مهـران مطبعـه سـي، اسـتانبول ١٣١٦رومـي (١٨٩٨م)، ص٤٠٩٢.

(٢) کورد لەمێـژووی دراوسـێکانیدا (یـان ـ سـیاحەتنامەی ئـەولیا چـەلەبی) و: ناکـام، بەغـدا ١٩٨٨، ل٧٣.

(٣) رحلة ابي طالب خان الى العراق واوروبا، ت: مصطفى جواد، دار الوراق للنشر، ط١، بغداد ٢٠٠٧، ص٢٤٥.

(٤) لەبارەی ئەم ڕووداوانە بڕوانە: د. سعدي عثمان هروتي، كوردستان والامبراطورية العثمانيـة/ دراسـة في تطـور سياسـة الهيمنـة العثمانيـة في كوردسـتان (١٥١٤-١٨٥١)، مؤسسـة موكرياني- اربيل، مطبعة خاني، دهوك ٢٠٠٨، ص٣٥-٥٨.

(٥) هامەر، دولت عثمانية تاريخي، مترجمي: محمد عطا، ج٤، استانبول ١٣٣٠ رومي، ص١٦١-١٦٢، ١٦٧.

(٦) شمس الدين سامي، م .س، مج٦، ص٤٠٩٢، ٤٠٩٣.

(٧) سیاحەتنامە، ل٧٢.

(٨) رحلة اوليفييه الى العراق١٧٩٤-١٧٩٦، ت: د.يوسف حبي، بغداد ١٩٨٨، ص٢٧.

(٩) بڕوانە: ابي طالب خان، م . س، ص٢٤٥-٢٤٦، ستيفن همسلي لونكريك، اربعة قرون من تـاريخ العـراق الحـديث، ت: جعفـر الخيـاط، دار الرافـدين للنـشر، ط٥، بـيروت ٢٠٠٤،ص٢٥٢.

(١٠) اوليفييه، م . س، ص٢٨، شمس الدين سامي، م .س، مج٦، ص٤٠٩٣.

(١١) ستيفن لونكريك، م .س ، ص١٥-١٦، د.سـعدي عثمـان حـسين، كوردسـتان الجنوبيـة في القرنين السابع عشر والثامن عشر/ دراسة في علاقتها الادارية والـسياسية والاقتـصادية مـع ايالتي بغداد والموصل، مطبعة سيما، السليمانية ٢٠٠٦، ص٣٥٨.

(١٢) بڕوانە: اوليفييه، م . س، ص٣٠-٤٢، جعفر الخياط، مشاهدات جون أشر في العراق، فصل ضمن كتاب (رحالة اوروبيون في العراق)، دار الوراق للنشر، لندن ٢٠٠٧، ص١٢٤.

(١٣) سەنجەق: واتە لیوا ، لەدەوڵەتی عوسمانی هەر ئیالەتێك دابەش دەبوو بـۆ چـەند سـەنجەقێك، کە سەنجەق بەگ بەڕێوەی دەبرد.

(١٤) سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، ل٧٢.

(١٥) ویلایەت: گەورەترین یەکەی کارگێڕی بوو لە دەوڵەتی عوسمانیدا، بـەر لەسـاڵی ١٥٩١ و دوای سـاڵی ١٨٦٤ بـەکاردەهات. لـەماوەی نێـوان ئـەم دوو سـاڵەش زاراوەی ئیالـەت

بەکاردەهێنرا. ئێمەش لە بەکارهێنانی ئەم دوو زاراوەیە لەتوێژینەوەکەدا ڕەچاوی ئەمەمان کردووە.

(١٦) عبدالسلام المارديني، تأريخ ماردين (مخطوط)، ورقة ١٣٨-١٣٩. نقلاً عن: عبدالعزيز سليمان نوار، داود باشا والي بغداد، دار الكاتب العربي للطباعة والنشر، القاهرة ١٩٦٨،ص١٥٢.

(١٧) بڕوانە: ئەولیا چەلەبی، س .پ، ل٣٦، هەروەها:

Ayni Ali Efendi (Defteri Hakani Emini-1018/1609):Osmanli Imparatorlugunda Eyalet Taksimati, Toprak Dagitmi ve Bunlarin Mali Gucleri, Bu gunkudile Ceviren:Hadiye Tuncer, Gursoy Basmevi- Ankara 1964,s.13-14.

(١٨) اوليفييه، م . س، ص٣١، عبدالعزيز سليمان نوار، م . س، ص١٥١. شایانی باسە لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەمدا ماردین یەکێك بوو لەم سێ سەنجەقەی کە ویلایەتی دیاربەکریان پێکدەهێنا و ئەم سەنجەقە پێنج قەزای هەبوو کە بریتی بوون لە: ماردین، نسێبین، جەزیرە، میدیات، عەونییە. شمس الدين سامي، م .س، مج٦، ص٤٠٩٣.

(١٩) موتەسەللیم: ئەو کەسەیە کە جێگەی والی دەگرێتەوە لەکاتی ئامادەنەبوونی، هەروەها بە سەرداری شارە سەرەکییەکانیش دەگوترا کە ڕاستەوخۆ سەربەویلایەت بوون، لەبەرئەوەی دەسەلاتیان لەخودی والی وەردەگرت. بۆ نموونە سەرداری بەسرا پێی دەگوترا (موتەسەللیم) کاتێ سەربە ئیالەتی بەغدا بوو.

(٢٠) عبدالعزيز سليمان نوار، م . س، ص١٥١.

(٢١) اربعة قرون...، ص١٥٨.

(٢٢) رحلة اوليفييه...، ص٢٧.

(٢٣) عبدالعزيز سليمان نوار، م . س، ص١٥٢، سعدي عثمان ، كوردستان الجنوبية...، ص١١٠-١١١.

(٢٤) جبرائيل حنوش اصفر، منتجع المرتاد في تاريخ بغداد/ او مختصر المستفاد في تأريخ بغداد، (مخطوط) دار العراق للمخطوطات، برقم ١١٠٤، ص١٢٨-١٢٩، ستيفن لونكريك، م .س ، ص١٥٨.

(٢٥) ريجارد كوك، بغداد مدينة السلام، ت: فؤاد جميل والدكتور مصطفى جواد، ط١، بغداد ١٩٦٧، ج٢، ص٦٩، سعدي عثمان ، كوردستان الجنوبية...، ص١١١.

(٢٦) ستيفن لونكريك، م .س ، ص١٦٩.

(٢٧) م .ن ، ص١٩٧.

(٢٨) سليمان فائق بك، تاريخ المماليك "الكوله مند " في بغداد، ت: محمد نجيب ارمنازي، مطبعة المعارف، بغداد ١٩٦١، ص٨٦، سعدي عثمان، كوردستان الجنوبية...، ص١١٢.

(٢٩) ستيفن لونكريك، م .س ، ص٢٤٢.

(٣٠) اوليفييه، م .س، ص٢٧.

(٣١) سەبارەت بەرەچەڵەکی جەلیلییەکان و ماوەی حوکمڕانییان لەموسڵ بڕوانە: عماد عبدالسلام رؤوف، الموصل في العهد العثماني/ فترة الحكم المحلي ١١٣٩-١٢٤٩هـ/ ١٧٢٦-١٨٣٤م، النجف ١٩٧٥.

(٣٢) سهيل قاشا، الموصل في العهد الجليلي ١١٣٩-١٢٥٠هـ/ ١٧٢٦-١٨٣٤، التنوير للطباعة والنشر، ط١، بيروت ٢٠١٠، ص٣٠٢-٣٠٣.

(33) Percy Kemp, Mosuli Sketches of Ottoman history, Middle Eastern Studies, vol.17, no.3, (jul.1981) , p310.

(٣٤) بيرسي كيمب، الموصل والمؤرخون الموصليون في العهد الجليلي/١٧٢٦- ١٨٣٤، ت: محب احمد الجليلي و غانم العكيلي، مركز دراسات الموصل، جامعة الموصل ٢٠٠٧، ص١٥٢-١٥٣، لەبارەی ناوی هەندێ لە کتێبەکانی بڕوانە هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

(٣٥) م . ن، ص١٥٣-١٥٧.

(٣٦) بۆ نموونە بڕوانە: ياسين بن خيرالله الخطيب العمري، غرائب الاثر في حوادث ربع القرن الثالث عشر، مطبعة ام الربيعين، الموصل ١٩٤٠ ،ص١٩، ٢١، ٢٣، ٢٧، ٤٨، ١٠٢.

(٣٧) ياسين العمري، غاية المرام في تاريخ محاسن بغداد دارالسلام، مطبعة دار البصري ، بغداد ١٩٦٨، ص٤-٦، ياسين بن خيرالله الخطيب العمرى، منية الادباء في تأريخ الموصل الحدباء، تحقيق ونشر: سعيد الديوەجي، مطبعة الهدف، الموصل ١٩٥٥،ص٥-٧.

(٣٨) بيرسي كيمب، م .س، ص١٥٢.

(٣٩) بۆنموونە بڕوانە: غاية المرام، ص٩٧-٩٩، غرائب الاثر، ص٨١، ١٠٧-١٠٨، بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: صديق الدملوجي، امارة بهدينان الكردية أو امارة العمادية، ط٢، مراجعة وتقديم: د.عبدالفتاح علي يحيى، اربيل ١٩٩٩، ص٢١-٢٧. جێگەی سەرنجە (سەدیق جەلیلی) دوای ئەوەی لەساڵی ١٩٤٠ کتێبی (غرائب الاثر) ی بڵاوکردۆتەوە، هەوڵی داوە دانەکانی کتێبەکە بکێشێتەوەو ئەو لاپەڕانە بدڕێنێ کە هێرشکردنیان تێدایە بۆ سەر کورد، بەڵام زۆر سەرکەوتوو نەبووە لەم کارەیدا. بڕوانە: بيرسي كيمب، م .س، ص١٥٧.

(٤٠) لەبارەی سنووری دەسەڵاتی ئیالەتی بەغدا بڕوانە: سعدي عثمان ، كوردستان الجنوبية...، ص١١٢-١١٣.

[٤١] غاية المرام، ص٤.
[٤٢] ياسين بن خيرالله الخطيب العمري ، زبدة الاثار الجلية في الحوادث الارضية ، انتخب زبدته: د. داود الجلبي، تحقيق: عماد عبدالسلام رؤوف، مطبعة الآداب، النجف ١٩٧٤، ص٧-١٠.
[٤٣] بڕوانە کتێبی: غرائب الاثر، صفحات متفرقة.
[٤٤] ص٨٦.
[٤٥] سياحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، ل٧٣.
[٤٦] غاية المرام، ص٥.
[٤٧] شمس الدين سامي، م .س، مج٣،استانبول ١٣٠٦، ص٢٠٨١، هەروەها بڕوانە: ئەولیا چەلەبی، س . پ، ل٧٤.
[٤٨] رحلة اوليفييه، ص٢٧، هەروەها بڕوانە: عبدالعزيز سليمان نوار، م . س، ص١٥٢.
[٤٩] غرائب الأثر، ص٣١.
[٥٠] غاية المرام، ص١٩١، زبدة لآثار، ص١٦٧.
[٥١] غاية المرام، ص١٩١، غرائب الأثر، ص٣٣.
[٥٢] لەم بارەیەوە بڕوانە: د.سهيل صابان، المعجم الموسوعي للمصطلحات العثمانية التاريخية، مراجعة: د.عبدالرزاق محمد حسن بركات، مكتبة الملك فهد الوطنية، الرياض،٢٠٠٠.
[٥٣] ص٨٦.
[٥٤] سليمان فائق بك، م . س، ص٣٧، ستيفن لونكريك، م . س، ص٢٧١.
[٥٥] غرائب الأثر، ص١٠٥.
[٥٦] غاية المرام، ص١٩٧.
[٥٧] بڕوانە: م . ن، ص١٩٧، غرائب الأثر، ص٥٧.
[٥٨] غرائب الأثر، ص٨٠.
[٥٩] لەلاپەڕەکانی دواتر باسی ئەم بزووتنەوەیە دەکەین.
[٦٠] کیس: لە دەوڵەتی عوسمانیدا دراوی ئاقچە یان قرش بەزۆری بە کیس دەژمێردران، ناوەڕۆکی کیسێك لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر و لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر دەگۆڕا.
[٦١] ص١٩١.
[٦٢] زبدة الآثار، ص١٦٧.
[٦٣] غرائب الأثر، ص٢٤.

(٦٤) بڕوانە: كارستن نيبور، رحلة نيبور الى العراق في القرن١٨،ت: محمود حسين الامين، بغداد ١٩٦٥، ص١١٤.

(٦٥) غرائب الأثر، ص٣٠.

(٦٦) رسول حاوي الكركوكلي، دوحة الوزراء في تأريخ وقائع بغداد الزوراء، ت: موسى كاظم نورس، مطبعة كرم، بيروت (د.ت)، ص١٩٤-١٩٥، عثمان بن سند الوائلي البصري، مطالع السعود بطيب اخبار الوالي داود/ تأريخ العراق من سنة ١١٨٨ الى سنة ١٢٤٢هـ (١٧٧٤-١٨٢٦م)، تحقيق: د. عماد عبدالسلام رؤوف وسهيلة عبدالمجيد القيسى، دار الحكمة للطباعة والنشر، الموصل ١٩٩١، ص٢٠٣-٢٠٤.

(٦٧) اربعة قرون، ص٢٥٣.

(٦٨) ص٣٣، ٣٩،٤١، هەروەها بڕوانە: غاية المرام، ص١٩١-١٩٣.

(٦٩) بۆ نموونە سەیری ئەم کتێبانەمان کرد (رسول الكركوكلي، دوحة الوزراء / عثمان بن سند الوائلي، مطالع السعود/ سليمان فائق بك، تاريخ المماليك) بەلاّم ئەم زانیارییانەمان نەبینی.

(٧٠) بڕوانە: زبدة الآثار، ص١٧٢، غرائب الأثر، ص٣١.

(٧١) لەم بارەیەوە بڕوانە: د. احمد عثمان أبوبكر، اكراد المللي وابراهيم باشا، بغداد ١٩٧٣.

(٧٢) محەمەد پاشای کوڕی خالید پاشای بابانە، لەبارەی بڕوانە: محمد امين زكي، مشاهير الكرد وكردستان، ج٢، الآثار الكاملة للمؤلف، اعداد: رفيق صالح، السليمانية ٢٠٠٥، ص٣٧٠-٣٧١.

(٧٣) زبدة الآثار، ص١٣٨. لەبارەی ئەم ڕووداوە بڕوانە: سعدي عثمان ، كوردستان الجنوبية...، ص٣١٧-٣١٨.

(٧٤) کەتخودا: جێگر و یاریدەدەری والی بوو لە ویلایەتدا.

(٧٥) غاية المرام، ص١٨٥.

(٧٦) بڕوانە: ستيفن لونكريك، م . س، ص٢١٦.

(٧٧) حسين ناظم بيگ، تاريخ الامارة البابانية، ت: شكور مصطفى و محمد الملا عبدالكريم المدرس، مؤسسة موكرياني للطباعة والنشر، اربيل ٢٠٠١، ص١٢٥.

(٧٨) رسول الكركوكلي، م . س، ص١٤٨.

(٧٩) سعدي عثمان، كوردستان والامبراطورية...، ص١٤٦، هەروەها بڕوانە: ستيفن لونكريك، م. س، ص٢٥٢، عبدالعزيز سليمان نوار، م . س، ص١٥٢.

(٨٠) غاية المرام، ص١٩١، زبدة الآثار، ص١٦٤.

(٨١) غرائب الأثر، ص٢٣.

(٨٢) رسول الكركوكلي، م . س، ص١٩٤، عثمان بن سند البصري، م . س، ص٢٠٣.

(٨٣) غاية المرام، ص١٩١.
(٨٤) غرائب الأثر، ص٢٣.
(٨٥) رسول الكركوكلي، م . س، ص١٩٤- ١٩٥، ستيفن لونكريك، م . س، ص٢٥٣، سعدي عثمان، كوردستان والامبراطورية...، ص١٤٧.
(٨٦) غرائب الأثر، ص٢٣.
(٨٧) عثمان بن سند البصري، م . س، ص٢٠٣، رسول الكركوكلي، م . س، ص١٩٤.
(٨٨) غرائب الأثر، ص٢٣-٢٤.
(٨٩) م . ن، ص٢٣-٢٤، غاية المرام، ص١٩١.
(٩٠) زبدة الآثار، ص١٦٤-١٦٥.
(٩١) عثمان بن سند البصري، م . س، ص٢٠٣، رسول الكركوكلي، م . س، ص١٩٥.
(٩٢) رسول الكركوكلي، م . س، ص١٩٥، عباس العزاوي، تأريخ العراق بين احتلالين، مج٦، شركة التجارة والطباعة المحدودة، بغداد ١٩٥٤،ص١١٠.
(٩٣) غرائب الأثر، ص٢٤، زبدة الآثار، ص١٦٦-١٦٧، غاية المرام، ص١٩١.
(٩٤) هەندێ سەرچاوەی تریش وا بەکورتی باسی ڕووداوەکە دەکەن، بڕوانە: عثمان بن سند البصري، م . س، ص٢٠٣، ستيفن لونكريك، م . س، ص٢٥٣.
(٩٥) بۆ درێژەی ئەم ڕووداوانە بڕوانە: رسول الكركوكلي، م . س، ص١٩٥.
(٩٦) بڕوانە: غرائب الأثر، ص٢٤، ٢٥، ٣٣-٣٤، زبدة الآثار، ص١٦٧-١٦٩، غاية المرام، ص١٩١، ١٩٢.
(٩٧) لەم بارەیەوە بڕوانە: عبدالعزيز سليمان نوار، م . س، ص١٥٢-١٥٣.
(٩٨) زبدة الآثار، ص١٧٢، غرائب الأثر، ص٣١.
(٩٩) دیارە سەرۆك هۆزێکی کوردە، چونکە عومەری وشەی (میر) بۆ سەرۆك هۆز بەکاردێنێ.
(١٠٠) غرائب الأثر، ص٣٣.
(١٠١) غاية المرام، ص١٩١.
(١٠٢) اربعة قرون، ص٢٥٣.
(١٠٣) غرائب الأثر، ص٣٩، غاية المرام، ص١٩٣. لەم کتێبەی دووەمیان ڕووداوەکە بەکورتی باس کراوە.
(١٠٤) اربعة قرون، ص٢٥٣.
(١٠٥) غرائب الأثر، ص٣٩، ٤٠، ٤١. دیسان لە کتێبی (غاية المرام) دا ئەم ڕووداوانە بەکورتی باس کراون. بڕوانە: ص١٩٣.
(١٠٦) غرائب الأثر، ص٥٧.

(١٠٧) غاية المرام، ص١٩٧.
(١٠٨) غرائب الأثر، ص٧٩-٨٠.
(١٠٩) م . ن ، ص٨٧.
(١١٠) عثمان بن سند البصري، م . س، ص٢٦٩-٢٧٠، رسول الكركوكلي، م . س، ص٢٤٥.
(١١١) بۆ درێژەی ئەم ڕووداوانە بڕوانە: غرائب الأثر، ص٨٧-٨٩، ١٠٦.
(١١٢) عثمان بن سند البصري، م . س، ص٢٧٠، ستيفن لونكريك، م . س، ص٢٧١.
(١١٣) غرائب الأثر، ص١٠٥.
(١١٤) ستيفن لونكريك، م . س، ص٢٩١.
(١١٥) بڕوانە: ابي طالب خان، م . س، ص٢٤٦، ٢٤٧، اوليفييه، م . س، ص٣٢.
(١١٦) غرائب الأثر، ص١٢١.
(١١٧) غاية المرام، ص١٩١.
(١١٨) غرائب الأثر، ص٨٨.
(١١٩) م . ن ، ص١٣.
(١٢٠) ص١٣٢-١٣٣.
(١٢١) ص١٨٧.
(١٢٢) دومنيكو لانزا، الموصل في القرن الثامن عشر حسب مذكرات دومنيكو لانزا، ت: القس روفائيل بيداود، ط٢، الموصل ١٩٥٣، ص١٣، محمد امين بن خيرالله الخطيب العمري، منهل الاولياء ومشرب الاصفياء من سادات الموصل الحدباء، ج١، تحقيق: سعيد الديوەجي، مطبعة الجمهورية، الموصل ١٩٦٧،ص١٨٦.
(١٢٣) بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بڕوانە: د. سەعدی عوسمان هەروتی، تەنگژە ئابووری و تەندروستییەکانی کوردستان لە سەردەمی عوسمانیدا، (زانکۆ) گۆڤاری زانستە مرۆڤایەتییەکانی زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر، ژ (٤٢) ٢٠٠٩، ل١٠٧.
(١٢٤) غرائب الأثر، ص٥٤.
(١٢٥) م . ن ، ص٥٤، منية الادباء، ص١٩٢.
(١٢٦) بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم پەتایە بڕوانە: سەعدی عوسمان هەروتی، تەنگژە ئابووری و...، ل١٠٩-١١٠.
(١٢٧) بڕوانە: كلوديوس جيمس ريج، رحلة ريج في العراق عام١٨٢٠، ت: بهاءالدين نوري، ج١، بغداد١٩٥١، ص٣١٧، رسول الكركوكلي، م . س، ص٢١٦، ستيفن لونكريك، م . س، ص٢٥٠.
(١٢٨) منية الادباء، ص١٩٢.

(١٢٩) غرائب الأثر، ص٦٨.

(١٣٠) م . ن ، ص١٠٠.

(١٣١) جعفر الخياط، مشاهدات الدكتور ايفز بين بغداد وكركوك والموصل، الاقلام (مجلة) ج (١٢) س (٢) آب ١٩٦٦، بغداد، ص٤٧.

(١٣٢) دومنيكو لانزا، م . س، ص٤٣، جعفر الخياط، صور من تأريخ العراق في العصور المظلمة، ج١، ط١، دار الكتب، بيروت ١٩٧١،ص١٦٠. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی ئەم ڕووداوە بڕوانە هەمان دوو سەرچاوە.

(١٣٣) زبدة الآثار، ص١١٢-١١٥، منية الادباء، ص١٨٣-١٨٤.

(١٣٤) زبدة الآثار، ص١١٢.

( ملخص البحث باللغة العربية )

## منطقة ماردين في بعض مؤلفات ياسين العمري


**أ.م.د.سعدي عثمان هروتي**

**كلية الآداب – جامعة صلاح الدين – اربيل**

يعد المؤرخ الموصلي ياسين بن خيرالله الخطيب العمري (١٧٤٥–١٨١٦) من المؤرخين العراقيين القلائل خلال العهد العثماني الذين تتميز مؤلفاتهم بالشمولية والتفصيل. اذ دوّن المؤرخ المذكور في مؤلفاته التأريخية (وخاصةً كتابيه: غرائب الاثر و الآثار الجلية) معلومات غزيرة ومفصلة احياناً عن عموم المنطقة، ولم ينحصر اهتمامه بحوادث ايالته أو الايالات العراقية وحدها كما كان يفعل أغلب المؤرخين العراقيين في ذلك العهد. ولذلك ترك لنا العمري معلومات مهمة تخدم كتابة تأريخ الايالات العثمانية من مختلف الجوانب. وخاصةً فيما يتعلق بالربع الأخير من القرن الثامن عشر والربع الاول من القرن التالي.

وحظيت أخبار منطقة ماردين بأهتمام متزايد في مؤلفات ياسين العمري، وذلك لقربها الجغرافي من الموصل، وتبعيتها الادارية لأيالة بغداد خلال الفترة المذكورة. اذ نجد في تلك المؤلفات معلومات عديدة عن التبدلات الادارية العديدة التي كان والي بغداد يجريها في منصب حاكم ماردين والذي كان يعرف بـ (ويوضة voyvoda). وهو مصطلح اداري عثماني ذو اصل ايطالي. كما نقف على الفوضى والقلاقل الداخلية التي حدثت فيها جراء ثورة سكانها على حاكم منطقتهم، أو نتيجة حملات الايالات المجاورة واعتداءات العشائر القاطنة في المنطقة. وكذلك يتطرق العمري في مؤلفاته التأريخية الى بعض الكوارث والازمات الاقتصادية والصحية التي اصابت ماردين خلال تلك الفترة وخاصةً حوادث المجاعة والغلاء وتفشي الاوبئة الفتاكة كالطاعون. وذلك الى جانب معلومات متنوعة أخرى تساهم بمجملها في معرفة ملامح منطقة ماردين التأريخية خلال ذلك العهد وفق رؤية عراقية موصلية.

**Abstract**

**Mardin region in the Yãsìn al-Ûmaries authoresses**

**Dr.Sàadi Uthman Hàruti**

**College of Art / Salahaddeen university –Erbil/ Iraq**

The historiographer of Mosul Yãsìn al-Ûmari (1745-1816), is one of the rare Iraqi historiographers in the Ottoman period, who their authoresses is comprehensiveness and detailing. This historiographer, chronicled in his historical authoresses – Especially in his two books: (Gharãib al-Àthar) &(al-Ãthãr al-jalìya)- abundant information about whole of the period. And he didn't limited his work in the events of his Iyalet or Iraqi Iyalets only, just like most of the Iraqi historiographers in this period. Therefore the Ûmari leave for us very important knowledge, which very useful for writing the history of Ottoman Iyalets in middle east in many aspects, Especially in the end of 18th and the beginning of 19th centuries.

The Yãsìn al-Ûmaries authoresses contain many information about district of Mardin, because its near the Mosul, also it was under the administration influence of Baghdad Iyalet at this time. This authoresses include many historical events of the internal anarchy and disorders, which caused by the uprising of its population against the ruler of Mardin. Or because of the campagins of neighboring Iyalets and tribal attacks. The authoresses also, offer many information about the administrative changes, which the wali of Baghdad do it in the post of Mardin ruler which called (voyvoda). Al-Ûmari writes down some information in his historical authoresses, about the economical conjunctures and Health calamities, which happened in this region during the Ottoman period. Especially the events of famine and the deadly pestilence. These facts with other information mentioned in these authoresses, contribute to understanding the historical aspects of Mardin region in this period, according to Mosul s historian.

# ڕۆڵی کورد لە بزووتنەوەی ئاشتیخوازان لە عێراقدا ١٩٥٨ ـ ١٩٦٣

## ( لێکۆڵینەوەیەکی مێژووییە )

د. مهدی محمد قادر
بەشی مێژوو / کۆلێژی ئاداب ـ زانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر

### پێشەکی

بزووتنەوەی ئاشتیخوازان یەکێکە لەم بزووتنەوە جەماوەرییانەی لە ساڵی ١٩٥٠ لە عێراق دامەزراوە، مێژووی ئەم بزووتنەوەیە بە دوو قۆناغی گرنگدا تێپەڕیوە، قۆناغی یەکەمیان لە سەردەمی حوکمڕانی پاشایەتی دەست پێدەکات کە تێیدا سەرەتاکانی دەرکەوت و تا کۆتایی هاتنی ئەم ڕژێمە بە شێوەیەکی نهێنی چالاکییەکانی لە سەر ئاستی ناوەخۆ و دەرەوەی عێراق ئەنجام دەدا . قۆناغی دووەمیش دوای دامەزراندنی ڕژێمی کۆماریی لە ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ دەست پێدەکات رۆڵێکی بەرچاوی لە ڕووداوە سیاسی و جەماوەرییەکانی عێراق و باشووری کوردستان بینیوە، دوای ڕوودانی کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ چالاکییەکانی دەوەستێت .

گرنگی توێژینەوەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەم ڕۆڵەی کە کورد لە بزووتنەوەی ئاشتیخوازانی عێراق لە ساڵانی ١٩٥٨ ـــ ١٩٦٣ لەسەر ئاستی ئەنجومەنی نیشتمانی و لێژنەی شارەکان بینیویەتی، لە لایەکی تر کەمی زانیاری دەربارەی ئەم بزووتنەوەیە لە سەرچاوەکان و لێکۆڵینەوە زانستییەکاندا لە کاتێکدا چەندین

کەسایەتی نیشتمانپەروەر و ئاشتیخواز و پیاوانی ئاینی و ناودارانی کورد ئەندامی چالاکی ئەم بزووتنەوەیە بووینە و ڕۆڵی گرنگیان تێدا گێڕاوە .

توێژینەوەکە لە پێشەکی و دەروازە و دوو تەوەر و ئەنجامەکەی پێك هاتووە، دەروازەی توێژینەوەکە کورتەیەکە دەربارەی ڕۆڵی کورد لە دامەزراندنی ئەم بزووتنەوەیە و چالاکییەکانی لە نێوان ساڵانی ١٩٥٠ ــ ١٩٥٨، تەوەری یەکەم پێکهاتووە لە ڕۆڵی کورد لە کۆنگرەی دووەم و سێیەمی بزووتنەوەی ئاشتیخوازان و ئاماژەکردن بۆ ئەو لێژنانەی کە لە شار و شارۆچکەکانی باشووری کوردستان دوای کۆنگرەی دووەم دامەزراون، هەروەها بەشداری کورد لە کۆنگرەی سێیەم هەر چەندە لەم کۆنگرەیەدا گۆڕانکاری بنەڕەتی رووی نەداوە . تەوەری دووەم بریتییە لە ڕۆڵی کورد لە هەڵوێست و چالاکی و جموجۆڵەکانی ئەم بزووتنەوەیە لە سەر ئاستی ناوەخۆ و دەرەوەی عێراق .

لە نووسینی ئەم توێژینەوەیەدا چەند گرفتێك رووبەڕووی توێژەر بوویتەوە بەتایبەتی کەمی سەرچاوەی ڕەسەن و تایبەت بەم بزووتنەوەیە چونکە گرنگی پێویست بە نووسینەوەی مێژووی ئەم بزووتنەوەیە نەدراوە، هەروەها کەمی ئەو سەرچاوانەی کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەیە بۆ داڕشتنەوەی بە شێوەیەکی زانستی و بابەتییانە بە پشت بەستن بە سەرچاوە رەسەنەکان و بەڵگەنامە مێژووییەکان و چاوپێکەوتنەکان، هەروەها نەبوونی هیچ توێژینەوەیەکی ئەکادیمییانە لەسەر ئەم بابەتە سەرەڕای کەمی بەڵگەنامە مێژووییەکان تایبەت بەم بزووتنەوەیە .

ئەم سەرچاوانەی کە سوودی لێ وەرگیراوە بۆ نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەیە، بەڵگەنامەکانن کە بەشێکیان بڵاونەکراوەن بە تایبەتی بەیاننامەکانی ئەم بزووتنەوەیە کە دەربارەی ڕووداوەکانی ناوەخۆ و دەرەوە دەریکردووە، هەروەها کتێبی (حقيقة حركة السلام) ی توفیق منیر، یاداشتەکانی (عزیز شەریف) سکرتێری بزووتنەوەکە کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە بزووتنەوەکەوە هەبوو، جێگای ئاماژەیە ڕۆژنامەکانی (خەبات و ژین) کە ڕۆژانە هەواڵەکانی تایبەت بە

بزووتنــەوەی ئاشــتیخوازانیان بــڵاو دەکــردەوە ســوودێکی زۆری لــێ وەرگــیراوە. هەروەها ئەم چاوپێکەوتنانەی کە لە لایەن توێـژەرەوە ئـەنجام دراون لەگـەڵ ئـەم کەسایەتییانەی کە ئاگاداری ڕووداوەکان بووینە و هەندێکیان ڕۆڵـی چـالاکیان لـەم بزووتنەوەیە بینیـوە وەك (، علـی مەکتەبـە، ناهیـدە شـێخ سـەلام، غفـوری مـیرزا کریم، عزالـدین مـستەفا رسـول، بهاءالـدین نـوری،، محمـدی مـەلا کـەریم) جێگـای ئاماژەیە بەشێك لەم چاوپێکەوتنانە بـە شـێوەی تۆمـارکراو لـە ئەرشـیفی توێـژەر ماوەتەوە . لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین باسێکی لەم جـۆرە هـەر چـەندە هەوڵێکـە بێ کـەم و کـوڕی نابێـت بـەڵام دەکرێـت بـە یەکـەم کـاری ئـەکادیمی تایبـەت بـەم مێژووی ئەم بزووتنەوەیە لەم ماوە مێژووییە دابندرێت .

**دەروازە : کورد و دامەزراندنی بزووتنەوەی ئاشتیخوازان لە عێراقدا .**

یــەکێك لــە دەرەنجامــەکانی جــەنگی دووەمــی جیهــانی (١٩٣٩ ـــ ١٩٤٥) ســەرهەڵدانی بیرۆکـەی دامەزرانـدنی بزووتنەوەیـەکی جیهـانی بـوو بـە مەبەسـتی بەرقـەرارکردنی ئاشـتی لـە جیهانـدا کـە لـە پـەراوێزی کۆبوونـەوەکانی کـۆنگرەی ڕۆشنبیرانی جیهانی لە ساڵی ١٩٤٨ لە شاری (فراکلۆ) لە پۆڵەندا کـە لـە ئـەنجامی شەڕی دووەمـی جیهانییـەوە تووشـی کاولکارییـەکی تـەواو ببـۆوە هاتەکایـەوە[١]. یەکەمین لێژنـەی ئامادەکـاریش بـۆ بەسـتنی کـۆنگرەی دامەزرانـدنی بزووتنـەوەی ئاشتی جیهانی بە سەرۆکایەتی زانـای بـەناوبانگی ئـەتۆم (جۆلیـۆ کـۆری ١٨٩٧– ١٩٥٦) پێکهێنرا و لە بەهاری ساڵی ١٩٤٩ لە ( بـراغ)ی پایتـەختی چیکۆسـلۆڤاکیا یەکەمین کۆنگرەی بزووتنەوەی ئاشتی جیهانی بەسترا و کـۆنگرەی دووەمـیش لـە تشرینی دووەمی ١٩٥٠ لە وارشۆی پایتەختی پۆڵەندا بەسـترا [٢] محەمـەد مەهـدی جەواهێری ( ١٨٩٩ ـ ١٩٩٧) وەك یەکـەم ئەنـدامی عێـراق لـە ئەنجومـەنی ئاشـتی جیهـانی هەڵبـژێردرا[٣]. جێگـای ئاماژەیـە ئـەم بزووتنەوەیـە لـە لایـەن چـەندان کەسایەتی رۆشنبیر سەری هەڵدا و بە پێچەوانەی هەڵوێستی حکومەتـە زلهێزەکـان بە تایبەتی هەر یەك لە فەرەنسا و بەریتانیا بەڵام هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە

لەناو وڵاتانی جیهانی سێیەم شوێنی خۆی کردەوە چونکە زۆر لەم وڵاتانە لەژێر حوکمڕانی سیستەمی دکتاتۆری و هەندێکیش لەژێر حوکمڕانی ئیمپریالیزمدا بوون.

عێراق وەك وڵاتێکی پاشکۆی بەریتانیا لە رووی سیاسی و سەربازی و ئابووریدا لە ساڵی ١٩٥٠ یەکەمین لیژنەی ئامادەکاری بە سەرۆکایەتی محمد مهدی الجواهری تێدا دامەزرا، کە کورد بە دوو ئەندام محمدامین زەکی بەگ ( ١٨٨٠ ــ ١٩٤٨) و عبدالله گۆران ( ١٩٠٤ ــ ١٩٦٢) بەشدار بوون(٤). دەتوانین پێکهێنانی ئەم لیژنەیە بە سەرەتای دامەزراندنی بزووتنەوەی ئاشتیخوازان لە عێراق دابنێین چونکە دوای پێکهێنانی ئەم لیژنەیە شارە سەرەکییەکانی عێراق وەك بەغدا و موسڵ و بەسرا و نەجەف و هەولێر و سلێمانی و کەرکوك لیژنەی تایبەت بە خۆیان پێك هێنا(٥).

دوای فراوانبوونی بنکەی جەماوەری بزووتنەوەکە لە ٢٥ی تەمموزی ١٩٥٤ کۆنگرەی یەکەمی بەستا(٦). کە چەند ئەندامێکی کورد لەم کۆنگرەیەدا بەشداربوون لەوانە (ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد زیاد ئاغا، شێخ لەتیف شێخ مەحمود بەرزنجی، ئیسماعیل حەققی شاوەیس، عبدالله گۆران، مسعود محمد)(٧). بەم جۆرە سەرەتای فەرمی بزووتنەوەیەکی رێکخراو کە هەڵگری ئامانجی ئاشتیخوازان بوو پێکهێندرا و عزیز شریف بە سکرتێری بزووتنەوەکە هەڵبژێردرا و دەستەیەکیش بە ناوی مەکتەبی هەمیشەیی لە هەر یەك لە (عبدالکریم الماشطة، محمد مهدی الجواهری، توفیق منیر، خالد سلام، جلال الاوقاتی، صفاء الحافظ) پێکهات و پەیوەندییەکانی لیژنەی شارەکان و مەکتەبی هەمیشەیی رێکخران(٨).

ئاشتیخوازانی کورد لە نێوان ساڵانی ١٩٥٠ ــ ١٩٥٨ بە شێوەیەکی نهێنی لە چەندین چالاکی جۆر بە جۆردا لە شارەکانی باشووری کوردستاندا بەشدارییان کردووە و لەم چالاکییانەش بەدەرنەبوون کە لە سەر ئاستی عێراقدا جێبەجێ دەکران وەك کۆکردنەوەی ئیمزا بۆ پشتگیری کردن لە بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ستۆکهۆڵم لە پێناو قەدەغەکردنی بەکارهێنانی چەکی ئەتۆمی لە جیهاندا(٩)، هەروەها دژی رێکەوتنامەی نەوت لە نێوان بەریتانیا و عێراق لە ١٣ی شوباتی ١٩٥٢ و بەیاننامەیەکی نارەزایی کە هەر یەك لە (محمدامین زەکی بەگ و

عبدالكريم الماشطة و عبدالوهاب محمود) ئیمزایان کرد بڵاو کردەوە[١٠]. لە سەر ئاستی بزووتنەوەی جەماوەریش بەشدارییان لە ڕاپەرینی تشرینی دووەمی ١٩٥٢ و ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٥٦ بۆ پاڵپشتی کردن لە گەلی میسر لە شاری بەغدا و دژی پەیماننامەی بەغدا ١٩٥٥ کردووە[١١].

هەر چەندە بزووتنەوەی ئاشتیخوازان لە بنەڕەتدا بزووتنەوەیەکی سیاسیی نەبوو بەڵام هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە لە ڕێگای هاتنە ناوەوەی ژمارەیەکی زۆر لە کەسانی سەر بە پارتە سیاسییەکان بە تایبەتی حزبی شیوعی عێراق و پارتی گەل (حزب الشعب) و پارتی نشتیمانی دیموکراتی ( حزب الوطني الديمقراطي) و پارتی دیموکراتی کوردستان کاریگەرییان بەسەر ڕێچکەی خەبات و تێکۆشانی ئەم بزووتنەوەیە کرد، ئەمەش بووە فاکتەرێك کە ڕێگای کارکردنی ئاشکرای لە لایەن حکومەتی پاشایەتی پێ نەدرێت، چونکە لە ڕوانگەی حکومەتی پاشایەتی ئەم بزووتنەوەیە ڕووێکی ئاشکرای پارتە بەرهەڵستکارەکان بوو بە تایبەتی حزبی شیوعی عێراق، هەر بۆیە زۆر لە ئەندامانی ڕوو بە ڕووی چەندین شێوازی دژایەتیکردن دەبوونەوە وەك دەستگیرکردن و ئەشکەنجەدان و لێسەندنەوەی ڕەگەزنامە و دوورخرانەوە بۆ دەرەوەی وڵات [١٢]. دەتوانین بڵێین هەر چەندە حکومەتی پاشایەتی دژی بزووتنەوەی نیشتمانی وەستاوە بەڵام سەبارەت بە پەیوەندی نێوان حزبی شیوعی و بزووتنەوەی ئاشتیخوازان تێگەیشتنێکی دروستی هەبوو، غفوری میرزا کەریم ئەندامی لێژنەی ناوەخۆی سلێمانی ــ حزبی شیوعی عێراق ئەم ڕاستییە دەردەخات کە حزبی شیوعی هەوڵی ئەوەی دەدا ئەم ڕێکخراوە وەك ڕووێکی ئاشکرای ئامانجەکانی جێبەجێ بکات[١٣]. بەم جۆرە تا بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ بزووتنەوەی ئاشتیخوازان بە شێوەیەکی نهێنی درێژەی بە چالاکییەکانییدا .

**تەوەری یەکەم /**

**کورد و کۆنگرەی دووەم و سێیەمینی بزووتنەوەی ئاشتیخوازان لە عێراقدا**

دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ و کۆتایی هێنان بە حوکمڕانی پاشایەتی و دامەزراندنی سیستەمی کۆماری لە عێراقدا، قۆناغێکی تازە لە ژیانی سیاسیی ئەم وڵاتە دەستی پێکرد و بوار بۆ پارتە سیاسییە (عێراقی و کوردستانی) یەکان ڕەخسا و بە پێی یاسای ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٦٠ مۆڵەتی کارکردنی ئاشکرایان پێدرا[١٤]. بەڵام بزووتنەوەی ئاشتیخوازان دوای دەرچوونی ئەم یاسایەش داوای مۆڵەتی کارکردنی ئاشکرای نەکرد چونکە سەرۆك وەزیران (عبدالکریم قاسم ١٩١٤ ـ ١٩٦٣) لە یەکێك لە وتارەکانیدا لە کاتی کردنەوەی کۆنگرەی دووەمی مامۆستایان لە شاری بەغدا لە نیسانی ١٩٦٠ ڕایگەیاند کە بزووتنەوەی ئاشتیخوازان بزووتنەوەیەکی شەرعییە پێویستی بەمۆڵەت نییە و ناچێتە ژێر یاسای کۆمەڵەکان[١٥].

دەکرێت بڵێین ئەم هەڵوێستەی عبدالکریم قاسم بووە بە پاڵپشتییەکی گەورە بۆ فراوانبوونی بنکەی جەماوەری ئەم بزووتنەوەیە چونکە لە لایەك هەڵگری پەیامی ئاشتییانە بوو لە لایەکی تر ئەندام و لایەنگر و دۆستانی جۆرێك لە دڵنیابوونیان بۆ دروست بوو کە کارکردن لەم بزووتنەوەیە لە هەر بارودۆخێکدا بێت هیچ مەترسییەکی نییە چونکە دوورە لە کاری سیاسییەوە.

لە چوارچێوەی ئەم بارودۆخەی کە بە هۆی شۆڕشی ١٤ی تەمموز هاتە کایەوە بۆ یەکەمین جار بە شێوەیەکی ئاشکرا لە ڕۆژانی ١٤ ــ ١٧ ی نیسانی ١٩٥٩ لە هۆڵی سینەما خیام لە شاری بەغدا کۆنگرەی دووەمی لە ژێر دروشمی (ئاشتی و پارێزگاری کردن لە کۆمار) بەستا[١٦]، کە ژمارەیەك لە بەرپرسانی گەورەی حکومەت لە کردنەوەی کۆنگرەکەدا لەوانە سەرۆك وەزیرانی عێراق عبدالکریم قاسم و چەند کەسایەتییەکی ناسراوی وەك شاعیری تاجیکی میرزا تورسون زادە، زانای گەورە ضیاءالدین باباخانوف موفتی ئۆزبەگستان، بورهان شەهیدی بە ناوی ئاشتیخوازانی چین، سەید ئەحمەد محەمەد خەیر، جێگری

سەرۆکی ئەنجومەنی ئاشتی لە بولگاریا، میشێل کیلمیکن سەرۆکی شاندی رۆمانی، سکرتێری ئاشتیخوازانی سودان، وەزیری دادی ئەلبانیا، سەید علی عبدالکریم سەرۆکی شاندی ئاشتی لە سعودیا، سید کاظم فرهود ئامادە بوون[١٧].

سەبارەت بە بەشداری کورد لەسەر ئاستی لێپرسراوانی لێژنەی شارەکانی (هەولێر و سلێمانی و کەرکوك) و قەزاکانی دهۆك و هەڵەبجە و کۆیە و رانییە بەشدارییان تێدا کردووە[١٨]، جێگای ئاماژەیە ئافرەتانی کورد بۆ یەکەمین جار بەشدارییان لە کۆنگرەی ئاشتیخوازان کرد لەوانە ( شەوقیە ئەحمەد ئاغا، ئەنجوم زوهدی، نهاية مستەفا، شەمسە فەقێ، ناهیدە شێخ سەلام) کە رۆڵێکی دیاریان گێڕا لە داکۆکیکردن لە رۆڵی ئافرەت[١٩].

جێگای ئاماژەیە لە هۆڵی کردنەوەی کۆنگرەکەدا لە نێوان دوو ئاڵای عێراق وێنەیەکی سەرۆك وەزیران عبدالکریم قاسم و لە لایەکی هۆڵەکەش وێنەیەکی (جولیۆ کۆری) داندرا بوو، هەروەها دروشمەکانی ئاشتی بە دیوارەکاندا هەڵواسرابوون بە زمانەکانی ( عەرەبی و ئینگلیزی و رووسی و چینی) بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرا هیچ دروشمێك بە زمانی کوردی لە ناو هۆڵەکەدا نەدەبینرا[٢٠] کە ئەمەش دەتوانین بە یەکێك لە کەموکورییەکانی لێژنەی ئامادەکاریی کۆنگرەکە دابنرێت چونکە ئەگەر مەبەست لە نووسینی دروشمەکان بە زمانەکانی رووسی وچینی و ئینگلیزی پشتگیری ئەم گەلانە بێت لە ئاشتی جیهانی ئەوا گەلی کورد زۆر بە دڵسۆزییەوە هەر لە سەرەتای دامەزراندنیدا بەشداری بەرچاوی کردووە و لەم خەباتەدا لە پێناو ئاشتی درێغی نەکردووە چونکە خۆی بە نەتەوەیەکی زوڵملێکراو زانیوە .

دوای تەواوبوونی ئاهەنگی رێوڕەسمی کردنەوەی کۆنگرەکە لە ئێوارەی هەمان رۆژدا کارەکانی دەستی پێکرد، دوای گفتوگۆکردن لە سەر راپۆرتی سکرتێری بزووتنەوە و بەرنامەی کاری لێژنەکان و جەختکردنەوە لەسەر پەسەندکردنی ئامانجەکانی بزووتنەوە لە هەوڵەکانی بۆ چەسپاندنی ئاشتی و دیموکراتی لە تەواوی عێراق و جیهاندا پابەندبوونی خۆی بە بەرنامەی ئاشتییانەی

بزووتنەوەی ئاشتی جیهانی دووپات کردەوە، لە ١٧ ی نیساندا کۆنگرەی دووەم کۆتایی بەکارەکانی هێنا. سەبارەت بە بڕیارەکانی کۆنگرە دەربارەی ئامانجەکانی لە سەر ئاستی جیهانیدا هەر وەك لە ڕاپۆرتی بالیۆزی بەریتانیا لە عێراق کە تایبەت بوو بە کۆنگرەی دووەمی بزووتنەوەی ئاشتیخوازان لە دوو خاڵی سەرەکیدا دەردەکەوێت :

١ / کۆکردنەوەی ڕای گشتی جیهانی لە پێناو حوکمڕانی نەکردنی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست لە لایەن ولاتە ئیستعمارییەکان و هەوڵدان بۆ نەهێشتنی دوژمنایەتی بۆ سەر کۆماری عێراق .

٢ / بەردەوامیدان بە پەیوەندییەکانی نێوان بزووتنەوەی ئاشتیخوازانی عێراق و بزووتنەوەی ئاشتی جیهانی و هەوڵدان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی جیهان بە ڕێگای ئاشتییانە و خۆ ئامادەکردن بۆ بەستنی کۆنگرەی ئاشتیخوازانی جیهانی لە ستوکهۆلم [٢١].

لەسەر ئاستی ناوەخۆش هەمان ئەو ئامانجانە بڕیاری لەسەر درا کە لە کۆنگرەی یەکەمدا پەسەند کرابوو کە بریتی بوو لە چەسپاندنی ئاشتی لە ولات و ناوچەکە و هەوڵدان بۆ دوورخستنەوەی ولاتانی ئیمپریالیزمی لە دەست خستنە ناو کاروباری عێراق[٢٢] بەلام دوای کۆنگرەی دووەم پارێزگاری و پاراستنی کۆماری عێراق بوو بە یەکێك لە ئامانجەکانی بزووتنەوەی ئاشتیخوازان[٢٣]. دەتوانین بڵێین هەر چەندە ئەم بزووتنەوەیە خاوەنی پەیڕەو و پرۆگرامێکی ناوەخۆ نەبوو وەك بزووتنەوەیەکی سیاسی کە هەڵوێستی لە مەسەلە نەتەوەییەکان دیار بخات، بەلام هێنانە کایەوەی ژیانێکی ئاسوودە و بەرقەرارکردنی ئاشتی لە ئامانجە بنەڕەتییەکانی بوو، کوردیش هەر لە سەرەتای دامەزراندنی ئەم بزووتنەوەیە بەشداری کاریگەری هەبوو بەلام لە ئامانجەکانیدا هیچ ئاماژەیەکی بە کێشەی کورد لە عێراق و چارەسەرەکەی نەکردووە کە ئەمەش بە بەشێك لە پاراستنی ئاشتی لەم ولاتەدا دادەندرێت، هەر بۆیە دەتوانین بڵێین بزووتنەوەی ئاشتیخوازان دەبوایە کێشەی نەتەوەیەك و چارەسەرنەکردنی

بـه‌ پێـشێلكارییه‌كانی ئاشـتی بزانیایـه‌ و هـه‌وڵی چاره‌سـه‌ری ئاشـتییانه‌ی لـه‌ ئامانجه‌كانیدا بۆ دیاربخستایه‌ چونكه‌ گه‌لی كـورد ده‌ری خـست كـه‌ ئاشـتیخوازه‌ و هه‌ر له‌ سه‌ره‌تاوه‌ تێكه‌ڵ به‌م بزووتنه‌وه‌یه‌ بوو . لـه‌ لایـه‌كی تریـشه‌وه‌ بـه‌دیهێنانی ئاشتی ئه‌و كاته‌ به‌رقه‌رار ده‌بێت كه‌ له‌ هـه‌موو ولآتـدا بێتـه‌ كایـه‌وه‌ ئـه‌رك و مـافی هه‌موو پێكهاته‌كانی به‌ شێوه‌یه‌كی یه‌كسان دیاری بكرێت .

سـه‌باره‌ت بـه‌ ده‌سـته‌ی سـه‌ركردایه‌تی بزووتنه‌وه‌كـه‌ عـه‌زیز شـه‌ریف بـه‌ سكرتێری بزووتنه‌وه‌ هه‌ڵبژێردرایه‌وه‌[٢٤] و ئه‌نجومه‌نێكی نشتیمانی له‌ (٩٤) ئه‌ندام هه‌ڵبژێردرا، كه‌ (١١) ئه‌نـدامی كـورد تێیـدا به‌شـدار بـوون كـه‌ ئه‌مانـه‌ن ( حه‌سـه‌ن به‌رزنجی ـ پیاوی ئاینی، هه‌مزه‌ عبدالله‌ ـ پارێزه‌ر، خلوق ئه‌مین زه‌كی ـ قوتـابی كۆلێژی یاسا، شوكت بابان ـ قازی، شێخ صدیق بارزانی، عبدالله‌ گۆران ـ شاعیر، شێخ لـه‌تیف شـێخ محمـود بـه‌رزنجی، مـه‌عروف بـه‌رزنجی ـــ پـارێزه‌ر، موكـه‌ره‌م تاڵه‌بانی ـ پارێزه‌ر، ناهیده‌ شێخ سه‌لام، نوری ئه‌حمـه‌د عـه‌لی)[٢٥]. و لـه‌ نـاو ئـه‌م ئه‌نجومه‌نه‌دا مه‌كته‌بی هه‌میشه‌یی هه‌ڵبژێردرا كه‌ پێك هـاتبوون لـه‌ (عزیـز شـریف، توفیق منیر، فاروق برتو، لطفی بكر، مظهـر العـزاوي، موسـی شـیخ راضـي، یوسـف اسماعیل، كمال عمر نظمـي، علـي جلیـل الـوردي، عبدالمجیـد الونـداوي)[٢٦]. جێگـای سه‌رنجه‌ وه‌ك له‌ ڕاپۆرتی باڵیۆزی به‌ریتانیا ده‌رده‌كه‌وێت له‌ مه‌كتـه‌بی هه‌میـشه‌یی هـیچ ئه‌نـدامێكی كـورد هه‌ڵنه‌بـژێردرا كـه‌ ئه‌مـه‌ش شـێوازی بـه‌ڕێوه‌بردنی ئـه‌م هه‌ڵبژاردنه‌ ده‌خاته‌ ژێر پرسیاره‌وه‌ چونكه‌ ناكرێت لـه‌ یـانزه‌ ئه‌نـدامی ئه‌نجومـه‌نی نیشتمانی یه‌ك كورد له‌ مه‌كته‌بی هه‌میـشه‌ییدا نه‌بێتـه‌ ئه‌نـدام ئـه‌م ڕاسـتییه‌ش لـه‌ كۆبوونه‌وه‌ی ئه‌نجومه‌نی نیشتمانی له‌ كـانونی دووه‌مـی ١٩٦٠ ده‌رده‌كـه‌وێت دوای ئه‌وه‌ی بڕیار درا به‌هه‌ڵبژاردنی هه‌ریه‌ك له‌ (نوری شاوه‌یس و ناهیده‌ شـێخ سـه‌لام) به‌ ئه‌ندامی مه‌كته‌بی هه‌میشه‌یی بزووتنه‌وه‌كه‌[٢٧].

سـه‌باره‌ت بـه‌ لێژنـه‌ی ئاشـتیخوازان لـه‌ شـاره‌كانی باشـووری كوردسـتان، لـه‌ شـاری هـه‌ولێر (جـه‌لیل هۆشـیار) بـه‌ به‌رپرسـی یه‌كـه‌م هه‌ڵبـژێردرا و ئه‌نـدامانی لێژنه‌كه‌ش پێكهاتبوو له‌ ( معروف ڕۆوف، قادر بكر تاڵه‌بانی، شه‌مـسه‌دین مـوفتی، فایه‌ق نادر، شه‌ریف جامباز، عـونی یوسـف، مـه‌لا شـه‌ریف ڕه‌نگه‌ڕێـژانی)[٢٨]. لـه‌

شاری سلێمانی (عبدالله گۆران) بە بەرپرسی یەکەم و هەر یەك لە (عومەر ئاشتی، بهجت سعید، فەرەج محەمەد عەلی، عبدالکریم چاوشین، صالح سعید، فؤاد رشید بکر، محمود توفیق خەزنەدار، علی احمد حمامچی، حمەی عارف ناسراو بە (حەمەی زیوەر)، محمود حاجی رەحیم) بە ئەندام هەڵبژێردران[29]. هەروەها لێژنەیەکی تایبەتیش بە ئافرەتانی شاری سلێمانی لە ( حەلاوەخانی شێخ لەتیف سەرۆکی لێژنە و ئەندامێتی ( پەروین ئەحمەد، ژیان سعید، نجیبە مصطفی، ئامینە قادر، نەزیرە تۆفیق، وهبیة سلێمان، پەخشان عارف، فاطمە قادر سلیم، حەلاوە عبدالله، ملیحة صالح) پێك هێندرا [30]. لە شاری کەرکووك مەعروف بەرزنجی بەرپرسی یەکەمی لێژنە و ئەندامێتی هەر یەك لە (مجید کاکە، حمید پاتاس، سعید عباس، احمد عبدالجبار، عبدالصمد خانقاە، محمد صالح زەنگەنە، مصطفی نریمان، عبدالقادر بەرزنجی) بوون[31]. هەروەها لە قەزا و ناحیەکان لێژنەی تایبەت پێك هێندران لە قەزای دهۆك مەلا عبدالحکیم بە لێپرسراوی لێژنەکە هەڵبژێردرا[32] لە زاخۆ هەر یەك لە (جمال حسین عیسی، حاجی اسماعیل حاجی سعید، ئەحمەد عبدالله) بە ئەندامی لێژنە هەڵبژێردران [33] لە ناوچەی شارەزوور قانعی شاعیر بە لێپرسراو و هەر یەك لە (شێخ رضا شێخ علی، جعفر شێخ احمد، مەلا حمە کەریم، مەلا حەسەن، مەلا صادق عبدالله، عبدالرحمن کاکە، کریم فتاح) بە ئەندامی لێژنە هەڵبژێردران[34]، لە ناوچەی شێروانەش احمد فتاح روستەم وەك سەرۆکی لێژنە و هەر یەك لە (محمد سعید جاف، جوامێر عبدالقادر، عبدالکریم معروف، فتاح عزیز، علی سلیم جاف، مەلا احمد هورێنی، رشید شێخ حسن) بە ئەندامانی لێژنە هەڵبژێردران [35].لە قەلادزێ (مصطفی صالح کریم، فؤاد عزەت، حسین حاجی محمود، شێخ نوری، حاجی حەقی عبداللە، مەلا محمد)[36] و لە رەواندز (سلێمان مصطفی، أیشە چلبی، شێخ نجم، یوسف رشید، صابر عبداللە رسام، عبدالرزاق محمد، نشأت شوکت، احمد حوێز، سالم کمال، انور طاهر، طوبیا رزوق، أسعد حاجی پەری) بە ئەندام هەڵبژێردران[37].

سەبارەت بە چۆنییەتی بەرێوەبردنی کاری لێژنەکان لە هەر شارێك لێژنەیەك بۆ سەر چەند لێژنەیەکی فەرعی دابەش دەکران کە پێك هاتبوون لە لێژنەکانی

(ڕێکخستن و پەیوەندییەکان) و (ڕۆشنبیری) و (کۆمەڵایەتی) و (دارایی و چالاکییەکان)، بۆ نموونە لە شاری سلێمانی ئەندامانی ئەم لێژنانە بەم جۆرە دەستنیشان کران لێژنەی ڕێکخستن وپەیوەندییەکان پێکهاتبوون لە عیزەت کابان، عومەر موتابچی، علی جاف، محمدامین حسن، کامل حبوبی، عبدالله عزیز، صابر قادر، شمعون داود، رؤوف معروف و لێژنەی کۆمەڵایەتی شێخ لەتیف شێخ محمود بەرزنجی، محمد رمزی معروف، ئەمین محی الدین، فائق هۆشیار، شاکر فتاح، صالح سعید، قادر شالی، أسعد بابان، فریق عقراوی، عزیز عبدالله محامی، شێخ مصطفی شێخ معروف و لێژنەی ڕۆشنبیری عبدالله گۆران، کامل بصیر، شکر مصطفی، شاکر فتاح، احمد زرنگ، عبدالله شالی، محمد رسول، محمد صالح دیلان، صالح سعید، فائق هۆشیار و لێژنەی دارایی و چالاکییەکان رؤوف معروف، ئازاد شوقی، مسیح اسکندر، سید کاظم جواد، رەفیق فتح الله، شاهین ئایجیان، گرەبیت نعلبنیان، مەلا صابر، محمد حاجی فرج افندی بوون [٣٨].

گۆڤاری (وطننا) کە گۆڤارێکی ( سیاسی، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری) بوو هەر دوو هەفتە جارێك دەردەچوو و یەکەمین ژمارەی لە ١٥ی شوباتی ١٩٥٩ دەرچوو چالاکییەکانی ئاشتیخوازان و وتاری تایبەت بە ئاشتی و جموجۆڵەکانی بزووتنەوەی ئاشتی جیهانی بڵاو دەکردەوە[٣٩]، ژمارەیەك لە نووسەران و رۆشنبیرانی عەرەب و کورد بابەتیان لەم گۆڤارە بڵاو دەکردەوە، لە دیارترین نوسەرانی کورد لەم گۆڤارە (هۆگر گۆران) بوو[٤٠]. دواتر ئەم گۆڤارە ناوەکەی گۆڕا بۆ گۆڤاری (السلم)[٤١]، جێگای ئاماژەیە هەردوو رۆژنامەی (خەبات و ژین) دوو منبەری سەرەکی بڵاوکردنەوەی چالاکییەکانی ئاشتیخوازانی کورد بوون [٤٢].

دوای پێپەڕبوونی کەمتر لە ساڵێك مەکتەبی هەمیشەیی بە مەبەستی ئامادەکاری بۆ بەستنی کۆنگرەی سێیەم لە کانونی دووەمی ١٩٦٠ لە شاری بەغدا بە ئامادەبوونی نوێنەرانی لێژنەی ئاشتیخوازانی سەرجەم شارەکانی عێراق کۆبوونەوەیەکی فراوانی بەستا، کە هەر یەك لە نوری شاوەیس و ناهیدە شێخ سەلام و بەرپرسانی لێژنەی شارەکانی باشووری کوردستان بەشدارییان تێدا کرد[٤٣]، عزیز شریف سکرتێری بزووتنەوە دەربارەی بارودۆخی ناوەخۆ و دەرەوە

ڕاپــۆرتێکی پێــشکەش کــرد و دوای تــاوتوێکردنی نــاوەرۆکی ڕاپۆرتەکــە و هەڵسەنگاندنی چەند بڕیارێك درا، لەوانە پیرۆزبایی ئاڕاستەی گەلانی عێراق کرد بەرامبەر ئەو تێکۆشانەی کە داویانە بۆ لەناوبردنی هەموو جۆرە پیلانێك کە لە دژی کۆماری عێراق ئەنجام دراوە . دەربارەی وڵاتانی عەرەبیش بڕیاردرا بە پشتگیری کردن لە گەلانی ژێر دەستی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستان و سەرکۆنەکردنی سیاسەتی بەریتانی و ئەمەریکی و فەرەنسی لە جەزائیر و عەممان و فەلەستین کە پیادەیان دەکرد و ڕەتکردنەوەی ئەو دەستدرێژییانەی دەکرێتە سەر ئاشتیخوازانی سوریا و میسر، هەروەها بێزاری دەربڕین بەرامبەر حکومەتی ئێران لە دژی ئەو سیاسەتەی بەکاری دێنێت بەرامبەر بە گەلی کورد لە ڕۆژهەلاتی کوردستان، و پاڵپشتی گەلانی ئاسیا و ئەفەریقیا لە خەباتیان دژ بە ئیمپریالیزم لە پێناو رزگاری و سەربەخۆیی دووپات کرایەوە و لە کۆتاییدا بڕیاری بەستنی کۆنگرەی سێیەمی بزووتنەوەی ئاشتیخوازان لە نیسانی ١٩٦٠ درا [٤٤].

بەم جۆرە دوای ئامادەکارییەکان لە ٣١ی ئاداری ١٩٦٠ لە شاری بەغدا کۆنگرەی سێیەمین دەستی بە کارەکانی کرد، لە ئاهەنگی کردنەوەی کۆنگرەکە سەرۆك وەزیران (عبدالکریم قاسم) وتارێکی پێشکەش کرد کە تێیدا ستایشێکی زۆری ڕۆڵی ئاشتیخوازانی عێراقی لە قۆناغی دوای شۆڕش کرد، جێگای ئاماژەیە ژمارەیەکی زۆر لە ئاشتیخوازانی وڵاتانی یەکێتی سۆڤیەت و چین و کۆریا و میسر و سوریا و کوبا بەشدارییان تێدا کرد، ژمارەیەك برووسکەی پیرۆزبایی کردن ئاڕاستەی سکرتێر و ئەندامانی کۆنگرە کرا لەوانەش نامەی سەرۆکی یەکێتی سۆڤیەت میکیتا خرۆتشوف (١٨٩٤ ــ ١٩٧١) لە لایەن شاندی ئاشتیخوازانی سۆڤیەت خوێندرایەوە [٤٥].

سەبارەت بە بڕیارەکانی کۆنگرەی سێیەم عەزیز شەریف جارێکی تر بە سکرتێر هەڵبژێردرایەوە [٤٦]، دەربارەی ئامانجەکانی بزووتنەوەش لە سەر ئاستی ناوەخۆ هەر ئەم بڕیارانە وەك ئامانجی بزووتنەوە پەسەند کرایەوە کە پێشتر لە کۆنگرەی دووەم بڕیاری لە سەر درابوو، هەروەها چەند پێشنیارێك خرایە بەردەم حکومەت لەوانە کۆتایی پێهێنان بە ناڕەزاییەکانی لە سەر ئاستی عەرەبی و

نێودەوڵەتی بە تایبەتی بەرامبەر کۆماری عەرەبی یەکگرتوو (میسر و سوریا) و پشتگیری لە گەلانی عەرەبی لە نیمچە دوورگەی عەرەبی و جەزائیر و فەلەستین بکات و دان بە کۆماری ئەڵمانیای دیموکراتی بندرێت و سوپای ئەمەریکا لە کۆریای باشوور بکشێندرێتەوە و کۆماری چینی میللی بە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان وەربگیرێت و کۆتایی هێنان بە شەڕی سارد و بنکە و دامەزراوە سەربازییەکان لە وڵاتانی ئەوروپا و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا[٤٧].

سەبارەت بە سەرکردایەتی بزووتنەوەکەش ئەنجومەنێکی تازە هەڵبژێردرا و هەر یەك لە (ابراهیم کبە، عبدالفتاح ابراهیم، عبدالجلیل برتو، ابراهیم احمد، نوری شاوەیس، ناهیدە شێخ سەلام، یوسف اسماعیل البستاني، احمد الجلبي، عبود زلزلە، فاروق برتو، کمال عمر نظمي، علی جلیل الوردي، علي یاسین) بە ئەندامانی مەکتەبی هەمیشەیی هەڵبژێردران[٤٨]، دەتوانین بڵێین هەڵبژاردنی سێ ئەندامی کورد لە لێژنەی هەمیشەیی گۆڕانکارییەکی گرنگ بوو لە کۆنگرەی سێیەم و پێکهێنانی سەرکردایەتی بزووتنەوەکە .

**تەوەری دووەم :**

## ڕۆڵی کورد لە چالاکییەکانی بزووتنەوەی ئاشتیخوازانی عێراقدا

دوای ئەوەی شۆڕشی ١٤ی تەمموز بارودۆخێکی گونجاوی هێنا کایەوە چالاکییەکانی کورد لەم بزووتنەوەیەدا پێی نایە قۆناغێکی تازەوە لە هەموو ڕووداو و بۆنە و چالاکییە جەماوەرییەکاندا، هەڵوێست و بەشداری گرنگ و بەرچاوی هەبوو، سەبارەت بە ڕۆڵی کورد لە چوارچێوەی عێراقدا، لە یەکەمین دەرکەوتنی جەماوەریدا دوای ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی بزووتنەوەی ئاشتیخوازان بە ناوی ( ڕۆژی ئاشتی) لە ٦ی ئاداری ١٩٥٩ خۆپیشاندانێکی فراوانی لە پاریگای موسڵ ئەنجام دا کە ژمارەیەکی زۆر لە ئاشتیخوازانی کورد لە شار و شارۆچکەکاندا بەشدارییان تێدا کرد [٤٩] . جێگای ئاماژەیە بانگەوازەکانی ئیستگەی بەغدا و ڕۆڵی ڕۆژنامەکان بە تایبەتی ڕۆژنامەی (اتحاد الشعب) زمانحاڵی حزبی شیوعی عێراق و گواستنەوەی جەماوەر لە ڕێگای شەمەندەفەر بە خۆڕایی

هانــدەرێكی گــەورە بــوو بــۆ بەشــداربوونی ژمارەیــەكی زۆری خــەڵك لــەم فیستڤاڵەدا[٥٠]، حزبی شیوعی عێراق وەك هەڵوێستێك لە دژی بیرۆكەی نەتـەوەیی و شكاندنی هەیمەنەی هێزی نەتەوەیی و ئاینی لـە شـارەكەدا لـە ڕێكخستنی ئـەم كۆبوونـەوە جەماوەرییـەدا ڕۆڵێكـی كـارای گێـڕا [٥١]. هـەر چـەندە كاربەدەسـتانی شارەكە بـە تایبـەتی بەڕێوەبـەری هـەواڵگری سـەربازی (رفعـت الحـاج سـری) كـە بەرهەڵستی بەڕێوەبردنی فیستڤاڵێكی لـەم جـۆرە بـوو بـەڵام سـووربوونی سـەرۆك وەزیران عبـدالكریم قاسـم لـە ئەنجامـدانی ئـەم كۆبوونەوەیـە بـووە پاڵپـشتییەكی گـەورە بـۆ ئەنجامـدانی[٥٢]. دەركـەوتنی ئـەم جـەماوەرە فراوانـە و ڕۆڵـی حزبـی شـیوعی لـە خۆپیـشاندانەكەدا لـەپاڵ بزووتنـەوەی ئاشـتیخوازان هـەر دوای تـەواو بــوونی فیــستڤاڵەكە كاردانــەوەی گــەورەی لــێ كەوتــەوە، لــە ٧ی ئــادار خۆپیشاندانەكی جەماوەری فراوان دژی ئەم دەركەوتنەی ئاشـتیخوازان لـە موسـڵ لــە لایــەن نەتەوەپەرســتانی عــەرەب بەڕێوەچــوو و دواتــر لەهــەمان شــەودا هاتوچۆكردن لە شارەكە قەدەغە كـرا و چـەند لـە كەسـانی سـەر بـە بزووتنـەوەی ئاشتیخوازان لە شارەكە دەستگیر كران[٥٣]، هـەر بۆیـە زۆر لـە مێژوونووسـان ئـەم خۆپیشاندانە بە هۆكاری هێنانـە پێـشی كـاتی ئەنجامـدانی بزووتنـەوەی شـەواف دادەنێن[٥٤]، دەكرێت بڵـێین ئـەم لێكدانەوەیـە لـە ڕاسـتییەوە نزیكـە چـونكە ئـەم پیلانــە لــە شــوباتی ١٩٥٩ لــەئارادا بــوو وەك هــەنگاوی یەكــەم بــە دەســت لەكاركێـشانەوەی وەزیـرە نەتەوەپەرسـتەكان (نـاجی طالـب - وەزیـری كاروبـاری كۆمەڵایەتی، عبدالجبار الجومرد - وەزیری دەرەوە، صدیق شنشل – وەزیری ئیرشاد، محمد علی محمود – وەزیری تەندروستی، فؤاد الركابي – وەزیـری دەوڵـەت) دەسـتی پێكرد[٥٥]، لەوكاتیش ڕۆژنامەی (اتحاد الشعب) پیرۆزبـایی لـە گـەلانی عێـراق كـرد دوای ڕەزامەندی سەرۆك وەزیران لە سەر دەست لە كاركێشانەوەی ئەم وەزیرانە و چەندین برووسكەش بۆ پشتگیری كۆمار و سەرۆك وەزیران بڵاوكرانەوە[٥٦].

لە ناو ئەم ڕەوشـە ئـاڵۆزەی كـە شـاری موسـڵ پێیـدا تێدەپـەڕی بەرەبـەیانی ڕۆژی یەكـشەممە ٨ی ئـادار بەیاننامـەی یەكـەمی بزووتنەوەكـە بـە سـەرۆكایەتی عبدالوهاب الشواف (١٩١٦ ـ ١٩٥٩) لەم ئیسگەیەی كە لە سوریا بۆیان هاتبوو بـە

ناوی (ئێرە موسڵە) دەنگی شۆڕش خوێندرایەوە[٥٧]، هەمان بەیاننامە لە سەر داوای ئەفسەرەکان لە لایەن (شێخ عبدالله هەولێری)* کە یەکێك بوو لە لایەنگرانی کۆمەڵەی (برایانی موسڵمان ـ أخوان المسلمین) بە زمانی کوردی دەخوێندرێتەوە بۆ ئەوەی ناوچە کوردییەکانی دەوروبەری موسڵ لە پەرەسەندنەکان ئاگادار ببنەوە[٥٨].

لێژنەکانی ئاشتیخوازان لە شارەکانی کوردستاندا دوای ئەوەی بڕیاری لەناوبردنی ئەم بزووتنەوەیە لە لایەن عبدالکریم قاسم درا، لەناو ئەو بازنە چەکدارییانەی کە حزبی شیوعی و پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان ڕێکیان خست بەشدارییان بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەی شەواف کرد بۆ نموونە ژمارەیەك لە ئاشتیخوازانی دەوروبەری هەولێر لەوانە (حمدامین قادر حسن، نوری وەسمان قەرەنی، حاجی سمایل سوراحی) لە گوندی قازیخانە و (باپیر حاجی رسول، صابر ابراهیم عبدالله، تاهیر ابراهیم حمد شوان) لە گوندی سێبیرانی ئاغا بەشدارییان تێدا کرد [٥٩]، هەر چەندە ئەمانە لە بنەڕەتدا سەر بە هەر دوو حزبی شیوعی عێراق و پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان بوون بەڵام بە ناوی ئاشتیخوازانەوە تێکەڵ بە شانە چەکدارەکان بوون[٦٠].

دوای لەناوبردنی بزووتنەوەکەش لە زۆربەی شارەکاندا خۆپیشاندان بەڕێوەچوو و داوایان دەکرد پیلانگێڕەکان بدرێنە دادگا و بەسزا بگەیەندرێن ئاشتیخوازان لەم خۆپیشاندانانە ڕۆڵی دیاریان بینی بە تایبەتی لە شارەکانی هەولێر و سلێمانی و کەرکووك و بەغدا[٦١]، لە ٢٤ی ئاداری ١٩٥٩ ئاهەنگێکی گەورە بە بۆنەی جەژنی نەورۆز بە ئامادەبوونی عبدالکریم قاسم لە شاری بەغدا کە لە لایەن لێژنەیەکی هاوبەشی نێوان (حزبی شیوعی عێراق و پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان) ڕێکخرا[٦٢]، لەناو ئاپۆڕایەکی فراوانی جەماوەریدا بزووتنەوەی ئاشتیخوازان بەشدارییەکی فراوانیان لەم ئاهەنگەدا کرد، ئاشتیخوازانی کورد ڕۆڵی گرنگیان گێڕا، ( همزه عبدالله ١٩١٢ ـ ١٩٩٨) یەکێك لە کەسایەتییە دیارەکانی ناو ئاهەنگەکە بوو کە بەم بۆنەیەوە وتارێکی پێشکەش کرد[٦٣]، هەروەها کامل الحبوبي وتارێکی بە ناوی ئاشتیخوازان پێشکەش کرد[٦٤].

دوای لــەناوبردنی بزووتنــەوەی شــەواف لــە ئایــاری ١٩٥٩ ( شــێخ رەشــیدی لۆلان)* سەرکردایەتی یاخیبوونێکی چەکداری دژی حکومـەتی قاسـم ڕاگەیانـد(٦٥)، ئاشــتیخوازانی کــورد لــە ســەرەتادا پــشتگیری هــەوڵی ئاشــتییانەیان کــرد بــۆ چارەسەرکردنی کێشەکە کە لە لایەن شـاندێکی حکومـەت بـە سـەرۆکایەتی عـونی یوسف ئەنجامدرا کە بێ ئەنجام بـوو(٦٦)، دواتـر لـە ڕێگـای هێـزەوە کۆتـایی بـەم یاخیبوونە هێندرا، ئاشتیخوازانی کورد کەوتبوونە ژێـر کاریگـەری بریـاڕی سیاسـی پارتــە سیاســییەکان لەوانــەش (پــارتی وشــیوعی) بۆیــە دەکرێــت بڵــێین دوور لــە ئامــانجی بزووتنەوەکــە مامەڵــەی لەگــەڵ ئــەم ڕەوشــە کــرد بــۆ نموونــە یــەکێك لــە ئەنــدامانی لێژنــەی ئاشــتیخوازانی هــەولێر بــە نــاوی ( شەمــسەدین مــوفتی) سەرپەرشتی ئەو هێزەی دەکرد کە بۆ لەناوبردنی بزووتنەوەکە لە خۆبەخـشەکانی ئەم شارە پێك هاتبوو(٦٧).

دوای تێپەڕبوونی ساڵێك بە سەر هەڵگەڕانـەوەکانی سـاڵی ١٩٥٩ بزووتنـەوەی ئاشتیخوازان بەیاننامەیەکی بڵاو کردەوە کـە تێیـدا ئامـاژە بـۆ ڕۆڵـی ئـەو لایەنانـە دەکات کە هەر دەم لە هەوڵی لەباربردنی ئەم کۆمارەن و داوای یەك ڕیـزی گـەلانی عێراق بۆ سەرکەوتنی کۆمار دەکات، هـەروەها ئامـاژە بـۆ ڕۆڵـی کـورد دەکـات لـە سەرکەوتن بە سەر ئەم پیلانانەدا (٦٨).

ئەم هەڵوێستانەی ئاشتیخوازان کە بەهۆی پەیوەندییان لەگەڵ حزبـی شـیوعی و پارتی لـە لایـەك و پاڵپـشتی عبـدالکریم قاسـم لەگـەڵ بزووتنەوەکـە لـە ئامانجـە سەرەکییەکانی خۆی دوور خستبۆوە ئەمەش ببووە فاکتەرێك بۆ ئەوەی پیلان لـە دژی ئەم بزووتنەوەیە دابڕێژرێت هەر وەك (عزیز شـریف) سـکرتێری بزووتنەوەکـە لە سەرەتای ئاداری ١٩٦٠ لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی لە شاری بەغدا لە دژی ئەو هەوڵ و پیلانانەی کـە دەدرێـن بـۆ تێکـدانی پەیوەنـدی نێـوان سـەرۆك وەزیـران و بزووتنەوەی ئاشتیخوازان ئەوەی ڕاگەیاند کە عبدالکریم قاسم خۆی ئاشـتیخوازە و لایەنگری ئاشتی دەکات(٦٩).

بزووتنــــەوەی ئاشــــتیخوازان وەك وەڵامدانەوەیــــەك بــــۆ ئــــەم پیلانانــــە خۆپیشاندانێکی جەماوەری هێمنانەی فراوانی لە شەقامی رەشید لە شـاری بەغـدا

بە بەشداری سەرجەم چین و توێژەکان ساز کرد کە هەموو پێکهاتە ئاینی و نەتەوەییەکانی عێراق تێیدا بەشدار بوون، لەوانەش ئاشتیخوازانی کورد کە لە ژێر دروشمی ( ئاشتیمان دەوێ ئاشتیمان دەوێ ... هێزی ئاشتیخواز دەبێ سەرکەوێ) بەشدارییەکی کارای ئەم خۆپیشاندانەیان کرد، جێگای ئاماژەیە لەبەر فراوانی و زۆری بەشداربووانی ئەم خۆپیشاندانە ئیسگەی ڕادیۆی بەغدا بە شێوەی تۆمارکراو هتاف کێشان و وتنەوەی دروشمەکانی ئاشتیخوازان لە هەمان ڕۆژ پەخش کرد[٧٠].

پەیوەندییەکانی نێوان عبدالکریم قاسم و بزووتنەوەی ئاشتیخوازان لە ئاستێکی بەهێزدا دەردەکەوت هەر بۆیە لەو کاتەی لە ٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٩ لە شەقامی ڕەشید ڕووبەڕووی هەوڵێکی تیرۆرکردن دەبێتەوە لە لایەن چەند ئەندامێکی سەر بە ( پارتی بەعس) لە هەوڵەکە ڕزگاری دەبێت، ئەنجومەنی نیشتمانی ـــ بزووتنەوەی ئاشتیخوازانی عێراق لە بەیاننامەیەکدا مژدەی دەربازبوونی سەرۆك وەزیران ڕادەگەیەنێت و ئەم کارە بە پیلانێکی دژ بە کۆمار و گەلانی عێراق دەناسێنێ[٧١].

ئاشتیخوازانی کورد لە شارەکانی هەولێر و سلێمانی و کەرکوك لە ڕێگای لێژنەکانەوە ئەم هەوڵەیان مەحکوم کرد و پاڵپشتییان بۆ عبدالکریم قاسم دووپات کردەوە، جەلیل هۆشیار بە ناوی لێژنەی ئاشتیخوازانی شاری هەولێر برووسکەیەکی ئاڕاستەی ناوبراو کرد کە تێیدا ئیدانەی ئەم هەوڵە دەکات و هیوای چاکبوونەوەی بۆ دەخوازێت [٧٢]. هەر بە هەمان بۆنەوە لە شاری هەولێر ئاهەنگێك لە هۆڵی سینەما سەلاحەدین لە ١٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٩ بە بەشداری لێژنەی ئاشتیخوازانی هەولێر سازکرا [٧٣]. هەروەها لێژنەی ئاشتیخوازانی کەرکوك لە بەیاننامەیەکدا کە بە ئیمزای هەر یەك لە (شێخ قادر بەرزنجی و محمد صالح قادر و حەمید باتاسی) بە ناوی ئاشتیخوازانی کەرکووکەوە بڵاو کرایەوە ئاماژە بە ڕۆڵی سەرۆك وەزیران لە پشتگیری کردنی لە ئاشتیخوازان و برایەتی نەتەوەیی لە کۆماری عێراقدا دەکات و ڕۆژی دەرچوونی لە نەخۆشخانە بە جەژنی گەلانی عێراق دادەنێت [٧٤]. هەر لەم چوارچێوەیەدا لە

١٠ی تشرينی يەكەم ئاشتيخوازانی سلێمانی لە بەياننامەيەكدا بە ناوی (دەستێكی ناپاكی خائن دەست لە زەعيم عبدالكريم ئەوەشێنێ) ئەم كارە مەحكوم دەكات[٧٥].

دوا بە دوای ڕووداوەكانی شاری كەركووك لە ١٤ی تەمموزی ١٩٥٩ كە لە يادی تێپەڕبوونی يەك ساڵ بە سەر شۆڕشی ١٤ی تەمموز لە نێوان كورد و توركمان ڕووی دا [٧٦]، كاردانەوەی خراپی لە سەر هەڵوێستی حكومەت بەرامبەر حزبی شيوعی لێكەوتەوە كە كاريگەری بەسەر پەيوەندی نێوان عبدالكريم قاسم و بزووتنەوەی ئاشتيخوازان هەبوو بە تايبەتی دژی ئەوانەی ئەندامی حزبی شيوعی بوون و لە بزووتنەوەی ئاشتيخوازان كاريان دەكرد، چالاكييەكانی ئاشتيخوازان لە تەواوی شارەكانی عێراق دوای تێكچوونی پەيوەندييەكانی نێوان حزبی شيوعی و عبدالكريم قاسم كەوتە ژێر چاودێری هێزە ناوەخۆيەكان هەروەها لە كوردستانيش كەوتنە ژێر چاودێری لە لايەن دام و دەزگا ئەمنييەكان، هەر چەندە خودی عبدالكريم قاسم لەم ماوەيەدا بەڕواڵەت وای دەردەخست كە پشتگيری بەردەوام لە ئاشتيخوازان دەكات بەڵام ڕاستييەكەی بە ئاڕاستەيەكی پێچەوانە دەردەكەوێت و لە هەوڵی ئەوەدا بوو كە چالاكييەكانيان قەتيس بكات، هەر وەك لە ڕاپۆرتی بەڕێوەبەرايەتی ئاسايشی گشتی (مديرية الامن العامة) كە لە ٢٧ی ئاداری ١٩٦٠ دەربارەی جموجۆڵەكانی ئاشتيخوازان دەردەكەوێت كە نارەزايی دەربارەی ئەو خۆپيشاندانانەی ئاشتيخوازان دەردەخات[٧٧]، هەر لە درێژەی هەوڵەكانی نەهێشتنی چالاكييەكانی ئەم بزووتنەوەيە چەند ئەندامێكی ئەنجومەنی نيشتيمانی دەستگير دەكرێن لەوانە (توفيق منير، عبدالله اسماعيل، عمر نظمی، معروف بەرزنجی، عبدالجبار وهبی، محسن النقيب)، بە مەبەستی ئازادكردنيان عزيز شريف لە ٦ی كانونی دووەمی ١٩٦١ بە بۆنەی يادی دامەزراندنی سوپای عێراق داواكارييەك ئاڕاستەی عبدالكريم قاسم دەكات[٧٨]. بەڵام سەرەڕای بەدەنگەوە نەهاتن بۆ داواكارييەكەی لە ٧ی ئاياری ١٩٦١ بە بڕياری (ئەحمەد ساڵح ئەلعەبدی) حاكمی سەربازی گشتی جێبەجێ كراو هەموو بارەگاكانی لێژنەی ئاشتيخوازان داخران[٧٩]، دەتوانين بڵێين هەر چەندە عبدالكريم قاسم لەم ماوەيەدا

تاڕادەیەك پەیڕەوی سیاسەتێکی تاکڕەوی دەکرد لە حوکمڕانیدا و کەوتە دژایەتی حزبی شیوعی و بەشێك لە ئاشتیخوازان بە تایبەتی ئەوانەی هەڵگری بیرۆکەی چەپ بوون کە هۆکاری سەرەکی دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە بزووتنەوەی ئاشتیخوازان وەك ئامرازێك لە لایەن حزبی شیوعی بەکار دەهێندرا ئەمەش لە ڕێڕەوی ڕاستەقینەکەی دوورخستەوە[٨٠]، ڕووداوەکانی شاری کەرکووك ئەم ڕاستییە دەردەخات چونکە دوای ئەوەی پەیوەندی نێوان عبدالکریم قاسم و حزبی شیوعی تێکدەچێت کاریگەری دەکاتە سەر پێگەی ئەم بزووتنەوەیە هەر وەك پێشتر ئاماژەی پێکرا[٨١]، لە لایەکی تر هەوڵی ئەوەیان دەدا لە ڕێگای ئاشتیخوازانەوە بە تەواوی بخزێنە ناو ڕیزەکانی هێزە چەکدارەکان کە ئەمەش لە چاوپێکەوتنی نێوان سکرتێری حزبی شیوعی سلام عادل و عزیز شریف دوای تێکچوونی پەیوەندی نێوان قاسم و حزبی شیوعی بە ئاشکرا باسی لێوە دەکرێت[٨٢].

ئاشتیخوازانی کورد لە شارەکانی باشووری کوردستان بە هەمان شێوە کەوتنە ژێر کاریگەری ئەم بڕیارە[٨٣]، هاوکات لە گەڵ ئەم پەرەسەندنانە پەیوەندییەکانی نێوان پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان و حکومەتی عبدالکریم قاسم چووە قۆناغێکی مەترسیدار کە دەرەنجامەکەی ئەمەش ڕەوشەکەی سەبارەت بە کوردستان ئاڵۆزتر کرد و شۆڕشی ئەیلولی ١٩٦١ ی لێ کەوتەوە، ئەم ڕەوشەش بواری کار و چالاکییەکانی ئەم بزووتنەوەیەی لە کوردستان تەواو سست کرد بەلاَم ئاشتیخوازانی کوردستان هەر لە سەرەتای دەستپێکردنی شۆڕشدا کەوتنە هەوڵی چارەسەری ئاشتییانەی ئەم کێشەیە بۆ ئەمەش کەوتە کۆکردنەوەی ئیمزا بۆ دوورخستنەوەی شەڕ لە کوردستان و هەوڵدان بۆ چارەسەری ئاشتییانەی مەسەلەکان کە چەند هەزار ئیمزایان کۆکردەوە بەلاَم هیچ گۆرانێکی بەسەر هەڵوێستی حکومەتدا نەهێنا [٨٤]، تەنانەت ڕەوشەکە ئاڵۆزتر بوو دوای ئەوەی ڕۆژنامەی خەبات لە٢٢ی ئاداری ١٩٦١ داخرا، بەمەبەستی ڕێگاگرتن لە پەرەسەندنی ئەم بارگرژییەی نێوان مصطفی بارزانی و عبدالکریم قاسم و چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە عێراقدا بە ڕێگایەکی ئاشتییانە

حزبــی شــیوعی عێــراق لــە ئــاداری ١٩٦١ بەیاننامەیــەکیان بــۆ هێورکردنــەوەی ڕەوشەکە دەرکرد کە ژمارەیەکی زۆر لـە ئاشـتیخوازانی کـورد و عـەرەب شـان بـە شـانی دیموکراتیخـوازان لـە سـەر داوای حزبـی شـیوعی ئیمزایـان لـە سـەر ئـەم بەیاننامەیە کرد بەڵام ئەم هەنگاوەش هیچ گۆڕانێکی یەسەر هەڵوێستی عبدالکریم قاسم نەهێنا [٨٥].

دوای تێپـەڕبوونی حـەوت مـانگ بەسـەر سـەرهەڵدانی شۆڕشـی ئـەیلول وەك هەنگاوێکی ئاشتییانە لە ٢٧ی نیسانی ١٩٦٢ ئاشتیخوازانی کورد لە شـاری بەغـدا شانبەشــانی ڕێکخراوەکــانی حزبــی شــیوعی ڕۆڵێکــی گــەورەیان گێــڕا لــە خۆپیشاندانێکی جـەماوەری فـراوان لـە ژێـر دروشـمی ( ئاشـتی بـۆ کوردسـتان) و هەڵمەتێکی کۆکرنەوەی ئیمزا بۆ ڕاگرتنی شەڕ لە کوردستان وچەسـپاندنی ئاشـتی دەستی پێکرد، تەنها لە شاری بەغـدا زیـاتر لـە (٦٠) هـەزار ئیمـزا کۆکرایـەوە کـە ژمارەیـەکی زۆر لــە ڕۆشـنبیران و پـارێزەر و ڕۆژنامەنووسـان و دیموکراتیخـوازان بەشدارییان لەم هەڵمەتەدا کرد[٨٦]، هەروەها لە٢ی نیسـانی ١٩٦٢ بەیاننامەیـەکی بە ناوی (السلم في كردستان ـ الديمقراطية بدل القمع العسكري) بڵاو کردەوە و لـە ٢٢ی نیساندا بەیاننامەیەکی تر بە ناوی (استئناف الحملة العسكرية على كردستان يعرض وحدة الجمهورية واستقلالها للخطر) ئەم بەیاننامانـە ژمارەیـەکی زۆر لـە ئاشـتیخوازان ئیمزایان لەسەر کرد کە هەندێکیان دواتر بەم هۆیەوە دەستگیر کران لەوانە توفیق منیر جێگری سکرتێری ئاشتیخوازان و عونی یوسف، عبدالله البستاني، موکـەرەم تاڵەبانی[٨٧].

بزووتنەوەی ئاشتیخوازان بۆ جەختکردنەوە لەسـەر ئامـانجی ئاشـتییانەی لـە ڕوونکردنەوەیەکـدا بــۆ ســەرجەم لێژنــەکان ئــەوەی دووپــات کردۆتــەوە کــە ئاشتیخوازان جوولانەوەیەکـە دوور لـە کێـشەی چینایەتی و حزبایـەتی و بـە هـیچ جۆرێك تێکەڵ بە ململانـێ سیاسـییەکان نابێـت چـونکە ئـەم بابەتـە لـە دەرەوەی سنووری پێویـستییەکانی جوولانـەوەی ئاشـتیخوازانە، هـەر بۆیـە وەرگرتنـی هـەر هەڵوێـستێك بـە پێـچەوانەی ئامانجـەکانی بزووتنەوەکـە کـارێکی دروسـت نییـە، هەروەها لە ڕوونکردنەوەکەدا داوا دەکات کە هیچ لێژنەیـەك بـێ ئاگـاداری لێژنـەی

مەکتەبی هەمیشەیی لە بەغدا هیچ جۆرە بەیاننامەیەك بلاَو نەکەنەوە و پێویستە لێژنەکان پەیوەست بن بە بڕیارەکانی کۆنگرەی دووەم و سێیەم کە هیچ گۆڕانێك بێ ئاگاداری و ڕەزامەندی لێژنەکان ئەنجام نەدرێت بە بێ ڕێکەوتنی پێشوەخت لەگەڵ لێژنەی هەمیشەیی وەك گۆڕینی ئەندامی لێژنەکان یان دەست لە کارکێشانەوەیان[٨٨]. دەتوانین بلێین بزووتنەوەی ئاشتیخوازان بە هۆی ئەوەی لە ئامانجە سەرەکییەکانی خۆی لایدا وەك ڕێکخراوێکی سیاسی مامەڵەی لەگەڵدا کرا و روو بە ڕووی گیران و ئەشکەنجەدان و داخستنی بارەگاکان بوونەوە .

سەبارەت بە چالاکییەکانی لێژنەکانی ئاشتیخوازان لە شارەکانی باشووری کوردستاندا بە چەند شێوازێك دەرکەوتوون وەك کۆڕ و کۆبوونەوە و ئاهەنگ و دەرکردنی بەیاننامە و بەرزکردنەوەی یاداشت، لە یادی تێپەڕبوونی ساڵێك بە سەر شۆڕشی ١٤ی تەمموز ئاهەنگێکی فراوان لە شاری هەولێر بەڕێوە چوو کە ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی ئەم شارە و دەوروبەری ئامادەی بوون هەر لەم ئاهەنگەدا کە لە ژێر ناوی کوردستان لە جەژنی ڕزگاریدا بەڕێوە چوو لێژنەی ئاشتیخوازان بەشدارییەکی بەرچاویان نواند[٨٩]. هەروەها لە قەزای دهۆك ڕێوڕەسمێکی فراوان بەڕێوە چوو کە تێدا ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی شارەکە بەرەو ناوچەی زاوێتە چوون لەوێ یەکیان گرتەوە لەگەڵ کرێکاران و جووتیارانی ناوچەکە کە هوتافیان بە ناوی ئاشتیخوازانەوە دەکێشا یەکێك لە هوتافەکان بریتی بوو لە (ئاشتیخوازان لە کوردستان ئاهەنگ دەگێڕن بۆ جەژنی نیشتمانی) و ( ماکو زعیم الا کریم) دەوترایەوە و بەڕێڕەو بەرەو ناوەوەی شارەکە هاتن[٩٠].

لە چوارچێوەی چالاکییەکانی ئاشتیخوازان شارۆچکەی هەڵەبجەش لە ڕۆژی هەینی ١٥ ئایاری ١٩٥٩ ڤیستڤاڵێکی گەورەی لەخۆ گرت ئاشتیخوازان لە شارەکانی بەغدا و هەولێر و کەرکووك و سلێمانی و ناوچەکانی بادینان بەشدارییان تێدا کرد، دوای خوێندنەوەی وتاری دەستپێکردنی ڤیستڤاڵەکە لە لایەن لێژنەی ئاشتیخوازانی هەڵەبجەوە گۆرانی شاعیر بەناوی ئاشتیخوازانی سلێمانی وتارێکی پێشکەش کرد، جێگای ئاماژەیە پیاوانی ئاینی لەم ڤیستڤاڵەدا بەشدارییان کرد و مەلا محەمەدی هەڵەبجەیی لە وتارێکدا گرنگیی ئاشتی لە ڕوانگەی ئاینی پیرۆزی

ئیسلامدا روون کردەوە، دوای تـەواوبوونی ئاهەنگەکـە شـاندە بەشـداربووەکان لـە ناو شەقامی هەڵەبجە گەڕان و دواتر بەڕێ خران[91].

ئاشتیخوازانی ڕەواندز لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٥٩ لە یادی لەسـێدارەدانی هـەر چـوار ئەفـسەری کـورد (خیراللـه عبـدالکریم و عـزت عبـدالعزیز و محمـد قودسـی و مـستەفا خۆشـناو) بەشـداری ئاهـەنگی یادکرنـەوەی ئـەم چـوار ئەفـسەرەیان لـە شارۆچکەی ڕەواندز کرد و ئەحمەد حەوێز وتارێکی پێشکەش کرد کـە تێیـدا ڕۆڵـی ئەم ئەفسەرانەی بەرز نرخاند لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ڕژێمی پاشایەتی لـە عێـراق و هــەوێنی یــەکرێزی و تێکۆشــان بــوون، جێگــای ئاماژەیــە ژمارەیــەکی زۆر لــە دانیشتوانی شارۆچکەی ڕەواندز و دەوروبەری ئامادە بوون [92].

بــەرپابوونی شۆڕشــی کوردســتان لــە ئــەیلولی ١٩٦١ بــووە هــۆی ئــەوەی چالاکییەکانی ئاشتیخوازانی کورد بچێتە قۆناغی تارادەیـەك سـڕبوون بـە تایبـەتی ئەوانــەی زیــاتر مــەیلیان بــەلای نەتەوایەتیــدا دەچــوو و هەنــدێك بــە هــۆی پەیوەنـدیکردنیان بـە شـۆڕش و هەنـدێکی تـر بـە هـۆی چـاودێری حکومـەت بەسەریانەوە کەمتر لە بواری چالاکی نوانـدن دەردەکـەوتن، لـە هەنـدێ کاتـدا لـە بڵاوکردنەوەی وتارەکانیان بە ناوی نهێنی لـە ڕۆژنامەکانـدا دەربـارەی ئاشـتی بـۆ کوردستان وتاریان بڵاو دەکردەوە، یەکێك لە ئاشتیخوازانی کورد لە کاتی بەستنی ڤیـستیڤاڵی حەوتــەمی ئاشـتیخوازانی جیهـان یاداشـتێك بـە ناونیـشانی ئاشـتی و دۆستایەتی بە ناوی ( لاوێکی کوردستان) ئاڕاسـتەی ڤیـستیڤاڵەکە دەکـات کـە لـە بەشێکدا هاتووە :

**"...... ئێمەی کوردیش وەك هەموو نەتەوەکانی سەر ڕووی زەمین وەنەبی ناسۆری شەڕ نەی گرتبینەوە ... شەڕ ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمان بە ئافرەت و پیاو بێ جیاوازی تێوە دەگلێنێ برسێتی و گرانی و بێدەرامەتی ڕوومان تێ دەکات ... کەواتە با لە کۆڕی ئاهەنگەکانی ڤیستیڤاڵی حەوتەم دەرکـەوین بە بەشداربوونمان ئێمەی لاوانی کورد ... بە دەنگی پڕ سۆزمان بـە زمانـە نەمرەکەمان تێکـەڵ بـە زمانـەکانی تـر بکـەین بەسـتە بڵـێین بـۆ ئاشـتی و**

**دۆستایەتی ... با تێمان بگەن و تێیان بگەین کە ئێمەی کورد ئاشتی و ئازادیخوازین و دۆستی گشت گەلانین "**[٩٣].

ئاشتیخوازانی کورد لە سەر ئاستی دەرەوەش ڕۆڵی گرنگیان بینیوە، لە چوارچێوەی هەوڵەکانی پتەوکردنی پەیوەندییەکانی نێوان ئاشتیخوازانی عێراق و وڵاتانی ئاسیا لە ئایاری ١٩٥٩ شاندێکی ئاشتیخوازان کە هەر یەك لە (شێخ لەتیف شێخ محمود و عبدالله گۆران و جەمیل ڕۆژبەیانی) تێیدا بەشدار بوون بە ناوی دۆستایەتی و هاوکاری سەردانی چینی میللی و کۆریای دیموکراتی و یەکێتی سۆڤیەتیان کرد و لە لایەن خرۆشوف سەرۆکی یەکێتی سۆڤیەت پێشوازییان لێ کرا[٩٤]. هەروەها لە تشرینی دووەمی ١٩٥٩ ئاشتیخوازانی کورد لە چوارچێوەی شاندی ئاشتیخوازانی عێراق لەگەڵ شاندی (٣٠) وڵاتی تر بەشدارییان لە ئاهەنگی ڕێزلێنان لە ئاشتیخوازانی وڵاتانی جیهانی کرد و لە لایەن ( کرموجۆ) سەرۆکی لێژنەی ئاشتیخوازانی چین ڕێزیان لێنرا[٩٥].

ئاشتیخوازانی کورد لە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی نیشتمانی لە ١٦ی ئەیلولی ١٩٦٠ لە شاری بەغدا پشتگیرییان لە خەباتی گەلی جەزائیر بۆ سەربەخۆیی و دیاریکردنی مافی چارەی خۆنووسین لە ڕێگای گەلەوە بە سەرپەرشتی نەتەوە یەکگرتووەکان کرد و پاڵپشتی خۆی بۆ بڕیارەکانی ئەنجومەنی ئاشتی جیهانی لە بارەی نەهێشتنی چەکی ئەتۆمی و سەربەخۆیی گەلان و لەناوبردنی بەرژەوەندییەکانی ئیمپریالیزمی لە وڵاتاندا دووپاتکردەوە[٩٦].

ئاشتیخوازانی شاری سلێمانی لەم کاتەی کە فەرەنسا سوور بوو لەسەر جێبەجێکردنی تاقیکردنەوەی ئەتۆمی لە خاکی ئەفریقیا ئەم کارە مەحکوم دەکەن [٩٧]، هەروەها لە بەیاننامەیەکی تر پاڵپشتی لێدوانەکانی زانای ئەتۆمی (شارل مارتان) ی کرد دەربارەی ڕاگەیاندنی زیانەکانی بۆمبی نایترۆجینی کە چەند بە قەد زیانەکانی هێرۆشیما دەبێت، لە بەشێکی بەیاننامەکەدا هاتووە:

**" ... ئاشتیخوازانی سلێمانی بانگتان ئەکەن ئەی ئاشتیخوازانی نیازپاك، ئەی ئەو کەسانەی کە ئاشتیتان کردووە بە مەبەست و ئاواتی ڕاستتان بە دڵ و باوەڕ بۆی تێبکۆشن . دەنگمان دەدەینە پاڵ ئەم زانا ئەتۆمییە و**

**خەبات دەکەین بۆ گەیاندنی دەنگی میللەتە ئاشتیخوازەکەمان بە جیهـانی ئاشتی دۆست [98].**

هەر لە درێـژەی هەوڵـەکان لـە دژی بـەکارهێنانی چـەکی ئـەتۆمی، درەخـشان عـارف بــە نـاوی لێژنــەی ئافرەتـانی شـاری سـلێمانی برووسـکەیەکی نـاڕەزایی ئاڕاستەی حکومەتی فەرەنسا دەکات تێیدا سـەرکۆنەی تاقیکردنـەوەکانی بـۆمبی ئەتۆمی لە دەشتی جەزائیر دەکات [99]، هەر لەم چوارچێوەیەدا بە بۆنەی هەفتەی چەك داماڵین و سـەرکەوتنی گـەلی جـەزائیر لـە هـۆڵی گـەل لـە ٢٠ی ئـەیلولی ١٩٦٠ ئاهەنگێکی وتار خوێندنەوە بەڕێوەچوو کە تێیدا سەرۆك وەزیران عبدالکریم قاسـم ئامادەی بوو وتارێکی بەم بۆنەیەوە پێشکەش کرد کە تێیدا جەختی لە سەر ڕۆڵـی ئاشتیخوازانی عێراق لەهەمبەر مەسەلە نشتیمانییەکان کردەوە، وەك لـە بەشـێکی وتارەکەدا دەڵێت :

**" ... پـشتگیری لـە بزووتنـەوەی ئاشـتیخوازان لـە کۆمـاری عێـراق و لـە بزووتنەوەی ئاشتی جیهـانی دەکـەم لـە داواکاریکردن بـۆ چـەك دامـاڵینی دوژمنکاران لە رووی گەلانی لاواز و ژێر دەست و گەلانی ئازا و خەباتگێڕ لە رووی داگیرکەرانیدا ... من لەو کاتەی کە لێـرەدا ئامـادەم بـۆ ئەوەیـە کـە بیسەلمێنم ئێمە لە کۆماری عێراقدا دان بەم حکومەتەی جەزائیر نانێین کە حکومەتێکی شەرعی نەبێت ئەو حکومەتەی کە گەلی جـەزائیر خـەباتی بـۆ کردووە ... ئەی گەل پێویستە ئەوە بزانن بەبێ خەبات و تێکۆشان مافتان پێ نادرێت چـونکە سەربەسـتی و سـەربەخۆیی و سـەروەری وەرئـەگیرێت نادرێت ... "[100].**

هــەر لــەم بۆنەیــەدا ئیــبراهیم ئەحمــەد ئەنــدامی مەکتــەبی هەمیــشەیی ئاشتیخوازانی عێراق وتارێکی پێشکەش کرد کە تێیدا ئاماژەی بۆ تێکۆشانی گـەلی جەزائیر کـرد بەرامبـەر هێـزی ئیـستعماری فەرەنـسی و بـە خـەباتی گـەلی کـوردی چواند، وەك لە بەشێکی وتارەکەدا دەڵێت :

**" ... بـە هـۆی پێکـچوونمان لـە خەباتـدا گـەلی کـورد پـشتگیری لـە گـەلی جەزائیر دەکات بە هەموو ئەو هۆکارانەی لەبـەر دەسـتدان شـان بـە شـانی**

**برایانی عەرەب و پاڵپشتی هـەموو هـەنگاوەکانی حکومـەتی نیـشتمانیمان دەکــەین لــە پــشتگیری کردنــی گــەلی جــەزائر چــونکە ئێمــە هــەموو سەرکەوتنێکی گەلانی عەرەب بە سەرکەوتنی گەلی کورد دەزانین "**[١٠١].

هەروەها ناهیدە شێخ سەلام وتارێکی پێشکەش کرد کە لە بەشێکیدا هاتووە:

**" ... گـەلی عێـراق بـە کـورد و عـەرەب دەسـت لـەناو دەسـت پاڵپـشتی تێکۆشـانی گـەلی جـەزائیر دەکـات ... هـەر سـەرکەوتنێکی بزووتنـەوەی رزگـاریخوازی هـەر گـەلێك بـە سـەرکەوتنی گـەلی کـورد دادەنـێین ... داوا دەکەم لە گەلی عێراق بە کورد و عەرەب و سەرجەم چین و دەستەو پارت و رێکخـراوە نـشتیمانییـەکان کـە رۆژی ١ی تـشرینی دووەم بکـەن بـە رۆژی هاوکـاری گـەلی جـەزائیر ... بـژی خـەباتی گـەلان لـە پێنـاو رزگـاری و ئاشتیدا"**[١٠٢].

جێگـای ئاماژەیـە لیژنـەکانی کوردسـتان لـەم هەڵوێـستانەدا بـەدەر نـەبوون، لەوانە ئاشتیخوازانی کۆیە بە ئیمزای (١٩) کەس کە ئەمانەن (مەلا مەعصوم، مـەلا محمد مەلا ابراهیم، مەلا علی حاجی توفیق، مەلا قادر ، کاکەزیاد، صابر اسماعیل، حنا انطوان، صوفی محمد، بکر صدیق، کمال حاجی مەجید، سـەید عبداللـە سـەید اسماعیل، بکر حاجی محمد، محمد جلال، سعدالله محمد، رشید تاڵـەبانی، مـسعود مەلا محەمەد، جـەنگی تاڵـەبانی، مەجیـد عومـەر، عوسمـان عـەونی) بـۆ پاڵپـشتی گەلانی ژێر دەسـت و بـە تایبـەتی گـەلی جـەزائیر و بزووتنـەوەی رزگـاریخوازی لـە ئەفەریقیادا بەیاننامەیەکیان ئاراستەی گەلانی عێراق کرد[١٠٣].

لەوکاتەش هەوڵە نێودەوڵەتییەکان لە ئارادا بوون بۆ پاراستنی ئاشتی جیهـانی ئاشتیخوازانی شاری کەرکوك بە ئیمزای نزیکەی (٤٩١٩) کـەس پـشتگیری خۆیـان بۆ ئەو نامەیە دەردەبڕن کە لە لایەن ئاشتیخوازانی عێراقەوە ئاراستەی هەر چـوار وەزیری دەرەوەی وڵاتانی (فەرەنسا و بەریتانیا و ئەمـەریکا و یـەکێتی سـۆڤیەت) دەکرێـت لـە بـارەی پاراسـتنی ئاشـتی جیهـانی و دەقـی یاداشـتەکەش لـە لایـەن سەرۆکی لیژنەی کەرکوکەوە (معروف بەرزنجی) ئیمزا دەکرێت [١٠٤].

جێگای ئاماژەیە لەو کاتەی ئاشتیخوازانی کورد لە ولآتی سوریا دەکەونە ژێر سیاسەتی دەستگیرکردن و ئەشکەنجەدان لێژنەی ئاشتیخوازانی شارەزوور بەیاننامەیەك لە دژی حکومەتی سوریا بلآو دەکەنەوە و داوای ئازادکردنی گیراوەکان بە تایبەتی شاعیری ئاشتیخواز (قدری جان) دەکات ئەم هەڵوێستە پاڵپشتییەکی جەماوەری فراوانی ناوچەکەی بەخۆوە بینی[١٠٥]. هەروەها دوای ئەوەی عبداللە ابراهیم جاف کە یەکێکە لە ئاشتیخوازانی ناوچەی کفری ناڕەزاییەك ئاڕاستەی مەکتەبی هەمیشەیی دەکات کە بێ دەنگە لەمەڕ سیاسەتی سەرکوتکەرانەی ئێران بەرامبەر بە ئاشتیخوازانی کورد، بزووتنەوەی ئاشتیخوازانی عێراق لە بەیاننامەیەکدا مەحکومی ئەو سیاسەتە سەرکوتکەرانەی حکومەتی ئێران بەرامبەر ئاشتیخوازانی کورد لە ڕۆژهەلاتی کوردستان دەکات[١٠٦].

ئاشتیخوازانی کورد سەبارەت بە خەباتی گەلان لە ولآتانی ئاسیا و ئەفریقیا و ئەوروپای ڕۆژهەڵاتدا لە کۆبوونەوەی ١٦ی ئەیلولدا ١٩٦٠ پاڵپشتی تەواوی خۆی بۆ بڕیارەکانی کۆبوونەوەی ئەنجومەنی ئاشتی جیهانی لە ستۆکهۆلم لە ١١ی تەمموزی ١٩٦٠ دەربڕی دەربارەی پشتگیریکردن لە خەباتی گەلانی جەزائیر و کۆنغۆ و کوبا و ئەڵمانیا[١٠٧]. بە بۆنەی نزیکبوونەوەی تێپەڕبوونی ساڵێك بە سەر شۆڕشی ١٤ی تەمموز ئاشتیخوازانی شارەزوور بە ئیمزای (٥٠٠) ئاشتیخوازی ناوچەکە بەیاننامەیەك بلآودەکەنەوە کە لە بەشێکیدا داوای ئازادکردنی ئەو گیراوانە دەکەن کە لە لایەن حکومەتی ئیسپانیاوە گیراون[١٠٨]. مانوئیل سانشیزارکاس نوێنەری ئیسپانیا لە ئەنجومەنی ئاشتی جیهانی بەرامبەر ئەم هەڵوێستە سوپاسنامەیەك ئاڕاستەی مەکتەبی هەمیشەیی دەکات و ڕۆڵ و کاریگەری ئاشتیخوازان لە عێراقدا لە ئاستێکی بەرز دەنرخێنێت[١٠٩]. هەروەها جلیل هۆشیار بەرپرسی لێژنەی ئاشتیخوازانی هەولێر بە مەبەستی ڕاگرتنی ئەم سیاسەتەی کە حکومەتی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا لە دژی ئاشتیخوازان پیادەی دەکات یاداشتێك بە ناوی ئاشتیخوازانی هەولێر پێشکەش بە باڵیۆزخانەی ئەڵمانیا لە بەغدا دەکات و داوای ئازادکردنی (ادبست هورن) و سەرجەم بەندکراوەکان دەکات[١١٠]. دەکرێت بڵێین هەر چەندە ئازادکردنی گیراوەکان داواکارییەکە لە

شوێنی خۆیتی بەڵام لەوە دەچێت ئەم هەڵوێستە لە ژێر کاریگەری بۆچوونەکانی حزبی شیوعی بێت چونکە ئەڵمانیای ڕۆژهەڵاتیش یەکێك بووە لە وڵاتە پۆلیسییەکان بەڵام هیچ ڕەخنەیەك لە سیاسەتی ئەم وڵاتە شان بە شانی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا نەگیراوە .

جێگای ئاماژەیە ژمارەیەك لە ئاشتیخوازانی عێراق لە شاری لەندەن بەشدارییان لە کۆبوونەوەیەکدا کرد کە ڕێکخراوە کرێکاری و دیموکراتییەکانی بەریتانیا پێی هەڵسان و چەند لە کەسایەتییە ناسراوەکانی ئەم وڵاتە ئامادەی بوون ئامانجی سەرەکی ئەم کۆبوونەوەیەش هەوڵدان بوو بۆ کوژانەوەی جەنگی سارد و نەهێشتنی بنکە موشەکییەکان لە ئەوروپادا وەك پاپتیەك بۆ ئەم هەوڵە هەر یەك لە (قانع، کریم فتاح، شێخ ڕەزا شێخ علی، شێخ جعفر شێخ احمد، عبدالرحمن کاکە) بە ناوی (٣٠٠) ئەندامی لێژنەی ئاشتیخوازانی شارەزوور برووسکەیەکی پشتگیرییان بە ناوی (بۆ برا ئاشیخوازەکانی لەندەنمان) ڕەوانە کرد[١١١].

ئەنجومەنی ئاشتیخوازانی جیهان لە برووسکەیەکدا ڕۆڵی ئاشتیخوازانی عێراق بەرز دەنرخێنێت و سوپاسیش ئاڕاستەی ئەو ڕۆژنامانە دەکات کە ڕۆڵی بەرچاویان گێڕاوە لە بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئاشتی و پاڵپشتی کردنی بڕیارەکانی کۆبوونەوەی ستوکهۆلم[١١٢]، دەتوانین بڵێین هەردوو ڕۆژنامەی (خەبات) و (ژین) لەم بوارەدا ڕۆڵی زۆر کاریگەریان بینیوە لە بڵاوکردنەوەی بڕیارەکانی ئەنجومەنی ئاشتی جیهانی و چالاکییەکانی ئاشتیخوازانی عێراق بەگشتی و جموجۆڵەکانی ئاشتیخوازانی کورد بەتایبەتی[١١٣]. بەم جۆرە ڕۆڵی کورد لە چالاکییەکانی بزووتنەوەی ئاشتیخوازان لە عێراقدا دوای ڕوودانی کودەتای ٨ی شوباتی ١٩٦٣ چووە قۆناغی نەمان و ڕووبەڕووی شاڵاوی گرتن و ئەشکەنجەدان بۆوە، لەم مێژووەوە قۆناغێکی مەترسیدار لە مێژووی خەباتی ئەم بزووتنەوەیە دەست پێدەکات .

## ئه نجام

له ئه‌نجامی ئه‌م توێژینه‌وه‌یه‌دا ده‌گه‌ینه ئه‌م خالآنه‌ی خواره‌وه :

١ / زانیـاری مێـژوویی ده‌ربـاره‌ی بزووتنـه‌وه‌ی ئاشـتیخوازان بـه پێـی ئـه‌و سه‌رچاوانه‌ی که توێژه‌ر گه‌ڕاوه‌ته‌وه سـه‌ری زۆر کـه‌من کـه شـایه‌نی مێـژووی ئـه‌م بزووتنه‌وه نییه هۆکاری ئه‌مه‌ش ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ که‌می لێکۆڵینه‌وه مێژووییه‌کان و گرنگی نه‌دان به مێژووی ئه‌م بزووتنه‌وه‌یه .

٢ / گه‌لی کورد له کوردستانی عێراق وه‌کو هه‌موو گه‌لانی جیهان له کاریگه‌ری لـه‌م گۆڕانکارییانه به‌ده‌ر نه‌بووه که له سه‌ر ئاسـتی نـاوه‌خۆ و ده‌ره‌وه ڕوویـان داوه و به‌رقه‌رارکردنی ئاشتی بـه خـه‌باتێکی سـه‌رده‌مانه زانیـوه کـه خزمـه‌ت بـه هـه‌موو گه‌لان ده‌کات و ڕێگایه‌کیشه بۆ چاره‌سه‌رکردنی کێشه‌کان .

٣ / هـه‌ر چـه‌نده واقعـی ئـابووری ـ کۆمه‌لآیـه‌تی کۆمـه‌ڵگای کـوردی لـه ئاسـتێکی پێـشکه‌وتوو نـه‌بوو بـه‌لآم ئـافره‌تی کـورد ڕۆڵـی به‌رچـاویان لـه بزووتنـه‌وه‌ی ئاشـتیخوازان گێـڕاوه، ته‌نانـه‌ت یه‌کـه‌مین ئـافره‌ت کـه لـه ئه‌نجومـه‌نی نیـشتمانی هه‌ڵبژێردرا کورد بوو .

٤ / ئاشتیخوازانی کـورد پـشتگیری خـه‌باتی ڕزگـاریخوازی گـه‌لانی ژێرده‌سـتی لـه ئاسـیا و ئـه‌فریقیا و ئـه‌وروپا و ئـه‌مریکای لاتینیـدا کـردووه و سـه‌رکه‌وتنی ئـه‌م خه‌باته‌ی به پاڵپشتی خه‌باتی نه‌ته‌وه‌یی خۆی زانیوه .

٥ / ئاشـتیخوازانی کـورد لـه چوارچـێوه‌ی بزووتنـه‌وه‌ی ئاشـتیخوازانی عێـراق که‌وتبوونـه ژێـر کاریگـه‌ری نه‌خـشه‌و پلانـه‌کانی پارتـه سیاسـییه‌کان بـه تایبـه‌تی (حزبی شیوعی عێراق) ئه‌مه‌ش له ئامانجه ڕاسته‌قینه‌که‌ی دووری خسته‌وه.

٦ / تێڕوانینی کێشه‌ی کورد له عێـراق وه‌ك کێـشه‌یه‌کی نه‌تـه‌وه‌یی لـه لایـه‌ن ئـه‌م بزووتنه‌وه‌یه نه‌هاتۆته ناساندن به‌ڵکو هه‌ندێك له ئه‌ندامانی کورد له‌م بزووتنه‌وه‌یـه که‌وتبوونـه ژێـر کاریگـه‌ری عێراقـچێتی کـه ئه‌مـه‌ش لـه وتـار و به‌شـدارییه‌کانی ئاشـتیخوازانی کـورد لـه بۆنـه جیاوازه‌کانـدا بـه روونـی ده‌رده‌کـه‌وێت . بـه‌لآم به‌شێکیش داکۆکییان له خه‌باتی نه‌ته‌وه‌یی کورد کردووه .

٧ / نەبوونی کاریگەری هەڵوێستی بزووتنەوەی ئاشتیخوازان بۆ نەهێشتنی شەڕ لە کوردستان دوای دەستپێکردنی شۆڕشی ئەیلول لە ١٩٦١ کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دوورکەوتنەوەی بزووتنەوەکە لە ئامانجە سەرەکییەکەی و نەمانی متمانەی حکومەتیش بە بنەماکانی ئەم بزووتنەوەیە .

٨ / ئامانجەکانی ئاشتی جیهانی بە خێرایی لە عێراقدا شوێنی خۆی کردەوە بەڵام دەرەنجامەکەی پێچەوانەی ئامانجە راستەقینەکە دەرکەوت کە هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ تێکەڵبوونی ژمارەیەکی زۆر لە ئەندام و لێپرسراوانی پارتە سیاسییەکان لەناو ئەم بزووتنەوەیە کە ئاڕاستەی بزووتنەوەکەیان گۆڕی بە مەبەستی سیاسیی خۆیان .

# لیستی سەرچاوەکان

**یەکەم : بەڵگەنامەکان .**

**١ ـ بڵاونەکراوەکان .**

**ـ بە زمانی عەرەبی .**

ـ د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، مديرية التحقيقات الجنائية، موضوع : تقرير خاص عن انصار السلام، في ١٩ كانون الاول ١٩٥٣.

ـ د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، م.و.د، بيان مجلس السلم في الجمهورية العراقية، بغداد، ١٥ / تشرين الاول / ١٩٥٩ .

ـ د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، م.و.د، بيان انصار السلام في كركوك، ١٩٥٩ .

ـ د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، الموضوع : بيان حركة انصار السلام في العراق بمناسبة الذكرى الاولى لنضال الموصل ضد مؤامرة زمرة الشواف، بتاريخ ٩ / ٣ / ١٩٦٠ .

ـ د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، رقم : س / ٩٦، الموضوع : التقرير الشهري لنشاطات حركة انصار السلام، اذار / ١٩٦٠ .

**ـ بە زمانی کوردی .**

ـ بەیاننامەی لیژنەی ئاشتیخوازنی شارەزوور، حوزەیرانی ١٩٥٩ .

ـ بەیاننامەی لیژنەی ئاشتیخوازانی کۆیە، ئەیلولی ١٩٥٩ .

**٢ / بەڵگەنامە بڵاوکراوەکان .**

**ـ بە زمانی عەرەبی .**

ـ مذكرة انصار السلم في العراق في ١٣ /١٠/ ١٩٥٢ .

ـــ السفارة البريطانية / بغداد، رقم الوثيقة : ٣٧١ / ١٤٠٩٤٦، الموضوع : خطاب عبدالكريم قاسم في مؤتمر انصار السلام الموسع في الفترة ١٤ ـــ ١٧ نيسان ١٩٥٩، بتاريخ ٢١ / نيسان / ١٩٥٩ .

ـ العراق في الوثائق البريطانية ١٩٥٨ ــ ١٩٥٩، ١ كانون الثاني ــ ٣٠ حزيران ١٩٥٩، ترجمة وتعليق : ابراهيم حسين الزوبعي، ج(٣)، من منشورات بيت الحكمة، بغداد، ٢٠٠٠ .

ـ بيان ختامي لاجتماع المجلس الوطني لحركة انصار السلام في العراق، ١٦ ايلول ١٩٦٠ .

**دووه‌م / یاداشته‌كان** .

**ـ به‌ زمانی كوردی** .

ـ زرار سلێمان به‌گ ده‌رگه‌ڵه‌یی، بیره‌وه‌رییه‌كانم له‌ ساڵانی ١٩٤٣ ــ ١٩٧٧، چاپخانه‌ی ره‌هه‌ند، سلێمانی، ٢٠٠٧

ـ عیزه‌دین مسته‌فا ڕه‌سوڵ، به‌شێك له‌ یاداشته‌كانم، ده‌زگای حه‌مدی، سلێمانی، ٢٠٠٦، ب (١) .

ـ مارف خه‌زنه‌دار، ڕۆژگاری من دروست بوون ١٩٤٩ ــ ١٩٦٠، به‌رگ (٢)، چاپخانه‌ی حاجی هاشم، هه‌ولێر، ٢٠٠٩ .

ـ نه‌جمه‌دین مامۆ، بیره‌وه‌رییه‌كانی نه‌جمه‌دین مامۆ هه‌ریری، پێداچوونه‌وه‌ی : سلێمان شێخ محمد، به‌رگی (١)، چاپخانه‌ی رۆژهه‌ڵات، هه‌ولێر، ٢٠٠٩ .

**ـ به‌ زمانی عه‌ره‌بی** .

ـ حافظ قاضي، ذكريات (١)، مطبعة خاني، دهوك، ٢٠٠٦ .

ــ عصام عزيز شريف، مذكرات عزيز شريف، ٢٠١٠ . منشور في الموقع الالكتروني Home page of Dr.Issam Sharif . www.Issamasharif.com

ـ كريم احمد، المسيرة ـ صفحات من مذكرات كريم احمد، مطبعة شهاب، اربيل، ٢٠٠٦ .

ـ محسن دزه‌يی، احداث عاصرتها، حاوره : طارق ابراهيم شريف، ج(١)، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠١ .

ـ محمد مهدى كبة، مذكراتي في صميم الاحداث ١٩١٨ ــ ١٩٥٨، بيروت، ١٩٦١ .

ـ مذكرات بهاءالدين نوري، ط(٢)، مطبعة جامعة صلاح الدين، اربيل، ١٩٩٥ .

**سێیه‌م / چاوپێكه‌وتنه‌كان** .

ـ بهاءالدين نوري، له‌ ٢٤ی تشرینی یه‌كه‌می ٢٠٠٢ .

ـ حمدامین قادر حسن، له حوزەیرانی ١٩٩٤ .

ـ حیدر عوسمان، له ٢٢ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢ .

ـ رەشید عبدالقادر، له ٥ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢ .

ـ زرار سلێمان دەرگەڵەیی، له ٢٣ی تەمووزی ٢٠٠٩ .

ـ عزالدین مصطفی رسول، له ٢٢ی ئەیلولی ٢٠٠٣ .

ـ عزیز محمد، له ٢ی تشرینی دووەمی ٢٠١٠ .

ـ علی عبدالله ناسراو به (علی مەکتەبە)، له ٢٩ی ئابی ٢٠٠٣ .

ـ فتاح توفیق فتاح ناسراو به (مەلا حەسەن)، له ٤ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٣ .

ـ فؤاد عارف، له ١٩ی ئابی ٢٠٠٩ .

ـ کەریم ئەحمەد، له ١٠ی کانوونی دووەمی ٢٠١١ .

ـ مارف خەزنەدار، له ١١ی ئاداری ٢٠٠٩ .

ـ محەمەد مەلا قادر، له ٢٣ی کانونی یەکەمی ٢٠٠٢ .

ـ محەمەدی مەلا کەریم، له ٥ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢ .

ـ مستەفا عبدالله ناسراو به ( رەئیس مستەفا)، ٢١ی ئابی ٢٠٠٩ .

ـ ممتاز حیدری، له ١٦ی نیسانی ٢٠١١ .

ـ ناهیده شێخ سەلام، له ٢ی ئەیلولی ٢٠٠٣ .

ـ نوری وەسمان قەرەنی، له حوزەیرانی ١٩٩٤ .

**چوارەم / نامەی زانکۆیی .**

**ـ ماستەر .**

ـ مغدید حاجی أمین، عەزیز شەریف (١٩٠٤ ـ ١٩٩٠) ڕۆڵی سیاسی و هەڵوێستی بەرامبەر به مەسەلەی کورد، نامەی ماستەر ـ بلاونەکراوە، زانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر، کۆلێژی ئاداب، ٢٠١٠ .

ـ شوان محەمەد ئەمین تەها خۆشناو، هەولێر له نێوان ساڵانی ١٩٥٨ ـ ١٩٦٣، نامەی ماستەر ـ بلاونەکراوە، زانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر، کۆلێژی ئاداب، ٢٠٠٩ .

**پێنجەم / کتێبەکان .**

**ـ بە زمانی کوردی .**

ـ فـاتح رەسـولْ، بنـچینەی مێـژووی بیرۆکـەی چـەپ لـە کوردسـتان، چ(٢)، چـاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠٠٥.

ـ دیوانی گۆران، کۆکردنەوەو ئامادەکردنی : حەمەی مەلا کەریم، بەغدا، ١٩٨٠، بـەرگی یەکەم .

ـ غەفوری میرزا کەریم، چەند هەڵۆیەك لە خەرمانی نووسینەکانمدا، سلێمانی، ٢٠٠١ .

**ـ بە زمانی عەرەبی .**

ـ أوريل دان، العراق في عهد قاسم ـ تاريخ سياسي ١٩٥٨ -١٩٦٣، ت:جرجيس فتح اللـه، دار نبز للطباعة والنشر، السويد، ١٩٨٩.

ـ توفيق منير، حقيقة حركة السلام، ط(٢)، دار الفكر للطباعة والنشر، قاهرة، ١٩٥٦ .

ـ ثمينة نـاجي يوسـف و نـزار خالـد، سـلام عـادل ـ سـيرة مناضـل، دار المـدى للثقافـة والنشر، دمشق، ٢٠٠١، ج(١) .

ـ جعفر عباس الحميدي، التطورات السياسية في العراق ١٩٤١ ـ ١٩٥٣، النجف، ١٩٧٦ .

ـ جمال مصطفى مردان، عبدالكريم قاسم البداية والسقوط، دار العربيـة للطباعـة، بغـداد، ١٩٨٩ .

ـ حامد مصطفى مقصود، ثورة ١٤ تموز ـ مـدارات الأخـوة الأعـداء ـ الخلفيـات، الوقـائع، النهايات، وسيرة ذاتية، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٢ .

ـ حسن مصطفى، البارزانيون وحركات بارزان ١٩٣٢ ـ ١٩٤٧، ط(٢)، بغداد، ١٩٨٣ .

ـ حنا بطاطو، العراق (الكتاب الثالث ـ الشيوعيون والبعثيون والضباط الاحرار، ت:عفيـف الرزاز، تهران، ٢٠٠٦.

ـ خليل ابراهيم حسين، الصراع بين عبدالكريم قاسـم و الـشيوعيين وعبـدالوهاب وضـباط الموصل الوحدويين، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٩ .

ـ سعيد خديدة علـو، العلاقـات العراقيـة ـ الايرانيـة وأثرهـا في القـضية الكورديـة في العـراق ١٤تموز ١٩٥٨ ـ ٨ شباط ١٩٦٣، اربيل، ٢٠٠٦.

ـ صبحي عبدالحميد، اسرار ثورة ١٤ تموز في العراق، بغداد، ١٩٨٩، ١٣٦ .
ـ عبدالفتاح علي البوتاني، العراق ـ التطورات السياسية الداخلية ١٤ تموز ١٩٥٨ ـــ ٨ شباط ١٩٦٣، دار الزمان للطباعة والنشر، دمشق، ٢٠٠٨ .
ـ عبدالكريم فرحان، حصاد الثورة ـ مذكرات، تجربة السلطة في العراق ١٩٥٨ ـــ ١٩٦٨، لندن، ١٩٩٤ .
ـ محمد كاظم علي، العراق في عهد عبدالكريم قاسم ـ دراسة في القوى السياسية والصراع الايدولوجي ١٩٥٨ـ١٩٦٣، بغداد، ١٩٨٩.
ـ ميڤان عارف بادي، الحركة القومية الكوردية التحررية في كوردستان العراق، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٥.

**شەشەم / توێژینەوە و وتار .**

**ـ بە زمانی کوردی .**

صفاء الحافظ، یەکەمین کۆنگرەی ئاشتیخوازانی عێراق، بیری نوێ "گۆڤار"، ژ(٣٠٠)، تەمموزی ١٩٧٨ .
ــــ عمر ئاشتی، ژیان بە گەشەسەندن و پەرەسەندنی ئاشتی و دادپەروەری بەڕێوەدەچی، کۆڕی تێکۆشان "رۆژنامە"، ژ(٩)، تشرینی دووەم ٢٠٠٤.
ـ آشتی خوازان تێ ئەکۆشن بۆ آشتی و پاراستنی جمهوریەت، ژین"رۆژنامە"، ژ(١٤٥٣)، ١١/٦/ ١٩٥٩ .
ــــ هاوار، خۆپیشاندانە مەزنەکەی ئاشتیخوازانی عێراق گەورەترین هێزی گەل، ژین"رۆژنامە"، ژ(١٥٢١)،ساڵی (٣٥)، ١١/٤/ ١٩٥٩.

**ـ بە زمانی عەرەبی .**

احمد ناجي، انصار السلام مسيرة معطرة بذكريات الوطن، المدى "جريدة"، ع (٤٧٩)، ٢/٩/٢٠٠٥ .
مجلس السلم العالمي، تضامن "مجلة"، ع(٤)، كانون الثاني ٢٠٠٨ .

**حەوتەم / گۆڤار و ڕۆژنامەکان .**

**ـ بە زمانی کوردی .**

ـ ئازادی "رۆژنامە"، ژ(٥)، ٣١ی ئایاری ١٩٥٩ .

ــ خەبات "جريدة"، ع(٣٢٥)، السنة الثانية، ٢٩ /١٩٦٠/٩ ؛ ع(٣٢١)، السنة الثانية، ٢٥ /١٩٦٠/٩ ؛ ع(١٥٧)، السنة الاولى، ٢٩ /١/ ١٩٥٩ ؛ ع(١٢)، السنة الاولى، ١٦ /٦/ ١٩٥٩ ؛ ع(١٢١)، السنة الاولى، ١٦ /١٢/ ١٩٥٩ ؛ ع(٧٠)، السنة الاولى، ٢ /١٠/ ١٩٥٩ ؛ ع(٣٢)، السنة الاولى، ١٧ /٨/ ١٩٥٩ ؛ ع(٣١٨)، السنة الثانية، ٢١ /١٩٦٠/٩ ؛ ع(٣٥٠)، السنة الثانية، ١٩٦٠/١١/١ ؛ ع (٣١٧) ٢٠/ ٩ / ١٩٦٠ ؛ ع(١٣)، السنة الاولى، ٦ /٧/ ١٩٥٩ ؛ ع(٢٨)، السنة الاولى، ١١ /٨/ ١٩٥٩ ؛ ع(١٧)، السنة الاولى، ٢٣ /٧/ ١٩٥٩ ؛ ع (٤٠٢)، السنه الثانية، ٧ / ٥ / ١٩٦١ ؛ ع(١١٣)،١٠ كانون الاول ١٩٥٩ ؛ ع(١١٨)، السنة الاولى، ١٣ /١٢/ ١٩٥٩ ؛ ع(١١)، السنة الاولى، ١٩٥٩/٦/١٢ ؛ ع(١٧٨)، السنة الاولى، ٢ /٤/ ١٩٦٠ ؛ ع(١٠)، السنة الاولى، ٨ /٤/ ١٩٥٩ ؛ ع(٣٩٣)، السنة الثانية، ٢٦ / ١٢ / ١٩٦٠ ؛ ع(٤٠٢)، السنة الثانية، ٦ /١/ ١٩٦١ .

ــ ژین "رۆژنامە"، ژ(١٤٤١)، ساڵی (٣٤)، ٢٧ /٤/ ١٩٥٩ ؛ ژ(١٤٤٦)، ساڵی (٣٤)، ١٨ /٥/ ١٩٥٩ ؛ ژ(١٤٤٥)، ساڵی (٣٥)، ١٥ /٥/ ١٩٥٩ ؛ ژ(١٤٥١)، ساڵی (٣٥)، ٤ /٦/ ١٩٥٩ ؛ ژ(١٤٤٨)، ساڵی (٣٥)، ٢٥ /٥/ ١٩٥٩ ؛ ژ(١٤٤٧)، ساڵی (٣٥)، ٢١ /٥/ ١٩٥٩ ؛ ژ(١٤٥٣)، ساڵی (١٥)، ١١ / ٦ / ١٩٥٩ ؛ ژ(١٥٠٤)، ساڵی (٣٥)، ٢١ / ١ / ١٩٦٠ ؛ ژ(١٤٥٤)، ساڵی (٣٤)، ١٥/٦/ ١٩٥٩ ؛ ژ(١٥١٥)، ساڵی (٣٥)، ١٧/٣/ ١٩٦٠ ؛ ژ(١٤٥٧)، ساڵی (٣٤)، ٢ /٧/ ١٩٥٩ ؛ ژ(١٦٨٢)، ساڵی (٣٧)، ٢٨ /٦/ ١٩٦٢ ؛ ژ(١٤٦٥)، ساڵی (٣٤)، ١٧ /٨/ ١٩٥٩ ؛ ژ(١٥٠٦)، ساڵی (٣٥)، ٢٨ / ١ / ١٩٦٠ ؛ ژ(١٤٧٩)، ساڵی (٣٤)، ١٠/١٠/ ١٩٥٩ ؛ ژ(١٤٦٣)، ساڵی (٣٤)، ٦ /٨/ ١٩٥٩ .

ــ شارەوانی سلێمانی "گۆڤار"، ژ(٧٦)، تشرینی دووەم ٢٠٠٦ .

ــ هەتاو"گۆڤار"، ژ(١٦٧)، ١٥ کانونی یەکەمی ١٩٥٩ .

**ــ بە زمانی عەرەبی .**

ــ اتحاد الشعب"جريدة"، ع (١٤)، ١٩٥٩/٢/٩ .

ــ وطننا "مجلة"، ع(١)، السنة الاولى، ١٥ /٢/ ١٩٥٩ .

ــ الوقائع العراقية "جريدة"، ع(٢٨٣)، ٢ /١٩٦٠/١ .

# پەراوێزەکان

[١] توفيق منير، حقيقة حركة السلام، ط(٢)، دار الفكر للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٥٦، ص ١٢ .

[٢] المصدر نفسه، ص ١٢ ــ ١٣ .

[٣] جعفر عباس الحميدي، التطورات السياسية في العراق ١٩٤١ ــ ١٩٥٣، النجف، ١٩٧٦، ص ٦٦٥ .

[٤] صفاء الحافظ، یەکەمین کۆنگرەی ئاشتیخوازانی عێراق، بیری نوێ "گۆڤار"، ژ(٣٠٠)، تەمموزی ١٩٧٨، ل ٢ .

[٥] چاوپێکەوتنێك لەگەڵ عەزیز محەمەد، لە٢ی تشرینی دووەمی ٢٠١٠ ؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ کەریم ئەحمەد، لە ١٠ی کانوونی دووەمی ٢٠١١.

[٦] ئەم کۆنگرەیە بە شێوەیەکی نهێنی لە ماڵی ( ئەحمەد جەعفەر چەلەبی) لە شاری بەغدا بەسترا . بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: توفيق منير، المصدر السابق، ص ١١ ــ ١٣ ؛ ثمينة ناجي يوسف و نزار خالد، سلام عادل ــ سيرة مناضل، ج(١)، دار المدى للثقافة والنشر، دمشق، ٢٠٠١، ص ٨٢ ــ ٨٣ ؛ مجلس السلم العالمي، تضامن "مجلة"، ع (٤)، كانون الثاني ٢٠٠٨، ص ٤٦ ــ ٤٧ .

[٧] صفاء الحافظ، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣ .

[٨] ثمينة ناجي يوسف و نزار خالد، المصدر السابق، ص ٨٢ ــ ٨٣ .

[٩] مذكرات بهاءالدين نوري، ط(٢)، مطبعة جامعة صلاح الدين، اربيل، ١٩٩٥، ص٨٨ .

[١٠] مذكرة انصار السلم في العراق في ١٣ /١١/ ١٩٥٢، الملف العراقي"مجلة "، عدد (١٤٤ــ ١٤٥)، ايلول ـ تشرين الثاني ٢٠٠٥، ص ٢٣.

[١١] بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی چالاکییەکانی ئاشتیخوازانی کورد تا ساڵی ١٩٥٨ بڕوانە : المصدر نفسه، ص ٢٢ ــ ٢٣ ؛ احمد ناجي، انصار السلام مسيرة معطرة بذكريات الوطن، المدى"جريدة"، ع (٤٧٩)، ٢٠٠٥/٩/٢ ؛ محمد مهدي كبة، مذكراتي في صميم الاحداث ١٩١٨ ــ ١٩٥٨، بيروت، ١٩٦١، ص ٣٤٤ــ ٣٤٥ ؛ دیوانی گۆران، کۆکردنەوەو ئامادەکردنی : حەمەی مەلا کەریم، بەرگی (١)، بەغدا، ١٩٨٠، ل٤١٣ .

[١٢] د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، مديرية التحقيقات الجنائية، موضوع : تقرير خاص عن انصار السلام، في ١٩ كانون الاول ١٩٥٣ .

[١٣] غفوری میرزا کەریم، چەند هەڵۆیەك لە خەرمانی نووسینەکانمدا، چاپخانەی ڕەهەند، سلێمانی، ٢٠٠١، ل١١ .

(١٤) محمد كاظم علي، العراق في عهد عبدالكريم قاسم ـ دراسة في القوى السياسية والصراع الايدولوجي ١٩٥٨ــ١٩٦٣، بغداد، ١٩٨٩، ص١٣٣. دەربارەی دەقی یاساکه بڕوانه : الوقائع العراقية "جريدة"، ع(٢٨٣)، ٢ /١٩٦٠/١ .

(١٥) بڕوانه دەقی وتارەکه له : خەبات "جريدة"، ع (١٧٨)، السنة الاولى، ٢ /٤/ ١٩٦٠ .

(١٦) عبدالفتاح علي البوتاني، العراق ـ التطورات السياسية الداخلية ١٤ تموز١٩٥٨ ــ ٨ شباط ١٩٦٣، دار الزمان للطباعة والنشر، دمشق، ٢٠٠٨، ص ١٤٥.

(١٧) عصام عزيز شريف، مذكرات عزيز شريف، ص ٦٤ . في Home page of Dr.Issam Sharif . www.Issamasharif.com ؛ ژین "ڕۆژنامە"، ژ(١٤٤١)، ساڵی (٣٤)، ٢٧ /٤/ ١٩٥٩ .

(١٨) عمر ئاشتی، ژیان به گەشەسەندن و پەرەسەندنی ئاشتی دادپەروەری بەڕێوه دەچی "کۆری تێکۆشان" ڕۆژنامە، ژ(٩)، تشرینی دووەم ٢٠٠٤ ،ل٤.

(١٩) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ ناهیده شێخ سەلام، له ٢ی ئەیلولی ٢٠٠٣ .

(٢٠) خەبات "جريدة"، ع (١٠)، السنة الاولى، ٨ /٤/ ١٩٥٩ .

(٢١) السفارة البريطانية / بغداد، رقم الوثيقة : ٣٧١ / ١٤٠٩٤٦، الموضوع : خطاب عبدالكريم قاسم في مؤتمر انصار السلام الموسع في الفترة ١٤ ــ ١٧ نيسان ١٩٥٩، بتاريخ ٢١ / نيسان / ١٩٥٩ . وەرگیراوه له : العراق في الوثائق البريطانية ١٩٥٨ ــ ١٩٥٩، ١ كانون الثاني ــ ٣٠ حزيران ١٩٥٩، ترجمة وتعليق : ابراهيم حسين الزوبعي، ج(٣)، من منشورات بيت الحكمة، بغداد، ٢٠٠٠، ص ٢٢٣.

(٢٢) بڕوانه ئامانجەکانی کۆنگرەی یەکەم له : ثمينة ناجي يوسف و نزار خالد، المصدر السابق، ص٨٣ .

(٢٣) خەبات "جريدة"، ع (١٠)، السنة الاولى، ١٩٥٩/٤/٨ .

(٢٤) مذكرات عزيز شريف، ص٦٤ ؛ أوريل دان، العراق في عهد قاسم ــ تاريخ سياسي ١٩٥٨ ــ ١٩٦٣، ت : جرجيس فتح الله، دار نبز للطباعة والنشر، السويد، ١٩٨٩، ص٢٥٠ .

(٢٥) العراق في الوثائق البريطانية ١٩٥٨ ــ ١٩٥٩، ص ٢٢٥ ــ ٢٢٨ .

(٢٦) المصدر نفسه، ص ٢٢٥ .

(٢٧) بڕوانه دەقی ڕاپۆرتی کۆبوونەوەکه له : خەبات "جريدة"، ع (٣٩٣)، السنة الثانية، ٢٦ / ١٢ / ١٩٦٠ .

(٢٨) خەبات "جريدة"، ع(١١)، السنة الاولى، ١٩٥٩/٦/١٢، چاوپێکەوتنێك لەگەڵ کەریم ئەحمەد، له ١٠ ی کانونی دووەمی ٢٠١١ .

(٢٩) شارەوانی سلێمانی "گۆڤار"، ژ (٧٦)، تشرینی دووەم ٢٠٠٦، ل٤ .

(۳۰) ژین "رۆژنامه"، ژ(١٤٤٦)، ساڵی (٣٤)، ١٨ /٥/ ١٩٥٩ .

(۳۱) ژین "رۆژنامه"، ژ(١٤٤٥)، ساڵی (٣٥)، ١٥ /٥/ ١٩٥٩ .

(۳۲) خەبات "جريدة"، ع(٢٨)، السنة الاولى، ١١ /٨/ ١٩٥٩ .

(۳۳) خەبات "جريدة"،ع(١١٨)، السنة الاولى، ١٣ /١٢/ ١٩٥٩ .

(۳٤) ژین "رۆژنامه"،ژ(١٤٥١)، ساڵی (٣٥)، ٤ /٦/ ١٩٥٩ .

(۳٥) ژین "رۆژنامه"، ژ(١٤٤٨)، ساڵی (٣٥)، ٢٥ /٥/ ١٩٥٩ .

(۳٦) ژین "رۆژنامه"، ژ(١٤٤٧)، ساڵی (٣٥)، ٢١ /٥/ ١٩٥٩ ؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ عیزەدین مصطفى رسول، لە ٢٢ی ئەیلولی ٢٠٠٣؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ بهاءالدین نوری، لە ٢٤ی تشرینی یەکەم ٢٠٠٣.

(۳۷) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ علی عبدالله ناسراو بە (علی مەکتەبە)، لە ٢٩ی ئابی ٢٠٠٣ ؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ فتاح توفیق فتاح ناسراو بە (مەلا حەسەن)، لە ٤ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٣ .

(۳۸) ژین "رۆژنامه"، ژ(١٤٥٣)، ساڵی (٣٥)، ١١ / ٦ / ١٩٥٩ .

(۳۹) وطننا "مجلة"، ع(١)، سنة (١)، ١٥ شباط ١٩٥٩، ص ١ .

(٤٠) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە : وطننا "مجلة"، ع(١ ــ٨)، لسنة ١٩٥٩ .

(٤١) عبدالفتاح علي، المصدر السابق، ص١٤٥ .

(٤٢) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە : ئەو ژمارانەی کە لە ساڵانی ١٩٥٩ ــ ١٩٦٠ ــ ١٩٦١ دەرچووە .

(٤٣) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ ناهیدە شێخ سەلام، لە ٢ی ئەیلولی ٢٠٠٣ .

(٤٤) ژین "رۆژنامه"، ژ(١٥٠٤)، ساڵی (٣٥)، ٢١ / ١ / ١٩٦٠ .

(٤٥) مذكرات عزيز شريف، ص ٢٠٤ .

(٤٦) مغدید حاجی أمین، عەزیز شەریف (١٩٠٤ ــ ١٩٩٠) ڕۆڵی سیاسی وهەڵوێستی بەرامبەر بە مەسەلەی کورد، نامەی ماستەر ــ بڵاونەکراوە، زانکۆی سەلاحەدین ــ هەولێر، کۆلێژی ئاداب، ٢٠١٠، ل ٨٥ .

(٤٧) تقرير السفارة البريطانية ــ بغداد، ٢١ / نيسان / ١٩٥٩ .

(٤٨) خەبات "جريدة"، ع(٤٠٢)، السنة الثانية، ٦ /١/ ١٩٦١ .

(٤٩) حنا بطاطو، العراق (الكتاب الثالث - الشيوعيون والبعثيون والضباط الاحرار، ت:عفيف الرزاز، تهران، ٢٠٠٦، ص١٩٣ . لە کاتی گەیشتنی ئاشتیخوازان لە شارەکانی تر بۆ شاری موسڵ دوای بەڕێکەوتنیان لە وێستگەی شەمەندەفەر بەرەو یاریگای موسڵ لە ناو ئاپۆرایەکی جەماوەری ئەم هۆنراوەیان دەوتەوە :

أهل الموصل ياكرام     احنه انصار السلام

مدينة موصل                فدوه لابن قاسم

بڕوانە : جمال مصطفى مردان، عبدالكريم قاسم البداية والسقوط، دار العربية للطباعة، بغداد، ١٩٨٩، ص٨٨ .

[٥٠] خليل ابراهيم حسين، الصراع بين عبدالكريم قاسم والشيوعيين وعبدالوهاب وضباط الموصل الوحدويين، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٩، ص١٥٠.

[٥١] اشتى خوازان تێ ئەكۆشن بۆ اشتى و پاراستنى جمهوريەت، ژين"رۆژنامە"، ژ(١٤٥٣)، ١١/٦/ ١٩٥٩ .

[٥٢] عبدالكريم فرحان، حصاد الثورة ـ مذكرات، تجربة السلطة في العراق ١٩٥٨ـ١٩٦٨، لندن، ١٩٩٤، ص ٢٤؛عبدالفتاح علي، المصدر السابق، ص٢١٨.

[٥٣] ميڤان عارف بادى، الحركة القومية الكوردية التحررية في كوردستان العراق، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٥، ص٧٤ .

[٥٤] بڕوانە : حنا بطاطو، المصدر السابق، ص ١٩٢ ــ ١٩٣ ؛ خليل ابراهيم، المصدر السابق، ص ١٥١ .

[٥٥] صبحى عبدالحميد، اسرار ثورة ١٤ تموز في العراق، بغداد، ١٩٨٩، ص ١٣٦ ؛ حامد مصطفى مقصود، ثورة ١٤ تموز ـ مدارات الأخوة الأعداء ـ الخلفيات، الوقائع، النهايات، وسيرة ذاتية، مطبعة وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٢، ص٢٦٢ .

[٥٦] بڕوانە دەقى وتارەكە لە : اتحاد الشعب"جريدة"، ع (١٤)، ١٩٥٩/٢/٩ .

[٥٧] حافظ قاضى، ذكريات (١)، مطبعة خانى، دهوك، ٢٠٠٦، ص٩١ ؛ چاوپێكەوتنێك لەگەڵ فؤاد عارف، لە ١٩ى ئابى ٢٠٠٩. ؛ چاوپێكەوتنێك لەگەڵ مستەفا عبدالله ناسراو بە ( رەئيس مستەفا)، ٢١ى ئابى ٢٠٠٩.بڕوانە بەياننامەكە لە: خليل ابراهيم حسين، المصدر السابق، ص١٧٣ـ ١٧٦.

* لە سالى ١٩١٤ لە شارى هەولێر لەدايك بووە، دواتر لە موسڵ ژيانى بەسەر بردووە و لەم شارە خوێندنى تەواو كردووە و تا سالى ١٩٧٦ وەك مامۆستا لە پەيمانگاى ئيسلامى وانە دەڵێتەوە، لە ئابى ١٩٨٣ مردووە . عبدالفتاح على يحيى البوتاني، المصدر السابق، ص٢٢٦ .

[٥٨] شوان محەمەد ئەمين تەها خۆشناو، هەولێر لە نێوان سالآنى ١٩٥٨ ــ ١٩٦٣، نامەى ماستەر ــ بلأونەكراوە، زانكۆى سەلاحەدين ــ هەولێر، كۆلێژى ئاداب، ٢٠٠٩، ل ٥٦ .

[٥٩] هەمان سەرچاوە، ل ٥٧ .

[٦٠] چاوپێكەوتنێكى تۆماركراو لەگەڵ حمدامين قادر حسن و نورى وەسمان قەرەنى، حوزەيرانى ١٩٩٤ . ئەرشيفى تەلەفزيۆنى ئازادى ـ هەولێر.

(٦١) نەجمەدین مامۆ، بیرەوەرییەکانی نەجمەدین مامۆ هەریری، پێداچوونەوەی:سلێمان شێخ محمد، بەرگی(١)، چاپخانەی رۆژهەلات، هەولێر، ٢٠٠٩، ل١٠١.

(٦٢) محسن دزەیی، احداث عاصرتها، حاوره : طارق ابراهیم شریف، ج(١)، مطبعة وزارة التربیة، اربیل ،٢٠٠١، ص١٧٧ .

(٦٣) عیزەدین مستەفا ڕەسولّ، بەشێك لە یاداشتەکانم، ب (١)، دەزگای حەمدی، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل١٣٣ ــ ١٣٦.

(٦٤) ژین"رۆژنامە"، ژ(١٤٥٤)، سالّی (٣٤)، ١٥/٦/ ١٩٥٩ .

* لە ناوچەی برادۆست لە دایك بووە و پێشرەوی ئاینی هۆزی برادۆست بوو، لە شۆڕشەکانی بارزان لە سالأنی ١٩٤٣ ــ ١٩٤٥ لایەنگری حکومەتی پاشایەتی دەکات، دوای لەناوبردنی یاخیبوونەکەی پەنا دەباتە ولأتی ئێران دواتر لە هەمان سالّدا دوای لێبوردنی لە لایان عبدالکریم قاسم دەگەڕێتەوە عێراق و لە ناوچەکەی خۆیدا دەمێنێتەوە . بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە : حسن مصطفی، البارزانیون وحرکات بارزان ١٩٣٢ ــ ١٩٤٧، ط(٢)، بغداد، ١٩٨٣، ص٢٦ ــ ٢٧ ؛ میڤان عارف، المصدر السابق، ص ٧١ .

(٦٥) بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەم یاخیبوونە بڕوانە : سعید خدیدة علو، العلاقات العراقیة ـ الایرانیة وأثرها في القضیة الکوردیة في العراق ١٤ تموز ١٩٥٨ ــ ٨ شباط ١٩٦٣، اربیل، ٢٠٠٦، ص١٦٣ــ ١٧٣ .

(٦٦) خەبات "جریدة"، ع(١١)، السنة الاولى، ١٢ /٦/ ١٩٥٩ ؛ شوان محەمەد ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٣ .

(٦٧) شوان محەمەد ئەمین، سەرچاوەی پێشوو، ل٦٤ .

(٦٨) د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقیة، الموضوع : الذکرى الاولى لنضال الموصل ضد مؤامرة زمرة الشواف، بتاریخ ٩ / ٣ / ١٩٦٠ .

(٦٩) ژین"رۆژنامە"، ژ(١٥١٥)، سالّی (٣٥)، ١٧ی ئاداری ١٩٦٠، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە : مغدید حاجی أمین، سەرچاوەی پێشوو، ل٨٥ .

(٧٠) هاوار، خۆپیشاندانە مەزنەکەی ئاشتیخوازانی عێراق گەورەترین هێزی گەل ، ژین"رۆژنامە"، ژ(١٥٢١)، سالّی (٣٥)، ١١ /٤/ ١٩٥٩ .

(٧١) د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقیة، بیان مجلس السلم في الجمهوریة العراقیة، ١٥ / تشرین الاول / ١٩٥٩ .

(٧٢) خەبات "جریدة"، ع (١١٣)، السنة الاولى، ١٠ کانون الاول ١٩٥٩ .

(٧٣) هەتاو"گۆڤار"، ژ(١٦٧)، ١٥ کانونی یەکەمی ١٩٥٩، شوان محەمەد ئەمین تەها خۆشناو، هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٩٥٨ ــ ١٩٦٣، نامەی ماستەر ــ بڵاونەکراوە، زانکۆی سەلاحەدین ــ هەولێر، کۆلێژی ئاداب، ٢٠٠٩، ل ٧٦ .

(٧٤) د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، بيان انصار السلام في كركوك، تشرين الاول ١٩٥٩ .

(٧٥) ژین"رۆژنامە"، ژ(١٤٧٩)، ساڵی (٣٤)، ١٠/١٠/ ١٩٥٩ .

(٧٦) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە : عبدالفتاح على البوتاني، المصدر السابق، ص ٤١٥ــ ٤٢٧ ؛ مارف خەزنەدار، ڕۆژگاری من دروست بوون ١٩٤٩ ــ ١٩٦٠، بەرگ (٢)، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠٠٩، ل٢٧٩ ــ ٢٨٤ .

(٧٧) د.ك.و.ع، الوحدة الوثائقية، رقم : س / ٩٦، الموضوع : نشاطات حركة انصار السلام، تقرير شهر آذار / ١٩٦٠ .

(٧٨) خەبات "جريدة"، ع (٤٠٢)، السنة الثانية، ٧ / ٥ / ١٩٦١ .

(٧٩) مذكرات عزيز شريف، ص ٢٠٤ .

(٨٠) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ بهاءالدين نورى، لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢ ؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ محمدی مەلا کەریم، لە ٥ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٢ ؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ مستەفا عبدالله ناسراو بە ( رەئیس مستەفا)، ٢١ی ئابی ٢٠٠٩ .

(٨١) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ مارف خەزنەدار، لە ١١ی ئاداری ٢٠٠٩ ؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ عزيز محمد، لە ٢ی تشرینی دووەمی ٢٠١٠ .

(٨٢) مذكرات عزيز شريف، ص ٦٦ .

(٨٣) چاوپێکەوتنێك لەگەڵ محەمەد مەلا قادر، لە ٢٣ی کانونی یەکەمی ٢٠٠٢ ؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ کريم احمد، لە ١٠ی کانوونی دووەمی ٢٠١١

(٨٤) كريم احمد، المسيرة ـ صفحات من مذكرات كريم احمد، مطبعة شهاب، اربيل، ٢٠٠٦، ص١٥٤؛چاوپێکەوتنێك لەگەڵ فؤاد عارف، لە ١٩ی ئابی ٢٠٠٩.

(٨٥) مذكرات عزيز شريف، ص ٢١٣ .

(٨٦) الثقافة الجديدة "مجلة "، ع(٩ ــ ١٠)، تموز ــ اب ١٩٨٨، ص ٩٥ ؛ چاوپێکەوتنێك لەگەڵ رەشید عبدالقادر، لە ٥ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٢ .

(٨٧) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: عبدالفتاح علي البوتاني، المصدر السابق، ص٣٥١ ـ ٣٥٢ ؛ فاتح رەسوڵ، بنچینەی مێژووی بیرۆکەی چەپ لە کوردستان، چ(٢)، چاپخانەی چوارچرا، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٣٣٥ .

(٨٨) ژین "رۆژنامە"، ژ(١٤٦٣)، ساڵی (٣٤)، ٦ /٨/ ١٩٥٩ .

[٨٩] خەبات "جريدة"، ع(١٧)، السنة الاولى، ٢٣ /٧/ ١٩٥٩؛ چاوپێكەوتنێك لەگەڵ حيدر عوسمان، لە ٢٢ی تشرينی دووەمی ٢٠٠٢ ؛چاوپێكەوتنێك لەگەڵ ممتاز حيدری، لە ١٦ی ئەيلولی ٢٠١١ .

[٩٠] خەبات "جريدة"، ع(٢٨)، السنة الاولى، ١١ /٨/ ١٩٥٩ .

[٩١] ژين "رۆژنامە"، ژ(١٤٤٦)، ساڵی (٣٤)، ١٨ /٥/ ١٩٥٩ .

[٩٢] خەبات "جريدة"، ع(١٣)، السنة الاولى، ٦ /٧/ ١٩٥٩ ؛ چاوپێكەوتنێك لەگەڵ زرار سلێمان دەرگەڵەيی، لە ٢٣ی تەمموزی ٢٠٠٩ ؛ چاوپێكەوتنێك لەگەڵ علی مەكتەبە، لە ٢٩ی ئابی ٢٠٠٣ .

[٩٣] بۆ زانياری زياتر بڕوانە دەقی ياداشتەكە لە : ژين "رۆژنامە"، ژ(١٦٨٢)، ساڵی (٣٧)، ٢٨ /٦/ ١٩٦٢ .

[٩٤] هەر يەك لە (ثمينة ناجی و شاكر ال جريو، اسماعيل رشيد، ناجی يوسف، پارێزەر مظهر فهمي العزاوي و مهدی حميد) ئەندامی شاندەكە بوون . زرار سلێمان بەگ دەرگەڵەيی، بيرەوەرييەكانم لە ساڵانی ١٩٤٣ ــ ١٩٧٧، چاپخانەی رەهەند، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل٢٢٩ ــ ٢٣٠ . بڕوانە وێنەی يادەوەری ئەم شاندە لەگەڵ خرۆشوف لە : خليل ابراهيم حسين، المصدر السابق، ص٢٨٨ .

[٩٥] خەبات " جريدة "، ع(٧٠)، السنة الاولى، ٢ /١٠/ ١٩٥٩ .

[٩٦] خەبات "جريدة"، ع (٣١٧)، السنة الثانية، ٢٠/ ٩ / ١٩٦٠ .

[٩٧] خەبات "جريدة"، ع(٣٢)، السنة الاولى، ١٧ /٨/ ١٩٥٩ .

[٩٨] ژين "رۆژنامە"، ژ(١٥٠٦)، ساڵی (٣٥)، ٢٨ / ١ / ١٩٦٠ .

[٩٩] ژين "رۆژنامە"، ژ(١٤٦٥)، ساڵی (٣٤)، ١٧ /٨/ ١٩٥٩ .

[١٠٠] بڕوانە دەقی وتارەكە لە : خەبات "جريدة"، ع(٣١٨)، السنة الثانية، ٢١ /٩/١٩٦٠ .

[١٠١] بڕوانە دەقی وتارەكە لە : خەبات "جريدة"، ع(٤٤١)، السنة الثانية، ٢٦ /٢/ ١٩٦١ .

[١٠٢] خەبات "جريدة"، ع(٣٥٠)، السنة الثانية، ١ /١١/١٩٦٠ .

[١٠٣] بەياننامەی لێژنەی ئاشتيخوازانی كۆيە، ١٩٥٩ .

[١٠٤] ژين"رۆژنامە"، ژ(١٤٤٥)، سالی (٣٤)، ١٥/٥/ ١٩٥٩ .

[١٠٥] خەبات "جريدة"، ع(١٢)، السنة الاولى، ١٦ /٦/ ١٩٥٩ .

[١٠٦] خەبات "جريدة"، ع(١٢١)، السنة الاولى، ١٦ /١٢/ ١٩٥٩ .

[١٠٧] بيان ختامي لاجتماع المجلس الوطني لحركة انصار السلام، ١٦ ايلول ١٩٦٠. بڕوانە : خەبات "جريدة"، ع(٣٢١)، السنة الثانية، ٢٥ /٩/١٩٦٠.

[١٠٨] بەياننامەی لێژنەی ئاشيخوازنی شارەزور، حوزەيرانی ١٩٥٩ .

(١٠٩) رسالة الى مجلس السلم الوطني العراقي، من (مانوئيل سانشيزاركاس) عضو مجلس السلم العالمي، فينا، بتاريخ ١ /٩/ ١٩٥٩ . وه‌رگیراوه‌ له‌: خه‌بات "جريدة"، ع(٧٠)، السنة الاولى، ٢ /١٠/ ١٩٥٩ .

(١١٠) خه‌بات "جريدة"، ع(١٥٧)، السنة الاولى، ٢٩ /١/ ١٩٥٩ .

(١١١) بڕوانه‌ ده‌قه‌كه‌ی له‌ : ژین "رۆژنامه‌"، ژ(١٤٥٧)، سالی (٣٤)، ٢ /٧/ ١٩٥٩ .

(١١٢) برقية حركة السلم العالمي الى حركة انصار السلام في العراق، ايلول ١٩٦٠.وه‌رگیراوه‌ له‌: خه‌بات"جريدة"، ع(٣٢٥)، السنة الثانية، ٢٩ /٩/١٩٦٠.

(١١٣) بڕوانه‌ ژماره‌كانی ئه‌م دوو رۆژنامه‌یه‌ له‌ سالانی ١٩٥٩، ١٩٦٠، ١٩٦١ .

## ملخص البحث باللغة العربية

تعد الحقبة التأريخية بعد قيام ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ واعلان الجمهورية في العراق مرحلة مهمة في تاريخ الحركات والمنظمات الجماهيرية في العراق بشكل عام وكوردستان العراق بشكل خاص، تعتبر حركة انصار السلام من احدى هذه الحركات الجماهيرية التي لعبت دورا هاماً في العهد الجمهوري الاول ١٩٥٨ ــ ١٩٦٣ .

تطرقت في مقدمة هذا البحث الى أهمية هذه الدراسة وجدواها واسباب اختيار الموضوع مع الاشارة الى المعلومات التي صادفتها اثناء اعداد البحث والمصادر والمراجع التى اعتمدها والتي اغنت جوانب البحث .

شمل التمهيد نبذة تاريخية مختصرة عن دور الكرد في تأسيس هذه الحركة مع اشارة الى دورها في نشاطات الحركة خلال سنوات ١٩٥٠ ــ ١٩٥٨ في العهد الملكي، تناول المحور الاول دور الكرد في مؤتمرى الثاني والثالث للحركة التي انعقد في بغداد و أهم نتائجه، مع لجان التي تشكل في مدن والاقضية الكردية مثل اربيل وسليمانية وكركوك وهلبجة ودهوك . اما المحور الثاني تناول فيها دور الكرد في هذه النشاطات التى شملت المظاهرات الجماهيرية التي اقيمت في المدن العراقية مثل الموصل وبغداد و اصدار البيانات والمذكرات التي صدر من لجان السلام في كردستان الى الجهات العليا في الدولة وسفارات والقنصليات الاجنبية في العراق، اضافة الى ذلك اعطاء صورة واضحة عن دورهم في مهرجانات واحتفاليات في مدن كردستان بمناسبات عديدة .

واحتوت خاتمة البحث على الاستنتاجات التي توصلت اليها من خلال دراستي فيه عن دور الكرد في هذه الحركة خلال تلك الفترة وقمت بايجازها بشكل نقاط .

وختاما ارجو ان اكون قد وفقت في اعطاء صورة واضحة عن دور الكرد في حركة انصار السلام في العراق في مرحلة مهمة في تاريخه النضالي بين عامي ١٩٥٨ ــ ١٩٦٣ .

ولله ولي التوفيق ...

## Abstract

They years that following the revolution of 14th July 1958 and the declaration of republic in Iraq was an important era in the history of mass movements and Organizations in Iraq generally , and Iraqi Kurdistan especially . The movement of Peace Partisans ( Ansar al – salam) considered one of those mass movements that played a prominent role in the first Republican era 1958 – 1963 .

This article divided in to an introduction and two topics . The introduction is a short historical review of the role of the Kurds in establishing the above mentioned movement and their role in its activities during the year 1950 – 1958 . the first topic dealt with the role of the Kurds in the 2nd and 3rd confernces of the movement held in Baghdad and its results , and the committees established in Kurdish cities and towns like Erbil , Sulymania , Kirkuk , Halabja and Dohuk .

The second topic tackles the Kurdish role in the activities of the movement , which included mass demonstrations in Iraqi cities Mosul and the Baghdad and issuing manifestos and memorandums from peace committees in Kurdistan to high officials in the Iraqi states and foreign embassies and consulates in Iraq . This topic illustrates the role of the Kurds in the celebrations and festivals of the peace partisans movement in the Kurdish cities .

The article ends with conclusion .

# لێکۆڵینەوەیەکی شوێنەواری لەسەر گۆڕستانی (کول تاریکە) ی پارێزگای کوردستان (سەنەندج) لە ڕاپۆرتێکدا

**کەمال نوری مەعروف**
**لە فارسییەوە گۆڕیویەتی**

پـایزی ١٣٧٩ وەرزێکـی نـوێ لـە کـاری کنـەو پـشکنینی شـوێنەواری لـە ئەشکەوتی (کەرەفتو) لە پارێزگای کوردستان دەستی پێکرد . ئامـانج لەمـەدا بـۆ زیاتر زانین و ڕۆشنکردنەوەی ئەشکەوتی (کەرەفتو) بوو لە سەردەمە جیاجیاکانی فەرهەنگیدا ، هـەروەها بـۆ بەدەستخستنی سامانی ئەشـکەوتەکەو کۆکردنـەوەی پاشماوەکانیشی بوو . لەلایەکی تریشەوە بۆ کۆکردنەوەی فەرهەنگی ناوچەکە بوو بەهۆی کاری کنەو پشکنینەوە کـە لەچـواردەوریا لـەوەرزی یەکەمـداو لەسـنووری باکوریدا ئەجامدرا . دوو کاری شـوێنەواری تـریش هـەر لـەو وەرزەدا لـە باشـوورو خۆرئاوایداو یەکێکی تـریش لـە دەوروبـەری گۆڕسـتانی (٥) کیلۆمـەتری باشـووری خۆرهـەڵاتی ئەشـکەوتی (کـەرەفتو) بـەجێ گـەیانران . لـە مـانگی مـەهری ١٣٨٠ وەرزی دووەمی لێکۆڵینەوە جگە لەگەڕان و پشکنین لە ئەشـکەوتی (کـەرەفتو) دا لەو زەوییانەی دەوروبەری (کانی میکائیل) یش وەکو (بەلەك ئـاوی) و (کونـەدەو) (کول تاریکە)ش دەستی پێکرد . ئەنجامەکانی ئەو کنەو پشکنینانەی ئەشـکەوتی (کانی میکائیل) ئەو بەڵگە گرنگانەی نەبوو کـە لەسـەر گۆڕسـتانی (کـول تاریکـە) دەرکەوت چونکە ئەمەی دوایی زیانی لێ کەوتبوو بـەهۆی هـەڵکۆڵینی نایاسـایی و مۆڵـەت نـەدراو ، ئـەوەبوو ئـەنجامی کارەکـەی چـاپ کـراو بلاوکرایـەوە. کنـەو پـشکنینی شـوێنەواری جـارێکی تـر لـەئازەری ١٣٨٢ لـەو شـوێنەوارەدا دەسـتی پێکـردەوە و لەکۆتاییـدا ڕاپـۆرتی کارەکـانی هـەردوو وەرزی کنـەو پـشکنینەکەی لەخۆ گرت.

**شـوێن و چـۆنێتی دۆزینـەوەی و دەوروبەرەكـەی** : گۆڕسـتانی (كـول تاریكـە) دەكەوێتـە باشـووری خۆرئـاوای گونـدی (یوزبـاش كنـدی) لـەدەوری كیلۆمـەترێك لێـوەی . یەكـەمین كـاری لێكۆڵینـەوەی شـوێنەواری كـە لـە ئـەترافی ئەشـكەوتی كەرەفتو واتە لەم شـوێنەوارەدا ئەنجامـدرا بـۆ پـایزی ١٣٧٩ دەگەڕێتـەوە بـەهۆی كاری نایاسایی بوو لەسەری كە تیایدا كرابوو ژمارەیەك چاڵ كرابووە ڕووبەرەكـەی و لەتە گۆزەش لەناویا بلاو بوو .

بەشێك لە ڕووبەری ناوچەی گۆڕستانەكەی (كول تاریكە) پێكهاتووە لە تەپەی بەرزو لووتكەی بڵند كە بەدەشتەكەوە پەیوەستن و تیایدا بەرچاو دەكـەون . ئـەم ناوچەیە لەبەرئەوەی لەڕووی دەریاوە بەرزییەكەی دەگاتە دوو هەزار مـەتر بـارانی زۆری لە پایز و زستان و بەهاردا لێ دەبارێ . ئەم بارانەش لەوەرگای دەوڵەمەنـدو پاوانی دەوڵەمەند لە ناوچەكەدا دەخاتەوە بە جۆرێك بەشـێك لـەو پاوانـە بۆچـەند مـانگی زسـتان لـەپاشماوەی وەرزەكانـدا دەبێتـە سەرچـاوە بـۆ ئـالیكی ئـاژەڵی خەڵكی ناوچەكە . لەگەڵ ڕادەی باران بارینی زۆریـش لـەم ناوچـەیەدا ئـاوی سـەر زەوی بـە جۆگەلـەكانا بـلاو بوونەتـەوەو بـۆ پڕكردنـی حـەوزی گـەورەی ئـاو بەكاردەهێنرێت . ئاوی ئەم جۆگەلانە بۆئاودانی باخی بچكۆلەش لەو دەوروبـەرەدا سوودیان لێ دەبینن . بەهۆی سەرچـاوەی ئـەو ئاوانـەوە كەلـە ناوچـەكەدا هـەن و بـلاون گونـدی زۆر لەئـەمرۆدا لـە ڕۆخیانـدا بـەو هۆیـەوە دەركـەوتوون بەرهـەمی سەرەكی ناوچەكەش كشتوكاڵە وەكو گەنم و جۆ ، كە دێمەكارن .

**وەسفی شوێنەكە** : گۆڕسـتانی (كـول تاریكـە) بەرزییەكـەی لـەڕووی ئاوەكـانی چواردەورییەوە لە سنووری ٢١٠٠ مەتردایە ، دامێنەكەی كەمێك نزمـەو پـشتەوەی دەڕوانێـت بەسـەر زەوییـەكی تـەختی بەریندا ، دوو جۆگـە لـە ئـاوی بـچكۆلەش بەردەوام لە باكورو باشووریدا واتە دوای ئـەوەی لـە پـشتەوەی گۆڕسـتانەكە یـەك دەگرنـەوە ڕووەو خۆرئـاوا دەكـشێن . دامێنـی خۆرئـاوای گۆڕسـتانەكە نزمـە بـە زەوییـەكی تـەخت كۆتـایی دێـت كـە دوو جۆگەلـە ئـاو لـە خۆرئاوایـدا بەیـەكتری دەگەنەوە . لەسەر ڕووی شوێنەكە نیشانە دەبینین كە بە بـەردی گـەورە دروسـت

کراوە لەشێوەی چینی دیواردا بەرچاو دەکەون . لەوەش زیاتر لەڕووی ئەم شوێنە تەختەدا لەتە گۆزەو گلێنەی تێدا بلاوە لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لە ئـامێری بـەردین و بەردە ئەستێی چاککراو بەرچاو دەکەون . لای باکور و باشوور و خۆرئاوای ئـەم شوێنە پڕن لە بەردی کونکراو ، لەبەشێکی تـری شوێنەکەشـدا بـەردی سـتوونیش هەن کە دەڕوانن بەسەر دوو جۆگەلە ئاوەکە ، لای خۆرهەلاتیشی بـە تەپـەی بلنـد کۆتایی دێت کە گۆڕستانەکەی لەسـەرە لەگـەڵ ئـەو بـەردە کوناوییانـە زۆرانەشـدا لەئەشکەوتە بچکۆلەکاندا ژمارەیەك بەردە ئەستێی چاککراو هەن کە لە هەندێکیانا لەتە سوالەت و دەمە چەقۆی لەبەرد دروستکراویش بەدەست گەیشتوون .

**کاری کنەو پشکنین** : دوای دانانی نەخشەیەکی سنووردار کە ئەگەری گۆڕسـتان هەبوو لەسەر بەشێکی تەختاییەکەی کە پەیوەستە بەڕووبەرەکەی سـنووری ۱۵۰۰ مـەتری چـوار گۆشـە دوای دانـانی تـۆڕی ٥*٥ مـەتری چـوار گۆشـە بـۆ کـاری کنەوپشنینەکە و دەستکردن بەکاری پاککردنەوەی لە گـژوگیا گـۆڕی هەلکـەنراوی بێ مۆڵەت لەلایەن خەلکی ناوچەکەوە دەرکەوتن، بۆیە بڕیارم دا بـە ئاشـکراکردنی ڕووبەری گۆڕەپانی ئەو شوێنەو تاوەکو چـەند سـانتیمەترێك هـەڵم کەنـدو چـوومە خـوارەوە بـەئامانجی ئاشـکراکردنی دیـواری بـەردی گۆڕەکـان و بـەردی دەمـی گۆڕەکانیش کە گژوگیاو گڵ داپۆشیبوون بۆئـەوەی زانیـاریم لەسـەریان هـەبێت ، بەوجۆرە (۳) گۆڕ بە هەلکۆلینی ڕێگە پێنەدراو دەرکەوتن کە ژمارەیان لـە (۱_۳) بوونە لەگەڵ ئەوانەشدا (۷) گۆڕی تریش دەرکەوتن ، کەلوپـەلی نـاو گـۆڕی یەکـەم تەواو لەناوچووبوو بەمانا نەمابوون بەلام گۆڕەکـانی دووەم و سـێیەم لەبەرئـەوەی بەشێوەیەکی ناتەواو هەلکەندنیان تیادا کرابوو لەناویا توانیم ژمارەیەك پاشماوەی شوێنەواری بەدەست بهێنم .

**گــۆڕە دروســتکراوەکان** : لەوەوبـەر نیـشانەی دەرکـەوتنی گۆڕەکـان کەوتـە بەردەستمان بەهۆی هەلکۆلینی نایاساییەوە کە چەند تەختە بەردێك بـوون ڕووی چاڵی گۆڕەکان بەشـێوەیەکی ئاسـۆیی داپۆشـیبوو ، تـەنیا گۆڕێکیـان نـەبێت کـە

گـۆڕی نوێـەم بـوو کـە گـیراوەی شـلەیەك کرابـوو بەسـەر تەختـە بەردەکەیـدا بـۆ بەستنەوەی ، ئەستووری بـەردی سـەری گۆڕەکـە (٢٠) سـانتیمەترە، یـان کـەمێك زیاتر بوو تـوخمی بـەردەکان لـە ڕەنگـی خاکەکـە بـوون کـە پێـوەی بەسـتبوون ، درێــژی گۆڕەکــان لــەنێوان (١،٨٠ — ٢) مــەتر بــوون و پانییــەکانیان (٦٠— ٨٠) سانتیمەتر و قووڵییەکەشیان لەنێوان (٨٠—١٠٠) سانتیمەتر بوون ، لـەو ڕۆژگـارەدا مردووەکان کە خرابوونـە گۆڕەکانیانـەوە بەشـێکیان ڕووەو خۆرهـەڵات و خۆرئـاوا بوون بەڵام هەندێکی تریان بەمانا ژمارە (٨) و (١٠) ڕووەو باکور ، باشوور بوون.

لــەناو گۆڕەکــانی گۆڕســتانی (کــول تاریکــە) دا گۆڕەکــانی (٩) و (١٠) لــە دروسـتکردنیانا لـەوانی تـر جیـاوازتر بـوون ، بـەوجۆرە بـوون چـاڵی گـۆڕی (٩) پێچەوانەی چاڵی گۆڕەکانی پێشووتری بوون لەلایەك گڵ بـاڵای دیـواری گۆڕەکـەی داپۆشیبوو گۆڕەکـەش هـەروەکو باسمـان کـرد گـیراوەی شـلەیەك کرابـوو بەسـەر تەختە بەردەکەی چاڵی گۆڕی (١٠)ش بەسەیرکردنی دەرئەکەوێت دەچێتەوە سەر چـاڵی گـۆڕی (٩) بـەڵام چـینی دیوارەکـانی بـەو تەختـە بـەردە گەورانـە بـوو کـە بەشـێوەی سـتوونی لـە زەویـدا بـەرز بوونـەوە ، داپۆشـینی گۆڕەکـەش وەکـو گۆڕەکانی تر وابوو کە بەچەند تەختە بەردێك گیرابوو ، خاڵێك کـە لێـرەدا جێگـای گرنگیدانــە ئەوەیــە مردووەکــە ڕووەو بــاکوری خۆرئــاوا ڕاکێــشرابوو ، دیــواری گۆڕەکـەش بـەردەکانی بـەو شـلەیە بەسـترابوون بەیەکـەوە کەلـەم گـۆڕە بـەولاوە لەهیچ گۆڕێکی تریاندا بەو شێوەیەم نەبینی ، دەبێت ئـەوەش بڵـێم ئـەو گیراوەیـە پەیوەندی خاکناسی دروسـتی نـەکردبوو بـەڵکو بەسـەیرکردنی دەرکـەوت تایبەتـە بەشوێنەکەو بە بەکارهێنانی .

**مردووخستنە گۆڕ** : ئێسك بەندی مردوو لەم گۆڕانەدا لەسەر شـێوەیەك نـەبوون چونکە لایان دانانی مردووەکە هەرواکارێکی ئاسـان نـەبووە ، بـەپێی ئـەو بنەمایـە ئێسك بەندی مردووی گۆڕی (٧) شێوە کۆنەکەی وەرگرتبوو ئەوەش بەهێنانەوەی دەستی بۆ سەر چاوی ، لـە گۆڕێکدا مردوویـەك دانـراوە بـەڵام گـۆڕیش هەیـە دوو مردووی تێدا بوو وەکو گۆڕەکانی (٣) و (٩) و یەکێك لەو گۆڕانەش کـە گـۆڕی (٥)

بوو هیچ ئێسك بەندێكی تێدا نەبوو لێرەدا تـەنیا ژمارەیـەك لەتـە سـواڵەت و یـەك ئەڵقەی دەست و پارچەیەك مەعدەن و (٣) مۆری بـەرد بەدەسـت گەیـشتوون بـەو جۆرە دانانی دیاری گۆڕ بۆ مردووەكە زۆر ڕۆشن نەبوو بە بەراورد لەگـەڵ ئەوانـەی لە گۆڕی (٧ و ٨ ) دا هەبوون دیاری ناو گۆڕیش نزیكی سەری مردووەكـە دانرابـوو بەڵام گۆڕی (١٠) لەوانی تر جیـاوازتر بـوو چـونكە دیارییەكـە نـەخرابووە ناوچـاڵی گۆڕەكەوە بەڵكو لە دەری گۆڕەكە دۆزرایەوە .

**دیاریی گۆڕ** : ژمارەو جـۆری دیـاریی گـۆڕ لـە گۆڕسـتانی (كـول تاریكـە) دا لـە سەرچاوەكەیەوە كە بۆی هاتووە بەپێی پلەی ئابووری گۆڕاوە ئـەو كەلوپەلانـەش كە زیاتر بە دیاری هاتوون وەكو سواڵەتی قاپ و قاچاخ كە هەندێك لەوانە سـاغن و ماونەتەوەو بەدەستمان گەیشتوون ، لەناو ئەو قاپ و قاچاخە گلێنەیانەشدا چـەند شێوەیەك بەرچـاو دەكـەون كـە لایـەنی سەرپـەرشـتیاری گـۆڕ بـۆ مـەرامی ئـاینیی داناون وەكو شێوە مەسینەی گلێنەیی بچووك كـە لوولەیـەكی نـووك تیـژی هەیـە لەگـەڵ دانـانی گـۆزەی بـچووكی لوولـەدار ، كۆمەڵـە گلێنـەی دەركـەوتوو لـەڕووی شێوەو جۆریانەوە لەیەكتری بەزۆری جیاواز بوون نموونەی ئەمەش لـە گـۆڕی (٢) دا دەركەوت كە (٥) قاپ و قاچاخی گلێنەیی تەواو نیوە تەواو بوون كە دۆزرانەوە، بە بەراوردی ئەمانە لەگەڵ سواڵەتەكانی گۆڕی (٧) یان (٩) دەرئەكەوێت لە هەموو ئەو شوێنانەدا دیاری گۆڕ كە پێویست بووە بۆ مردووەكە دانـراوە بـەڵام بەهـەمان شێوە كەلوپـەلی مەعـدەنیش وەكـو یـەك لـەناو گۆڕەكانـا دانـەنراوە ، لـە كۆمەڵـە مەعدەنی گۆڕستانی ( كول تاریكە) دا كەلوپەلی دۆزراوە وەكـو پارچـە مەعـدەن ، دەرزی سنجاقی داخراو ، شووژن كە بـۆ جـوانی بـەكارهێنراوە ، ئەڵقـەی پەنجـە ، گوارە ، كاسەی گلێنەیی ، گلێنەی ستوونی ، مێخێكی پرچ و مۆرێكی بچكۆلە .

خاڵێـك لـە سەرچـاوەكەیەوە كـە پێویـستی بـە تێڕوانینـە كۆمـەڵێك كەلوپـەلی مەعدەنی تەواوە لە گۆڕستانی (كـول تاریكـە) كـە لـەناویانا بابـەتی شـەڕ بەرچـاو ناكەوێت ، لەناو ئەو كۆمەڵە زۆرەو كەلوپەلە جۆراوجـۆرەدا كـە لـە ئاسـن دروسـت

کراون و لەبەردەستدان تێیانا کەلوپەلی مس دروستکراو کەمە ، بەلاّم لە زووەوە ئەو پاشماوانەی لە ئاسن دروست کراون دووچاری لەناوچوون هاتوون کە ناسینەوەیان شێوەی سەرەتاییان تووشی گرانی و دژواریت ئەکات کە ناتوانیت بزانیت چی بوون گۆڕی (٧) لەناو گۆڕەکانی تـرداو لەڕووی ژمارەو جۆری شتومەکی ئاسندا کە کاری کنەو پشکنین دەری خستوون لەوانی تر جیاوازترن و بێ وێنەن ، لەم گۆڕەدا (٣) چەقۆ و خەنجەرێك ئەڵقەیەکی بچکۆلە (لەوانەیە ئەڵقەی پەنجە بێت) لەگەڵ (٥) پارچە شێوە بازنەیی کە دووانیان کون کراون لەگەڵ سنووری (٥٠٠) گرام پارچەی تر کە ناناسرێنەوە ئەمانە لەبەردەستدان ، زیاتر لەمانەش لە گۆڕی ژمارە (٩) دا شووژنێك و لە گۆڕی (١٠) ە دا چەقۆیەك کە لەوانەیە دانەیەك بێت لە دەستەیەك ، هەروەها لە گۆڕەکانی (٣-٦-٨) دا ژمارەیەك پارچە ئاسن دۆزرانەوە کە نازانرێت کاتی خۆی شێوەیان چۆن بووە.

کۆمەڵە کەلوپەلی بەردینی گۆڕستانی (کول تاریکە) لە بنەمادا پەیوەستە بە (مۆڕ) کە بە جوانی دروست کراون و دەکەونە بەرچاو ، لە پێشوودا مۆرە بەردینەکانی لە جۆری بەردی ئاوی بوون هەروەها لەو جۆرە مۆرانە لە توخمی یاقووتیش هەن کە گەورەتر لە مۆرەکانی تر دروست کراوە یەکێکی تریان لە بەردێکی سەوزی نیوە ڕووناکە کە ژمارەیەکی زیاد لەو مۆرانە لەناویانا هەبوون لەو شتومەکانەی تر لە گۆڕستانی (کول تاریکە) بەدەستمان گەیشتوون جۆرێك لە گوێچکە ماسی دەریایە بەناوی (گێژەکە) ، لە کەنداوی فارس بەزۆری دەست دەکەون (هەتاکو دواییەش ئەو گوێچکە ماسییانە ئافرەتی کورد بۆ ڕازاندنەوەی جلکی سوودی لێ بینیوە) .

دەوڵەمەندترینی گۆڕەکان لەڕووی کەلوپەلەکانیانەوە گۆڕەکانی (٧-٨-١٠) .

ئەو کۆمەڵە کەلوپەلانەی لە گۆڕی (٧) بەدەست گەیشتن پێکهاتوون لە (٢) قاپی مس (٢) سواڵەت (٣) چەقۆ خەنجەرێکی ئاسنی تەواو لەگەڵ (٢) ئەڵقە لەوانەیە لە مس دروست کرابن ، لەگەڵ ژمارەیەك مۆری یاقووت ، لە گۆڕی (٨) یشدا (٥) سواڵەتی گلێنەیی (٢) سنجاقی قفڵی تەواونیوەتەواو لە مس دروست کراون لەگەڵ چوار شووژن بۆ جوانی کە لە مسن ، لەگەڵیانا (٣٠٠) مۆری لەبەرد

دروستکراو کە ژمارەیەکی زۆرە لەگەڵ سەرەتەشییەکی گلێنەیی بۆیەکراو و ژمارەیەك پارچە مسی نادیار کە نازانرێت چی بوون کۆمەڵە کەلوپەلی گۆڕی (دە) کە بەدەست گەیشتوون پێکهاتوون لە (٥) سواڵەتی تەواو چواردە پارچە مەعدەنی مس و دوو چەقۆی ئاسن و ئەڵقەیەك و گوارەیەکی مس و دوو شت کە بۆ جوانی لە ئێسقان دروست کراون بەشێوەی گوڵی سیانزە پەڕ لەگەڵ مۆرێکی بەرد لەنێوان کەلوپەلەکانی گۆڕی (دە) دا کە سەرنجراکێش بوون و بۆ جوانی لە ئێسقان دروست کرابوو لەشێوەی گوڵێکدایە کە سیانزە پەڕەو کەمەرەکەی (٢٨) میلیمەترە لەگەڵ دەرزیەکی بچکۆلە کەمەرەکەی ٣,٥ میلیمەترە بەرچاو دەکەوێت لەشێوەی مێخێکدایە لە قژ ئەدرێ و لە مس دروست کراوە .

شێوەی ئەم کەلوپەلە یادگارییانەو نەخشی جوانیان هاوشێوەکەی لەسەر ڕووی گۆزەی بچکۆلەی بۆیەکراوی (زیویە) هەیە مۆری بەردینیش کە سنووردارە بەو گۆڕانە کەمن کە لەدەری گۆڕی (دە) بەدەستمان گەیشتن بەشێوەی نیوە لوولەیەکن درێژییەکانیان (٢٣) میلیمەترەو لەڕووە قۆقزەکەی ئەم مۆرانەدا نەخشێکیان لەسەرە لەشێوەی پیاوێکدا و لەڕووەکەی تریشیاندا بەهەمان شێوە نەخشی مرۆڤێك بەرچاو دەکەوێت سەما دەکات و پۆشاکی سەری بەشێوەی تیشکی هەتاوە و خەنجەرێك لە دەستیا دەبینرێت .

**<u>کۆکردنەوەو گرێدان</u>** : ئەو مێژووەی گۆڕستانی کول تاریکە کە ژمارەیەکیان سواڵەتی ساغن بەڵام زۆرینەیان لەتە سواڵەتن ئەم کۆمەڵە لەڕووی شێوەیان و پۆشینی ڕەنگیان جۆری بابەتیان تێدا نییە ، لەڕووی ڕەنگیانەوە سواڵەتەکان بە نارنجی داپۆشرابوون ، سواڵەتەکانیش بەزۆری لەسەر شێوەی کاسەو پەرداخ بوون کە زۆر و بڵاو بوون سواڵەتەکان کە بەڕەنگی نارنجی داپۆشرابوون لە جۆری سواڵەتە زبرەکانن لە قوڕێکی شێوە نارنجی دروست کراون و ساف کراون قوڕەکەی لەو جۆرانەیە کە لمی ورد یان وردە چەوی لەناودایەو لە جۆری

خراپەکانیا لەسەر ڕووەکانیان دردەدەکەوێت جۆری باشی ئەم سواڵەتە ڕەنگەکەی نارنجییەو بە چەرخ کراوەو ڕووەکەی بە جوانی ساف کراوە .

ئەوەی لەشێوەی ئەم سواڵەتە لەناو گۆڕەکانـدا بەکارهێنراوە کاسەی هەمەجۆر شێوەکانیش هەن وەکو گۆزەی بچکۆڵەو ڕەحەتی نووك تیژو تاسەی بچکۆلە کە گەردنێکی بڵندی هەیە و دەمی بۆ دەرەوە کراوەتەوەو پەیوەستە بە گەردنی گۆزەکەوە ، لەو شێوانەش لەناو گۆڕەکانـدا بەکارهێنراون لەو جۆرانەی وەکو ڕەحەتی دەمکراوەی بچکۆلە کە لوولەیەکی ستوونی بە گەردنەکەیەوە پەیوەستە لەگەڵ گۆزەی ورگداری دەم بچکۆڵەو پاڵەی بچکۆڵەی لوولەدار لەناویانا زۆرن و بەرچاو دەکەون لەناو سواڵەتەکانا شێوەی نارنجی تایبەتی خۆی هەیەو جوانکاری تێدا کراوە کەلە هەندێکیانا بەرچاو دەکەون ، ئەم جوانکارییە لەسەر شێوەی نەخشی ئەندازیارییە ئەویش بەدروستکردنی هێڵی باریك و کەمێك قووڵ لەسەر بەدەنەکەی کراوە وەکو دیمەنی شانە لەسەر سواڵەتەکە بەشێوەی سێگۆشەو لەبزینەیی بەرچاو دەکەون ئەمانە بە شریتێکی ئاسۆیی کراوە پەیوەستن کە لەسەرەوە بۆ خوارەوە هاتوونەتەوە هەندێك جاریش وێنە نەخشێنراوەکان زۆرن کە لەناویانا نەخشی لەم جۆرە کە بەشێوەی قۆری بۆ جوانکاری دەرئەکەون ، ئەم جۆرە سواڵەتەش پێچەوانەی ئەوانەی پێشووە نموونەی شێوەکانی و ڕەنگەکانی شێوە خاکییە لە جۆرەکانی تری ئەو سواڵەتانەی لە گۆڕستانی (کول تاریکە) بەکارهێنراوە سواڵەتێکە ڕووەکەی بە شەرابی بۆیە کراوە ، قوڕی ئەم سواڵەتە ڕەنگی نارنجییەو وردە لم یان وردە چەو لەناویا دیارە شێوە دەرکەوتووەکانی ئەم سواڵەتە ڕەحەتی بچووکی گەردن دار لەگەڵ کاسەی قوڵفدار کە دەمەکەی بەرەو ناوەوە چووە و کاسەی تری کەمێك قووڵ کە قوڵفەی هەیە لەشێوەی ئێسی ئینگلیزی کە ئاماژەیە بۆی لەناو ئەو کۆمەڵە سواڵەتەی گۆڕستانی (کول تاریکە) دا دوو سواڵەتی بۆیەکراوی تریش دێن یەکێکیان لە گۆڕی حەوت و ئەوی تریان لە گۆڕی دە بە دەست گەیشتوون ، سواڵەتەکەی گۆڕی ٧ بەرزییەکەی (١٠) سانتیمەترەو لەشێوەی پەرداخی ئاودایەو

گەردنی بەرزەو بەدەنێکی بازنەیی هەیە ، سوالەتەکەش بنکەکەی بە ڕەنگی سەوز بۆیـە کـراوەو بەشـەکانی تریـشی بـە ڕەنگـە ئـاوی ، جـوانکردنی ئـەم سـوالەتەش بەشـێوەی (٩) گـەلای گـوڵی ڕەنگـاوڕەنگ بـووە کـە (٥)یـان لـە خـوارەوەی گەردنەکەین تاوەکو ناوەڕاستی بەدەنی سوالەتەکەی گرتووەتـەوە لێوارەکانیـشی بە وێنـەی گـوڵ داپۆشـراوە ڕەنگـی ڕەشـی دلفـڕێن کـراوە هـەتاکو دەگاتـەوە بـە ئەترافەکانی خوارەوەی ڕۆیشتووە .

سـوالەتی ڕەنگکـراوی گـۆڕی (١٠) پێکهـاتووە لـە گـۆزەی دەم بـچکۆڵە بـەبێ ئەوەی گرنگی پێدرابێت و بە ڕەنگی ئاویش داپۆشراوە .

لەپێشووشدا ڕووی سوالەتەکە ڕەشی خاکەکەی لەسەر کۆ ببۆوەو داپۆشیبوو بەسەیرکردنی خراپی سوالەتەکە لە دروستکردنیا دەرئەکەوێت .

لە نموونە جیاجیاکانی تری قاپ و قاچاخی (کول تاریکە) سـوالەتێکی گـەورە دێت کە دیوارەکانی بە ئاسۆیی هاتوونەتەوە و لە گۆڕی ژمـارە (١٠) دۆزراوەتـەوە ئەم گلێنەیە بە ئەندازەیەکی جوان هێلکاری تێدا کـراوە ، ئەمـەش بـە هـەڵکۆڵینی هێڵی قووڵ و پان لە ڕووەکەیـدا دەرکـەوتووە ، نەخـشەکانیش بەشـێوەی زیگـزاك هاتوونەتـەوەو هێڵـەکانیش بۆیـەی سـپی کـراون خـاڵێکی تـریش کـە شـوێنی ورد وردبوونەوەیە لە گلێنەکـەدا ئـەوەش بـوونی هێڵـی سـپی گەورەیـە لـە ڕووەکەیـدا کۆمەڵە سوالەتەکانی (کول تاریکـە) بـەزۆری هاوشـێوەی گلێنـەکانی (زێویـە) ن ، ئـەم لەیەکـچوونەش بەتایبـەتی سەرچـاوەی سـوالەتە نارنجییـە سـافکراوەکان دەگرێتـەوە کـە نەخـشی لەسـەر هـەڵکۆڵراوە ٬ نموونـەی لەبەرچـاویش ڕەحـەتی بچووکی لوولەداری گۆڕی (٩) یـە ، لـەو شـێوە سـوالەتەش لـە (زێویـە) بەدەسـت گەیـشتووە نەخـشەی هـەڵکۆڵراو بـۆ جوانکـاری بەشـێوەی سێگۆشـەو لەبزینـەیی ساکار کە پەیوەستن بە شریتێکی ئاسۆیی لەشێوەی شـانەدا وێنـە کـراون لەسـەر سوالەتەکە دەرئەکەون ، لە سوالەتەکانی (کول تاریکـە) شـدا هـەن ، هـەروەها لـە سوالەتەکانی (زێویە) شدا جارێکی تر بەرچاو ئەکەون ، گلێنەی بۆیـەکراوی گـۆڕی (٧) جارێکی تر شـێوەکەی دێتـەوە بەرچـاو و نەخـشەکەی بەگشتی هاوشـێوەی

زۆری گلێنەی بۆیەکراوی (زێویە) یەو سوالّەتەکەش بەڕەنگی سوور داپۆشراوە ئەوەی (کول تاریکە) ش هاوشێوەی سوالّەتێکی ترە لە کۆمەڵەی ڕەسەنی (زێویە) .

سوالّەتەکانی گۆڕستانی (کول تاریکە) لەگەڵ سوالّەتەکانی زێویە نموونەیان لە زیندانی سلێمان بەرچاو ئەکەوێت نموونەی ئەمانەش کاسەی بچکۆلەی دووانەی ستوونییە کە کەمێك چەمانەوە لە بالأکەیدا هەیە نموونەی هاوشێوەشی لە زیندانی سلێمان و زێویە هەن ، بەوجۆرە کە لەسەر سوالّەتەکان دوایین مێژووەکانیان بۆ نیوەی یەکەمی هەزارەی یەکەمی پ.ز دەگەڕێتەوە یان لەوانەیە بۆ سەردەمی (مانایی) بگەڕێنەوە کە لە گۆڕستانی (کول تاریکە) دا بەرچاوم کەوتن .

**قسەی تر** : لە دوو وەرزی کنەوپشکنیندا لە گۆڕستانی (کول تاریکە) و ناوچەی نیشتەجێبوونیدا بەڵگەو ئاسەوار بەدەست گەیشتن کەرەسەی فەرهەنگی گۆڕەکان و هاوشێوەکانیان بە پەنابردن بۆ دروستکردنی بیناو کەرەسەی فەرهەنگیان لە خاڵەکانی تری هەمان سەردەمدا سەردەمی گۆڕستانەکە دیاری دەکەن ، ئەمانە دەری ئەخەن ئەو پاشماوانەی کە دەوری دەشتی (کەرەفتوو) و (زێویە) یان داوە بۆ سەردەمی نیوەی یەکەمی هەزارەی یەکەمی پ.ز دەگەڕێتەوە کە شوێنی ژیان و دانیشتن بووە لە بنەماشدا بەڵگە هەیەو لەبەرچاو گیراوە کە ناوچەی دانیشتنی (کول تاریکە) قەلأیەك بووە و شوورای ئەو خانووانەش تاوەکو دوور لەیەکتری پشتێنەیەکی سروشتی بۆ دروست کردوون ، لەناو پاشماوەی بینای شووراکەشدا کەرەسەی فەرهەنگی لە نموونەی سوالّەتی ساکار و درشت کە وردە چەو یان لمیان پێوە دیاربوو دەرکەوتن .

دیارە لە گوندەکانی (گوڵ تەپە) کە قەلأی زێویەش هەر لەو شوێنەدا دروست کراوە تیایدا شوێنی مانەوەیان بۆخۆیان دروست کردووە ، نموونەی ئەو قەلأیەشم دیوە کە شووراکەی بە خشتی قوڕ ١٠*٥٠*٥٠ دروست کراوەو بناغەشی لاشەکەی

بە بـەرد دانـراوە نموونـەی ئەمـەش کـە بـۆ باسـکردن بـشێت قـەڵای (زێویـە) و ٣ کیلۆمەتری (قاپلان دو) کە شووراکەی بە خشت دروست کراوەو بناغەکەی بە بەرد هەڵبەتە دروستکردنی لە ناوچەی دانیشتنی کوێستانیدا لەبەر بەرژەوەندییان بووە بۆیە بناغەکەیان بە بـەرد دانـاوە تـاوەکو پتـەو بێـت ئـەو سـواڵەتانەش کـە لـەناو ناوچەکەدا کنەو پشکنینیان بۆ کراوە بۆ سەیرکردنی شێوەو ڕەنگیـان هاوشـێوەی جۆری سواڵەتەکانی گۆڕستانی (کول تاریکە) و شوێنی دانیشتنەکەیانە کە لـە دوو هاوشێوەی ئاینیدا دەرئەکەون ، پرشێکی گرنگ لێـرەدا خـۆی دەنوێنێـت ئـەویش ئامـادەکردنی کەرەسـتەی پێویـست بـۆ دروسـتکردنی بینـا بـۆ نیـشتەجێبوون لـە قۆناغێکی مێژووییدا بەپێی مەرجی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی بووە کـە ئـەو خانووانـە لە شوێنە بەرزەکاندا دروست کراون ئەگەر ئەو شوورانە بەو قۆناغەدا تێپەڕ بـوون کـە گـەلانی مـانیی لـە سـەدەکانی (٦،٧،٨) ی پ.ز لـەو ناوچـەیەدا ژیـابن لەبـەر هێرشەکانی ئاشوورییەکان و بەردەوامی شەڕی نەتەوایەتییان لەگەڵیانا دروسـتیان کردووە بۆیە بەوە گەیشتم کـە تـوانیم لێکۆڵینـەوەی بـۆ بکـەم دەربـارەی ئـەوەی بۆچی ئەوانەیان دروست کردووە .

شوێنی نیشتەجێبوونی ئەم گەلانەش باشووری دەریاچەی ورمێ بووە تاوەکو دەگاتەوە بە (سەنەندج) (کوردستان) لەڕاستیشدا هێرشی ئاشووری بـۆ سـەر ئـەو گەلانـە جارجارێـك ڕووی داوە و گەلـە بـچکۆلەکانی ناوچـەکەش پێویـست بـووە بەرگری لە خۆیان بکەن و لە هێرشی گەلانی تریش خۆیان بپارێزن کە هێرشـبەران بۆسـەر بەرزاییـەکان لـە هێرشـکردنا بـوون واتـە بـۆ سـەر گـەلانی ناوچـەکە بۆیـە شوورای بەرزو بەهێزیان دروست کردووە بۆ پارێزگاری لە خۆیـان لەوانەشـە (کـول تاریکە) یەکێك بێت لەو شوێنە ناوخۆییانە کە گەلانی مانایی تیایدا دانیشتبن.

لێـرەدا پرسـێك دێتـە پێـشەوە کـە پێویـستی بـە ڕوونکردنـەوە هەیـە و بـەو جۆرەیە دەسەڵاتداران لە ناوچەی (زێویـە) دا لـەڕووی ئـابووری و کۆمەڵایەتییـەوە چـۆن توانیویانـە فەرمانڕەوایـەتی بکـەن لەگـەڵ ئـەوەی پاشمـاوەی شـوێنەواری

تایبـەت بـەو قەڵایـە بەدەسـت گەیـشتووە ، هـەروەها لـەو دەوروبەرەشـدا بینـای تایبەت بەو بۆنەیەوە هەبووە ؟ بۆ وەڵامی ئەمە دەبێت : ناوچەکە شوێنی جێگای تایبەت بە گەلێك بووە کە فەرمانڕەوایی تێدا کردووە و خەڵکەکەش بەگشتی لەژێر دەسـتەڵاتیانا بـوون بـەو خەڵکانـەی تـریش کـە لەشـوێنی تـری ناوچـەکەدا ژیـاون ئەوەش ئاشـکرایە هێرشـبەرانی ئاشـووری و غێـری ئـەوان لـەو ڕۆژگـارەدا بـەدوای تاڵانی زۆر و گرانی نرخـدا گـەڕاون کـە دەسـەڵاتدارەکانی ناوچـەکە لـە قـەڵاکانیانا شاردوویانەتەوە و پاسەوانیان بۆ داناوە .

بەوجۆرە گۆڕستانی (کول تاریکە) و شوورای نیشتەجێبوون تیایدا خەڵکەکەی مەرجـەکانی ژیانیـان هـەبووە کـە دەوری ناوچـەکەیان داوە ژیـانی ئابووریـشیان لەسەر کشتوکاڵی دێمی و ئاژەڵداری بووە کە لەوانەیە بەشـێك لەمانـەش کۆچـەری بووبن هەرچـۆنێك بێـت لـەم قۆناغـەدا لـە کۆمەڵگایـەکی داخـراودا لـەو شـوێنانەدا نیشتەجێ بوون و تیایاندا ژیانیان بەسـەر بـردووە و ئـەوەی بـۆ نیـشتەجێبوونیش نەیان بووە دروستیان کردووە .

## هاوشێوەی فەرهەنگی و پاشماوەی کۆنی گۆڕسـتانی (کـول تـاریکـە ) و خاڵـەکانی تری:

بەسـتنەوەی چـینەکان و ناسـینەوەی قـاپ و قاچـاخی سـواڵەت و پارچـە سواڵەتەکان و کەلوپەلی وەرشاو و مۆری بەردینی بەدەستگەیشتوو لـە گۆڕسـتانی (کـول تاریکـە) و ناوچـەی دانیـشتنیان و پێوانـەی کەلوپـەلی فەرهـەنگییان بـە کەلوپەلی فەرهەنگی شوێنی تر ، وەکو زێویە و قاپلان توو و قەڵای حـاجی سـۆفی لە گوندەکانی گوڵ تەپـە ، وێنەیـەکی ڕێـژیمان لەسـەر قـەڵای زێویـە ئـەداتێ یـان لەوانەیە بۆ دروست بکات کە کاری کنەو پشکنینەکانی ساڵانی پێشووتر کە بۆیـان دیاری کردووین لەنێوان سەدەکانی ٦ و ٧ ی پ.ز بەئەنجامی گەیاندووە لە ئێـستادا بۆ مێژووی تەنیا توانیمان شـوورای گۆڕسـتانی (کـول تاریکـە) و قـەڵای زێویـە لـە ڕێگای پاشماوەی شوێنەواری بەیەکتری بـەراورد بکـەین ، لێکۆڵینـەوەکان لەسـەر

میراتی کوردستان لە گوندەکانی گولّ تەپە لە دەشتی زێویە کە لەلایەن (سابیر وەفایی) ئاخاوتنی لەسەرداوە کە ئەشکەوتی (کەرەفتوو) و قەلأی (زێویە) و شووراکانی (قاپلان توو) و (حاجی سوّفی) لە دەشتی زێویە نیشان ئەدات دەری دەخات کە نیشتەجێبوون لەو دەشتەی کەرەفتوو و زێویە لەسەردەمێکی قوّناغی مێژووییدا هەبووە کە فەرهەنگی ئەو شوێنە تایبەت و فراوانە پەیوەست بوون بەگەلانی مانایی ئەمەش پەنابردن بوّ قەڵەمڕەو و فەرمانڕەواییان وادیارە لە باشووری دەریاچەی (ورمێ) وە تاوەکو ناوچەی (سەنەندج) و هەمەدان لەژێر دەسەلأتیانا بووە .

یەکێك لە ناوچە ڕەسەنەکانی ئەم قەومە گوندی قەیچە بووە کە سەر بەناوچەی بوّکانە لە ئازەربایجانی خوّرئاوا ئەمەش بەپێی ئەو بەردە نووسراوە یادگارییە دێت کە بە ئەلفبای ئارامی کوّن نووسراوە وا دانراوە لە کنەوپشکنینی گوندی قەلأیچە دوّزراوەتەوە کە بوّ ٧١٦ ی پ. ز دەگەڕێتەوە شوێنەکەش بە (زیرتو) دەخوێنرێتەوە کە پایتەختی ولأتی (ماننا) بووە و نووسینەکەش پەیوەستە بە ڕوّژگاری فەرمانڕەوایەتی (ئوّلوّسوّنوّ) ی پادشای بەتوانای (ماننا) کە ناوەڕوّکەکەی دەڵێت بەڕەسمی ناسینی (یانزی) دادوەری شاری (زیرتو) ی پایتەختی ولأتی (ماننا) کە لەبەردەمی خواکانی پەرستگای پادشایەتی و دادوەری خوای خالدی لەسەر خاکی (ماننا) بەردەوامییان بە دەستەلأتی داوە .

سوالّەتەکانی ئەم ناوچەیە هاوشێوەی سوالّەتەکانی گوّڕستانی (کول تاریکە)یە، جگە لەوەش ڕەنگی خشتەکانی قەلأیچەی بوّکان زیاتر هاوشێوەی سوالّەتی گوّڕستانی کول تاریکە و کاشییەکانی قەلأی زێویە لە نزیك سەقز یش شوورایەکی کوّن بە ناوی (قەلأی ساحیب) هەیە کە بەهوّی وێنە دەستییەکانی ئەو شوورایەو ئەو لێکوّڵینەوەیەی لەسەر سوالّەتەکانی کراوە دەرئەکەوێت کە هاوشێوەی دوو جوّر لە سوالّەتی گوّڕستان و ناوچەی نیشتەجێبوونی (کول تاریکە) ن ، ئەم سوالّەتانە لە دوو کوّمەڵدا بەرچاو دەکەون یەکێکیان ڕەنگی

لۆبیای توخمی هەیە سواڵەتەکەشی بە چەرخ سازکراوە ئەوی تریشیان ڕەنگی سووری ترێییەو تاوەکو ئەندازەیەکیش ساکارەو پوخت نییە بەهەرحاڵ لە سەرچاوەی بەڵگەکانەوە توانیمان بوونی (قەومی ماننا) لەم ناوچەیەدا دیاری بکەین ئەوەش لەڕێگەی قاپ و قاچاخی مەعدەنی بۆکان و کنەوپشکنینی دێرین ناسی گۆڕستانی (کول تاریکە) وە بوون بە پشت بەستن بە سەیرکردنمان بۆ وێنە جیاجیاکانی ڕەگەز و شێوەی کەلوپەلی فەرهەنگییان کە بەدەست گەیشتوون ، ئەمانە بەگشتی دەری ئەخەن کە قەڵای زێویە و ئەترافەکانی خاوەنی فەرهەنگی هاوبەش بوون یەکێك لەو سواڵەتانەی کە لە زێویە بەدەست گەیشتووە لە گۆڕستانی (کول تاریکە) ش جارێکی کەش لە دوو گۆڕدا بە جیا دەرکەوتوون لەوانە گۆزەڵەیەك یان گوڵدانێکە کە لاشەکەیی و گەردنەکەی بەنەخشی ئەندازیاری بەشێوەی سێگۆشەو بەڕەنگی ڕەش تەختەکەیی و تەواو بەدەنەکەی داپۆشیوە جگەلەوەش بەڕەنگی پیرۆزەیی و سەوزی کەمڕەنگیش پشتێنەدراوە ئەم سواڵەتە بۆیەکراو و نەخشێنراوە بەسەیرکردنی بەدەنی و شێوەی تەواوی ڕەنگەکەی هاوشێوەی سواڵەتی (زێویە) و جیاوازیشیان تەنیا لە بوونی نەخشی چەند پەڕە گوڵ و دیمەنی چەند ئاژەڵێکدا هەیە ، ئەم گوڵە چەند پەڕە لە (کول تاریکە) ش شێوەکەی لەسەر پارچە ئێسقان بەرچاو دەکەوێت ، سواڵەتی تریش لە ڕەنگی لۆبیای تۆخ جارێکی تر لە هەردوو شوێنەکەدا بەرچاو دەکەون کە دەمەکانیان کراوەتەوە و دوو دەسکیان لەسەر شێوەی ئەڵقەی پەنجە هەیە کە ناوەڕاستی بەدەنەکەی گرتووە .

ئەم سواڵەتانە بەزۆری لەشێوەدا جوانن و بەدەنەکانیان لە ناوەڕاستدا دەرپۆقیون نەخشی هەڵکۆڵراویان تیادایە کە لە خوڕ دەچێت تیشکەکانی لەشێوەی چەرخدا پەخش دەکات .

کەلوپەلی کانزایی زۆری تریش وەکو سنجاق بۆ جوانی و شووژنی مەعدەنی و پارچە مەعدەنێك لەسەر شێوەی گەلا لەو شتومەکانەن کە لەهەردوو شوێنەکە بەرچاو دەکەون ، جگە لە سەدان مۆری لەبەرد دروستکراوی ڕەنگاوڕەنگی بچکۆلەو مۆری یاقووت کەلەو دوو خاکەدا بەدەست گەیشتوون ، ئەمانە تەواو

لـەڕووی ڕەنـگ و پێوانـەو توخمـەوە هاوشـێوەن بەشـی زۆری مـۆرە ڕەنگـاو ڕەنگـەکانیش کـە شـێوە خـاکین و لـە گۆڕسـتانی (کـول تاریکـە) و (زێویـە) دۆزراونەتەوە هاوشێوە دەوەستنەوە .

لێـرەدا پرسـیارێك دێتـە پێـشەوە لەسـەر دروسـتکردنی ئـەم کەلوپـەلی فەرهەنگی و سواڵەتی مەعدەنییە کە بەو شێوەیەیە ئایـە ئـەم پیشە کـە شێوەی خۆی وەرگرتووە ناوخۆییە یان وەرگیراو و لە شوێنی ترەوە هاتووە ؟

بۆ وەڵامی ئەمە لە ئێستادا ناتوانین قسە لەسەر ناوچەی دانیشتن و مانەوە لە (کول تاریکە) دا بکەین تاوەکو بـەپێی بەڵگـەکان لێکۆڵینـەوەی لەسـەر نەکـەین ، وادیارە کەلوپەلی جوان سازی ناو گۆڕەکـان و سـواڵەتە بۆیـەکراوەکانی پێدەچێت لەناویانـدا تـەنیا سـواڵەتە سـاکارەکان ڕۆژانـە دروسـت کـرابن بـە بەڵگـەی لاوازی ئەوەی لەم شوێنەدا تەنیا کوورەی سـوورکردنەوەیان بەدەسـت گەیـشتووە بـەڵام تاوەکو ئێستاش بەڵگەی دروستکردنی سواڵەتی بریقەدار یـان قاڵبـەکانی مەعـدەن سازی بەدەست نەگەیشتوون .

سـەرئەنجام مرۆڤـی کۆمـەڵگای (کـول تاریکـە) کـە ئابوورییەکـەی لەسـەر ئاژەڵداری و کشتوکاڵی دێـم بـووە لـە ڕێگایانـەوە ژیانیـان گوزەرانـدووە ، دووری بۆچوونی پسپۆڕانیش لەسەر سواڵەت و قـاپ و قاچـاخە مەعدەنییـەکان کـە ڕایـان لـەو نێوانـەدا لەیـەکترەوە دوورە ، بـوونی ئـەو بەڵگانـە یـان نزیکبوونـەوەیان لـە ڕاکانیانـدا کنەوپـشکنینی ئاینـدە لـە شـوێنی مانـەوەی جێگـای گۆڕسـتانی (کـول تاریکە) دا کەمێك ئەو بۆچوونانە لەیەکتری نزیك دەخاتەوە بۆ گەیشتن بەئەنجامی پرسەکان .

**سەرچاوە**

مجموعة مقالات همایش بین المللی باستان شناسی ایران حوزه شمال غرب به کوشش دکتر مسعود ازرنوش چاپ نخست ١٣٨٣ ل. ٨١ – ٨٦








وێنەی (٢) دیمەنی ڕووبەری گۆڕستانی کول تاریکە



وێنەی (٣) دوو پەنابەردین لە دەربەندی باشووری گۆڕستان



وێنەی (٤) تەختە بەردێکی گەورەی ڕووی گۆڕ

# گه‌شتی ولیام هوید بۆ كوردستان (١٨١٧)

وه‌رگێڕانی له‌ فه‌ڕانسییه‌وه‌:
د. نه‌جاتی عه‌بدوڵڵا*

**ئه‌ڵقه‌ی دووه‌م و كۆتایی**

ولیام هوید ساڵی ١٨١٧ هاتۆته‌ كوردستانی عوسمانی و سه‌فه‌رنامه‌كه‌ی بۆ یه‌كه‌م جار ساڵی ١٨١٩ له‌ له‌نده‌ن به‌ زمانی ئینگلیزی بڵاو كردۆته‌وه‌ و دواتر ساڵی ١٨٢٠ سه‌فه‌رنامه‌كه‌ كراوه‌ به‌ فره‌نسی و له‌ پاریس بڵاوكراوه‌ته‌وه‌ و هه‌ر سێ به‌شی كۆتایی سه‌فه‌رنامه‌كه‌ هه‌مووی تایبه‌تن به‌ كوردستان. له‌م سه‌فه‌رنامه‌یه‌دا هه‌ر سێ به‌شی سه‌فه‌رنامه‌كه‌ كراونه‌ته‌ كوردی و له‌ ژماره‌ (١٩) ی گۆڤاری ئه‌كادیمیای كوردی ئه‌ڵقه‌ی یه‌كه‌می ئه‌م سه‌فه‌رنامه‌یه‌ بڵاوكرایه‌وه‌ كه‌ وه‌رگێڕاوی كوردیی به‌شی یانزه‌هه‌می ئه‌م سه‌فه‌رنامه‌یه‌ بوو، وا له‌م ژماره‌یه‌دا به‌شی دوانزه‌هه‌م و سیانزه‌می ئه‌م سه‌فه‌رنامه‌یه‌ وه‌كو ئه‌ڵقه‌ی دووه‌م و كۆتایی ئه‌م سه‌فه‌رنامه‌یه‌ بڵاو ده‌كه‌ینه‌وه‌ كه‌ به‌سه‌ریه‌كه‌وه‌ بریتین له‌ كۆی ئه‌و به‌شانه‌ی سه‌فه‌رنامه‌كه‌ كه‌ ته‌رخانی كوردستان كراون.

### به‌شی دوانزه‌م

پاشماوه‌كانی نه‌ینه‌وای كۆن–گۆڕی یۆحه‌ننا– وه‌سپی مووسڵ– سه‌فه‌ر به‌ناو بیابانی بچووك بۆ نه‌سیبین– گه‌یشتن بۆ ماردین– وه‌سپی شاره‌كه‌– ورده‌كاری له‌باره‌ی ئێزیدییه‌كان یان شه‌یتان په‌رسته‌كان.

به‌شێوه‌یه‌كی گشتیی وا دێته‌ به‌رچاو كه‌ مووسڵ كه‌وتبێته‌ به‌رانبه‌ر ئه‌و شوێنه‌ی كه‌ جاران نه‌ینه‌وای به‌ناوبانگی لێ بووه‌. ئه‌م شاره‌ كه‌وتۆته‌ سه‌ر

* ئه‌ندامی كارای ئه‌كادیمیای كوردی.

کەناری ڕۆژئاوای دیجلە، نزیکەی چوارسەد میل لە بەغداوە دوورە.، بە پردێکی پانزە کەوانەیی پێی دەگەین بەڵام چونکە پێنج کەوانەی ناوەڕاستەکەی دارمابوون، ڕووبارەکەمان بە کەلەکێکی دارین بڕی. من نازانم ئەوە دووپات بکەمەوە داخۆ بەرزاییەکانی زەوی و ئەو کەرەستەگەلە نەناسراوانەی کە لەسەر کەناری ڕۆژهەڵاتیدا دەبینرێن بەشێك بوونە لەو شارە گەورەیەی کەوا گریمانە دەکرێ لەم شوێنەدا دامەزرابێ. بۆ دووپاتکردنەوەی ئەم ڕایە دەبێ زانیاری زۆر فراوانتر پشتئەستوور بە بەڵگەوە لەبەردەست دابێ. بەڵام ئەوەی جێگەی گومان نییە کەوا لە مەودایەکی زۆر کەمی شارەکەدا، چەند بەرزاییەکی بێ شومار دەبینرێ کە پێدەچێ دەستکرد بن و بەزۆری لە کەلاوەکانی بابل دەچن. یەکەمیان نزیکەی یەك میل لە مووسڵەوە دوورە و لەسەر کەناری ڕۆژهەڵاتی دیجلەیە و چێوەکەی نزیکەی یەك میل دەبێت. دووەمیان زۆر بەرزترە، بەڵام کەمتر فراوانترە و بینایەکی بەسەرەوەیە کە قوبەیەکی بەسەرەوەیە و دەڵێن گڵکۆی پێغەمبەر یۆحەننایە و جوولەکەکان زیارەتی دەکەن و ئاواییەکی بە دەورەوەیە بەناوی کۆنی شارەکە کە وا باوەڕ دەکرێ ئەمە پاشماوەی شارەکە بوویێت. ڕێبەرەکەم دڵنیای کردمەوە کەوا بەرزایی لەو شێوەیە لە پێدەشتەکە بۆ ماوەی چەندین میل دەبینرێ و بڕێك کووخی نیشان دام کە لەسەر زەوییێکی بەرز دەبینرێ، لە بەسەرکەوتنی بە ئاڕاستەی ڕووبارەکە، وەك ئەوەی بە ئاڕاستەی ئەو بەرزاییانە بن کە بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ دەورانی نادر شا.

پێم وایە زانایەکان سەرقاڵی ئەوەن بە وردی ئەو شوێنە دیاری بکەن کە جاران ئەم شارەی لەسەر بینا کراوە. بیروڕایەکان دابەش بووە لەنێوان ئەوەی کە ئەم بەرزاییانەی کە کەوتۆتە بەرانبەر مووسڵ و ئەو شوێنەی کە گۆڕی پێغەمبەر یۆحەننای لێیە و دەوروبەری ئاواییەکی چکۆڵە کە بڕێك لە کووخەکانیان پێ نیشان دام. بەڵام ئەگەر بە وردی تێبینی ئەوە بکەین کە ئەو شارانەی لەسەر کەناری ڕووبارێك دروستدەکرێن بە شێوەیەکی ئاسایی ئەو ئاڕاستەیە دەگرێ کە شەقامەکانی بە ئاڕاستەی ئاوەڕۆکە دەبن و نەینەوا هەمیشە وەکو شارێکی گەورەی بێ شومار نیشاندراوە، بۆیە هیچ شیمانەی ئەوە ناکرێ کەوا ئەم دوو ڕایە لەسەر بنەمایەك هەڵنراین و ئەم شارە گەورەیە ڕووبەرێکی ١٨ میل زەوی بە

درێـژایی ڕووباره‌كـه ده‌گرێتـه‌وه. جـا ئه‌گـه‌ر لـه لای مووسـڵه‌وه بـۆی بـچین به‌شێوه‌یه‌كی سه‌ره‌كی ئه‌و به‌رزاییه كه‌ڵه‌كه‌بووه خۆڵییه ده‌دۆزینـه‌وه كـه ده‌كـرێ گریمانه‌ی ئه‌وه بكرێ كـه كـه‌لاوه‌ی كۆشـك، پاشمـاوه‌ی دیـوار و بینـای سـه‌ره‌كی نه‌ینه‌وا بن. بـه پـشت به‌سـتن بـه‌م مه‌نتیقـه، ده‌كـرێ بـوترێ مووسـڵ لـه بنه‌وانـدا سنووری لای باشووری شاره‌كه پێكده‌هێنێ.

ئه‌م شاره له‌م ڕه‌وشه‌ی ئێسته‌یدا هێشتا شارێكی زۆر گه‌وره‌یه، وێـڕای ئـه‌وه‌ی كـه لـه‌كاتی له‌ناوچـوونیدا دیـواری بـه‌ردینی زۆر بـه‌رز ده‌وریـان داوه. پـێش گه‌مارۆدانی شاره‌كه كـه دواتـر قـسه‌ی له‌سـه‌ر ده‌كـه‌م، شـارێك بـووه وه‌ك ده‌ڵـێن بیست هه‌زار ماڵ بووه: سێ چـاره‌گی ڕووخـاوه و تـه‌نها نیـوه‌ی ئـه‌و ماڵانـه‌ی لـێ ماوه‌ته‌وه كه ئێسته‌كه ماون. به گریمانه‌كردنی شـه‌ش یـان حـه‌وت كـه‌س بـۆ هـه‌ر ماڵێك، دانیشتووانی شاره‌كه ده‌گاته چل تا چل و پێنج هه‌زار كه‌س: له‌وانه دوانزه هه‌زار مه‌سیحی كه سێزده كه‌نیسه‌یان هه‌یه و هه‌زار و شه‌شسه‌د ماڵن كه ماڵه‌كانی خراپ نـین. لـه‌ناوه‌وه‌ی شـاره‌كه كه‌لاوه‌گـه‌لی زۆری لێیـه، بـه‌لام بینایـه‌ی جـوانی نایابی تێدایـه، حـه‌مام و مزگـه‌وتی جـوانی لێیـه و حه‌مامـه‌كان لـه جـوانترین ئـه‌و حه‌مامه‌ن كه له ژیانمدا بینیبم، ڕووكاری ده‌ره‌وه‌ی له مه‌ڕمه‌ڕه و زۆر پاك و خاوێن و ناسـكن. لـه‌ناو ئـه‌و شـانزه مه‌نزلخانـه* (كاروانـسه‌را)یـه‌ی كـه هـه‌ن، ده یـان دوانزه‌یـان زۆر گـه‌وره‌ن و هـه‌موو شـتێك بـه گه‌ڕۆكـه‌كان ده‌ده‌ن كـه ئه‌مـه داب و نه‌ریتی خه‌ڵكی ولاتی ڕۆژهه‌لاته.

دانیشتووانی شار زۆر له شاره‌كانی دیكـه كراوه‌تـرن. ژنـه‌كان ئـه‌و هێنـده بـه خۆپارێزییه‌وه وه‌ك له به‌غدا وایه خۆیان داناپۆشن. بازرگـانی قـاڵی و ئه‌مرازگـه‌لی ئاسن و مـس و كه‌ره‌سـه‌ی ئه‌سپـسازی، شـێوه‌یه‌ك لـه شـێوه‌كانی ده‌وڵه‌مه‌نـدی و متمانه‌یـه‌ك نیـشان ده‌دات كـه لـه‌ناو هـه‌مان شـاره گـه‌وره‌كانی دیكـه‌دا نـابینرێ. مووسـڵ له‌گـه‌ڵ ناوچـه‌یه‌كی بـچكۆڵه‌ی ده‌وروبـه‌ری لـه‌ژێر حـوكمڕانی سـه‌ربه‌خۆی پاشایه‌كن له چینی یه‌كه‌م. ئه‌م شاره به بێهووده لـه لایـه‌ن نـادر شـا لـه ده‌ورانـی حـوكمڕانی حوسـێن پاشـا گـه‌مارۆ درا و مه‌سـیحییه‌كان بـه حه‌ماسـه‌تبازی و بوێرییه‌ك به‌شدارییان له به‌رگری شاره‌كه كرد كه بوو بـه مایـه‌ی ڕێـز و سه‌رسـامی

* Menzil-Khaneh

هـەمووان کـە تـا ئێـستەش هـەر جێگـەی ڕێـزن. ئێرانییـەکان بێهـوودە لـە کـاتی گەماڕۆکەیاندا سێ ڕۆژ بـە بـەردەوامی پـەلاماری شـاریان دا کەچـی هەمیـشە هـەر دوور دەخرانـەوە و هـەموو جارێـك بـە دۆڕاوی دەگەڕانـەوە. هـەرکاتێك درزێـك لـە شـوورەی شـارەکە بوایـە هـەر دەمودەسـت چـاك دەکرایـەوە. تورکـەکان بـە خەمـساردییێکی زۆرەوە ڕایانگەیانـد کـە ئـەوان پێیـان باشـترە سـەری ژن و کچەکانیان ببڕن لەوەی بەجێیان بهێڵن ببنە دیلی دەستی ئەو گومڕا قێزلێبووانە.

چیایەکانی دەوروبەری مووسڵ برێك کانی زیو و چەندین پارچە بەردی مەڕمەڕی لێیـە، جگـە لـەو دوو شـتە، نـازانم ئەگـەر شـتێکی دیکـەی لـێ بێـت کـە سـەرنج ڕابکێشێ. ئـەو ئێوارەیـەی گەیشتینە ئـەوێ ئێوارەیـەکی خـراپم بەسـەر بـرد، تـا ئەوەی بەیانییەکەی خۆم شوشت ئەوجا بـە ئیـشتیایەکی چاکەوە گەڕامـەوە بـۆ کاروانسەرا، بەڵام تەتەرەکەم بە بێ ئەوەی بایەخ بە مـن بـدات چـووە لای پاشـا و هەرچی خزمەتکارەکان بوو، هەمان هەڵسوکەوتیان کرد و هەموو ئـەو ئازووقەیـەی کـە نێردرابـوو ماشـیبوویانەوە و بـچووکترین شـتیان بـۆ مـن نەهێـشتبۆوە. ئـەم پشتگوێخستنە هەسـتی برینـدار کـردم و وێـڕای ئـەوەی کـە ئـەم کلۆڵانـە بـە مـن پێدەکـەنین. مـن بـە تـاك و تـەنیام، هێـشتا سـەفەرێکی ناخۆشـم لـە پێـشدایە لـە گەڵیان، کەوایە هیچ دەمەقاڵێیەك لەگـەڵیان سـوودی نییـە.، بۆیـە بەشـوێن پلانـە ئاسـاییەکەی خۆمـدا چـووم. ئـەویش ئـەوەبوو بۆیـان بسەلمێنم کـە مـن دەتـوانم دەستبەرداری ئەوان ببم. چووم یـەکێك لـە خزمـەتکارەکانی کاروانـسەراکە کـە لـە ویستی چاکی دڵنیابووم راسپارد تا لەگـەڵم بێـت بـۆ حـەمام و دیارییـەکی بـچووکم پێشکەش کرد بەرانبەر بە خزمەتەکانی و داوام لێ کـرد لەگـەڵم بێـت بـۆ بـازاڕ بـۆ کڕینی برێك ئازووقە. ئەوەی پێویستم بوو بۆ ئامـادەکردنی ژەمێکـی نایـاب کـڕیم. لەکاتی هاتنەوەم بە ئازووقەوە، بینیم ئاپۆرای هاوڕێیەکان، هـەموو خەڵکـەکانمان بە مەیتەرەکەشەوە لە دەورم کۆبوونەوە و پاڵیان بەیەکەوە دەنا بەو هیوایەی کـە بەشـی خۆیـان بەردەسـت بخـەن. بـەڵام پـێم گـوتن ئێـوە نـانی ئێـوارەی خۆتـان خواردووە وێڕای ئەوەی کە ئەوان ئەوەیان لەسەربوو چاوەڕوانیان دەکـرد کـە مـن لە نانی ئێوارەم ببمەوە چونکە ئینگلیز مل نادەن و لەگەڵ خەڵکی ڕەشۆك لەسـەر مێز دانانیشن. خۆ ئەمە ئەگەر لە ڕواڵەتدا برێك گەبجارپـشی تێدا بووبێـت کـە بـۆ

شان و شکۆی من بوو، به‌ڵام برێك سوودیشم لێوه بینی له‌گه‌ڵ خه‌ڵکانێك که مامه‌ڵه‌یان له‌گه‌ڵدا ده‌که‌م. فه‌رمانم دا هه‌موو ئه‌و خواردنانه‌ی که بۆ خۆم کڕیبووم ببه‌نه ژووره‌که‌م و جگه له خزمه‌تکاره خاکییه‌کانی کاروانسه‌را که به حه‌ماس و دڵسۆزییه‌وه خزمه‌تیان کرد به‌و هیوایه‌ی که به‌شیان ببێ له‌وه‌ی که ده‌مینێته‌وه، که‌سم به‌ده‌وره‌وه نه‌ما. کاتێك ته‌ته‌ره‌که‌م هاته‌وه هه‌ستی به تاسیری ئه‌م هه‌ڵسوکه‌وته‌ی من کرد و له پیاوه‌کانمان تووڕه بوو و داوای پۆزشت هێنانه‌وه‌ی بۆ کردم له‌وه‌ی که منیان پشتگوێ خستبوو.

له ١٧ ی مانگ، کاتژمێر ٥ ی ئێواره دوای ڕۆیشتنێك که دوو کاتژمێر و سێ چاره‌گی خایاند گه‌یشتینه ئاواییه‌کی چکۆڵه. گوررزی قامچییه‌کان وه‌کو ئاسایی به‌سه‌ر هه‌موو خه‌ڵکی گوند که‌وت، به‌ڵام نه‌مانتوانی هیچ شتێك وه‌چنگ بخه‌ین. به‌ڕێ که‌وتینه‌وه و دوای ڕۆیشتنێکی دوو کاتژمێر ڕه‌شماڵێکی عه‌ره‌بیمان له بیابانێکی چکۆڵه‌ی درێژبوه‌ی نێوان مووسڵ و نه‌سیبیندا بینی و گیسکێکی چکۆڵه‌مان به‌رده‌ست که‌وت که هه‌ر ده‌موده‌ست هه‌ر له‌وێ سوورمان کرده‌وه. دوای ئه‌وه‌ی برسێتیمان نه‌ما به‌ڕێ که‌وتینه‌وه. کاتژمێر یانزه و نیو چاومان به هۆزێکی دیکه که‌وت به‌ڵام نه‌وه‌ستاین ته‌نیا ئه‌وه‌نده نه‌بێت که بۆ به‌رده‌ستکه‌وتنی ڕێبه‌ره‌کانمان پێویست بوو.

١٨ ی مانگ، ته‌واوی شه‌و ڕۆیشتین و تا به‌یانییه‌که‌ی ڕۆژی دواتر له‌سه‌ر که‌ناری ڕووبارێکی بچووك وه‌ستاین بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌سپه‌کانمان ئاو بده‌ین. له‌گه‌ڵ نیوه‌ڕۆ گه‌یشتینه نزیك گردێکی به‌رزی شێوه قووچه‌ك ڕێبه‌ره‌کانمان به‌سه‌ر که‌وتن بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌و بڕه سواره بناسنه‌وه که له دووره‌وه دیار بوون. هه‌رچی من بووم جگه له خاڵێکی ڕه‌ش که‌وا دیار بوو (با) به‌ناو ته‌متومانێکدا که ئاسۆکه‌ی ته‌نیبوو ده‌یبرد هیچی ترم نه‌بینی. به‌ڵام چاوی ڕێبه‌ره‌کانمان به‌هێز و ڕاهاتوو بوون و به تاقیکردنه‌وه ده‌یانزانی که‌وا ئه‌م خاڵه هێنده نابات گه‌وره ده‌بێت و بڵاو ده‌بێته‌وه. له‌گه‌ڵ ئه‌و گه‌شتیارانه‌ی که له مووسڵه‌وه له‌گه‌ڵمان که‌وتبوون ئێمه نزیکه‌ی هه‌شتا پیاوی ته‌واو چه‌کدار بووین. به‌ڵام سنجاقه‌کان به‌شێوه‌یه‌کی ئاسایی که زۆربه‌ی جار له سه‌دان پیاو پێکدێن بۆ په‌لاماردان و له‌سه‌ر شێوه‌ی

دەستەی گەورە كۆدەبنەوە و تەتەرەكەمان برێك كەشافەی نارد، ئێمە بەسەر بەرزاییەكە كەوتین.

یەكەمەكان كە گەڕانەوە پێیان وتین خۆتان بۆ جەنگ ئامادە بكەن. دەمودەست هەندێك لە هاوڕێیەكانم دەستیان كرد بە هاواری جەنگ، بە شمشێرەكانیان لە دەمانچەكانیان دەدا بۆ ئەوەی بەهێزی هەرا و زەنا ئازایەتی وەبەرخۆیان بنێن. پێم وابوو كە ڕەوشەكە ڕێگەم پێ دەدات برێك لە ڕای خۆم دەرببڕم و داوام لێ كردن بە تەواوی بێدەنگی بپارێزن و جانتاكانمان بەڕیز بكەن بە مەتەرێز لەو ناوچانەی كە مكوم نییە و دەكرێ دەرفەتی تێدا بقۆزرێتەوە. بەڵام ئەم ئامۆژگارییەم خەریك بوو ئەو ناوبانگە كەمەی ئازایەتییەی كە لە سوزا* بەردەستم خستبوو لە دەستی بدەم. هاوڕێكانم وا دیار بوو لایان وابوو كەوا هاتوهاوار چاكترین وەسیلەیە و نیشانەی ئازایەتییە. بەردەوام بوون لە هاتوهاوار، لە كاتێكدا هەندێكی دیكە لەسەر زەوی دانیشتبوون و بە هێمنی بە پایپ جگەرەیان دەكێشا. نیو كاتژمێرێك بەم شێوەیە ماینەوە. ئەوكاتە بینیمان پاشماوەی كەشافەكانمان كە لە لایەن چەند سوارەیەكی دابڕاو لە فیرقەی سەرەكی سنجاقەكان دابڕابوون ڕەدوونرابوون بە هەڵەداوان گەڕانەوە، ئەو چەند سوارەیە تەنها ئەو كاتە وەستان كە ژمارەی ئێمە، یەكگرتوویی و هێزی شوێنی ئێمەیان بینی، ئەوكاتە بە سەلامون عەلەیكوم سڵاویان لێ كردین و بە هەڕاكردن كشانەوە و پێوەندییان بە فیرقەی سوپاكەی خۆیان كرد و زۆری نەبرد لەبەرچاو ون بوون.

دڵخۆش بووین بەوەی لە دوژمنێك رزگارمان بوو كە وای بۆ چووین بە ئازایەتی خۆمان ترساندمان. بەڕێ كەوتینەوە، دوای دوو كاتژمێر و نیو ڕۆیشتن، بینینی گرووپێكی دیكەی ڕێگر ناچاری كردین شوێنەكانمان لەنێوان ئەو كەلاوە زۆرانەی كە لە دەستەچەپمان بوو ڕێك بخەین. پێم وابوو ئەم كەلاوەیە تەنها كەلاوەی كاروانسەرایەكی گەورە بووە، چەندین لە هاوڕێیەكانم ئەوەیان بۆ دووپاتە كردمەوە كە جاران شارێكی گەورە لەم شوێنەدا بووە و لەم بارەیەوە چیرۆكی بێ

* Souza

سوودیان بۆ گێڕامەوە کە هەمیشە ئامادەن لە دەرفەتی هاوشێوەدا بیگێڕنەوە. لە کاتژمێر چوار ڕۆیشتین و تا نیوەی شەو هەر بەڕێوە بووین.

دوای کاتژمێرێك لـە حەسـانەوە، سـواری پـشتی ئەسـپەکانمان بووینـەوە و بـە وریاییەکی گـەلێك زۆرەوە دەچـووینە پێـشەوە، تەتەرەکـەمان قەدەغـەی کردبـوو ورتـە لـە زارمـان بێتـە دەرەوە و هـەتا جگەرەکێـشانیش قەدەغـە بـوو لـە ترسـی ئەوەی نەوەکا دووکەڵی پایپەکانمان ڕۆیشتنی بێدەنگمان بـەدیار بخـات. لـەوەتای ١٧ ی مانگەوە لە کاتژمێر پێنجی ئێوارەوە ئێمـە بەسـەر پـشتی ئەسـپەکانمانەوە بووین بە نزیکەیی بە بێ وەستان و بەبێ وەرگرتنی هیچ پشوویەك و جگە لە چەند سەڵکە پیازێك و پارچەیەك نانی ڕەش بەولاوە زیاترمان لا نەبوو. لـە بەیانییەکـەی ١٩ ی مانگ ئەسپەکەم لە ماندوێتییان تاقەتی پڕۆکا و منی فڕێدایە ناو جۆبارێـك و کاتێـك ئێمـە کاتـژمێر دە و نیـو لـەناو ئاواییـەکی پـەڕپووت بـەناوی ئاغـا گهێلـی* وەستاین، هیوام خواست کە ئەو هێندە کاتەی کە لە ڕۆژەکـە مـاوە کـەمێك تێیـدا بحەسـێینەوە، بـەڵام نیـشانەی دەرچـوون هـەر دەمودەسـت دەرچـوو و دەبـوو بچینەوە سەر پشتی ئەسپەکانمانەوە.

تا ئەو ساتە لە هەموو ڕۆیشتنەکانی گەشـتەکەمدا زۆر کـەم دەرفـەتی وام بـووە گلەیی لە دانیشتووانی ئەو وڵاتە بکەم کـە پیایـدا تێپـەڕ دەبـین. خـۆ ئەگـەر بڕێـك جاریش بەرەورووی هەڵسوکەوتی وەك پشتگوێخستن و بێڕێزی بووبمـەوە ئـەوا لـە لایەن تورکی لووتبەرز یان لە لایـەن تەتـەری نیمـچە شارسـتان بـووە کـە لەگـەڵ کاروانەکەماندا بوون.، بەڵام ئەو ڕۆژە یارییەکیان لەگەڵدا کردم کە زیانێکی زۆریان پێ گەیاندم. پۆتینە تورکییەکانم لە ئەنجامی ئەو ڕووداوەی کە بەسـەر منـدا هـات شێدار بوو بوو و ئەوهێندە تەسك بووبۆوە کە زانیم ئیدی ئەستەمە بتوانم لـە پێـی بکەم. جووتیارێك، کە یەکێك لە ڕێبەرەکانمان بوو، دەمودەسـت جووتێـك پـێڵاوی کۆنی تەواو بەکارهێنراوی پێشکەش کردم و ئـەوەی خـستە بـەردەمم کـە تـاوەکو ماردین پووتەکەم بۆ هەڵدەگرێ. من هەمیشە وریـایی ئـەوەم هـەبوو کـە ئاگـام لـە هەموو چەشنە فێڵکردنێك ببێ، بەڵام جووتیارە چەپەڵەکە بە سیمای دەسـتپاکیی خۆیەوە بەشـێوەیەك ڕازی کـردم و قرۆشێکیـشم پـێ دا چـونکە بایـەخی پـێ دام.

---

* AgaGeheli

دوای ماوەیەك زانیم کەوا برایەکەی ئۆردووەکەی جێهێشتووە و پۆتینەکانی منیشی بردووە. یەخەیم گرت و لەسەر ئەوەبوو کە لەبەرامبەر ئەم فێڵلێکردنە سزای بدەم کاتێك تەتەرەکەم منی گرت و وادەی پێ دام کە دادپەروەریم بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام وادەیەك کە هەرگیز جێبەجێ نەکرا.

دواجار لە کاتژمێر دە و نیوی ئێوارە، چووینە ناو کاروانسەرای دووگرووت[*] . شەومان لەوێدا بردە سەر و ٢٠ ی مانگ کاتژمێر شەش و نیوی بەیانی بەڕێ کەوتین. لە ڕێگە چاومان بە گرووپێکی تەتەر کەوت و پێشنیارمان کرد ئەسپەکانمان بگۆڕینەوە، بەڵام ئەوان ئەوهێنە زیرەك بوون کە تێنەکەون و دوای چوار کاتژمێر و نیو لە ڕۆیشتن گەیشتینە نەسیبین.

نەسیبین جگە لە پاشماوەی پەڕپووتی شارێك کە جاران بەرفراوانییەکی زۆری هەبووە چیتر نییە و کەوتۆتە سەر کەناری ڕووباری مەقدۆنیس[**] کە، ڕووبارێکی زۆر پان نییە بەڵام زۆر تیژڕۆیە لە لای باکوور شارەکە دەپارێزێ لە کاتێکدا لە لای باشوورەوە زۆنگاوێك دەیپارێزێ. ئێمە جگە لە کەلاوە هیچی ترمان تێدا نەبینی. پۆستەخانەکەی پیس و پۆخڵ بوو و باقی قەنتەرەکانی ئاو و بڕێك بینایەی دیکە هێشتا گرینگی کۆنی شارەکە نیشان دەدەن. بینایەکمان بینی کە پێدەچوو کۆشك یان قەڵایەك بووبێ، دیوارەکانی کونی زۆر گەورەیان تێدابوو، مزگەوتێك لە بەرد کە منارەیەکی بەسەرەوە بوو و پاشماوەی کەنیسەیەکی مەسیحی کە کاتی خۆی پێشکەش بە سانت–ژاك[***] کرابوو. لە دوورایییەکی هێندە زۆر دوورنا لەم کەنیسەیە کە هێشتا پێنج ئەستوونی لە یەك بەرد هەڵکەنراوی هەبوو کە یەکێکیان پانزە تا هەژدە پێ بەرز بوو، لە سمتی چەپدا.

دوای ئەوەی بۆ نانی نیوەڕۆ و بۆ حەسانەوەمان نزیکەی کاتژمێرێك و چارەگێکی تێدا ماینەوە بەڕێ کەوتینەوە. دوای ئەوەی نزیکەی حەوت میلمان بڕی، کەلاوەگەلێکی بێ شومارمان بینی کە ڕێبەرەکانمان ناویان نابوو سەریکەخان[****] و دواتر زانیمان کەوا ناوی ڕاستەقینە قەسری

---

[*] Dougrout
[**] Maygdonius
[***] Saint-Jacques
[****] Serika-Khan

جیهانه[*]. ئه‌م كه‌لاوه‌گه‌له بیری ئه‌وه ده‌دات كه ئه‌مه كـه‌لاوه‌ی قه‌ڵایـه‌كی بـه‌هێزی پانوپۆڕ بـووه كـه تـا ئێـسته‌كه‌ش دیـواره پـان و به‌رینـه بـه‌رزه‌كانی هـه‌ر مـاون. ئه‌وه‌یان بۆ دووپات كردمه‌وه كه‌وا بیرێك له ناوه‌ڕاسته‌كه‌یدا هه‌یه كه ئاوه‌كه‌ی زۆر سازگاره و به په‌یژه‌یه‌كی به‌ردین ده‌توانین بچینه ناویه‌وه كـه ئێـسته‌ش به‌شـێكی زۆری هه‌ر ماوه. شه‌و له حه‌مووده[**]، ئاواییه‌كی زۆر بچووك كـه ده‌كه‌وێتـه دووری چوار كاتژمێر له نه‌سیبین ماینه‌وه.

٢١ ی مانگ، به‌یانیه‌كه‌ی كه‌لاوه‌ی مه‌زنی دارا–مان بینی كه جاران شاری سـه‌ر سنوور بووه و گرینگییه‌كی زۆری هه‌بووه. كاپیتـان ماكدۆنالـد كیننـه‌ر وه‌سـپێكی وردی كردووه. دوای ڕۆیـشتنێكی پێـنج كاتـژمێر و نیـو گه‌یـشتینه مـاردین كـه لـه كۆندا پێیان وتووه "ماردا". ئه‌م شاره كه‌وتۆته سـه‌ر چیایه‌ك كـه بـه ڕێگه‌یـه‌كی سه‌خت و ته‌سك و ناخۆشدا ده‌كرێ بـۆی بـچین كـه لـه كۆتاییه‌كه‌یـدا هه‌ڵكه‌نـدنی به‌رچاو ده‌بینین كه له  به‌رد هه‌ڵكه‌ندراون.

حاكمی شار پێشوازییه‌كی گه‌رمی لێ كردین و منیش پێشوازیم له دانیشتووانه سه‌ره‌كیه مه‌سیحییه‌كانی شاره‌كه كرد كه ئازادانه شه‌راب و نـانی زۆر چـاكیان بـۆ هێنـام و پرسـیارگه‌لێكی زۆریـان لـێ كـردم لـه‌باره‌ی له‌شـساغی قه‌شـه‌كه‌یان و كاروباری گشتییه‌وه. دوای ئه‌وه‌ی ئه‌وان ده‌رچوون، هاوڕێكانم په‌له‌یان بوو به‌شـی خۆیان له‌وه‌ی پێشكه‌شیان كـردم وه‌ربگـرن و به‌شـێوه‌یه‌ك ده‌سـتیان بـه بوتله‌كـه داده‌هێنا قه‌ناعه‌تم به‌وه هات كه ئامانجیـان ئـه‌وه‌بوو بگه‌نـه ئـه‌وه‌ی ته‌مـه‌توع بـه له‌ززه‌ت بكه‌ن كه له وڕێنه‌ی سه‌رخۆشیدا ده‌ییبینن. توركـه‌كان لـه‌م باره‌یـه‌وه بـێ حه‌وسه‌ڵه‌ن و ئه‌وانـه كـه لـه ڕووكـاری ده‌ره‌وه‌دا گـه‌وره‌ترین بێزلێبوونـه‌وه‌یان بـۆ هه‌موو چه‌شنه شه‌رابێك ده‌رده‌بـڕن و بـه گـشتی به‌وه‌نـده ده‌سـتبه‌ردار ده‌بـن كـه ئاوی سازگار بخۆنـه‌وه.، بـه‌ڵام كاتێـك ده‌رفـه‌تی شـیاویان بـۆ بڕه‌خـسێ ئـه‌وا بـه چڵێسییه‌وه ده‌یقۆزنه‌وه.

شـاری مـاردین چـێوه‌كه‌ی نزیكـه‌ی سـێ میلـه و ده‌كه‌وێتـه باشـوور و به‌سـه‌ر لێژاییـــه‌كی گردێكه‌وه‌یـــه كه‌وتۆتـــه خـــواروی قه‌ڵایـــه‌كی كـــۆن بـــه لووتكـــه‌ی

---

[*] Caissir-Jehan
[**] Hamouda

شاخێکەوەیە. شوورەیەکی بەردین دەوری شارەکەی داوە کە دەگاتەوە شوورەی قەلاَیەکە و نزیکەی هەموو خانووەکان لە بەرد دروست کراون، ئەمە لە ئەنجامدا وای کردووە لە هەموو ئەو شارانە جوانتر بێت کە تا ئێستەکە من بینیومن. شەقامەکانی سەخت و دژوارن بەلاَم زۆر خاوێنن، چۆنایەتی پاك و خاوێنییەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی شارێکی زۆر لێژە و کەمترین باران بارین هەموو قوڕ و لیتەیەك لەگەڵ خۆی ڕادەماڵێ. ماردین بارەگای سەرەکی مەترانی مەسیحییە کاتۆلیکەکانە کە لە بەغدا بینیم و حاکمێك بەناوی موتەسەلیم کە لە لایەن پاشاوە دیاری دەکرێ حوکمڕانی شارەکە دەکات. هەرچی پێکهاتەکانی دیکەی دانیشتووانە بریتین لە مەسیحیی کاتۆلیك، نەستووری و ئەرمەنی.، تورك، عەرەب، جوولەکە و چەند بنەماڵەیەکی ئێرانی و ژمارەی دانیشتووانی بە ٢٠٠٠٠ کەس دەخەملێنرێ. دەوترێ کە موسڵمانەکان لەناو دوو هەزار ماڵ و مەسیحییەکان بە هەموو تایەفە جیاوازییەکانیانەوە لەناو هەزار ماڵدا دەژین (پلانشی ٥).

بەرلەوەی ماردین بەجێ بهێڵین دەبێ چەند شتێك دەربارەی ئێزیدییەکانی چیای شەنگاڵ بڵێین کە زۆر بە دەگمەن لە دەرەوەی ئەم شارەدا دەبینرێن. ئەوانە گرۆیەکی توندڕۆن کە بیابانە چکۆڵەکانی نێوان مووسڵ و نەسیبینیان گرتووە و بە شەیتان پەرست ناویان دەبەن. بەلاَم من پێم وایە ڕاستتر وایە بگوترێ کە ئەوانە تەنها هەوڵ دەدەن خۆیان لە تووڕەیی شەیتان بەدوور بگرن. من وای دەبینم کە ئەوان لە هەمان ڕەوشی ئەو ئافرەتە بەسالاَچووەدان کاتێك لەسەر شەرەفی جەلالەتی شەیتان مۆمێك دادەگیرسێنێ. " شەیتان ئەو هێندە خراپ نییە وەك ئەوەی بانگەشەی بۆ دەکەن"، ئەوان وا دەڵێن و "چاکتر وایە لە هەموو شوێنێك هاوڕێیەکت هەبێت".

ئێمە شتێکی زۆر کەم لەبارەی عەقیدەی تایبەتییان دەزانین، چونکە تورکەکان تەنها ڕێگە بەو تایەفانە دەدەن کە کتێبی نووسراویان هەبێت، وەکو مەسیحی و جوولەکەکان، بۆیە ئێزیدییەکان دەبینین ناچارن لەگەڵ ئەم ڕەوشە باوەڕیان بە پێویستی پێکەوەژیان هەبێ و دەڵێن ئەوان بەگوێرەی ڕەوشەکە موسڵمان، مەسیحی یان جوولەکەن. بڕێك بانگەشەی ئەوە دەکەن کەوا ئێزیدییەکان ڕێز لە کتێبە پیرۆزەکانی وەکو قورئان دەنێن و بە هەمان شێوە ڕێز

له ده‌سه‌ڵاتی ئایینی مه‌سیحییه‌كان و موسڵمانه‌كانیش ده‌گرن. هه‌ندێكی دیكه ده‌ڵێن ئه‌وان نه‌وه‌ی "یه‌زید"-ن و له‌و عه‌ره‌بانه‌ن كه حوسێن-ی كوڕه‌زای پێغه‌مبه‌ریان قه‌تڵوعام كرد و بنه‌ماڵه‌ی عه‌لی-یان ئه‌وهێنده به زۆر و زه‌برورزه‌نگ و سه‌رسه‌ختانه ڕه‌دوونا. سونه‌تكردن شتێكی هاوبه‌شه له‌نێوان تورك و موسڵمانه‌كان، به‌شێوه‌یه‌ك كه هه‌موو منداڵێكی نێرینه سونه‌ت ده‌كرێت به‌ڵام ئه‌مه ئه‌وه ناگه‌یه‌نێ كه ئه‌وان پێڕه‌وی له هه‌مان ئاقیده ده‌كه‌ن. به‌ڵام وه‌ك چۆن ئه‌م سونه‌تكردنه له لایه‌ن نه‌ته‌وه‌گه‌لی دیكه‌ی ئاسیایی و هه‌تاوه‌كو وه‌ك ئه‌وه‌ی بۆیان دووپاته كردمه‌وه كه‌وا له لایه‌ن برێك له مه‌سیحییه‌كانی ڕۆژهه‌ڵاتیش پیاده ده‌كرێ بۆیه ئه‌مه ئه‌وه‌ی لێوه ده‌رئه‌نجام ناكرێ كه‌وا ئه‌مه له ئاینه‌كه‌یانه‌وه سه‌رچاوه‌ی گرتبێت. دوور له‌و ڕقه‌ی كه موسڵمانه‌كان به‌رانبه‌ر به شه‌راب هه‌یانه، ده‌بینین ئێزیدییه‌كان شه‌راب پیرۆز ده‌كه‌ن به‌و پێیه‌ی كه ئه‌مه به‌خششێكه له به‌خششه‌كانی خودایی و حه‌ز ناكه‌ن یه‌ك دڵۆپیشی لێ بڕێژن. كاتێكیش شه‌راب ده‌خۆنه‌وه پیاڵه‌كه به هه‌ردوو ده‌ستیانه‌وه ده‌گرن و جا ئه‌گه‌ر وێڕای وریاییان چه‌ند دڵۆپێك ڕژا، ئه‌وا به خاك دایده‌پۆشن و وه‌ك ئه‌وه‌ی كه به‌شێك بێت ده‌سه‌ڵاتێكی سه‌رووتر پاراستبێتی. له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا سه‌رخۆشبوون زۆر به‌ده‌گمه‌ن له‌ناویاندا ڕووده‌دات، چونكه یه‌ك ساته وه‌ختی له‌بیرچوون ده‌شێ ببێته هۆی ئه‌وه‌ی هه‌موو هیوایه‌كیان له پێكه‌وه‌ژیانی ئاشتییانه له ده‌ست بدات.

پره‌نسیپێك كه هه‌موو ئێزیدییه‌كان پێڕه‌وی ده‌كه‌ن ئه‌وه‌یه كه‌وا به‌خشنده‌یی ئافه‌ریده‌كار سنووری بۆ نییه وه‌ك چۆن حیكمه‌ته‌كه‌شی بێ كۆتاییه. جا ئه‌گه‌ر به‌ڕێزه‌وه باسی ئه‌و ئافه‌ریده‌یه ده‌كه‌ن كه به‌وه تاوانباریان ده‌كه‌ن ده‌یپه‌رستن، جا ئه‌گه‌ر ناویان ناوه خوداوه‌ند یا په‌روه‌ردگار ئه‌وه له‌به‌ر ئه‌وه‌یه كه ئه‌وان به تووندی له‌و باوه‌ڕه‌دان ڕوژێك دێ ده‌گه‌ڕێنه‌وه به‌ر ڕه‌حمه‌ت و كرنۆشی خوداوه‌ند، ڕۆژێك دێت ئه‌و كه‌رامه‌ت و شكۆیه‌ی كه له سۆنگه‌ی یاخیبوونییه‌وه له ده‌ستی داوه بۆی ده‌گه‌ڕێته‌وه. كه‌وایه وه‌ك ئه‌وه‌ی ئه‌وان ده‌یڵێن بۆچی تووڕه‌یی بورووژێنن؟ بۆچی ده‌خاله‌ت له‌نێوان فریشته‌یه‌كی لێكه‌وتوو و خوداوه‌نده‌كه‌ی بكرێ؟ ئایا خوداوه‌ند پێویستی به‌وه هه‌یه كه ئێمه نه‌فره‌ت له‌وه بكه‌ین كه خۆی سزای داوه، ئایا ناشێ لێی خۆش ببێ؟ هه‌روه‌ها بێته‌وه ئایا پێویست ده‌كات

شمشێرەکەت بەڕووی یەکێك لە نزیکەکانی خوداوەند هەڵبگری کە ئەمڕۆ غەزەبی لێ گیراوە، ئایا ناشێ بەیانی هەموو کەرامەتی بۆ بگێڕدرێتەوە؟

ئەو ئێزیدییانە بە زۆری لە دەوروبەری چیای شەنگالدا دەژین، کە یەکێك لەو زنجیرە چیایانەیە کە پێدەشتی میزۆپۆتامیا لە باشوور–ڕۆژهەڵاتی ماردین دەبڕێ و دار مێو، هەنجیر، قەیسی بەشێوەیەکی خۆڕسك تێیدا دەڕوێ. هەرچی لە زستانە لە ئەشکەوتەگەلی هەڵکەندراو لە خوارووی ئەم چیایانەدا دەژین. هەرچی لە مانگەکانی هاویندایە، لە پێدەشتەکە بڵاودەبنەوە و پەلاماری کاروانەکان دەدەن و هەموو گەڕۆکێك کە تووشی ببن بەبێ جیاوازی ڕووتی دەکەنەوە. ئەوکاتە لەسەر شێوەی بیابانشینەکان ڕەشماڵ هەڵدەدەن و لەسەر پشتی ئەسپ، بە شمشێر، هەروەها ڕم و دەمانچە و تفەنگ دەجەنگن و هەروەك پارتەکان* کە لە بەشێکی وڵاتدا دەژین، چاك دەزانن چۆن ئەم چەکانە لە کاتی پەلاماردانا بەکاربهێنن و لە کشانەوەدا تەقە دەکەن و بەتاوی زۆر خێرا ڕادەکەن و زۆر بەدەگمەن وادەبێ کە ئامانجەکانیان ناپێکن.

ئێزیدییەکان جلوبەرگیان وەکو جلوبەرگی تورکەکان وایە و بەگشتی پیاویان قۆز، تونودتۆڵ، لەش و لاریان بەهێزە و هەر لە گەنجییانەوە لەگەڵ چەك ڕادەهێنرێن، لەسەر بەرگەگرتنی هەموو شێوەکانی ماندوویێتی و بێبەشبوون ڕاهاتوون. بەڵام خیانەتکار، دڵڕەق و ترسنۆکن، دیلەکانیان دەکوژن یان دوای ئەوەی ڕووتیان دەکەنەوە لەناو بیابان بەجێیان دەهێڵن بۆ ئەوەی لە برسان و لە کڵۆڵیدا لەناو بچن، چەندین نموونەیان لەبارەی ئەو مامەڵە بەربەرییانە بۆ گێڕاینەوە کە لەگەڵ ئەو گەڕۆکانەیان کردووە کە کەوتوونەتە ژێر دەستیان. بەڵام لە دوو یان سێ دەرفەتدا بووە کە بوێری و تەسمیمگرتنی تاقە کەسێك بەس بووە بۆ تۆقاندنیان و ڕزگارکردنی کاروانێك.

ژمارەی دانیشتووانیان لە ملیۆنێك زیاترە و هەتا دوو ملیۆنیش بەگوێرەی برێك لە ڕاپۆرتەکان دەڕوات. دانیشتووان دابەشی سەر چەندین هۆزگەلی بچووکی سەربەخۆ دەبن کە هەریەکێکیان سەرۆکی خۆی هەیە. دەڵێن هەموویان لە بنەواندا لە پێنج بنەماڵە کەوتوونەتەوە، بەڵام ئەمڕۆ بریتین لە هۆزگەلی کۆچەر و

* Parthes :

نیشته‌جیٚ. هه‌ندێکیان له‌وانه له ناویاندا له ئێزیدی سپی و ڕه‌ش پێك دێن: ئه‌وه ڕه‌نگی جلوبه‌رگیانه که ئه‌م وه‌سپه‌ی پێداون. ئێزیدییه ڕه‌شه‌کان ئه‌و پیرانه‌ن که ته‌نها هه‌ر گرینگی به ئیلتیزاماتی خۆیان ناده‌ن به‌ڵکو زۆربه‌ی جار هه‌روا پاسه‌وانی مێگه‌لی هاوبه‌شی هۆزیش ده‌که‌ن.

یه‌کێك له‌و خورافیاته سه‌یروسه‌مه‌رانه‌ی که بایه‌خی پیٚ ده‌ده‌ن و له‌سه‌ر ئه‌وه تاوانباریان ده‌که‌ن که له‌وانه‌یه هه‌ق بێت ئه‌وه‌یه که ساڵی جارێك له که‌ناری ئه‌شکه‌وتێکی گه‌وره له بناری چیای عه‌بدولعه‌زیز[*] کۆده‌بنه‌وه و به‌شێك له شته‌کان و زێڕ و زه‌به‌ره هه‌ره گرانبه‌هایه‌کانی خۆیان پێشکه‌ش به شه‌یتان ده‌که‌ن و ده‌یهاوێژنه ناو ئه‌م چاڵه. ئه‌م قوربانییه ته‌واو ده‌که‌ن که له‌وانه‌یه ڕه‌مزی به‌چاوی سووك سه‌یرکردنی ئه‌وان بێت بۆ ماڵی دونیا، و هاوڕیٚ له‌گه‌ڵ ئه‌م به‌خشینه‌دا، ئاهه‌نگێکی کافرانه و ترسناك ده‌ست پێده‌که‌ن و به ده‌نگی بۆقیه و سیمبال، سه‌مایه‌کی کێوییانه ده‌که‌ن له‌گه‌ڵ هێماگه‌لێکی شێتانه وه‌ك ئه‌وه‌ی ئیلهامی ئایینییان بۆهاتبیٚ.

ئێزیدییه‌کان ژنه‌کانیان له باوکیان ده‌کڕن و هه‌رگیز ڕێگه‌یان پیٚ ناده‌ن دوای هاوسه‌ری لێیان جیا ببنه‌وه، ته‌نها مه‌گه‌ر خۆی ته‌رخانی په‌رستگه‌که‌یان بکات و ئه‌وکاته ڕێگه‌یان پێدراوه و ده‌توانن جارێکی دیکه ژن بهێننه‌وه، ئازادییه‌ك که ده‌شیٚ لای ئێزیدییه‌کان یان شه‌یتان په‌رسته‌کان هه‌بێت و ئه‌مه ئیمتیازێکه ده‌توانیٚ ئه‌وه لێکبداته‌وه بۆچی ژماره‌یه‌کی ئه‌وهێنده زۆری ئێزیدییه‌کان ڕه‌شن. نه‌متوانی هیچ ورده‌کارییه‌ك له‌باره‌ی ئه‌و ئاهه‌نگانه په‌یدا بکه‌م که له دوای منداڵبوونیان ده‌کریٚ.، به‌ڵام زانیم که ئه‌وان ڕێوڕه‌سمی مردوویی له‌کاتی ناشتنی مردووه‌کانیان به خۆشنوودییه‌وه ده‌گێڕن به‌و مه‌رجه‌ی مردووه‌که به مردنێکی قاره‌مانانه مردبیٚ و به تۆڵه‌سه‌ندنه‌وه نه‌مردبیٚ. له‌م حاڵه‌ته‌دا، ڕێوڕه‌سمه‌که به بێده‌نگی ده‌کریٚ.، نزیکترین که‌سه‌کانی مردووه‌که وه‌کو نیشانه‌ی پرسه و له‌ده‌ستدانی شه‌ره‌ف ڕدێنیان ده‌تاشن و نایه‌ڵن ڕیشیان درێژبێته‌وه تا ئه‌و کاته‌ی تۆڵه‌ی مردووه‌که ده‌که‌نه‌وه و کۆستکه‌وتوویی مردووه‌که هێور ده‌که‌نه‌وه.، ته‌نها ئه‌وکاته مه‌راسیمی ماته‌میی بۆ داده‌نێن.

[*] Abdoul-Asiz

لەوانەیە ئەو خورافاتەی کە پێشتر باسم لێوەکرد ئەو بیروڕایە گشتییەی لێوە لەدایك بووبێت کە ئەوانە گەنجینەیەکی گەورەیان لە قووڵایی زەریادا هەیە. جا چ لەبەر چاوتێبڕینی ئەم گەنجینە شاراوەیە بێت یان لەبەر سزادانی دزی و دڵڕەقییان بووبێت، سلێمانی گەورە، بە سوپایەکی بێ شومارەوە پەلاماری دان و تا چیایەکانیان ڕەدووی نان، ڕەزەکانی لێ تێکدان و شوێنەواری هیچ سەوزاییەکی بۆ نەهێشتنەوە و سەری سەرۆکەکەیانی بڕی. ڕاپەڕینێکی چەکداری، سلێمانی گەورەی ناچاری کرد ڕووی سوپایەکەی وەربگێڕێتە لایەکی دیکە و دوای خۆی تەنها یادەوەری بەربەرییەت و ڕقێکی قووڵی دژ بە تورکەکان بەجێ هێشت.



VOYAGE

DE

LA CÔTE DE MALABAR

A CONSTANTINOPLE,

PAR LE GOLFE PERSIQUE, L'ARA[illegible] MÉSOPO-TAMIE, LE KOURDISTAN ET LA TUR[illegible];

FAIT EN 1817,

PAR WILLIAM HEUDE,

LIEUTENANT AU SERVICE DE L'ANGLETERRE;

AVEC UNE GRANDE CARTE ET DES GRAVURES.

TRADUIT DE L'ANGLAIS,

PAR LE TRADUCTEUR DU VOYAGE DE MAXWELL.

PARIS:

LIBRAIRIE DE GIDE FILS,

RUE SAINT-MARC-FEYDEAU, N.° 20.

1820.

بەرگی چاپی فڕەنسی سەفەرنامەکە ١٨٢٠



A

VOYAGE

UP

THE PERSIAN GULF,

AND A

JOURNEY OVERLAND

FROM INDIA TO ENGLAND,

IN 1817.

CONTAINING NOTICES OF

ARABIA FELIX, ARABIA DESERTA, PERSIA, MESOPOTAMIA, THE GARDEN OF EDEN, BABYLON, BAGDAD, KOORDISTAN, ARMENIA, ASIA MINOR, &c. &c.

BY LIEUTENANT WILLIAM HEUDE,

OF THE MADRAS MILITARY ESTABLISHMENT.

LONDON:

Printed by Strahan and Spottiswoode, Printers-Street;

FOR LONGMAN, HURST, REES, ORME, AND BROWN,

PATERNOSTER-ROW.

1819.



بەرگی چاپی ئینگلیزی سەفەرنامەکە ١٨١٩

**به‌شی سیانزه‌م**

ده‌رچوون له ماردین– تێزیان–وه‌سپی دیاربه‌کر–چیای تۆرۆس–مه‌لاتیه–دۆڵی سیواس–ڕه‌وشی جووتیاران له تورکیا–ئه‌ماسیه–بۆلی–هنده‌ك–گه‌یشتن بۆ سکوتاری.

سپێده‌که‌ی ٢٢ ی مانگ له چێشته‌نگاوێکی زۆر زوودا (ماردین) مان به‌جێهێشت. ڕۆژی پێشتر موته‌سه‌لیمی شار حه‌زی خۆی نیشان دا به‌وه‌ی ده‌مانچه‌کانی به‌ر پیشتێنم بکڕێ. به‌لام من زیاد له نرخه‌که‌ی وه‌ك پاره زیاتر به ده‌مانچه‌کانمه‌وه دڵبه‌سته بووم، چونکو له‌و سه‌فه‌ره‌ی که له به‌رده‌مما مابوو ده‌مانچه‌کان ده‌توانن به‌رگری له پاره‌که‌م بکه‌ن ، به‌لام پاره‌که‌م ناتوانێ به‌رگری له که‌سیی خۆم بکات. بۆیه من هیچ مه‌یلی ئه‌وه‌م نه‌بوو له‌ده‌ست خۆمی بکه‌مه‌وه و بۆ ئه‌وه‌ش تا زۆر به ڕه‌قی داوایه‌که‌ی ڕه‌ت نه‌که‌مه‌وه پێم وت که من ناتوانم به که‌متر له دووسه‌د پیاسته‌ر بیانفرۆشم، پێم وابوو که داواکردنی نرخێکی وا به‌رز وای لێ ده‌کات واز له‌و هه‌وه‌سه‌ی بهێنێ. که‌چی له‌و ساته‌وه‌خته‌ی که به‌سه‌ر پشتی ئه‌سپه‌که‌م ده‌که‌وتم، ئه‌و پاره‌یان بۆ هێنام و ناچار بووم پابه‌ندی قسه‌که‌ی خۆم بم. ئه‌وه به‌م شێوه‌یه که پیاوه گه‌وره‌کان بازرگانی خۆیان له ڕۆژهه‌لاتدا ده‌که‌ن. به‌لام ئه‌و گه‌ڕۆکه‌ی که ده‌که‌وێته ژێر ده‌ستیان ئازادی هه‌ڵبژاردنی نییه، به‌ڵکو هه‌ندێك جار به بێ هیچ ڕه‌چاوکردنێك ده‌ست به‌سه‌ر ئه‌و شتانه‌دا ده‌گرن که پێیانه بێ ئه‌وه‌ی که‌مترین قه‌ره‌بووی بکه‌نه‌وه، واش ده‌بێ بڕێك جار لایه‌نی هه‌ره لاواز له‌م گۆڕینه‌وه‌یه به‌زۆره‌دا قازانج ده‌کات، هه‌روه‌ك ئه‌وه‌ی له‌م بۆنه‌یه‌دا به‌سه‌ر مندا هات.

یه‌که‌مین به‌شی ڕێگاکه له ده‌رچوون له ماردینه‌وه به‌ناو وڵاتێکی بیابان و چیایی که هه‌ر وه‌ك هاوڕێکانم ده‌ڵێن پڕ ده‌بێ له گرووپگه‌لی تالانچی. ئه‌وه‌نده‌ی توانیمان به گرووپی به‌ڕیز له‌پاڵ یه‌کدا ده‌ڕۆیشتین و چونکه ئه‌سپه‌کانمان له ڕه‌وشێکی باشدا بوون، دوای شه‌ش کاتژمێر ڕۆیشتن، به بێ هیچ ڕووداوێك، به‌لام به زیاتر له جارێك ئاگاداریکردنه‌وه گه‌یشتنیه تێزیان. ئاخاوتنی هاوڕێکانم به‌س بوو بۆ ئه‌وه‌ی له‌وه تێبگه‌ین، به‌لام بێ گومان زیاتر له چه‌ند جارێك چاومان به گرووپه‌یلی چه‌کداری خه‌ڵك ده‌که‌وت که به‌لای که‌مییه‌وه سیمایان جێگه‌ی گومان

بوو و خۆیان مۆڵ دابـوو بـۆ دۆزینـەوەی دەرفـەتێك چـەند پیادەیـەکیان بکەوێتـە بندەست. ئەم دزانە بەشێوەیەکی ئاسایی لەسەر شێوەی گرووپـی چـوار تـا پێـنج کەسیی لەسەر لووتکەی ئەو بەرزاییانە دەوەستن کە ئێمـە پێیانـدا تێپـەڕ دەبـین. هــەر یــەك لەوانــە دەمانــچەیەکی لــە دەســتە و بڕێــك جــار دزە دەکەنــە نــاو دارودرەختــەکان خۆیــان دەشــارنەوە و ئامــادەن بــۆ تەقــەکردن ئەگــەر ببیــنن ڕەوشەکە لەبار بێ. چەند تەقەیـەکمان بـە دەمانـچە بـە ئاسمانـا کـرد بـۆ ئـەوەی نیـشانیان بـدەین کـە ئێمـە ئامـادەین داکۆکی لـە خۆمـان بکـەین. ئـەوان خۆیـان گەیانــدەوە نــاو چــیایە هــەرە ســەختەکان و ئاوڕیــان دایــەوە داخــۆ ئێمــە بــە شــوێنیانەوەین، شــیمانەی ئــەوەش هــەبوو کــە ئــەوانیش زارەتــرۆق بــووبن وەك ئێمـەمانان، چـونکە کاروانەکـەی ئێمـە بەگـشتی ناسـراو بـوو بـەوەی گـەورەترین تالآنچی بەڕێوەی دەبەن کە بەناو وڵاتدا تێپەڕ دەبن.

تێزیان–خان ئاواییەکی گەورەیە ئەو چـەند ژمـارە ڕووبـارە بـچکۆلانەیەی کـە ئـاوی دەدەن دەڕژێنــە نـاو دیجلـەوە. بینـای سـەرەکی گوندەکـە کەوتۆتـە سـەر بەرزاییەك کە کەوتۆتە ناوەڕاستەکەی. لە کاتی گەیـشتنمان ئێمـەیان بـرد بـۆ نـاو هۆڵێکی گەورەی زۆر تاریك. دوای ماوەیەك سەرۆکی هۆزەکە بە خۆیی و بیست تـا سی دەستوپێوەندی ڕوخسار ناشرین و چەکدار لە تۆقی سەریانەوە تا بنی پێیان، هات بۆ ئەوەی بمانبینێ کە بە چاوێکی شەڕانی و درۆدۆنگەوە تێیـان دەڕوانـین و بە بێ پێـشەکی لـەو شـوێنەیان وەدەرنـاین کـە تێیـدا بـووین و دەسـتیان بەسـەر شوێنەکەدا گرت کە ئەمە بووە هۆی دەمەقاڵێیەکی توند لەنێوان تەتەرەکـەمان و ئەو سەرۆکە. سەرۆکەکە کوردێکی بالآبـەرز و ڕوخـسارێکی وەحـشییانەی هـەبوو. وادیار بوو گومانی لەڕاسـتی ئـەو فرمانـە هـەبوو کـە پێمـان بـوو و دەیویـست ئـەو سـەرانە ببـینێ کـە تەتەرەکـەم ئـەرکی ئـەوەی پـێ سـپێردرابوو بیانگەینێتـە کۆنستانتینۆپل. تەتەرەکـە لـە بوخـچەیەکدا قووتوویـەکی بـچووکی چوارگۆشـەی دەرهێنا، سەری پاشا بەدبەختەکەی پیشان دا و بە خۆڕاگرییەوە پێـی وت: "بـەم شـێوەیە دەکـرێ سـەری تـۆش بپـەڕێ، مـستەفا ئاغـا ئەگـەر جورئـەت بکـەی سووکایەتی بە کارمەندانی دەوڵەت بکەیت". وا دیار بوو ئەم تالآنچییە زۆر بایەخی بەم هەڕەشەیە نەدا بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تاسیری هـەر لەسـەری هـەبوو، چـونکە

کشایه‌وه و دڵنیـای کردینـه‌وه کـه ئـه‌و ڕێـز لـه فرمانه‌کـه ده‌گـرێ. شـانازیکار بـه سه‌ربه‌خۆیی خۆیـه‌وه، له‌وانه‌یـه هـه‌رگیز تووشـی هه‌ڵوێـستی هاوشـێوه نـه‌بووبێ، به‌ڵام ئه‌م نمایشه لێکدانه‌وه‌ی سه‌نگینی بـۆ هێنـاوه. ئێـواره، ئازووقـه‌ی زۆری بـۆ ناردین، هه‌روه‌ها لیبۆکۆکیشی بۆ ناردین بۆ کات به‌سـه‌ربردنمان. کاتێـك ویـستمان بخـه‌وین، سـه‌رۆکه‌که‌مان ڕایـسپاردین کـه شمـشێره‌کان و ده‌مانـچه‌کانمان لـه‌ژێر ده‌ستمان بێ، ئاماده بـۆ بـه‌کارهێنانی ئه‌گـه‌ر هـه‌ر حاڵـه‌تێکی خیانـه‌تکاری هاتـه پێشه‌وه.

٢٣ ی مانگ هێشتا به‌ناو وڵاتێکی زۆر ڕووته‌ن و کێوی تردا ده‌ڕۆیـشتین. هـیچ شێوه‌یه‌کی کشتوکاڵکردنی تێدا نه‌بوو، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا دوای ئه‌وه‌ی دوو ئاواییمان بڕی کـه بـه هـیچ شـێوه‌یه‌ك نه‌چووینه ناویانـه‌وه، ناوچـه‌که خـه‌ریك بـوو دیمـه‌نی جوانتری نیشان ده‌دا، گردی ڕووته‌ن نـه‌ما و پێده‌شـتێکی پـان و بـه‌رینمان بـینی، چـاك چـێنراو و چـه‌ند ئاواییـه‌کی بـه‌خۆوه گرتبـوو. کـشتوکاڵ تێیـدا گه‌یـشتبووه ئاستێکی به‌رزی ته‌واو. کێڵگه‌کان داپۆشرابوون به په‌ین و به گاسـن کـه لـه لایـه‌ن مانگای به‌هێز و به‌رز ڕاده‌کێشران، ده‌کێڵران. له‌ماوه‌ی سه‌فه‌رێك که هه‌زار میلمـان بڕی، ئه‌وه تاقه ناوچه‌یه‌ك بوو که به‌شێوه‌یه‌کی نیزامی چێنراوبێ کـه مـن بینیـبم. لـه شـوێنه‌کانی دیکـه کاتێـك زه‌وی ئاماده‌یـه بـۆ درووێنـه ، تـه‌نها ئه‌وه‌نـده‌ی لـێ چاوه‌ڕوان ده‌کرێ که به‌س بێ بۆ تێرکردنی ژماره‌یه‌کی که‌می دانیشتووان. له‌گه‌ڵ نزیکبوونـه‌وه‌مان لـه دیاربـه‌کر، ڕێگه‌کـه زۆر سـه‌ختتر ده‌بـوو و زۆربـه‌ی جـار زۆنگاوه‌کان ده‌یانبڕی و ڕێگه‌کـه بـۆ مـاوه‌ی چـوار میلـی دوایـی بـه‌ناو چیایه‌کاندا ته‌سـك ده‌بـۆوه. لـه نوێـوه ڕووبـاری دیجلـه‌مان بینییـه‌وه، هه‌میـشه خێـرا و ئـه‌و هێنده‌ی خوارووی مووسڵ پێچی ده‌کرده‌وه و دوای ئه‌وه‌ی کـه سـێ پردمـان بـڕی کـه دووانیـان زۆر چـاك دروسـت کرابـوون و لـه ده که‌وانـه‌ی جـوان پێکهـاتبوون. کاتژمێر پێنج و نیو گه‌یشتینه به‌ر ده‌رگای ده‌ره‌وه‌ی شار.

دیاربـه‌کر وه‌کـو ئامـه‌دی کـۆن ناسـراوه و تورکـه‌کان ئامـاژه بـه ڕه‌نگـی ئـه‌و به‌رده‌ی که بینایه سه‌ره‌کییه‌کانی شاره‌که‌ی پێ دروست کراوه نـاوی قـه‌ره ئامـه‌د یان (ئامه‌ده ڕه‌ش) یان لێناوه. زۆر که‌م ناوچه هه‌یه لـه ڕۆژهـه‌ڵات کـه دیمـه‌نێکی زۆر نوێ و زۆر سـه‌رنجڕاکێش بـه گه‌شـتیاری ئـه‌ورووپی ببه‌خـشێ. وادیـاره دیجلـه

سنووری ژیانی مرۆڤایەتی تێدا دیاری دەکات. هەرکە لە پردەکە پەڕینەوە لە هەموو لایەکەوە تارمایی مانەوەی مەرگ خۆی نیشان دەدات، گۆڕستانەکان ئاپۆرەی داین و دیوارێکی مەڕمەڕی ڕەش دەوران دەوری داوە کە ئەوە زیاتر ئیلهامبەخشی ماتەمیی دەبەخشێ. لەژێر دەرگا گەورە بەرزەکان ئاپۆرەی خەڵکی ترساومان بینی کە جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگیان لەبەردابوو وەك ئەوەی ئافەریدەی جیهانێکی دیکە بن و هاتبنە ئەو ناوچەیەی کە پێشتر تێیدا ژیابوون. هەمان سەرنج کاتێك بە شەقامەکانی ناو شاردا تێپەڕ دەبووین. ئەمە پێویستی بە خەیاڵێکی زیندوو نەبوو چونکە گەڕۆکەکان دەشێ باوەڕ بەوە بکەن کە لە کۆشکی ئەفسوون و بێ هیواییدان کە شەهرەزادی جوان وەسپێکی هێندە زیندووی کردووە نەبێتەوە.

هەرکە گەیشتینە ناو ئەو کاروانسەرایەی کە بە تەنیشت کۆشکی پاشاوە بوو و بۆ پێشوازیکردنی نێردراوگەلی گشتیی تەرخان کرابوو، ئێوارە لەسەر شێوەی تورکی نانیان داین، واتە خواردن دوای خواردنیان بۆ دەهێنایین. یەکەمیان کە پێشکەشیان کردین بریتی بوو لە برنجێکی زۆر خراپ کولاو بەڵام یانزە کاتژمێر و نیو ڕۆیشتن کردی بە خواردنێکی خۆش تام. دووەمیان و سێیەمیان بە هیچ شێوەیەك لە هی یەکەم چاکتر نەبوون، بەڵام گوێم لێ بوو کە وتیان دەمودەست بەڕێ دەکەوین. تەنها بیرم لەوە دەکردەوە کە کاتەکەم بەشێوەیەکی چاك بەکاربهێنم: لەگەڵ ئەوەشدا دواتر پڵاوێکی نایاب، ئێغنییەکی* بەتام و هەموو جۆرە شیرنەمەنییەکیان بۆ هێنایین. ددان بەوەدا دەنێم کە ئەوکاتە هەڵەیەکی گەورەم لە سیاسەتدا کرد کە وادەم بە خۆم دا کە پارێزگاری لە هێزی خۆم بکەم بۆ دواڕۆژ تا کۆتایی شەڕەکە. لەگەڵ ئەوەشدا بەیانییەکەی بەو پێیەی کە خواردنی یەکەم و دووەمم لە چاوەڕوانی خواردنی سێیەمدا پشتگوێ خست ، بەڵام هیچ شتێکی دیکەیان بۆ نەهێنایین تا گەیشتمە نانی ئێوارە: بۆ ورياکردنەوەی گەڕۆکە هەستیارەکان و بۆ بەرژەوەندییان ئەم حەقایەتە دەگێڕمەوە.

---

* ئێغنی: ragout بە عەرەبی واتە (يخنه)، بریتییە لە پارچە گۆشتی ورد کە لەسەر شێوەی گۆشتاو دەکولێندرێ، وەرگێڕ.



HAMOUD-BEG-EFFENDI.

حه‌موود به‌گ ئه‌فه‌ندی





TURC DE MERDYN.

تورکێکی ماردینی

که‌مێك زانیاریم له‌باره‌ی ئه‌م شاره وه‌گیرخست كه پێشتر نه‌زانراو بوون. ته‌واوی ئێواره و ته‌واوی به‌یانییه‌كه‌ی ڕۆژی دواترم له‌گه‌ڵ ئه‌رمه‌نییه‌ك كه خۆی پێشكه‌ش كرد ببێ به ڕێبه‌رم به‌ناو شاردا سووڕاینه‌وه. بینیم بینایه‌كانی شاره‌كه به‌شێوه‌یه‌كی زۆر چاك دروست كراون كه له بینای هه‌ر شارێكی دیكه‌ی ئیسلامی چاكتر دروست كراون به بێ هه‌ڵاوێردان هه‌تا به شاری كۆنستانتینۆپلیشه‌وه. شه‌قامه‌كانی به‌گشتی ته‌ختكراو و تا ڕاده‌یه‌ك خاوێنن و له شاره‌كانی دیكه فراوانتر بوون. بازاڕه‌كانی گه‌وره و پڕبوون له كه‌لوپه‌ل.، حه‌مامه‌كانی له به‌ردی مه‌ڕمه‌ری ڕه‌ش دروست كراون و خۆش و ڕێكوپێكن. مزگه‌وته‌كان كه زۆربه‌یان بریتین له كۆنه كلێسه‌ی مه‌سیحییه‌كان، ژماره‌یان زۆرن و چاك دروست كراون. شاره‌كه له باكوور قه‌ڵایه‌ك ده‌یپارێزێ كه دیواری زۆر به‌رزی به‌ده‌وره‌وه‌یه كه وه‌ك دیواره‌كانی شار به‌هێزن و قه‌ڵایه‌كه ژماره‌یه‌ك بورجی چوارگۆشه كه تۆپخانه‌ی به‌سه‌ره‌وه‌یه وێڕای ئه‌وه‌ی كه به گشتی تۆپه‌كان له ڕه‌وشێكی خراپدان و به‌كار نایه‌ن. له‌سه‌ر ژماره‌یه‌ك له‌و بورجانه‌ی كه وا پێده‌چێ له چه‌ند ده‌ورانێكی جیاوازدا دروست كرابن. هه‌روا ده‌بینین له‌سه‌ر ده‌رگاكانیش نه‌خش و نیگارگه‌لێك،

کە برێکیان لەسەر بەرد و هەندێکی دیکەشیان لەسەر خشت هەڵکەندراون، بەڵام نە هێندە کاتم هەبوو و نە زانیاریی زمانەوانیم هەبوو تا لەو نەخش و نیگارانە تێبگەم. ڕێبەرەکەم کە واپێدەچوو پیاوێکی تا ڕادەیەك ڕووناکبیر بێ، پێی وتم ئەوان گریمانەی ئەوە دەکەن وەك ئەوەی گریمانەی ئەو نەخش و نیگارانەش کە بەسەر پردەکانەوەیە، ئاماژە بە مێژووی دروستکردنی ئەم بینایە دەکەن و ناوی سوڵتان یا ئەو پاتشایەی کە ئەوکات حوکمڕانی کردووە لەسەر هەڵکەندراوە.

پاش ئەوەی سووڕێکم بە دەوری شوورەی شارەکە لێدا لە دەرگای ماردینەوە تاوەکو دەرگای داغ، کە بریتییە لە نیوەی شوورەی شارەکە.، دەتوانم چیوەی شارەکە بخەمڵێنم کە دەگاتە نزیکەی پێنج هەزار و سێ چارەگە میل و ئەوە تەنها لێرەدا بووم کە توانیم ژمارەی دانیشتووانەکەشی بە گریمانەی ئەوەی کە سێ چارەگی ئەو ڕووبەرەی کە کەوتۆتە نێوان شوورەکان بریتین لە شەقامەکان و ئەو ڕووبەرەشی کە ماوەتەوە دەشێ یانزە هەزار ماڵێك بگرێتەوە کە هەریەکێکیان حەڤدە پێی چوارگۆشە دەبێ بخەمڵێنم. هەر ماڵێك بەشێوەیەکی گشتی لە دوو نهۆم پێك دێت. بە گریمانەکردنی ئەوەی کە لە هەر ماڵێك پێنج کەس بژی، بەم شێوەیە ژمارەی دانیشتووانی شارەکە پەنجا و پێنج هەزار کەس دەبێ و ئەم ئەنجامە هاوجووتە لەگەڵ ژمارەی ئەو شارە ڕۆژهەڵاتییانەی کە ژمارەی دانیشتووانەکانی دەزانین.

٢٤ ی مانگ لە یەکی پاش نیوەڕۆ دەرچووین، تەواوی ڕۆژەکە هەر باران دەباری و بەشێکی زۆری شەوی پێشووش هەر باریبوو و وەك چۆن ئەو ڕێگەیەی کە پێیدا تێپەڕ دەبووین پڕی بوو لە جۆگاو بەشێوەیەك کە هەتا قامچیش نەیدەتوانی پاڵ بە ئەسپەکانمانەوە بنێ بۆ پێشەوە کە برێك جار هەموو قاچیان لەناو قوڕو لیتەدا دەچەقی. هەموو جۆگەلە ئاوێك بووبووە سێلاوێك کە تەنها بە مەلەکردن دەتوانرا لێوەی دەربچین. لەگەڵ نزیکبوونەوەی ئێوارەدا ئەسپەکان ئەو هێندە هیلاك بووبوون کە تەنها تەتەرەکان دەیانتوانی خەیاڵ بکەن کە هێشتا بڕۆن بەڕێوە. بەڵام من لەگەڵ تەتەرەکانا بووم و ئێمە بەردەوام بووین لە ڕۆیشتنی خۆمان هەرچەندە ئەو پاسەوانانەی کە لە دیاربەکرەوە بەگەڵمان کەوتن ڕەتیان کردەوە دوورتر لەگەڵمان بڕۆن و ئێمەیان بۆ چارەنووسی خۆمان

جێهێشت. له‌ماوه‌ی چوار یان پێنج کاتژمێری دواتری گه‌شته‌که‌مان به‌ناو تاریکاییه‌کی ئه‌نگوسته‌چاو و باران بارینێکی به‌رده‌وامدا ده‌ڕۆیشتین. من لام وابوو که ئێمه له چوار تا پێنج میل زیاتر ناڕۆین. له هه‌ر هه‌نگاوێکدا ئه‌سپه‌کانمان ده‌که‌وتن و ته‌نها به ژه‌می تایبه‌تیی دوو هێنده‌بووی قامچی هه‌ڵده‌ستانه‌وه. دواجار دوو له هاوڕێ سه‌ره‌کییه‌کانمان که هه‌وڵیان ده‌دا له ڕووبارێکدا بپه‌ڕنه‌وه، خه‌ریك بوو به‌خۆیان و ئه‌سپه‌کانیانه‌وه له ڕووباره‌که نوقم ببن دوای ئه‌وه‌ی شه‌پۆله‌کان ڕایماڵین، ئه‌وه‌ی که وای لێ کردین بوه‌ستین.

ماوه‌ی یانزه کاتژمێر له‌به‌ر بارانێکی به‌رده‌وامدا بووین و ئه‌و هێنده به ته‌واوی ڕێگه‌مان لێ ون ببوو که نه‌مانده‌زانی بۆ پێشه‌وه ده‌چین یان ده‌گه‌ڕێینه‌وه دواوه. به خۆشییه‌کی زۆره‌وه له دووره‌وه بینیمان ڕووناکییه‌ك ده‌بریسکێته‌وه و به‌ناو قوڕ و لیته و دار و ده‌وه‌ن و که‌لاوه‌دا به‌ره‌و لای ڕووناکییه‌که ڕۆیشتین. کووخێك بوو که‌وتبووه قه‌دپاڵی گاشه‌به‌ردێك. که‌ش و هه‌وایه‌که‌ی ئه‌و هێنده خراپ بوو که دۆست و دوژمن تێیدا په‌ریوه بووبوون. له‌ناو ئه‌و کووخه‌دا چاومان به بازرگانی مه‌سیحی، گه‌ڕۆك و ژماره‌یه‌ك دز که‌وت که ته‌نها له‌سه‌ر تالان و بڕۆیی ده‌ژیان. کووخه‌که هێنده گه‌وره نه‌بوو تا له‌گه‌ڵ ئه‌وانه‌ی له پێش ئێمه‌دا له‌وێ بوون شوێنمان ببێته‌وه. به‌ڵام ته‌ته‌ره‌کانمان هیچ له‌وه نه پرنگانه‌وه له‌وه‌ی که ئه‌وانه‌ی له‌وێ بوون ڕه‌دوویان بنێن و ده‌بێ حه‌قی خۆیان به قازانجی خۆیان بۆ بگێڕمه‌وه و بڵێم که ئه‌وانه له‌م ڕه‌وشه‌دا ده‌رده‌که‌ون که هیچ جیاوازییه‌ك ناکرێ له‌نێوان باوه‌ڕداره‌کان و گاوره‌کانه‌وه.

باقی شه‌وه‌که‌مان له‌م کووخه‌دا به‌سه‌ر برد که تا سه‌ر ئێسقان ته‌ڕ بووبووین و تا ئه‌ژنۆشمان له‌ناو قوڕدا بووین و له برسان ده‌مردین و خه‌ریك بوو دووکه‌ڵی ئه‌و ئاگره بمانخنکێنێ که دامانگیرساندبوو. هه‌رچی ئه‌و توره‌گه‌یه بوو که ئه‌و سه‌ره براوانه‌ی تێدا بوو که هه‌ڵمان گرتبوو، بووبووه سه‌رینی من که خۆم پێوه نووساندبوو. ده‌کرێ خه‌یاڵی ئه‌وه بکرێ که ڕه‌وشی ئێمه چۆن بووه، به‌خته‌وه‌ر بووین که نه‌وایه‌کمان دۆزیبۆوه. له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌شدا ئه‌مه دواین ناخۆشیمان نه‌بوو. باران له به‌یانی سبه‌ینه‌که‌ی به‌رده‌وام ده‌باری و ته‌متومانێکی ئه‌وهێنده چڕیشی له‌گه‌ڵدا بوو که هیچ ڕێبه‌رێکیشمان له‌گه‌ڵدا نه‌بوو و جارێکی دیکه ڕێگه‌مان لێ ون

بۆوە. بیست و چوار کاتژمێرمان پێویست بوو تا بگەینە ئارگۆنا لە بناری چیای تۆرۆس لەکاتێکدا بەشێوەیەکی ئاسایی ماوەی ئەم ڕێگەیە سێزدە کاتژمێرە و لە تەواوی ئەم ماوەیەشدا هیچ جۆرە توێشووەکمان پێ نەبوو. من لە هیندستان هەندێك جار تێبینی تیژڕۆیی ڕووبارەکانم کردبوو لەناو چیایەکانی ئێمەدا کە دەڕژێتە ناو جۆگەلەیەك و لە چیایەکانەوە دێتە خوارەوە، بەڵام هەرگیز وەك ئەو سێلاوەم نەبینیوە کە ئێستە بینینم. ڕووبارێکمان بڕی کە بە ئاستەم توانیمان سەرچاوەکەی دیاری بکەین. وتمان ڕەنگە برێك لە بەربەستەکانی زەریای ناوەڕاست پڕبووبنەوە بۆ غەرقبوونی پێدەشتەکە و ئەوانەی کە لە دواوە بوون برێکیان ئاو تا پشتێنیان دەهات لە کاتێکدا لە هەمان ئەو ناوچەیە ئەوانەی یەکەمەکان کە پێیدا تێپەڕبوون بە ئاستەم سمی ئەسپەکانیان تەڕ بوو بوو.

ئارگۆن وەکو ماردین کەوتۆتە سەر لووتکەی چیایەکی بەرز، بەڵام تەمتومانەکە ئەوهێندە خەست بوو و باران ئەوهێندە بەردەوام دەباری و وەك چۆن ئەوەی کەمێکیش نەحەسابوومەوە، وایان کرد ئەم شارە نەبینم. ئەم شارە بە شەراب بەناوبانگە کە لە دەوروبەری شارەکە، وەك ئەوەی لە چیای تۆرۆس و پێدەشتی خارپووت لە لای دیکە کەمێك دوورتر بەرهەمی دەهێنن. دەڵێن کە ئەم ڕەزانە چەندین جۆرە شەرابی هەمەچەشنە بەرهەم دەهێنن بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەمتوانی لە بوتلێکی بچووکی سووری بۆنخۆش زیاتر بەردەست بخەم کە زۆر بەناوبانگترە لە شەرابی بورگۆن و ناتوانێ شان لەشانی بدات.

لە ٢٦ ی مانگ، کاتژمێر یانزەی بەیانی بەسەر پشتی ئەسپی نوێوە بەڕێ کەوتینەوە، تەتەرەکەمان، کاپید–باشی کە سەرە بڕاوەکانی هەڵگرتبوو و لەگەڵ پێنج یان شەش کەسی دیکە لە پێشەوەدا دەڕۆیشتن. ڕێگەکە سەخت بوو دەستی کرد بەوەی ببێتە بەرزایی. لەکاتژمێر یەك یەکێك لە لقەکانی ڕووباری دیجلە، کە لەو ناوچەیەدا تەنها ڕووبارۆچکەیەکی بچووك بوو، بەسەر پردێکی سێ کەوانەییدا بڕی و پاشان دەستمان کرد بەوەی بەسەر زنجیرە سەرەکییەکانی چیای تۆرۆسدا سەربکەوین. کاتژمێرێك دواتر، پردێکی دیکەی زۆر بەرز کە لە دوو کەوانە پێکهاتبوو بڕی و گەیشتینە مادن، ئاواییەکی گەورە، بەقەدپاڵی چیای تۆرۆسەوە کە بە کانی مس بەناوبانگە و هەروەك بارەگای نازیری کانەکانیش بوو. لەکاتژمێر

پێنج، پردی سێیەممان بڕی کە یەك تاقە کەوانەی هەبوو و پاشان کاتژمێر شەش لەبەردەمی یەکێك لە ماڵەکان وەستاین کە وەکو گووشراوەی تریٚ شێلان و گوشین بۆ شەرابسازی لەسەر چیای تۆرۆس بەکاردەهێنریٚ. دوای ئەوەی ماوەی حەوت کاتژمێر بەو خێراییە کە ئەسپەکانمان ڕێگەی پیٚ دەدایـن بەسەر کەوتین.

لە ماردینەوە بە بەردەوامی هەر لەناو بەفردا دەڕۆیشتین و وەك چۆن ڕێگەکە نەکێشراو بوو و هەمیشە لە لێواری نشێوێکی ترسناکدا بووین. ئەوان بە ئاسانی وای بۆدەچوون کە من زۆر بیر لە هاوڕێکانم ناکەمەوە و نیگەران نیم بۆ ئەوانەی لە هێڵی پێشەوەدان و هەتا هەست بە ونبوونیشیان ناکەم. بەڵام کاتێك لەبەردەم ئاگر لە کونجێکی گەرم دانیشتم و شەرابی نایاب دەخۆمەوە کە خانەخوێیەکەم پێشکەشم دەکەن، شاش دەبم لەوەی کە نایانبینم و بەو شێوەیە ون دەبن. هەتا تەتەر و خزمەتکارەکەشی هەموویان ون بوون و لەگەڵ جانتاکان و دوو پیاوی کێوی سەروسیما خراپ کە بە ئاستەم دەمناسین مامەوە. ئەوە بۆمن ئاسان نەبوو تێی بگەم. پرسیاری تەتەرەکەم کرد پێیان گوتم کە بەرەو کۆنستانتینۆپل ڕۆیشتووە، لەکاتێکدا هێشتا ٨٠٠ میل دوورین. هەستم کرد ئەوە شۆخییەکە بۆ ترساندنی من، بەڵام دواتر زانیم کە ئەوە ڕاستییە. بەو پێیەی کە بڕێك لە گەشتیارەکان دەیانتوانی بچن بۆ لای سوڵتان پێش ئەو هەواڵی سەرکەوتنی داود ئەفەندی بە سوڵتان ڕابگەینن، خێراییەکەیان دوو هێندە کردۆتەوە تا پێشیان بکەونەوە و بە بیٚ هیچ پێشەکییەك جانتاکانیان بۆ بەجیٚ هێشتم و وایان کردبوو کە دواتر لەگەڵ جانتاکان بەشوێنیانەوە بچم.

بە تاق و تەنیا لەناو بێگانان و لە وڵاتێکی کێوی و نەناسراو و بە بیٚ هیچ کۆمەگییەك لە هیچ کەسێك، لەسەر چیای تۆرۆس بەجێیان هێشتم، دەشیٚ باوەڕ بەوە بکریٚ کە من خۆم لە ڕەوشێکی تووڕەو نیگەراندا بینیوەتەوە، بەڵام وانەبوو. ئەو جانتایانەی کە لە دوای خۆیانەوە جێیان هێشتبوو بۆ تەتەرەکانمان زۆر گرانبەها بوو هی ئەوە نەبوو سەرەڕۆیی ئەوە بکەن لە دەستی بدەن. کەوابوو هیچ مایەی ترس نەبوو لە مەترسییەك کە بەشێوەیەکی تایبەتی هەڕەشە بکات.، ئێوارە چاك جێگیر بووم و شەرابەکە نایاب بوو. بینیم کە دوو پیاوە نامۆکە ئامادەبوون لەسەر حیسابی من پێبکەنن، لە جیاتی ئەوەی هیچ سوودێك بە من

بگەینن، دەیانەویست باڵادەستیی خۆیـان بەسـەر چـارەوە بارهـەڵگرەکان کـە لـە بندەسـتیاندا بـوو بـە قـازانجی خۆیـان بـەکاربهێنن، پێیـان وابـوو بـە هـەمان ئـەو شـێوەیەی کـە سـەردارەکانیان لەگـەڵیان دەکـەن دەتـوانن هەڵـسوکەوت بکـەن، دەست بەسەر باشـترین ئەسـپ، باشـترین شـوێنی نزیـك ئـاگر، باشـترین قـاڵی بـۆ خەوتن دابگرن. بەڵام وەك چۆن من هەستم بە ناڕەحەتی ئـەم بانگەشـانە کردبـوو لەگەڵ سەرووی خۆیان کـە زیـاتر لـەوان شارسـتانیتر بـوون دەیـانکرد، بۆیـە وەك ئەوەی بۆم بلوێ لەسەر حیسابی خـۆم بڕیـارم دا بـۆ جارێـك و بـۆ تـا هەتاهەتایـە بیانخەمەوە شوێنی خۆیان یان ئەوەتا لەگـەڵیان دەگەمـە دابڕانێکـی ئاشـکرا و بـە تەنیا سەفەر دەکەم. بە ئاسانی سەرکەوتم بـەوەی هـەموو ئـەو شـتانەی لـەوانمان وەرگرتبوو بە خانەخوێیەکەم دان و سیمایەکی گرینگ و بـەرزم نیـشان دا کـە دوو کێوییەکە ناچار بوون ڕێزی لێ بگرن.

لە ٢٧ ی مانگ لە کاتژمێر پێنجـی بـەیانی لـە چـیایەکە دابـەزین و نـاکرێ ئـەو ئاستەنگییەی کە لە سەرکەوتندا بەرەو ڕوومان بۆوە لەگـەڵ ئـەوەی لـە دابەزینـدا تووشی بووین بەراورد بکرێ. دەزانین کە بەرزایی چیای تۆرۆس دەگاتە دە هـەزار پێ. بەو پێیـەی کـە تورکـەکان بـە دەگمـەن نـەبێت بـە پێویـستی نـازانن بـەدوای ڕێگەیەك بڕۆن بەرەو ڕاست یان بەرەو چەپ بـڕوات، بـەڵکو توولەڕێگـەی کـوتراوە دەگرنە بەر کە ڕاستەوخۆ بەسەر گردەکاندا دەڕۆن، بە گشتی ئـەو ڕێگایانـەی کـە بە ئاڕاستەی هێڵێکی ڕاست و ڕەوان دەڕۆن پێم وایـە بـە گشتی بەناوچـەی هـەرە سـەخت و هـەرە مەترسـیداردا دەڕۆن کـە نـەمانتوانی بیگرینـە بـەر. ئەسـتووری بـەفربارین لـە سـاڵدا دەگاتـە شـەش تـا هەشـت پـێ، بێجگـە لـەو توولـە ڕێگەیـە کوتراوەیە، جا وەك چۆن ئەم توولە ڕێگەیە پانییەکەی تەنها هەژدە ئینج و هەندێ جار کەمتریش بۆیە هەر هەنگاوێك بەهەڵە کە بەسەر زەویـدا بنـرێ دەشـێ نـوقمی ناو بەفر ببین یان لـە هەورازێکـەوە پارچەپارچـە ببین. مەترسـی گـەلی لـەوجۆرە کەمتر هەستی پێ دەکرێ لەکاتی بەسەر چیا کەوتنـدا، بـەڵام زۆر هەسـتیار دەبـێ لەو کاتەی کە دێینە خوارەوە. لەگەڵ ئەمەشـدا نـاتوانم سەرسـامی خـۆم بەرانبـەر بەو خۆڕاگرییە دەربڕم کە ئەو دوو هاوڕێیەم بەسەر پشتی زینەکانیانەوە نواندیان و یارمـەتی هـەموو خەڵکـەکانی ئێمـەیان دەدا لـە ئاڕاسـتەکردنی ئەسـپەکانمان.

هەرچی من بووم زیاد له جارێك ویستم پێم بخەمە سەر زەوی بەڵام شەرم دەیگێڕامەوە و بەگوێرەی توانا هەوڵم دەدا بەشوێن تەتەرەکان و ڕێبەرەکانمانەوە بڕۆم. لەگەڵ ئەوەشدا ئەستەم بوو بۆمن تا له کۆتاییدا نەمێنمەوە چونکه لەوانە بوو ڕێگەم لێ ون بوایە ئەگەر یەکێك له تەتەرەکان کە تا دوا ڕادە شارستانی بوو و وانەیەکی لەکاتی ئەسپسواری پێ نەگوتبام کە قەت بیرم لە پیادەکردنی نەدەکردەوە. له ئەنگلستان، کاتێك یەکێك له چیایەك دادەبەزێ، ئەسپەکەی خۆی دەگرێ و بەهێواشی بەو پەڕی وریایی دەڕوات. تەتەرەکە ڕێك پێچەوانەکەی کرد. بە هەڵەداوان ملی ئەسپەکەی خۆی گرت، هەموو ساتێك وای لێ دەکرد هەست بە قامچی و نەقیزە بکات، ئەسپەکە بەم جۆرە شەرمنی سروشتیی خۆی دەشکێ و پێیەکانی پێشەوەی بەهەموو هێزێکییەوە لە زەوی دەچەقێنێ، بەشێوەیەك کە هەنگاوەکانی تەواو زامن دەبن. بڕێك ئەزموون و پێویستی هێندەی نەبرد متمانەیان پێ بەخشیم. کاتژمێر پێنج بە بێ هیچ ڕووداوێك جگە لە ونبوونی ئەسپێك کە کەوتە ناو نشێوێکەوە کە قووڵاییەکەی سێلاوێك بوو و ئاوەکە بە کەفەکەیەوە دەمودەست ڕایماڵی، گەیشتینە بناری چیایەکە. لە ماوەی چوار کاتژمێری دواتر دوو پێدەشتمان بڕی کە چیای نزم لە یەکی جیا دەکردنەوە و کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ گەیشتینە خارپووت[*]، شاربۆتی[**] کۆن، شارێکی گەورەیە و کەوتۆتە ناو دۆڵی سۆفێن[***]، قەڵایەکی بەهێز دەیپارێزێ کە خۆیی و هەرێمە هاوسێیەکانی له لایەن حاکمیەتی پاشای مادن بەڕێوە دەبردرێن.

لە خارپووت تەنها دوو کاتژمێر و نیو بۆ خۆفێنککردنەوە و گۆڕینی ئەسپەکانمان ماینەوە. لەو ڕۆژەوە ئەوهێندە بەخێرایی دەڕۆیشتین کە خێرایی ڕۆیشتنەکەمان ڕێگەی نەدەداین هیچ شتێك ببینین. کاتژمێر چوار و نیوی ئێوارە بەڕێ کەوتین و تا ئۆکسۆلی[****] نەوەستاین کە له ٢٨ ی مانگ، کاتژمێر پێنجی بەیانی گەیشتین. شارێکی بچووکە کەوتۆتە سەر کەناری ڕۆژهەڵاتی ڕووباری

[*] Karpot
[**] Charpote
[***] Sophène
[****] Euxouly

فورات. دانیشتووانەکەی جووتیاری کوردن و پێم وایە ناوی چیس ئۆغلی [*]–یشی پێ دەڵێن. خزمەتکاری تەتەرەکەمان کە لە دوای خۆیەوە بەجێ هێشتبوو بۆ ئەوەی ڕێبەرایەتی کاروانەکەمان بکات پێمان گەیشتەوە. پاشان کەسایەتێکی تورکی لە ئاستێکی باڵا، حەممورد بەگ ئەفەندی (پلانشی ٦)، مێردی خوشکی سلێمان پاشای بچووك كە لە بەغدا لە دەست ستەمی داود ئەفەندی ڕایکردبوو داوای لێ کردین لەگەڵ نۆ یان دە کەس لە دەستوپێوەندەکانی کە لەگەڵیدا بوون لەگەڵ ئێمە سەفەر بکات.

٢٨ ی مانگ، دوای پێنج کاتژمێر حەسانەوە و فراوین خواردن، لە کاتژمێر یانزە بەڕێ کەوتین و دوای شەش کاتژمێر ڕۆیشتن گەیشتینە مەلاتیە یان مالیتێنا [**] ی کۆن. بەو پێیەی ئەسپەکەم لە ڕەوشێکی چاکدا بوو، ویستم هەوڵ بدەم ئەگەر بۆم بکرێ بە تەنیا سەفەر بکەم، بەپێش هاوڕێکانم کەوتمەوە و کاتژمێرێك پێش هاتنی ئەوان گەیشتمە مەنزل–خانە، بینیم کە بە پارەکەم دەتوانم بەچاکی پێشوازیم لێ بکەن و دە دوانزە تەتەرێکیش لەبەر پێمدا بوون. مەلاتیە جاران پایتەختی ئاسیای بچووك بووە. وێڕای ئەوەی کە وا دەردەکەوێ لە دەورانی شکۆی خۆی کەوتبێ کەچی لەگەڵ ئەوەشدا شارێکی گەورەیە. کاتژمێر پێنجی ئێوارە بەجێمان هێشت و دوای ئەوەی بە هەڵەداوان ماوەی پێنج کاتژمێر ڕۆیشتین، لە نیوەشەودا گەیشتینە ئاواییەك بەناوی حەسەن بادریك [***]. ئەو گوندە ژنەکانیان بەناوبانگ نین بەوەی ناوبانگیان باش بێت و پیاوەکانیشیان زیاتر بەلای ئەوەدا دەشکێنەوە کە کرداری نا سروشتی دەکەن. هاوڕێیەکانم پێیان وتم کە دانیشتووانەکەی نە مەسیحین و نە موسڵمانن، بەڵکو زۆربەیان گاوری نەگریس و بەدڕەوشتن.

تەتەرەکان لە سەفەریاندا شێوازێکی تایبەت بە خۆیان هەیە و زۆر ماندووکەرە. وەختایەك ئەسپەکانیان دەگۆڕن ڕێك دەوەستن و پاپیان دادەگیرسێنن و کاتێکیش جگەرەکەیان تەواو دەبێ، خێرایی ڕۆیشتنەکەیان دوو

[*] Djesis-Ogly
[**] Malétina
[***] Hassan-Badrik

هێندە دەکەن. پاشان پەلە دەکەن و زمانیان دەجوولێنن و دەنگێکیان لێ بەرز دەبێتەوە کە لە هاواری ئەسپەکان دەچێ بە پێڕەوکردنی ئەم هەنگاوە. پاشان بە هەموو هێزێکیانەوە ڕادەکەن و هاوارێکی ترسناك و بەردەوامیان لێ بەرز دەبێتەوە و کاتێك بە قامچی لە ئەسپەکانیان و ئەسپەکانی دراوسێکانیان دەدەن تا ئەوکاتەی ئەم حەیوانانە تاقەتیان نامینێ و خەریك دەبێ بکەون ئەوسا دەچنەوە سەر هەنگاوی هێواش و پاپێك دادەگیرسێنن، باز دەدەن و پاشان بە خێرایی دەڕۆن بەم شێوەیە بەردەوام دەبن تا دەگەنە وەستانێك.

٢٩ ی مانگ، ماوەی حەوت کاتژمێر بەناو وڵاتێکی کێوی و چیاییدا ڕۆیشتین لە گوندێکی بچووك بەناوی حەکیم–خان* وەستاین و شەومان تێیدا لەناو کووخێکی پەرپووتدا کردەوە. سەرەتا لە هۆیەکەی تێنەگەیشتم بەڵام زوو بوو بەهۆی گومان کە لەوانەیە گومان لەوە بکەم کە ئەوە بۆ لوتف نواندن بووبێ بۆ هاوڕێ نوێیەکەمان، حەممود بەگ ئەفەندی، کە هەستی بە سووکایەتی و برینداربوونی هەست و سۆزی کردووە ئەگەر لە ماڵە گشتییەکاندا بخەوێ، لە جیاتی ئەوە لە ئاواییەکی بچکۆڵەدا بمینێتەوە کە کەس تێیدا نەیناسێ. دەمانتوانی ڕۆیشتنەکانمان بەشێوەیەکی زۆر ئاسوودەتر بەڕێوە ببەین و بەم شێوەیە چونکە بوونی ئەو لە کاروانەکەمان هێشتا ئاستەنگگەلی دیکەی بۆ دروست دەکردم، دەستوپێوەندەکانی دەستیان بەسەر باشترین ئەسپ، بەسەر هەموو شتێکدا دەگرت کە دەیانبینی و باشترینیان دەبرد بۆیە گەیشتمە ئەوەی کە بڕیارم دا لە نزیکترین دەرفەتدا لێیان جیاببمەوە. بەیانییەکەی یانزە کاتژمێر ڕۆیشتین و شەومان لەناو قەڵایەکی چکۆڵە بەناوی هەلووژە–خان کردەوە.

٣١ ی مانگ، بەوپێیەی شەو بەفرێکی زۆر باریبوو، هەموو شوێنەوارێکی ڕێگەوبانەکانی سڕیبۆوە و زۆر سەخت بوو بتوانین بچینە پێشەوە. چەندجارێك ئەسپەکانمان تا زینیان دەکەوتنە ناو بەفرەوە، یەکێکیان بە بارەوە سووڕا و ڕاماڵرا و ئەوهێندە بە سەختی بریندار بوو کە ناچار بووین دەستبەرداری ببین. دوای ڕۆیشتنێکی حەوت کاتژمێر و نیو گەیشتینە دارغیلتاش، کە لەوێدا چووینە ناو کووخێکی پەرپووت لەکاتێکدا حەممود بەگیان بردە ناو جوانترین خانوو. پێم

* Hakim-Khan

وابوو کە هەقی ئەوەم هەیە بەشداری لەم بەخششەیدا بکەم هەروەك ئەوەی زۆربەی جار ئەو بەشداری لە بەخششەکانی مندا کردووە.، بە بێ هیچ پێشەکییەك بەشوێنییەوە کەوتم هەروەك ئەوەی ئەو لەگەڵ منی دەکرد. دەستوپێوەندەکەی نیازیان بوو بموەستێنن، بەڵام سەرم زۆر بەرز کردەوە و بەشێوازێکی ئاوەها هەڵسوکەوتم کرد کە دەمانچەکەی بەر پشتێنم ببینرێن و شمشێرە گەورەکەم لە زەوی خشاند و ڕۆیشتم بە بێ ئەوەی کەس جورئەت بکات ڕێگەم لێ بگرێ زۆر چاکم کرد چونکە ئێوارە خوانێکی نایابم خوارد و شوێنێکی چاکم بۆ خەوتن بە دەست کەوت. ئەگەر جیاوازی زۆرتری خۆم لەگەڵ نیشاندابوایە ئەوا بەشێوەیەکی پێچەوانە ڕێزگرتنەکەی منی لێکدەدایەوە، ئەو ڕێزگرتنە کە لای تورکەکان نەناسراوە و تووشی ئاستەنگ و هەتا سووکایەتی پێکردنیش دەبووم.

لە ١ ی نیسان، کاتژمێر یەکی سپێدە بە ڕێ کەوتین و دوای ڕۆیشتنێکی نۆ کاتژمێری بەناو ڕێگەیەکی چاکدا، سوولە–مان بڕی و گەیشتینە سیواس، شارێکی گەورە بەڵام پیس و پۆخڵ و خراپ بونیاتنراو، کەوتۆتە ئەوپەڕی باکووری دۆڵێکی بە پیت کە لەوێدا ئەسپی زۆر جوان بەخێو دەکەن. من دەرفەتی ئەوەم بوو چەند ئەسپێکیان ببینم. ئەسپەکان بە گشتی قەبارەیان نزیکەی پانزە پانایی بەری لەپ* بەرزە، بەهێز و تەواو ڕێکوپێکن و پڕن لە بریسکە و وا دیارە بۆ کاری ئەسپسواری شیاون. وەك هەنگاوێکی خۆپارێزی لەکاتی دەرچوونمان لە سیواس بۆ باقی ڕۆژەکە نانی پێویستمان کڕی. دوای ئەوەی بەسەر چیایەکی بورکانیدا ڕەت بووین دوای حەوت کاتژمێر و نیو گەیشتینە ئاواییەکی چکۆڵە کاروانسەرایەکی گەورەی لێ بوو و شەومان تێدا بردە سەر.

٢ ی مانگ، بەیانییەکەی لە کاتژمێر پێنج و نیو بەڕێ کەوتینەوە و نانی سپێدەمان لە کێڵگەیەکی چکۆڵەدا خوارد کە نانی نایابی بۆر، قەیماغی باش، هەنگوینی سروشتی و خواردنگەلێکی دیکەی دەشتەکی لەهەمان جۆریان پێداین. پیاوە پیرەکەی خاوەن کێڵگەکە خۆیی و ژنەکەیی و کچەکانی هەڵپەیان بوو

* پانایی بەری لەپ پێوانەیەکە نزیکەی چوار گرێ دەبێت، وەرگێڕ.

خزمه‌تمان بکه‌ن و له‌و دیو په‌رده‌یه‌که‌وه چه‌ند گه‌نجێکمان بینی که به کونجکۆڵی به‌چاوی ڕه‌شه‌وه ده‌یانه‌ویست ته‌ماشامان بکه‌ن.

پـێم وایـه ئێمـه بـاش لـه هه‌ڵوێـستی جووتیـاران لـه وڵاتـانی موسـڵماندا تێنه‌گه‌یشتووین. له خراپییـه‌کانی سیـستمی ملهورگـه‌رایی (ئیـستیبدادی) ئه‌وه‌یـه وه‌ختایه‌ك (که‌سی ملهور له هه‌مان کاتدا ئه‌گه‌ر خۆی که‌سـێکی سـته‌مکار نـه‌بێت) هه‌رگیز هه‌ست به‌وانه ناکات کـه ده‌که‌ونـه ژێـر هـه‌ژموونی ڕاسـته‌وخۆی خۆیـه‌وه. دوور له‌و تیشکۆ ڕاسته‌وخۆیه‌ی که ده‌بـێ دابگیرسـێنرێ، بـه‌ڵام ئـه‌وه‌ی ده‌یکـوژێ ئه‌وه ئاسووده‌یی خه‌وتنه. جا ئه‌گه‌رچی ئه‌م ڕه‌وشه زۆر شایان نییه بـۆ سروشـتی ئینسانیی به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ته‌واو هاوجووته له‌گه‌ڵ ئاشـتی و خۆشـنوودی نـاو ماڵ. جووتیاری تورك به‌لای که‌مییـه‌وه لـه‌ناو پێده‌شـته‌کاندا ئه‌گـه‌ر لـه‌ناو هـه‌موو ئیمپراتۆریا وا نه‌بێ، جلوبه‌رگی چاکه، چاك ده‌خوا و له‌ناو ماڵێکی گـه‌وره‌دا ده‌ژی که زه‌وییێکی به‌پیت و فه‌ڕی باش چـێنراوی به‌ده‌وره‌وه‌یـه، مێگـه‌لی زۆری هه‌یـه و له‌ناو یه‌کێك له ئاو و هه‌وایه خۆشـه‌کانی جیهانـدا ده‌ژیـن بلێـی به‌ختـه‌وه‌ر نـه‌بێ؟ تیۆرسینه ته‌جریدییه‌کان به نه‌رێ وه‌ڵامـی ئـه‌م پرسـیاره ده‌ده‌نـه‌وه چـونکه ئـه‌و جووتیاره کۆیله‌یه، به‌ڵام ئه‌زموون و لێوردبوونـه‌وه پێـچه‌وانه‌که‌ی ده‌ڵـێن، چـونکه ئه‌و جووتیاره هه‌رگیز ڕه‌وشی دیکه‌ی نه‌بینیوه. ئه‌ی که‌وایه ڕه‌وشی جووتیاران له زۆربه‌ی ئه‌و ناوچه زۆر ئازادانه‌ی که ئێمه ده‌یانناسین چۆنه؟ پێم وایه وه‌ك دکتـۆر جۆنسۆن ده‌یڵێ جووتیار هه‌ڵبژارده‌ی ئه‌وه‌ی هه‌یه کـه: " یـان کـار بکـات یـان لـه برسێتییان بمرێ" جا ئه‌مه‌یان ڕاستییه‌که‌یه، هـه‌موو ئـه‌و پانتاییـه ئازادییـه‌ی کـه چێژی لێ وه‌رده‌گرن ڕۆژوو گرتن یان کارکردنه، خۆ ئه‌گه‌ر بیانه‌وێ کار بکـه‌ن لـه برێکجاردا ناچار ده‌بن خاوه‌ن کارێك قه‌بووڵ بکه‌ن که ئه‌گه‌ر ده‌رفه‌تیان ببێت قه‌ت ڕازی نابن کـاری بـۆ بکـه‌ن. بـه‌ڵام وه‌ك چـۆن چاره‌نووسـیان هـه‌مان چاره‌نووسـه لـه‌ژێر هـه‌ر ئـاو و هه‌وایـه‌ك و هـه‌موو وڵاتانـدا بۆیـه پـێم وایـه ده‌کـرێ بلـێین کـه‌وا کارکردن به به‌خته‌وه‌رییان ده‌گه‌یه‌نێ ئه‌گه‌ر ژیانی ئاسووده‌ییان به فره‌یـی بۆیـان دابین کرا. جا ئه‌گه‌ر جووتیار سه‌رقاڵی بژێوی خێزانه‌که‌ی بـوو ئـه‌وا کـاتی ئـه‌وه‌ی نابێ به‌شوێن تیۆرییه چه‌واشه‌کارییه‌کانی ته‌جریدییه‌کاندا بچێ و هه‌میـشه هه‌سـت به‌وه ده‌کات پێویستی به بیرکردنه‌وه نییه. دوور له کاری ڕاسته‌وخۆی ئاژانـه‌کانی

ملهوڕگەرایی، بەشێوەیەك هەست بەو زوڵمە ناکات کە کەوتۆتە سەرشانی وەك ئەوەی کەوتۆتە سەر دانیشتووانی شارەکان و لاتەریکییەکەی شێوەیەکە لە شێوەکانی ئازادی.، چونکە بەشێوەیەکی ئاسایی ئەوە تەنها لە شارەکانەوەیە کە ملهوڕگەری بەدوای قوربانییەکانیدا دەگەڕێ. ئەوە لە شارە چەوساوەکانەوەیە کە لەژێر حوکمڕانییەکی ملهوڕ و تەواو متمانەپێکراو بە هێزەکانی خۆیەوە دەژین، ڕۆحییەتی ئازادی بۆ داکۆکی و سەندنەوەی ماف سروشت و مرۆڤایەتی ڕادەپەڕێ. بەختەوەر ئەو کەسەیە کە لەم حەماسەتبازییە پیرۆزەدا کە لەم داوا ڕەوایە سەرچاوە دەگرێ ئیلهام وەردەگرێ، بێ گومان نابێ ئەوە لە بیر بکەین وەك مۆنتیسکۆ دەڵێ " ئازادی ماف پیادەکردنی هەموو ئەو شتانەیە کە یاسایەکان ڕێگەی پێدەدەن".

دوای ئەوەی ئەم شوێنە بێوەیانەمان جێهێشت کە بوو بەهۆی لەدایکبوونی ئەم تێبینییانە لەبارەی ڕەوشی جووتیاران لە جوانترین دەروناوچەی ئەم ئیمپراتۆریایە پان و پۆڕەدا، ڕێگەیەکی زۆرچاکمان گرت تا تۆکات کە دوای رۆیشتنێکی پێنج کاتژمێر و نیو تێیدا وەستاین. ئەم شارە کە شاری کۆنی بەریسایە، کەوتۆتە ناو دۆڵێك کە هەردوو ڕووباری چقل–ئەرمەك پێدا دەڕوات و جاران ناوی ئیریس بووە. ئەمە گەورەترین شارە لە ئاسیای بچووك و دانیشتووانەکەی شێست هەزار کەسە. هیوام خواست کە تێیدا بوەستین، بەڵام هەر ئەوهێندە تێیدا وەستاین بۆ گۆڕینی ئەسپەکانمان و دیسان هەشت کاتژمێری دیکە ڕۆیشتین بۆ ئەوەی بگەینە گورکات، کە سێباستۆپۆلی کۆنە.

حەممود بەگ ئەفەندی دەستی بەسەر خزمەتکارە تەتەرەکەم کە لەگەڵ مندا بوو داگرت و هەموو جوولانەوەیەکی ئێمەی بەگوێرەی هەوەسی خۆی دیاری دەکرد، سوور بوو لەسەر ئەوەی کە خۆمان لەشارە گەورەکان بەدوور بخەینەوە و لە دێهاتە هەرە پەڕپووتەکان بمێنینەوە. ٣ ی مانگ زۆر بە ئاشکرایی پێم گوت کە من تکا دەکەم جیاببینەوە و هەریەکێکمان بە تەنیا سەفەر بکات و دەتوانی هەر تەتەرێك دەیەوێ هەڵی ببژێرێ، بەڵام حەزدەکەم خزمەتکارەکەی من بۆ من لێبگەڕێ: هەتا ئەوەشم خستە بەردەمی پاداشتی بدەمەوە ئەگەر بیەوێ ئەویان بۆ من لێبگەڕێ. بەڵام جیابوونەوە بەهیچ شێوەیەك لە پلانەکانی حەممود بەگدا

نه‌بوو که وێڕای ئـه‌و خۆبه‌زلزانینـه‌ی کـه نیـشانی ده‌دا که‌چـی جگـه لـه مرۆیـه‌کی هـه‌ڵاتوو چـیتر نـه‌بوو. ئێمـه تـه‌نها یـه‌ك فـه‌رمانمان پـێ بـوو کـه تایبـه‌ت بـوو بـه کاروانه‌که‌مان و له‌سه‌رێکی دیکه‌وه بیروڕای دیکه‌ی هه‌بوو که توانیم تێیبگه‌م کـه‌وا نیازی چی هه‌یه. حه‌ممود له گه‌نجێتیدا کۆیله‌یه‌کی مه‌ملووك بووه لای سولێمانی گه‌وره دوای ئه‌وه‌ی کرپویه‌تی په‌روه‌رده‌یه‌کی تایبه‌تی کراوه که بتوانێ پێ به پـێ بگاتـه بـه‌رزترین پایـه تـاوه‌کو کـراوه بـه حـاکمی به‌سـره و خوشـکی سـلێمانی بچکۆڵه‌ی هێناوه. له‌و ده‌سته‌یه بوو که بـه‌ژێر نـیردا ده‌ڕۆن تـا ده‌گه‌نـه بـه‌رزترین پله‌ی شایان. دوای کۆچی دوایی سلێمانی بچکۆڵه، بۆ ماوه‌یه‌ك عه‌بدوڵڵا ئه‌فه‌نـدی خه‌لعه‌تی لـێ وه‌رگرتـه‌وه، دوای ئـه‌وه داویه‌تـه پـاڵ ئه‌وانـه‌ی پـیلان ده‌گێـڕن بـۆ که‌وتنی ئه‌م سه‌رۆکه چاکه، به قازانجی ئه‌وه‌ی سه‌عید ببێته پاشای به‌غـدا، بـۆیێ عه‌بـدوڵڵا ئه‌فه‌نـدی ڕقـی لـێ هه‌ڵـده‌گرێ و لـه لیـستی ڕه‌دوونـراوه داواکراوه‌کـانی داده‌نێ و له گێژه‌نی ئه‌م ململانێیه له‌کاتی گه‌مارۆدا، له‌گه‌ڵ نـۆ یـان ده کـه‌س لـه ده‌ستوپێوه‌نده‌کانی که سـووربوون له‌سـه‌ر ئـه‌وه‌ی به‌گـه‌ڵی بکـه‌ون، هه‌ڵـدێ. زۆر خۆی به به‌ختـه‌وه‌ر ده‌زانـێ کـه هێـشتا سـه‌ری نه‌پـه‌ڕیوه. پێـی وتم کـه ده‌چـێته کۆنستانتینۆپل بۆ ئه‌وه‌ی له‌به‌رده‌م سولتان داکـۆکی لـه‌خۆی بکـات و بـۆ ئـه‌وه‌ی بیکه‌ن به فه‌رمانکاره‌یه‌کی وه‌ك کاپیدچی باشی بۆ نموونه.، وای بـۆ ده‌چـوو کـه‌وا باڵوێزی ئێمه لای بابی عالی پشتگیری له داوایه‌که‌ی بکات.

"ئه‌گه‌ر ئێوه له‌و شوێنه گرینگه دانران" من پێم گوت. " ده‌ته‌وێ چ سه‌رێك یه‌که‌م جار پێشکه‌ش به سولتان بکه‌یت؟".

"سـه‌ری داود ئه‌فه‌نـدی پاشـا بـه هـیچ ئه‌ولاوئه‌ولایـه‌ك"، ئـه‌و وه‌ڵامـی دامـه‌وه: "ئه‌گه‌ر ئـه‌و بیتوانیبوایـه سـه‌ری مـنی بـۆ سـولتان ده‌نـارد و ئـه‌و تاقـه سـۆنگه‌ی ئه‌وه‌بوو که من نه‌کرام به پاشای به‌غدا، چونکه ناوی مـن پێـشتر لـه فه‌رمانه‌کـه‌دا نووسرابوو، به‌ڵام کاتێك ده‌گه‌مه کۆنستانتینۆپل پێـشکه‌ش بـه بـاڵوێزی ئینگلیـزم بکه، چونکه من له هه‌ڵسوکه‌وتی ئێوه پیاوێکی ئاست به‌رز ده‌بینم، وێڕای ئـه‌وه‌ی که به ته‌نیا سه‌فه‌ر ده‌که‌ی هه‌روه‌ك ئـه‌وه‌ی به‌شـێوه‌یه‌کی ئاسـایی ئه‌وروپییـه‌کان کاتێـك ده‌یانـه‌وێ بـه‌دوای زانیاریـدا بگـه‌ڕێن، ده‌یکـه‌ن: متمانـه‌ی بـاڵوێز له‌گـه‌ڵ متمانـه‌ی مـن لـه پرۆژه‌کـانم سـه‌رکه‌وتووم ده‌کـه‌ن و ئه‌وکاتـه داود وریـایی خـۆی

وەردەگرێ. خوداوەند یارمەتیدەرە". (تورکەکان فەزاعەتێك ناکەن بە بێ ئـەوەی ناوی خودا نەهێنن)، "سەری دەپەڕێنم و شوێنی دەگرمەوە".

ئەمانە خواستی خاکیی کەسێك بوون کە چەند ڕۆژ پێشتر سـەری لەسـەر تاڵە داوێك وەستابوو. پێم گوت وێڕای ئـەوەی کـە قـسەکانم بڕێـك مەعقولییـەتیان تێدایـە وەك دەردەکـەوێ، بـەڵام مـن سـوور نـابم لەسـەر ئـەوەی لـە گەشـتەکە جیاببمەوە و دوای ئەوە ئاسـتەنگ و ترسـەکانی خـۆم بـۆ شـی کـردەوە. هـەموو ئەوەی کە من دەمویست بەردەستی بخەم ئەوە بوو وادەیەکم پێ بدات کە نەبێتـە سۆنگەی جاڕسکردنم و من بتوانم ئەو ئەسـپە هەڵبـژێرم کـە دەمـەوێ و هـەروەها ئەو خزمەتکارە تەتەرەم بۆ بگێڕێتەوە و لـە دواڕۆژ بەیەکـەوە وەسـتانەکانمان لـە هەر ڕۆژێکدا پێکەوە دیاری بکەین.

لە ئەنجامی ئەم ڕێککەوتنە من توانیم ئەسپێکی نایاب لە کاتی دەرچوونمان لە تورکات بەردەست بخەم و بۆ هێشتنەوەی ئەم ئیمتیازە بە پێش هەموو هاوڕێکانم کەوتمـەوە. دوای ئـەوەی مـاوەی سـێ کاتـژمێرمان بـڕی بـەناو وڵاتێکـی چـیایی و ڕۆمانتیـك، چـوومە نـاو کـوخێکی دارتاشـەکانی نـاو یـەکێك لـە دارسـتانەکان و فنجـانێکی قـاوەم بەردەسـت کـەوت. بـەڵام لـە کـاتی گەیـشتنیان مـن سـواری ئەسـپەکەم بـووم. دوای ڕۆیـشتنێکی شـەش کاتـژمێری هـەروەها لـە ئەماسـیە بـە پێشیان کەوتمەوە.

ئەم شارە کەوتۆتە ناو دۆڵێکی بەرتەسك لـەنێوان چـیای بـەرز و لەگـەڵ باخـچە زۆر و زەوەنـدەکانی هـەردوو ڕووبـاری چـەقلای ئەرمـەق دەبـڕێ. شـارەکە بـەوە بەناوبانگە کەوا سترابۆن لەوێ لە دایك بووە و ئەو ڕووبارەکەی بـەناوی "ئیریـس" ناوناوە و دواتر وەسپێکی نایابی شارەکە دەکات. هەروەها شارەکە ڕوفـاتی پاشـا پۆنت ی تێدایە کە بەشێك لە شانشینی کۆن بوو. شەش کاتژمێر ڕۆیـشتین و شـەو لە شاری ماراسۆن کە شارێکی گەورەیەماینەوە، بەڵام هەرگیز تـرووسـکەی پـاك و خاوێنی لێوە نەدەهات.

لە ٤ ی مانگ، دوای ئەوەی چوار کاتژمێر ڕۆیشتین گەیشتینە شاری عوسمـان چیك، شارێك کـە تـەنها ڕەگەزگـەلی دواکـەوتوو و کێـوی تێدایـە، دەکەوێتـە سـەر ڕووبارێك کە دەڕژێتە ناو قزل–ئەرمەق. بە قەڵایەکی کۆن و جوان و پردێکی جوان

به‌ناوبانگه‌ و ده‌ڵێن به‌ فه‌رمانی سوڵتان بایه‌زید بونیاد نراوه‌. دوای ئه‌وه‌ی ماوه‌ی نیو کاتژمێر له‌ ئێواره‌ و به‌شێکی شه‌و ڕۆیشتین، دوای ئه‌وه‌ی به‌ناو ڕێڕه‌وێکی ته‌سکی هه‌ڵکه‌ندراو به‌ناو چیادا ڕۆیشتین گه‌یشتینه‌ قه‌ڵای حاجی هه‌مزه‌، که‌ قه‌ڵایه‌کی بچووکه‌ و پێی ده‌وترێ ئه‌ندراپی کۆن.

له‌ پێنجی مانگ، دوای ئه‌وی سی میلمان له‌ ده‌رو ناوچه‌یه‌کی نایاب بڕی له‌ تۆسیا چاومان به‌ که‌سایه‌تییه‌کی ئێرانی گه‌وره‌ که‌وت که‌ ده‌گه‌ڕایه‌وه‌ بۆ وڵاته‌که‌ی و که‌سێکی خه‌ڵکی مه‌ڵاتییه‌ که‌ که‌مێك فره‌نسی ده‌زانی و به‌گه‌ڵم که‌وت بۆ ناو بازاڕ، له‌ هه‌مان ڕۆژدا، لووتم به‌ نموونه‌یه‌کی دیکه‌ی بێویژدانی که‌وت که‌ ئه‌فسه‌رانی تورك یا ته‌ته‌ره‌کان ده‌یکه‌ن بۆ ئه‌وه‌ی هه‌رشتێکیان بوێ به‌ هێزی زۆر به‌ده‌ستی بهێنن. من به‌چه‌ند میلێك له‌ پێش هاوڕێکانمه‌وه‌ بووم، کاتێك ته‌ته‌ره‌که‌ که‌ هه‌میشه‌ ڕایده‌کرد بۆ ئه‌وه‌ی له‌ پێشدا ئه‌سپه‌کان ئاماده‌ بکات، به‌ هه‌نگاوی گه‌وره‌ گه‌ڕایه‌وه‌ و داوای لێ کردم باقی کاروانه‌که‌ له‌ کوێیه‌. دوای ئه‌وه‌ی که‌مێك دواتر چه‌که‌کانی پشکنی، چه‌که‌که‌ی منی تاقی کرده‌وه‌ و داوای لێ کردم به‌شوێنییه‌وه‌ بچم. سه‌ره‌تا من لام وابوو که‌سانێك هه‌ن که‌ په‌لامارمان ده‌ده‌ن به‌ڵام پێچه‌وانه‌که‌ی ڕاست بوو. له‌گه‌ڵ یه‌که‌م پێچانه‌وه‌ی ڕێگه‌که‌ چاومان به‌ سێ پیاوی ته‌واو چه‌کدار که‌وت که‌ پانزه‌ ئه‌سپیان پێ بوو. ده‌مانچه‌ به‌ده‌ست په‌لاماری دان و پێش ئه‌وه‌ی ئه‌وان کاتی ته‌واویان ببێ داکۆکی له‌خۆیان بکه‌ن، حه‌وت یان هه‌شت له‌ باشترین ئه‌و ئه‌سپانه‌ی توانیمان هه‌ڵمانبژارد و سوێندمان خوارد که‌ هه‌ر که‌سێك بیه‌وێ ده‌ست بکاته‌وه‌ بیکوژین. ئه‌مه‌ کاری ساته‌ وه‌ختێك بوو و ئه‌م کرده‌وه‌ لێهاتووانه‌یه‌ سه‌رنجڕاکێشه‌ ئه‌وهێنده‌ خێرا ته‌واو بوو به‌ر له‌وه‌ی کاتی ئه‌وه‌م ببێ بیر له‌ ئه‌نجامه‌کانی بکه‌مه‌وه‌. من له‌و باوه‌ڕه‌دا بووم که‌ که‌مترین شتێك که‌ له‌ به‌رامبه‌ر خزمه‌ته‌کانی خۆم وه‌گیری بخه‌م ئه‌وه‌یه‌ که‌ ئه‌و ئه‌سپه‌ هه‌ڵبژێرم که‌ خۆم ده‌مه‌وێ، به‌ڵام ته‌ته‌ره‌ چه‌په‌ڵه‌که‌ پێی وتم ئه‌وانه‌ ئه‌سپی تایبه‌تیی مه‌حموود به‌گ و پیاوه‌کانیه‌تی. که‌ بینیم ئه‌مه‌ کارێکی ناڕه‌وایه‌ و به‌ڵکو دژی هه‌موو پره‌نسیپێکی مامه‌ڵه‌ی شه‌ریفانه‌یه‌ له‌نێوان خه‌ڵکانی یه‌ك چیندا، به‌ بێ ئه‌وه‌ی گوێ به‌وه‌ بده‌م که‌ مه‌حموود به‌گ و پیاوه‌کانی چی ده‌ڵێن، ئه‌سپێکم بۆ خۆم هه‌ڵبژارد و جڵه‌وی ئه‌سپه‌که‌م کرده‌ ملی و ده‌موده‌ست سواری پشتی

بووم و لە جیاتی ئەوەی تەتەرەکە تووڕە ببێت، تەنها بە شۆخییەکەوە وتی: "ئەوروپییەکە یاریدەی دام لە بەردەستخستنی ئەسپەکاندا"، تەتەرەکە وای گوت و " وێڕای ئەوەی کە عەدالەت وایە هەموو شتێك کە پێویستمان بێت لە بێگانەکانی وەربگرین، بەڵام ئێمە هەموومان سەرباز و گەڕۆکین، شێتییە کە هاوڕێیەکان لەنێوان خۆیاندا دەمەقاڵێیان بێ". ئەوە پرەنسیپە ئەخلاقییەکانی بوو.، ئەوەی کە ڕێگەی لێ نەگرت بەیانییەکەی بەرەورووی تەتەرێکی دیکە ببێتەوە و بە شمشێرەکەی برینداری بکات بەرلەوەی کە ئەویان بتوانێ بەرگری لە خۆی بکات، ئێمە تەنها ئەوکاتە توانیمان لە یەکیان بکەینەوە دوای ئەوەی بە دەستی شمشێرەوە خۆمان خستە نێوانیانەوە.

٦ ی مانگ دوای ئەوەی بە شاری قەرەژوان* ڕەت بووین، کە شارێکی چکۆڵەیە و دەکەوێتە پێدەشتێکی بەپیت.، دوای ئەوەی کاروانێکی بیست کاتژمێریمان بە بێ وەستان بڕی، چەند کاتژمێرێك بۆ حەسانەوە لە قەرەژولار** ماینەوە. لە ٧ ی مانگ، لە کەشێکی زۆر سارد کە لەوەتای دوو یان سێ ڕۆژ بوو هەڵی کردبوو و بەفرێکی زۆریش بەردەوام دەباری، ڕۆیشتین. ئەو گەڕۆکانەی کە چاویان پێمان کەوت ئامۆژگارییان کردین چیتر زیاتر نەڕۆین، چونکە ئەوان لە ڕێگەکە مەترسی زۆریان بینیبوو و بەفر ڕێگەی لەوە گرتبوو تەنانەت شوێنەواری ڕێگەکەش بناسرێتەوە، بەڵام تەتەرەکەمان لەگەڵ ئەوەشدا بڕیاری دا بەردەوام بین لە گەشتەکەمان جا ئەمە لە کەللەڕەقییەوە بووبێ یان لە بەسووك سەیرکردنی مەترسی و ماندووبوونەوە بووبێ. بەو پێیەی کەوا ئەسپەکەی من و ئەسپەکەی مەحموود بەگ نایاب بوون، توانیمان بە پێش هاوڕێکانم بکەوینەوە و بگەینەوە ڕێبەرەکە و تەتەرەکە کە پێش نیو سەعاتێك پێش ئێمە بەڕێ کەوتبوون. لە دوورابیەکی نزیکدا بینیمانن بەڵام بەفر بارین بە تەواوی ڕێگەی لێ گرتبووین تا دەمودەست بیانبینین و بەفر هەتا شوێنپێی ئەسپەکانیشی داپۆشیبوو. بە تەنیا بەناو زنجیرە چیا بەرزەکانی ئۆلیمپدا دەڕۆیشتین و تا شەو هەر تێیدا دەسووڕاینەوە. دەترساین لە هەر ساتێکدا بەفر ونمان بکات یان بکەوینە ناو

* Karajouan
** karajolar

خه‌ره‌ندێكه‌وه‌ ئه‌گه‌ر له‌و تووله‌ ڕێگه‌یه‌ دووربكه‌ینه‌وه‌ كه‌ ده‌بێ بیگرینه‌ به‌ر كه‌، چیتر نه‌مانده‌توانی ڕێگه‌كان بیانناسینه‌وه‌ ئه‌گه‌ر غه‌ریزه‌ی ئه‌سپه‌كانمان نه‌بوایه‌. دواجار دوای ئه‌وه‌ی ماوه‌ی شانزه‌ كاتژمێرمان بڕی بۆ ماوه‌یه‌ك كه‌ ده‌كرێ ته‌نها به‌ نۆ یان ده‌ كاتژمێر ببڕدرێ گه‌یشتینه‌ حه‌ماملی، وه‌ك چۆن شه‌و داهات، تا به‌یانییه‌كه‌ی ڕۆژی دواتر هاوڕێكانمان پێوه‌ندییان پێوه‌ نه‌كردین و ئه‌وانیش هه‌مان ئه‌و ئاسته‌نگانه‌یان هاتبووه‌ پێش كه‌ ئێمه‌ بینیمان، وێڕای ئه‌وه‌ی كه‌ ئه‌سپێكیشیان لێ ون بووبوو. به‌فر به‌رده‌وام ده‌باری به‌ڵام كه‌مێك سووكتر. دوای ده‌ كاتژمێر له‌ ڕۆیشتن گه‌یشتینه‌ شاری گه‌ریده‌، شارێكی بچووك، شارێك كه‌ هیچێكی سه‌رنجڕاكێشی تێدا نه‌بوو و ماڵه‌كانی له‌ دار دروست كرابوون. نه‌مانتوانی هیچ ئه‌سپێكی لێوه‌ به‌رده‌ست بخه‌ین به‌ڵام شه‌ومان له‌وێدا به‌سه‌ر برد.

٩ ی مانگ به‌ره‌و بۆلی به‌ڕێ كه‌وتین و ئێمه‌ ئه‌وه‌نده‌ خراپ سواری پشتی ئه‌سپه‌كان بووبووین كه‌ ته‌نها دوای سێزده‌ كاتژمێر و به‌ زه‌بری قامچی لێدان له‌ ئه‌سپه‌كانمان گه‌یشتینه‌ ئه‌وێ. ڕێگه‌كه‌ تا ڕاده‌یه‌ك باش بوو به‌ڵام له‌ ماوه‌ی یه‌كه‌م حه‌وت كاتژمێردا، نه‌ هیچ ئاواییێك و نه‌هیچ شتێكمان نه‌بینی كه‌ ئاماژه‌ بۆ ئاوه‌دانی بكه‌ن. ئه‌م شاره‌ ناوچه‌یه‌كی خاڵی وه‌ستانی سه‌رڕێگه‌ی زۆر نایاب بوو، له‌م شاره‌دا پۆسته‌خانه‌ و بازاڕێكی گه‌وره‌ و گه‌رماوگه‌لی چكۆڵه‌، به‌ڵام پاكوخاوێن و چاك ڕاگیراوی لێ بوون. ئه‌و پێده‌شته‌ی كه‌ ده‌وری دابوو به‌شێوه‌یه‌كی چاك چێنرابوو و پڕی بوو له‌و ئاواییانه‌ی كه‌ به‌شێوه‌یه‌كی گشتی كه‌وتبوونه‌ سه‌ر كه‌ناره‌كانی چه‌ند ڕووبارێكی چكۆڵه‌ كه‌ ده‌توانرێ پیایاندا بپه‌ڕیته‌وه‌ و ده‌ڕژێنه‌ ناو زه‌ریای ڕه‌ش.

له‌ ١٠ ی مانگ هه‌رگیز ئاوا به‌ خراپی سواری پشتی ئه‌سپه‌كان نه‌بووبووین و هه‌روه‌ك دوێنێ خراپترین ئه‌سپ به‌ نسیبی من بوو. به‌ڵام ئه‌سپی خراپ به‌ نیسبه‌ت ته‌ته‌ره‌كان بیانووه‌ك نه‌بوو بۆ ئه‌وه‌ی لێیان خۆشبێ بۆ ئه‌وه‌ی هه‌نگاوی خێرا نه‌نێ ئه‌گه‌ر بڕیار له‌سه‌ر ئه‌مه‌ بدات. ڕێگه‌كه‌ خراپ بوو و ئه‌سپه‌كانمان تا پاژنیان له‌ناو قوڕو لیته‌دا بوون و بڕێك جار پێیه‌كانیان له‌ناو ڕه‌گی داره‌كان ده‌چه‌قی وه‌ك ئه‌وه‌ی (له‌ناو ته‌ڵه‌یه‌كدا بووبن). ئه‌سپه‌ به‌دبه‌خته‌كه‌ كه‌ سواری پشتی بووم له‌ ماندووییێتییان كه‌وت و ئیدی مه‌حاڵ بوو هه‌ڵی بسێننه‌وه‌ و ناچار بووین وازی لێ بهێنین. ئه‌و ئه‌سپه‌ی كه‌ دوای ئه‌وه‌ دایانمێ كه‌مێك باشتر بوو، ڕێگه‌ باشتر ده‌بوو

و به هەنگاوی خێرا دەڕۆیشتین، به قامچی لـه ئەسپەکانمان دەدا و وەکـو شـێت هاوار دەکەین تاوەکو ئەسپەکانمان هەڕا بکەن. ئەسپەکەی من دوو جاران لەگـەڵ مندا کەوت بەڵام به بێ ئەوەی له زینەکه بکەومـه خـوارەوه.، بـەڵام میلێـك دواتـر جارێکی دیکه بەسەر مندا کەوته ناو زۆنگاوێك و منی لەودیو زۆنگاوەکه جێهێشت، له توندی کەوتنەکەم پەشـۆکام. پـێم داگـرت تـا ئەسـپێکی دیکـەم بـدەنێ، بـەڵام پێـشتر لـه ڕووداوگـەلی هاوشـێوەدا هـەموو ئـەو ئەسـپانەی کـه لـه نـۆرەدا بـوون بەکارهێنرابوون و بۆیه من ناچار بووم بەوەی خۆم دەستبەردار بم.

ئەمه شێوازی سەفەرکردنه لەگەڵ تەتەر. مـن بـەختی ئـەوەم بـوو هەیکـەلێکی زۆر باشـم هـەبوو. بـەڵام ئـەم ڕووداوه بـچووکانه دەشـێ ببنـه وانەیـەك و بەڵگـەی ئەوەی که پێویسته تەواو هێزەکانی خۆت لێك بدەیتەوه پێش ئـەوەی دەسـت بـه سـەفەرێکی ئـاوا بکـەیت لەگـەڵ پارەیـەکی کـەم کـه مـن هـەمبوو. بـەڵام ئەگـەر بمتوانیبووایه تەتەرێك و خزمەتکارێکم تەنها بۆ من هەبوایه لەگـەڵ کەرەسـتەگەلی شیاودا، مـاوه مـاوه گەڕۆکـەکان پێوەنـدییان پێـوه دەکـردین، و زۆر ئاسـوودەتر سەفەرم دەکرد، بەڵام که نەمتوانی ئەم کەرەسەگەله بەرچاوانه دابـین بکـەم ئـەوا زۆر خۆم به بەختەوەر دەزانم لەو دەرفەتەی کـه بـۆم هاتـه پێـشەوه. هەرچـەندە بوونی من بێ گومان بۆ هاوڕێکانی سـەفەرەکەم جاڕسـکار نـەبوو، بـەڵکو هێزێکـی زێـده بـوو بـۆ هێـزی ئـەوان و لـه ئەنجامـدا بـۆ ئاسایـشی ئـەوان، بـەڵام زۆر کـەم بایەخیان به پێویستییەکانی من دەدا، دەشیا به تەنیا جێم بهێڵن و دەسـتبەردارم بن ئەگەر من وەکو ئەوان بەرگەی ماندووبوون و بێبەشبوونم نەگرتبوایه.

دۆستشه، که شەوی دەی مانگمـان تێدا بەسـەر بـرد، جگـه لـه چـەند خـانێکی تایبەت بۆ حەسانەوەی گەشـتیارەکان هیـچی دیکـەی تێدا نـەبوو. یـانزەی مـانگ بەجێمان هێشت و ماوەی دوانزە کاتژمێر بەناو دارسـتان و بـەناو ڕێگـەی سـەختدا ڕۆیشتین تا گەیشتینه هەندەك که تەنها چەند کێڵگەیەکمان به دەوریەوه بینی کـه ترێـی نایـابی پێـوه بـوو و هیواکانمـان خـەریك بـوو دەبووژایـەوه. تاقـه شـتی سەرنجڕاکێش کـه لـەو ڕۆژەدا بینیمـان دوو یـان سـێ ئاشـی ئـاو بـوو کـه لەسـەر جۆگەلەیەکی ئاو دانرابوون، هەرچـەندە ئامێرسـازییەکی سـادە بـوو، بـەڵام مانـای پێـشکەوتنێکی هونـەری و شارەسـتانی دەگەیانـد کـه لـه وڵاتێکـی گوندنـشینی سەرەتاییدا پێشبینی نەدەکرا.

هەنـدەك دەكەوێتــە ســەد و بیــست میلــی كۆنــستانتینۆپل، هاوڕێكــانم بــە دەرچوونیان، سووربوون لەسەر ئەوەی لە گەشتەكە بەردەوام بن بە بێ وەسـتان. ئەوان نهێنی خۆیان بۆ نەدركاندم بەڵام من بە بـێ ئـەوەی ئامـادەی ئـەم سـەفەرە درێژە بم بە شوێنیان كەوتم و بە پردێكـی داریـن لـە ڕووبـاری سـەنگەر، ڕووبـاری ئەوهێنـدە تیـژڕۆدا پەڕینـەوە كـە كـەم جێگـەی ئـەمان بـوو و بەسـەر پاشمـاوەی پردێكی نایابدا ڕووبارێكی دیكەمان بڕی كە لەوانەیە هەر تەنها لقێكی ئەو ڕووبـارە بێت كە تازە باسم كرد. بەڵام ئاوەكان واپێدەچـوو سەرچـاوەی كـۆنی خۆیـان ون كردبـێ: بـە ئاسـتەم ئـاوی ڕۆیـشتوومان لـە قـووڵایی ڕووبارەكـە دەبـینی و هـیچ شتێكیش ئاماژە بۆ ئەوە ناكات كە ڕەوشەكە لەوەتەی چـەند سـاڵێك لـەوە باشـتر بووبێت.

دوانزە كاتژمێر لە دووریی هەندەك، سەبانجی– مان بـینی كـە كەوتۆتـە سـەر زەریاچەیەكی جـوان كـە بەشـێكی ڕێگەكـە پێچاوپێـچی بازنەییـە. ئەمـە شـارێكی بچووكە، دوای ئەوەی ئەسپەكانمان تێدا گۆڕی، بـەڕێ كەوتینـەوە. بـە ڕێگەیـەكی كۆنی بەردڕێژكراو بەناو زۆنگاوێكدا پەڕینەوە، دوای ئـەوەی دە كاتـژمێر ڕۆیـشتین گەیشتینە ئیزمید، نیكۆمیدی كۆن، كە كەوتۆتە ناو نیمـچە دوورگەیـەك كـە بـەرەو زەریـای مەڕمـەڕ دەڕوات. كاتێـك چـووینە نـاو ئـەم شـارە شـەو ڕاكشابوو. تـەنها ئەسپەكانمان تێدا گۆڕی و بەردەوام بووین لە ڕۆیشتن. شێست میلی كۆتاییمان بە بێ وەستان بڕی، تەنها جارێك وەستاین بـۆ گـۆڕینی ئەسـپەكانمان و بـە بـێ هـیچ ئازووقەیەك جگە لەوەی توانیمـان بەردەسـتی بخـەین بـە بـێ ئـەوەی لەسـەر زیـن بێینــە خــوارەوە و لــە ١٣ ی نیــسان لــە كاتــژمێر یــەكی پاشــنیوەڕۆ گەیــشتینە سكوتاری كە لەوێدا سەفەرەكەمان بە كۆتا هات.

**كۆتایی**

**سەرچاوە:**

William Heude, *Voyage de la côte de Malabar à Constantinople par le golfe Persique, l'Arabie, la Mésopotamie, le Kourdistan et la Turquie d'Asie, fait en 1817 par William Heude*. Traduit de l'anglais par le traducteur du voyage de Maxwell, Paris : Gide fils, 1820, PP: 303-356

# فەرهەنگی زاراوە مێژووییەکان

**لیژنەی مێژوو**

## بەشی پێنجەم

چەند وشەیەکی پێویست : لەم ژمارەیەی گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی بەشی پێنجەمی زاراوەکانی مێژوو بلاو دەکەینەوە. ئەم زاراوانە لە سەرچاوەگەلی جودا و بە زمانی جیاواز بلاوکراونەتەوە و گەلێ نووسەری تورك و عەرەب و رۆژهەلاتناسی ئەوروپایی هەولیان داوە کۆیان بکەنەوە و پێناسەی دروستیان بۆ بکەن و واتای تەواویان لە زمانەکانی خۆیاندا بۆ خوێنەرانی مێژوو بەو زمانانە روون بکەنەوە.
هەولی ئەندامانی لیژنەی مێژووش لە ئەکادیمیای کوردی بۆ ئەوەیە کە واتا و پێناسەی ئەم زاراوانەی مێژوو لە زمانی کوردیدا لای خوێنەری کورد روون بن و جێگیر بکرێن.
لەم کارەماندا پشتمان بە یەك سەرچاوە نەبەستووە و پەنامان بردۆتە بەر چەندین فەرهەنگ و سەرچاوەی تایبەت بەم بوارە بە زمانی جیاواز کە لە کۆتایی بەشی شەشەمدا ئاماژەیان پێدەکەین .

**سەرۆکی لیژنەی مێژوو**
**پرۆفیسۆر جەبار قادر**

## پیتەکانی (ق، ك، ل و م )

### پیتی (ق)

**قائمة الأوردو** :

(ع، تر) دراوێك بوو دەوڵەتی عوسمانی لە ماوەی جەنگی قرم دا لێیدا ، هەروا بەو بڕیارە دەوترا کە سەرکردە لە وەختی شەڕدا دەری دەکرد.

**قائمقام** (ع):

لە دەوڵەتی عوسمانی بە کەسێ دەگوترا کە لە جێی بەرپرسێکی لە خۆی باڵاتر کاری دەکرد.

**قاپو** (تر):

دەروازە ، لە دەوڵەتی عوسمانی بە دەروازە یان دەرباری سوڵتانی دەگوترا.

**قاپو ئاغاسی باشی** (تر):

سەرکاری نۆکەرانی دەرباری عوسمانی .

**قاپو قول** (تر):

دەرگەوان ، کۆیلە پاسەوانی دەرگا.

**قاپو کتخدا** (تر، فا):

بریکاری والی لە حکومەت یان پایتەختی عوسمانی .

قابودان باشی (ایتا، تر): کاپتن یان فەرماندەی دەریایی لە دەوڵەتی عوسمانی

**قانون نامە** (ع، تر):

تۆماری یاساکان، کۆمەڵێك یاسای سوڵتانەکانی عوسمانی بوو.

**قاپی غاسی** (تر):

سەرۆکی کۆیلە خەسێنراوە سپییەکان بوو لە دەرباری عوسمانی.

**قاپیچیلر باشی** (تر) :

سەرۆکی پاسەوانان لە سەردەمی عوسمانی.

**قاپیچیلر کتخداسی** (تر):

پشکنەری پاسەوانانی دەروازەکانی کۆشك بوو لە دەولەتی عوسمانی.

**قبودان دریا** (تر):

میری دەریا، کاپتنی گەلە کەشتی عوسمانی.

**قابلی ئینکشاری** (تر):

بەو تیپەی ئینکشارییەکان (یەنیچارییە) دەگوترا کە لەبەر گەندەڵی و بێ سەروبەری بەشداری شەڕیان پێ نەدەکرا .

**قاجقون** (تر):

لە دەوڵەتی عوسمانی بە مالاّتی بێ خاوەن دەگوترا کە دەستی بەسەردا دەگیرا، کە خاوەنی پەیدا دەبوو مالاّتەکەیان دەداوە بەرامبەر دانی باجی (قاجقون )

**قاپلیق** (لا) :

پلەو پایەیەکی کەهەنووتی کاتۆلیکی بوو لە خوار پەتریارك .

**قاچاقچی** (تر):

قاچاغچی .

**قادرغە** (تر) :

کەشتییەکی سەربازیی گەورەی سەوڵدارە .

**قادین** (تر):

خاتوون ، شاژنی سەردەمی مەملوکی و عوسمانی هەروا بە ژنەکانی سوڵتان دەگوترا ، لە تورکی ئەورۆدا کادین بەکار دێت .

**قازان** (تر):

بە خێڵی گەورە لە ناوەڕاستی ئاسیا دەگوترا ، و ناوی شارێکە لە تەتەرستانی ئەورۆ لە ڕووسیای فیدیرالی .

**قاصد** (ع):

نێردراو ، پەیك .

**قاضی عسکر** (ع):

قازی یان دادوەری سەربازان لە سەردەمی مەملوکی و عوسمانی بەلاّم لە دەوڵەتی عوسمانی دادوەری کاروباری شارستانیش بوو بە تایبەتی لەسەردەمە بەراییەکانی دەوڵەتدا .

**قاضی عسکر اناضولی**(ع، تر):

قازی سەربازان لەبەری ئاسیای دەوڵەتی عوسمانی .

**قاضی عسکر روملی** (ع، تر) :

قازی سەربازان لەبەری ئەوروپای دەوڵەتی عوسمانی پلەی لە قازی عسکری ئەنادۆڵ بەرزتر بوو .

**قاضی میری کاتبی** (ع) :

سەرۆکی دادگای پەیوەست بە کارگێڕی دارایی (دەفترخانە ) لە دەوڵەتی عوسمانی .

**قاضیلق** (ع):

دیوانی قازی، یان شوێنی قازی، هەروەها (قەزا)ش بوو، کە لە سەردەمی عوسمانی یەکەیەکی کارگێڕی بچووکتر بوو لە (سەنجەق)و لەڕووی کارگێری ودادگەرییەوە قازی بەڕێوەی دەبرد.

**قاطع الطریق**(ع):

جەردە ، ڕێگر .

**قالبق**(تر) :

جۆرە کڵاوێکی چەرمین بوو کە چەرکەس و تورك لەسەریان دەنا .

**قالبقچی** (تر):

لە دەوڵەتی عوسمانی بەو تیپەی سەربازان دەگوترا کە کڵاوی درێژیان لە سەر دەنا.

**قالوش** (تر) :

جۆرە گۆرەوییەك بوو لەگەڵ پۆتین لە پێ دەکرا.

**قالیون** (تر):

جۆرە کەشتییەك بوو .

**قالیونجی** (تر):

بە تیپێکی هێزی دەریایی عوسمانی دەگوترا کە لەساڵی (١٦٨٣) پێکهێنرا بوو.

**قامە** (**تر**):

شمشێرێکی پان و ڕاستەکی بوو عوسمانییەکان لە سەردەمانی زوو بەکاریان دەهێنا .

**قان** (**مغو**) :

نازناوی پادشاو میرانی تورك و مەغول و تەتەر بوو و لە دواییدا وشەی خان جێگەی گرتەوە .

**قانصو** (**تر، شرکس**):

میر ، لە لوبنان بوو نازناوی هەندێك بنەماڵەش .

**قانون** (**یو**) :

لە بنەچەدا یونانییە بەواتای یاسای تورکی و ڕێوڕەسم ، هەروا بە ئامێرێکی مۆسیقاش دەگوترێ .

**قاووق** (**تر**) :

جۆرە شاڵێکی درێژ بوو کە سەدری ئەعزەم و وەزیر و پاشاکان و نووسەرانی دەوڵەت دەیانپۆشی .

**قایق** (**تر**):

جۆرە کەشتییەکی بچووك بوو کە سەوڵ و چارۆکەدار بوو .

**القبة السلطانية** (ع):

چەتری هێمای سوڵتانەکانی مەمالیك بوو لە کووتاڵی ئاوریشمی ڕازاوە بە دروومانی زێڕو زیو دروست دەکرا .

**قبة الصخرة** (ع):

گومبەزی بەردین .

**قبطان بیرون** (**تر**) :

لە دەوڵەتی عوسمانی بەو دەریاوان و کاپتنە دەگوترا کە لە کەشتی میرەکان کاری دەکرد .

**قبلان** (**تر**):

لە قەپلان هاتووە بە واتای پڵینگ.

**قبودانه همايون (تر):**

هێزی دەریایی سوڵتانی عوسمانی .

**قدملی (تر):**

ئەفسەری لە مێژینە لە سوپای عوسمانی .

**قرابيص (تر):**

دراوێکی سەردەمی مەمالیك بوو ، پێشی دەگوترا فلوس.

**قرابينه (افر):**

جۆرە تفەنگێکی لوولە فراوان بوو لە دەوڵەتی عوسمانی، چەکی سوارەو پیادان بوو .

**قراڵ (تر) :**

لە دەوڵەتی عوسمانی بەمەلیك و پادشایانی مەسیحی دەگوترا کە ئیمپراتۆر نەبوون.

**القرائصة :**

سەردەمی مەمالیك بە مەمالیکە کۆنەکان دەگوترا لە بەرامبەر (الجلبان ) کە مەمالیکە نوێیەکان بوون .

**القراءات السبعة (ع):**

قورئان خوێنەکانی خودان شێوازی تایبەت ئەوانیش بریتین لە: نافع ، ابوکثیر، ابوعمرو بن العلاء، عامر ، عاصم بن ابی الجواد، حمزة الزیات و الکسائي.

**قراوانه (تر):**

جۆرە قاپێکی مس بوو سەربازانی عوسمانی خواردنیان تێدا دەخوارد، لە زمانی کوردیشدا گەلێ جار قەرەوانە بەکار دەهێنرێ .

**قراوڵ (تر) :**

سەربازی ئێشکگر لە تاوەرەکان، پێشڕەوی سوپا .

**القرش ألأسدي الفضي:**

جۆرە دراوێك بوو وێنەی شێری لەسەر بوو ، دەیکردە دووسەد عوسمانییە .

**قرصان (لا) :**

چەتەی ڕێگر لەنێو دەریادا .

**قرقل(تر):**

جۆرە پۆشاکێکی ژنانە بوو لە سەردەمی عوسمانی بەکاردەهات .

**قرقلا(فا) :**

جۆرە زرێیەك بوو.

**قرقور (تر):**

جۆرە کەشتییەکی سەردەمی عوسمانی بوو .

**قرمز بيرق (تر) :**

ئالأی سوور کە بەیداخی سوارەی سوپای عوسمانی بوو .

**القرمة (تر):**

جۆرە خەتێکی عەرەبی بوو ، نووسەرانی تورك لە خەتی رقعە وەریانگرتبوو ، پیتەکانی بە تێك ترنجاوی دەنووسران.

**قره أولوس (تر):**

عوسمانییەکان بە یەکیەتییەکی خێڵەکی کوردەکانی ڕۆژهەلأتی ئەنادۆڵ واتا بکوری کوردستانی ئەوڕۆیان دەگوت .

**قرەقلوقجی (تر) :**

نزمترین وەزیفەی نێو سوپای ئینکشاری بوو لە دەوڵەتی عوسمانی .

**قرەولە (تر):**

ئەو دەریاوانە عوسمانییانەی لە کەشتی گەورەی چارۆکەدار ئیشیان دەکرد .

**قره قوش (تر):**

هەڵۆی ڕەش ، نازناوی یەك لە میرانی سوڵتان سەلاحەدین بوو ، بە ناهەق و بوختان کاری ناڕەواو گەوجانەی دراوەتە پاڵ و لەڕاستیدا پیاوێکی ماقووڵ و کاربەدەستێکی بالأ بوو بە فەرمانی سەلاحەدین قەلأی قاهیرەی بنیادناوە .

**قره قۆینلو (تر) :**

بەرخە ڕەشە هۆزێکی تورکمان بوون لە سالأنی ١٤١٠ –١٤٦٨ حوکمی عێراق و ئێرانیان دەکرد و پاش ئەوان ئاق قۆینلو واتا بەرخە سپی یا خودان بەرخە سپییەکان هاتن.

**قرمانیە (تر) :**

پیاوی ڕەشتاڵ ، تیپێکی ڕەش پێستان بوو لەنێو سوپای عوسمانی .

**قروت(تر):**

کەشتییەکی جەنگیی تۆپ هەڵگری سەردەمی عوسمانی بوو.

**قزلباش (تر):**

ئەو هۆزە تورکمانانە بوون کە پاڵپشتی تەریقەتی سەفەوییان دەکرد و شێخ حەیدەری سەفەوی فەرمانی پێدان مێزەرێکی سوور لەسەر بنێن لەئەنجامدا بە قزلباش (واتە: سەرسوور) ناسران لەبەرئەوەی ئەم هۆزانە دواتر هێزی سەرەکی دەوڵەتی سەفەوییان (١٥٠١–١٧٣٦) پێکهێنا بۆیە هێزەکانی سەفەوی بەم ناوە ناسران . هەروەها لایەنگرانی سەفەویش لە ئەنادۆڵ هەر بەقزلباش دەناسران .

**قزلر اغاسی (تر) :**

بەرپرسی خانەی ژن و ژاڵی کۆشکی سوڵتانی عوسمانی .

**قزل الما(تر):**

سێوە سوورە زاراوەیەك بوو تورك بەشاری ڕۆما یان دەگوت .

**قشلە (تر):**

لە کیشلاکەوە هاتووە کە شوێنی سەربازان بوو لەوەرزی زستان، لە دواییدا بوو بە نێوی ئەو سەربازگانەی کە بۆ سەربازان دروست دەکرا .

**القصة (ع):**

داوا یان سکالاّ کە لە سەردەمی مەمالیك کەسێك پێشکەشی سوڵتانی دەکرد لەڕێی فەرمانبەرێك کە پێی دەگوترا (قصە دار).

**قصة الحضارة (ع):**

چیرۆکی شارستانیەت و ناونیشانی کتێبە بەناوبانگەکەی وۆڵ دیۆرانتە.

**قضاء القضاء (ع):**

وەزیفەیەك بوو لە دەوڵەتی ئیسلامی هەر لە سەردەمی عەباسییەکان کە کاری دادوەری و حوکمی شەرعی و رادەدانانیان لە ئەستۆ بوو وە جێگرو سەرکاریان لە دەڤەرو ناوچەکان هەبوو .

**قطب** (ع) :

سەرکردەی رۆحی تەریقەتی سۆفیگەری بوو و سەید قوتبیش رابـەری برایـانی موسوڵمان بوو.

**ققطان** (**تر**):

کووتاڵێك بوو قازی و زانایانی ئاینی مەمالیك و عوسمانی دەیانپۆشی.

**قلاع الدعوة** (ع):

بە قەڵایەکانی ئیسماعیلییەکان دەگوترا .

**القفار**(ع):

بیابان ، چوڵەوانی، دەشتی کاکی بەکاکی.

**قفص** (ع):

شوێنێك بوو لە دەرباری عوسمانی کە شازادەی تێدا جیا دەکرایەوە.

**قلالق** (**تر**):

شوێنی پشکنین یان پاسەوانی و ئێشکگری .

**قلاووز** (**تر**):

لە سەردەمی عوسمانی بە ڕێنوێن یان هەمەکارەی کەشتی دەگوترا .

**قلاوون** (**تر**):

مـراوی، نێـوی سـوڵتانێکی مـەمالیك بـوو لـەماوەی ١٢٧٩–١٢٩٠ز حـوکمی کردووە.

**قلعەبند** (ع، **فا**):

زیندانیکراو لە قەڵادا .

**قلعەدار** (ع،**فا**):

خاوەن یان پارێزەری قەڵا .(دژدار)

**قلیج** (**تر**):

شمشێر ، پشکی تایبەت لە زەوی میری .

**قلفت** (**تر**) :

کلێتە .

**قلم میزان الحریر** (ع):

بەو فەرمانگەیە دەگوترا کە لە دەوڵەتی عوسمانیدا کاروباری دارایی و باجی ژمێریاری ناوچەی ئەنەدۆڵی لەئەستۆ بوو کە تایبەت بوو بە باجی ئاوریشم .

**قلندریە (فا)**:

گرووپێکی سۆفی بوون دەرکەوتنیان بۆ سەردەمی سوڵتانی مەمالیك (الظاهر بیبرس ١٢٦٠–١٢٧٧ز) دەگەڕێتەوە ، بەوە دەناسرانەوە کە سەرو ردێن و برۆیان دەتاشی .

**قناق (تر)**:

قۆناغ ، ماڵ .

**القنانە** (ع):

بەندەگیری ، کۆیلەی وابەستە بەزەوی .

**قندیرە (تر)** :

جۆرە پێڵاوێك بوو سەربازانی عوسمانی لە پێیان دەکرد .

**قنصل (ایتا)**:

فەرمانبەری دبلۆماسی کە نوێنەری دەوڵەتانی بیانی بوون لە دەوڵەتی عوسمانی، یان دبلۆماسییانی عوسمانی لە هەندەران .

**قنطار** (لا):

یەکەیەکی کێش بوو دەیکردە ١٠٠ رەتل هەر رەتلێك دەیکردە ١٢ ئوقیە و هەر ئوقیەیەکیش ١٢ درهەم بوو، بەلاّم کێشەکەی بە پێی شوێنی بەکارهێنانی دەگۆڕا .

**قنطار اغاسی (لا، تر)** :

لەدەوڵەتی عوسمانی بەو فەرمانبەرە دەگوترا کە چاودێری کێشان و پێوانی بازاڕی دەکرد .

**قندقچی (تر)** :

چەك فرۆش .

**قنطش (تر)**:

زرێ جۆرە پۆشاکێکی تایبەت بوو گەورە پیاوانی عوسمانی لە بەریان دەکرد.

**قهرمان (ع، فا):**

ئازا ، بە واتای وەکیلی خەراجیش بەکار دەهات.

**قواس باشی (ع، تر):**

تیر هاوێژ ، سەرکردەی هەندێك لە سەربازان کە پاسەوانی وەزیران بوون .

**قواشین (تر):**

زەوی میری کە موڵکی سوڵتانی بوو .

**قوانین نامە (یو، فا) :**

کتێبی قانوونەکان، کۆمەڵە قانوونێکی سەردەمی سوڵتانی عوسمانی مورادی چوارەم (١٦٢٣–١٦٤٠) بوو.

**قوتلی (ع، تر):**

پیاوی بەهێز، جەربەزە .

**قوجە (تر):**

واتای زۆری هەیە وەکو مەزن ، بەتەمەن، مێرد و بە واتای مامۆستاش دێت.

**قوجەباشی (تر) :**

کوێخای گوندە مەسیحییەکان .

**القود (ع):**

بەو دیارییانە دەگوترا کە هۆزە عەرەبەکان بۆ سوڵتانیان دەهێنا لە ئەسپ و حوشترو شتی دی.

**القور (تر) :**

لە سەردەمی مەمالیك بە دیاری بەنرخ و بەهادار دەگوترا .

**قورجی (تر):**

چەکدار ، تیپێکی سوپای ئینکشاری بوون و ئێستاش بە پاساوانانی گوند لە باکوری کوردستان کە لە گەڵ سوپادا شەڕی پارتی کرێکارانی کوردستان دەکەن دەوترێ کۆی قروجیلەر یا بە کورتی قورروجی.

**القوس والنشاب (ع):**

تیرو کەوان.

**قوشاق** (تر):

پـشتێن کـە سـەربازانی عوسمـانی دەیانبەسـت، گـەر لـە چـەرم کرابـا پێیـان دەگوت (کمر – کەمەر ) بەڵام ئی کووتاڵ پێی دەگوترا (صوم کمر ) .

**قول** (تر):

پاسەوان ، سەربازی کۆیلە .

**قول بغداد** (تر):

سەربازانی بەبنەچە عیراقی، رۆڵیان لە عێراق زۆر بوو .

**قول کتخداسی** (تر):

یاریدەدەری ئاغای ئینکشاری بوو .

**قوللقجی** (تر):

بەو سەربازانەی عوسمانی دەگوترا کە دەوروبەری شارەکانیان دەپاراسـت وە سەرکوتی هەر یاخیبوونێکی نێو شارەکانیان دەکرد .

**قولنامە** (ع، فا):

لە دەوڵەتی عوسمانی بـە چـەکی بەڵێندەرایـەتی یـان بەڵگەنامـەی ڕێککـەوتن دەگوترا .

**القول المأثور** (ع):

قسەی نەستەق.

**قومانیە** (یو):

کۆگای نێو کەشتییان .

**قومندان** (تر):

ئەفسەر ، سەرکردە .

**قوناق** (تر):

مەنزڵ ، شوێنی مانەوە ، قۆناغ .

**قویومجی** (تر):

زێڕینگەر .

**القیاسة** (ع):

جۆرە کەشتییەکی مەیلەو پان بوون لە تەنکایی کەنار دەریاکان دەکار دەخران.

**قیراط** (یو) :

یەکەیەکی کێشانە دەکاتە چوار دەنك (حبة).

## پیتی (ك)

**کاتب ألانکشاریة** (ع) :

کاربەدەستی گەورەی عوسمانی کە سەرپەرشتی تۆماری سەربازانی دەکرد .

**کاتب الدرج** (ع):

باش نووس ، سەرۆکی نووسەرانی دیوانی هۆنینکاری (ألانشاء) لە سەردەمی مەمالیك .

**کاتب السر** (ع):

سەرۆکی دیوانی هۆنین کاری، نووسراوی هاتووی دەخوێندەوە و وەڵامی دەداوە .

**کاتب الغیبة** (ع):

پۆستێکی باڵای سەردەمی مەمالیك بوو ، دەبوو ئاگاداری ئامادەبوو یا نەهاتووانی شوێنە ئاینی و قوتابخانەکان بێت .

**کاخیا بگ** (تر):

لە سەردەمی عوسمانی بە یەك لە جێگرانی سەدری ئەعزەم دەگوترا .

**کاخیا قادین** (تر):

ئافرەتی بەرپرس لە حەرەمسەرای سوڵتان .

**کادیك** (تر):

لە سەردەمی عوسمانی بەو خانووبەرانەی دەوڵەت دەگوترا کە خەڵك بە کرێ تێیدا بوون .

**کاربوناری** (**ئیتا**):

ڕەژووکەران ، کۆمەڵەیەك بوو ڕۆڵی هەبوو لە بزاڤی یەکخستنی ئیتالیا لە سەدەی نوزدەیەمدا، کۆمەڵەی ( دارکەر)یش لە کوردستانی باشوور لەسەر شێوازی ئەو ڕێکخراوەیە دانرا .

**کارکلا** (**فا**):

جۆرە زرێیەکی سەردەمی مەملوکی بوو .

**کاشف** (ع):

لە سەردەمی مەملوکی بە سەرکردە یان سەرکار دەگوترا .

**کاشف الکشاف** (ع):

سەرکردەی جاسووسان .

**کاشف الوجه البحری** (ع) :

بەرپرسی کارگێڕی باکوری میسر لە سەردەمی مەمالیك .

**کاشف الوجه القبلی** (ع):

بەرپرسی کارگێڕی باشووری میسر .

**الکافل** (ع) :

جێگری سوڵتان لە سەردەمی مەمالیك، هەروا پێی دەگوترا (کافل الممالك الاسلامیة ).

**کباش** (ع) :

چەکێکی سەرگەورەی قۆچدار بوو لە سەردەمی مەمالیك بۆ ڕووخاندنی شوورەکان بەکاردەهێنرا .

**الکتابة المسماریة** (ع):

نووسینی مێخی، بزماری .

**کتبغا** (**تر**):

گوێرەکەی گچکە، ناوی چەند سوڵتانێکی مەمالیك بوو .

**کتخدا** (**فا**):

کەتخودا، کوێخا، کێخوا، ئەم وشانە لە بنەڕەتدا فارسین و هەر لە یەکتر وەرگیراون. لە ئێران و دەوڵەتی عوسمانی بەکاردەهاتن ، بۆ سەرپەرشتیارانی

گوندو شارۆچکە بچووکەکان، بەڵام لە دەوڵەتی عوسمانی بە جێگری والیش دەگوترا .

**کتخدا سفرلی** (**تر**):

ئەوانەی یاوەری سوڵتان بوون لە سەفەرەکانی .

**کچك قاینارجە** (**فا، تر**):

پەیماننامەیەك بوو لە ساڵی ١٧٧٤ز لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و نەمسا بەسترا.

**کدکلیات** (**فا**، ع) :

ئەو کەنیزانەی راستەوخۆ لە خزمەتی سوڵتانی عوسمانیدابوون .

**کدك** (**تر**):

ڕەپێش خستن یان ئیمتیازدان بە هەندێك بازرگان بە قۆرخکردنی کاڵا یان بەرهەمێکی دیاریکراو.

**کدکلی أفندیلر** (**تر**):

ئەو چوار فەرمانبەرانەی کە دەفتەری کۆگای عوسمانییان لە ئەستۆ بوو .

**کرافیلا**(**ایتا**):

جۆرە کەشتییەکی هێزی دەریایی عوسمانی بوو.

**کراکتیە** (**تر**):

تیپێکی سەربازی بەکرێگیراو بوون لە بنەچەدا خەڵکی موسڵ و کەرکووك بوون.

**کردوس** (ع) :

تیپی جەنگاوەری سوارە ، ڕەوە ئەسپی زۆر .

**کرکون** (**تر**):

کەرکۆن لە قەرەقۆڵی تورکییەوە وەرگیراوە و بە بنکەی ژاندرمە و پۆلیس دەوترێ، لە رابردوودا گەلێ جار زیندانیشی لە تەکدا بووە .

**کشاف** (ع):

لە سەردەمی مەمالیك بەو سەربازە دەگوترا کە باس و خواسی دوژمنی ئاشکرا دەکرد .

**کشکجی** (**مغ، تر**):

لە سەردەمی جەنگیزخان بە پاسەوانە تایبەتەکانی دەگوترا.

**کشوفیە** (ع):

یەکەیەکی ئیدارەی عوسمانی بوو لەمیسر هاوشێوەی سنجق (لیوا) بوو.

**کلخانە** (**تر**):

هۆڵێکی نێو کۆشکی سوڵتانەکانی عوسمانی سەر بەحەرەمسەرا بوو، نامەی نهێنی لێ دەنووسرا .

**کوپریچی** (**تر**):

تیپێکی تایبەتی چاککردنەوەی پرد بوون لە سەردەمی عوسمانی .

**کوسات** (**فا**) :

کۆی (کوسە) واتا تەپڵ.

**کوشلو** (**تر**):

پیاوانی ئاگر کوژێنەوە ، کە نیشتەجێی کۆشك بوون لە دەوڵەتی عوسمانی .

**کوکە** (**تر** ):

جۆرە کەشتییەکی سەردەمی عوسمانی بوو .

**کیسەدار** (**فا**):

وەکیلی خەراج .

**کیلتش** (**تر**):

جۆرە شمشێرێك بوو، بە یەکە تیمارێکی تۆمارکراویش دەگوترا .

**کیوان** (**فا**):

ئەستێرەی زوحەل، و یەك لە میرەکانی مەمالیك بوو ، هەروا ناوی بنەماڵەیەکە لە چیای لوبنان .

## پیتی ( ل )

**لاتین یەلکەنی :**

زاراوەیەکە لە سەردەمی عوسمانیدا بە جۆرە کەشتییەکی سێ گۆشەیی دەگوترا .

**لاجوق :**

لە سەردەمی مەملوکی و عوسمانی بەو خێوەتە شاهانە گەورەیە دەگوترا کە چەندین خێوەت بەدەوریدا بوون بۆ پاراستنی .

**لالە :**

زاراوەیەکی عوسمانییە لە بنەڕەتدا واتای مامۆستای دەگەیاند بەڵام لە دواییدا بوو بە نازناوێکی تایبەت بۆ مامۆستایان و پەروەردەکارانی شازادە و میرزادەکان .

**لاوەند :**

زاراوەیەکی ئیتاڵییە لە ( Levantino) یا (Levandino) وەرگیراوە کە واتای رۆژهەڵات دەگەیەنێ . بەڵام عوسمانییەکان لە سەردەمی سوڵتان محەمەد ئەلفاتیحەوە بۆ دەریاوان و سوارچاکانی دەریا بەکاریان دەهێنا هەروەها بۆ سەربازانی هێزی دەریایی و زەمینیش بەکاردەهێنرا کە بە جەربەزەیی و ئازایی نێویان دەرکرد. ئێستاش لە هەندێ وڵاتی رۆژهەڵات خێزان هەن بەو نێوە .

**لاوەندی رۆمی :**

نازناوێکە بۆ سەربازانی دەریایی کریستیان لە ریزی سوپای دەریایی عوسمانیدا.

**لاوەندی سوارە :**

بە واتای سوارچاکانی دەریایی دێت و بەو هێزە سوارەیە دەگوترا کە ئەرکی پاراستنی لێوارەکانی دەریایان پێ سپێردرا بوو .

**لذذ :**

زاراوەیەکە بە هەر سێ مانگی شەوال و زولقیعدە و زولحیجە دەوترا و سەربازانی ( قاپی قوڵو ) لە کۆتایی مانگی کۆتاییاندا پاداشتێکیان بەو نێوە وەردەگرت .

**لوغم :**

وشەیەکی یۆنانییە بەو جۆرە تەقەمەنیە دەگوترا کە دەخرایە ژێر خۆڵەوە و بۆ تێکدانی دیوار و قەڵا بەکاردەهێنرا.

**لوغمچی :**

بەو کەسە دەگوترا کە لە کاتی شەڕ و گەمارۆدانی شوورە و قەڵا، زەوی و بن دیواری هەڵدەکەند و تونێلی دروست دەکرد و تەقەمەنی دەخستە ژێر خاکەوە بۆ تەقاندنەوە و تێکدانی شوورە و قەڵای نەیاران.

**لوغمچی باشی :**

سەرکردەی هێزی لوغمچییەکان کە بریکارێك (کتخدا ) و یەکێك بە پلەی چاوش و ئاڵا هەڵگرێك (عەلەمدار ) یارمەتییان دەدا .

**لق یا لك :**

پاشکۆیەکی تورکییە دەخرێتە سەر ناو دەبێ بە ئاوەڵناو بۆ نموونە :

**سەلاملك :**

تایبەت بە سەڵاو وەرگرتن بۆ گەورە پیاوانی دەوڵەت.

**حەرەملك :**

شوێنی تایبەت بە ژنانی شا و سوڵتان و گەورە پیاوانی دەوڵەت .

**سەفەر بەرلك :**

لە بنەڕەتدا بۆ گەشت بە رێگەی وشکانیدا بەکاردەهێنرا بەڵام لە دواییدا بوو بە زاراوەیەکی تایبەت بە رەشبگیری بۆ سەربازی و ناردنی خەڵك بۆ بەرەکانی شەڕ .

**لەگەن :**

جۆرە مەنجەڵێکی قووڵە کە لە مس دروست کراوە . ئێستاش لە گەلێ شوێنی کوردستان بە هەمان واتا بەکاردەهێنرێ .

**لەنگ :**

وشەیەکی ئێرانییە بە واتای شەل و نازناوی میری تەتار و هێرشبەری بەنێوبانگ تەیمووری لەنگە .

**لیوا ( بە تورکی لیڤا ) :**

یەکەیەکی ئیداری عوسمانی بوو لە ویلایەت بچووك تر بوو .

**لەیقە :**

زاراوەیەکە بەو پارچە لۆکەیە دەگوترا کە بە مەرەکەب تەڕ دەکرا و پێی دەنووسرا .

**لیمان :**

وشەیەکی تورکییە بە واتای مینا دێت بەڵام لە میسر لە سەردەمی مەملوکیدا بە واتای زیندان بەکار دەهێنرا و گەلێ جار بە لۆمانیش بە کار دێت.

**لیمان رەئیسی :**

سەرۆکی مینا لە سەردەمی عوسمانیدا بەو ئەفسەرە دەریاییە دەگوترا کە بەرپرسی یەکەمی بەندەر بوو و دەبوایە بە پلەی بەگ بێت .

**لیمان کاتبی :**

نووسەری بەندەر ، بەو فەرمانبەرە دەگوترا کە ئەرکی تۆمار و پەڕاوەکانی بەندەری دەگرتە ئەستۆ لە هێزی دەریایی عوسمانی .

## پیتی (م)

**ئەلما** (ع) :

یەکەیەکی کێشان بوو. سەنگەکەی جیاواز بوو لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر و بەگشتی لە نێوان چوار سەد و حەوت سەد کیلۆگرام .

**ئەلمابەین** (ع) :

زاراوەیەك بوو بەو شوێنە دەگوترا کە سەرای سوڵتانی لە ژوورەکانی دەست و پێوەندەکان و ئەوانەی لە خزمەتیدا بوون جودا دەکردەوە .

**ئەلمابەینچیە** (ع . **تر**) :

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی عوسمانیدا بەو کەسانە دەوترا کە لە سەرای سوڵتانیدا کاریان دەکرد و لە خزمەتی سوڵتاندا بوون .

**ماخۆر** (**فا**) :

لە مەی و خواردنەوەوە هاتووە و بە مەیخانە دەگوترا.

**ماجریات** (ع):

وتەیەکی عەرەبی بە فارسی کراوە واتای ڕووداو و بەسەرهاتەکان دەگەیەنێ.

**مارتۆلۆس** (**لا. یۆ**) :

زاراوەیەکی لاتینی و یۆنانییە لە لایەن عوسمانییەکانەوە بەکاردەهێنرا و بەو میلیشیایانە دەگوترا کە بۆ پەلاماردان و کۆکردنەوەی زانیاری بەکار دەهاتن.

**مارستان** (**تر. ع** ) :

هەمان واتای بیمارستان ، بیمار واتا نەخۆش و ستان شوێنی نەخۆش واتا نەخۆشخانە.

**ماسار** (**تر. ع**) :

زاراوەیەك بوو یەکەمین تیپی هەر سێ مانگی عەرەبی ( موحەڕەم ، سەفەر و رەبیعی یەکەمی ) لە خۆیدا کۆ دەکردەوە و بەو پاداشتە وەرزییە دەگوترا کە دەدرا بە سوپای قاپی قوڵی و بە (مواجب ماسار ) نێو دەبرا.

**ماسح** (ع) :

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی مەمالیکدا بەو کەسانە دەگوترا کە زەوییان پێوانە دەکرد.

**ماکینچی** (**ئیتا. تر** ) :

لە وشەی (ماشین )و پاشکۆی (چی) پێکهاتووە. بەو کەسە تەقنییانە دەوترا کە خۆیان بە چاککردنی ئامێری میکانیکییەوە خەریك دەکرد.

**مالج** (**فا**):

بە کوردی خۆمان ماڵنجی پێدەوترێ کە وەستای گەچکاری بەکاری دێنی بۆ سپیکردنی دیوار.

**مالکانە** (ع. **فا**) :

زاراوەیەکە لە سەردەمی عوسمانیدا بەو سیستەمە دەگوترا کە لە دوای پەیماننامەی کارلۆڤیتز لە (١٦٩٩) داهێنرا و بریتی بوو لە فرۆشتنی زەویوزار بە کەسانێك کە مافی ئەوەیان دەبوو بە درێژایی تەمەن ئەو زەوییانە بە کار بێنن و سوودی لێ وەربگرن ئەوەش بۆ پشتیوانی کردنی گەنجینەی دەوڵەت کە هەمیشە کورتی دەهێنا.

**مالکانه قلفەسی** (ع. **فا**. **تر** ) :

زاراوەیەکە لە سەردەمی عوسمانیدا بە خامەیەك لە خامەکانی کارگێڕی دارایی دەوترا و ئەرکی تۆمارکردنی کۆنتراکتی ئیلتزامی گرتبووە ئەستۆی خۆی، کە لە گەڵ ئەوانەدا دەکرا کە ئەو زەویوزارانەیان بۆ هەموو ژیان بە قۆنتەرات دەگرت .

**مالیه دفتر خانەسی** (ع . **یۆ**. **فا**.**تر**) :

زاراوەیەکە بەو شوێنە دەوترا کە پەڕاوی تۆمارە داراییەکانی دەوڵەتی عوسمانی تێدا دەپارێزرا.

**مانده** (**فا**. **تر** ) :

مانده بەو سەربازە دەرگاوانانە (قاپی قولو ) دەوترا کە لەگەڵ سەربازەکانی تردا بەشدارییان نەدەکرد لە شەڕدا بە هۆی نەخۆشی یا پیرییەوە. ئەگەر لە هەندێ شەڕیشدا بەشدارییان پێ بکرابایە، ئەوا ئەرکی لاوەکییان پێ دەسپێرردا.

**مانەوی** :

ئاینێکە بە نێوی مانییەوە، کە لە سەدەی سێیەمی زاییندا دەرکەوت، نێوی دەرکرد و بریتی بوو لە تێکەڵییەك لە ئاینەکانی زەردەشتی و جوویی و کرستیانیی. لە سەردەمی عەبباسیدا لایەنگرانی مانەوی بە زەنادقە نێوزەد کران.

**ماهیه** (**فا** ) :

لە (ماه ) فارسییەوە هاتووە کە بە کوردی مانگە. بە مووچەی مانگانە دەوترا و تا ئێستاش لە میسر لە بەرامبەر مووچەی مانگانەدا هەر ماهیە بەکاردەهێنرێ.

**مباشر** (ع) :

زاراوەیەك بوو لە سەردەمی مەملوکیدا بەو فەرمانبەرە دەوترا کە داهاتەکانی ئەوقاف دەژمارد و پوختەی خەرج و قازانجی ساڵانەی رێکدەخست. ئەو کەسەشی کە لە دادگا بانگی کەسە پەیوەندارەکان دەکات بۆ ئەوەی بێنە بەردەم دادوەر بە مباشر دەناسرێ.

**مبشر** (ع) :

له دەوڵەتی عوسمانیدا بەو کەسە دەوترا کە مزگێنی گەیشتنی حاجییانی بە سوڵتان دەدا چ بە حیجاز و چ گەڕانەوەیان بۆ ئەستەمولّ لە ١٢ی رەبیعولسانیدا. بەم بۆنەیەوە ئاهەنگێکی گەورە ساز دەکرا.

**مبعوسان** (ع. **فا**) :

یەکێ لە ئەنجومەنەکانی پارلەمانی عوسمانی بە ئەنجومەنی مەبعوسان واتا ئەنجومەنی نوێنەران دەناسرا. ئەو کەسانەی بۆ ئەندامەتی ئەو ئەنجومەنە هەڵدەبژێردران و دەبوونە نوێنەری ولایەتەکەی خۆیان بە مەبعوس و کۆکەی مەبعوسان دەناسران. ئەنجومەنەکەی تری پارلەمانی عوسمانی ئەنجومەنی ئەعیان بوو.

**متارکه** ( ع ) :

زاراوەیەکە لە دەوڵەتی عوسمانیدا بۆ راگرتنی شەڕ بەکار دەهێنرا، دوا موتارەکە لە دەوڵەتی عوسمانیدا موتارەکەی مۆدروس بوو کە کۆتایی بە شەڕی یەکەمی جیهانیی هێنا.

**متسلم** ( ع) :

ئەو کەسەی لە لایەن والی نوێی ویلایەتەوە رادەسپێردرا کە کاروباری ویلایەتەکە بەڕێوەبەرێ تا خۆی دەگاتە ئەوێ پێی دەوترا موتەسەلیم . هەروەها ئەو کەسەش کە والی لە جێی خۆی دایدەنا کاتێ دەچوو بۆ شەڕ هەر بە موتەسەلیم دەناسرا. یەکێ لە ئەرکە سەرەکییەکانی موتەسەلیم ئەوە بوو کە داهاتی باج و خەراجی ویلایەتەکە کۆ بکاتەوە و بینێرێ بۆ والییە ئەسڵییەکە. بە خۆیشی لەگەڵ ئەو هێزەی لە گەڵیدا بوو باجی نەدەدا.

**متصرف** (ع) :

زاراوەیەکە لە دەوڵەتی عوسمانی بە فەرمانڕەوای موتەسەرفیە دەوترا ، بەتایبەتی دوای ئەوەی دەوڵەت زنجیرەیەك رێکخستن و چاکسازی کارگێڕی ئەنجام دا و چەند قەزایەك موتەسەرفییەیان پێکدەهێنا و چەند موتەسەرفییەیەکیش ویلایەتیان پێکدەهێنا.

**متفرقة** (ع) :

زاراوەیەکە لە سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانیدا بەو گرووپە پاسەوانە تایبەتییانەی سوڵتان دەگوترا کە لە کوڕانی گەورە پیاوانی دەوڵەت هەڵدەبژێردران و لە تەك سوڵتاندا بە سواری ئەسپ دەڕۆیشتن و باشترین چەکیان هەڵدەگرت و جلوبەرگی جوان و پڕ لە بریق و باقیان لە بەر دەکرد و مووچەکانیان بە پێی پێگە و پلە و پایەی باوکیان بوو. بۆ نموونە کوڕانی سەدرە ئەعزەمەکان ( سەرۆك وەزیرەکان ) شەست ئاقچەیان لە ڕۆژێکدا وەردەگرت، کوڕانی وەزیرەکان پەنجا ئاقچە، کوڕانی نیشانچییەکان چل ئاقچەو میرزادەکان چل و پێنج ئاقچە.

لە سەڵتەنەتی عوسمانیدا جۆرێکی تری سوارەی موتەفریقە هەبوون کە وەپێش سوڵتان دەکەوتن لە کاتی دەرچوونیدا بۆ شەڕ و ئەرکیان پاراستنی سەروەت و سامانەکان بوو.

**مەتلیك** (یۆ ) :

لە میتالیکۆسی یۆنانییەوە واتا کانزا وەرگیراوە . یەکەیەکی پارە بوو لە مس و لە سەردەمی عوسمانیدا بەکار دەهات .

**مجامعة** (ع) :

زاراوەیەکە لە سەردەمی مەملوکیدا بەکار دەهێنرا بۆ ئەو باجە هەفتانەیە کە لە سەوزە فرۆشان و خاوەن دووکانەکان وەردەگیرا.

**مجدە** (**فا**) :

لە موژدەی فارسییەوە وەرگیراوە. موژدە ئەو هەواڵە خۆشانەی دەگەیاند کە دەگەینرا بە فەرمانڕەوا.

**مجلة الاحکام العدلیة** (ع) :

ئەم زاراوەیە بەو قانوونە مەدەنییە دەوترا کە دەوڵەتی عوسمانی بە هاوکاری زانایانی ئاینی داینا. سەرچاوەی ئەم قانون و ڕێنماییانە فیقهی ئیسلامی بوو لە سەر مەزەبی حەنەفی . ڕێکار و ڕێنماییە قانوونییەکان دەربارەی مامەڵە و داوا بوون لە ١٨٥١ مادەدا کۆکرانەوە و لە شازدە بەرگدا جێگەیان کراوەتەوە.

**مجلس أعيان** (ع):

ئـەم زاراوەیـە بـۆ ئەنجومـەنی پیاومـاقوولان یـا پیرانـی پارلـەمانی عوسمـانی بەکاردەهێنرا. بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٧٧ کۆبووەوە، بەڵام دوای دەمێکی کورت لە کار خرا و تا ساڵی ١٩٠٨ نەکەوتەوە کار. هیچ ڕۆڵێکی ئەوتۆی نەبینی و لە ساڵی ١٩٢٣ لەگەڵ دامەزراندنی کۆمـاری تورکیـادا بـە یـەکجاری لـە بـەین چوو.

**مجلسی مشورت** (ع) :

بـە واتـای ئەنجومـەنی ڕاوێـژکاری . مەجلیـسی مەشـوەرەت بـەو ئەنجومەنـە دەگوترا کە سوڵتان سەلیمی سێیەم (١٧٨٩ – ١٨٠٧ ) پێکی هێنـا و بـوو بـە دەزگایەکی میری گرنگ کە هاوکارانی سوڵتان و گەورە بەرپرسانی دەوڵەتی لە خۆیدا کۆدەکردەوە. سوڵتان سەلیمی سێیەم بۆ یەکەمین جار بەشداری بە دوو کەسی ناموسوڵمان لەو ئەنجومەنەدا کرد.

**مجيدی** (ع):

جۆرە پارەیەك بوو لە زیو لە سەردەمی سوڵتان عەبدولمەجید لـە سـاڵی ١٨٤٤ لێدرا دوای دەرچوونی فەرمانی چاکسازی لە پارە و پولی عوسمانیدا. هەر لـەو کاتــەدا جـۆری دە قرووشـیش لێـدرا کـە نیـو مەجیـدی پێـدەوترا. چـارەکە مەجیدیش پێنج قرووش بوو، هەروەها دوو قرووشی و یەك قرووشـیش هـەبوو. مەجیدی بە ناسنامەی کەسیی هاوڵاتییانی عوسمانیش دەوترا.

**محصل** (ع) :

لە دەوڵەتی عوسمانی بە تحـصیلدار نێـودەبرا و بـەو فەرمانبـەرە دەوتـرا کـە ئەرکی وەرگرتنی باج و داهاتی دارایی لە ئەستۆ بوو.

**محضر اغا** (ع. تر) :

موحزیر ئاغـا یـەکێك لـە گـەورە ئەفـسەرانی سـوپای ئینکیـشاری بـوو و پلـەی سەربازیی لە نێوان کوتخدا و باشپیادە .

**محفدار** (ع. فا):

لــە ســەردەمی مەملوکیــدا مەحەفــە بــەو تەختــە دەوتــرا کــە هەڵــدەگیرا و دەگوێزرایەوە لەگەڵ سوڵتاندا بۆ ئەوەی لە سەری دابنیشێ یا پاڵبکەوێ . بەو

کەسەی ئەو تەختەی هەڵدەگرت دەگوترا مەحەفەدار .

**محلول** (ع) :

لە سەردەمی عوسمانیدا مەحلول بەو کەسە دەوترا کە زەویوزارەکەی یا پلە و پایە میرییەکەی لێ وەردەگیرایەوە. ئەو زەویوزارانەش کە خاوەنەکەیان کۆچی دوایی دەکرد یا لە ژیانی خۆیدا بڕیاری دەدا نەیداتە کەس بە مەحلول دادەنرا. هەروەها بەو پلە و پێگە ئاینییانەش وەکو ئیمام و گوتارخوێنی مزگەوتەکان کە چۆڵ دەبوون دەوترا مەحلول .

**محمودی** (ع) :

جۆرێك لە پارە بوو کە لە ئالتوون دروست دەکرا و لە سەردەمی سوڵتان مەحمودی دووەمدا لێدرا. بە زێڕی مەحمودی نوقتەداریش نێودەبرا.

# ڕەخنەی ڕەخنە

**ماجد مەردۆخ ڕۆحانی**

لـە ژمـارەی ١٩ی "ئـەكادیمی"، گۆڤـاری ئـەكادیمیای كوردیـدا، مامۆسـتای پایەبەرز محەمەد عەلی قەرەداغی، لەسەر "**مێژووی ناودارانی كورد**"، وەرگێڕاوەی كتێبی فارسی "**تـاریخ مـشاهیر كُرد**"، كۆكردنـەوە و نووسـینی خـوا لێ خۆشـبوو مامۆسـتا بابەشـێخی مـەردۆخ ڕۆحـانی "شـیوا"، وتـارێكی نووسـیوە و هێنـدێك ڕێنوێنی و پرسیار و ڕەخنەی تێدا جێ كردۆتەوە.

بـەو بۆنـەوە كـە ڕووی قـسەی وتارەكـە لـە منـی وەرگێـڕە، پـاش ئـەوەی ڕێنوێنییەكانی مامۆستا قەرەداغیم لەسەر چاوان دانا، بە پێویستم زانی پرسـیار و ڕەخنەكانی بێ وەڵام نەهێڵمـەوە و چـەند لێڵییـەكیش كـە بـەدی هـاتووە، بـەپێی توانا، ڕوونیان بكەمەوە.

پێشەكی دەبێ ئاماژە بـەوە بكـەم كـە ئـەم كـارە جـارێ ناتـەواوە و بـەرگی سێەمی مـاوە. لـە پێـشەكی فارسـی ئـەو بەرگـەدا ـ كـە سـاڵی ١٩٩١ز. لـە چـاپ دەرچووە ـ نووسیومە كە چۆن كاتێ كـە نووسـەری وەبـەر ڕەوانـشادی كتێبەكـە، لەبەر زۆر گرتنی نەخۆشییەكەی، زانی هەودای ژیانی لە پسانە و چیتر مەودای بـۆ تەواوكردنی كتێبەكە نەماوە، هەموو فیش و یاداشتەكانی بە من ئەسپارد و ڕێگـای ئەوەی پێ دام بە دڵی خۆم كار بكـەم و بـۆ داهـاتووش، هـەر شـێوە گۆڕانكـاری و تەنانەت دەستێوەردانێكم بە ڕەوا زانی، گەردنم ئازاد بێ.

جا مامۆستا قەرەداغی ئەگەر ئەو پێشەكییە فارسییەی بخوێندایەتـەوە، یـان هێنـدێك بـۆ نووسـینی ئـەو وتـارە پەلـەی نەكردایـە و بیهێـشتایە كارەكـە بگاتـە كۆتایی، ئەوجار هەڵیسەنگێنێ، شـكم نییـە وەڵامـی زۆرێـك لـە ڕەخنـەكانی دەس دەكەوت و لە ئەركی نووسینی زیاتر لـە نیـوەی بابەتەكـەی دەبـووەوە. بـۆ بـاقی ڕەخنەكانیش یەك بە یەك:

یەكەم لێڵی وتارەكـەی مامۆسـتا قـەرەداغی، سـەبارەت بـە خۆمـە، بەڕاسـتی نەمزانی مامۆستا منی لە حاندی ئـەو كتێبـە، بـە چـی زانیـوە و لـە كـوێی دانـاوم،

ئاخۆ وەرگێڕم؟ نووسەرم؟ نویسیار (ئیدیتۆر)م؟ جارێك گلـەییم لێ دەكـا بـۆ ئـەو كارەم نەخستۆتە سەر شێوەیەكی ئەكادیمیك و دەفەرموێ:

"مەبەستم لەو گواستنەوە ئەوەیە: كارەكە بخاتە شێوەیەكی ئەكادیمی [!] و پوخت و كورت و پڕ لە زانیاری و دەوڵەمەند بە سەرچاوە. واتە دەكرێ ئەو هەموو شیعر و پەخشان و باسانەی لە نـاوەرۆكی كتێبەكـەدان، هـەموویان ـ كـەمێكی زۆر كەمیان نەبێ ـ لا ببرێن و دەست لەسەر پوختەی ژیانی كەسایەتێیەكان دابگرێت و هـەوڵ بـدرێت ئـەو سەرچـاوانەی ـ بـە كـۆن و نوێـوە ـ باسـی ئـەو كەسـایەتییانە دەكەن، لە پەراوێزەوە، بە چڕی و خەستیی بنووسرێن، وەك **"معجم المـؤلفين"** و **"الأعلام"** و هاووێنەكانیان، تێیاندا كراوە".

واتا سـەرلەبەری كتێبەكـە هەڵبـشێوێنمەوە و بیكەمـە كتێبێكـی تـر و لەسـەر بنەمایەكی تر، بەڵام هەر لەو كاتەشدا وەبەر ئەو گازندەم دەخا كە بۆچی ئەگـەر ـ وەكو نویسیار ـ وردە دەسكارییەكم كردووە و بـەپێی پێداویـستی زمـانی كـوردی، دەستێكم تێ بردووە، یەك بە یەكم ئاماژە پێ نەكردووە.

نازانم كۆ كردنەوەی ئەو دوو داخوازە، لە یەك كتێبدا چۆناوچۆن دەست بدا؟

خاڵێكی تر: مامۆستا سەرەتا دەفەرموێ دەقی فارسی ئەو كتێبـە **"نزیـك بـە نیو چەرخی بەسەردا ڕۆیشتووە"** و جارێكی تر دووپاتی دەكاتەوە: **"فارسییەكەی نزیكەی چل ساڵی پـێش نووسـراوە...."** ئـەوی كتێبەكـەی نـەدیتبێ، وا هەسـت دەكا باسی كتێبێكـی كـۆنی لـە كـەڵك كـەوتووە. كەچـی، بەسـەر چـاپی هـەوەڵی بەرگی سێهەمی ئەو كتێبەدا هێشتا بیست ساڵی تەواویش تێ نەپـەڕیوە! شـیاوی باسە مامۆستا شیوا ساڵی ١٩٨٨ز. لە دنیا ڕۆیی و تا دوامین مانگی ژیانیشی، هەر دەستی بە قەڵەم و قەڵەمی بە سەر رووپەڕی كتێبەكەوە بوو. نازانم حیـسابی ئـەو ساڵانە چۆن بوون بە چل و پەنجا؟!

ئەمجارە لە بواری مێـژووی وێـژەدا، ئـەوی بایـەخی كتێبێـك دەردەخـا، تـازە بـوونی نییـە، مامۆسـتا قـەرەداغی وەكـوو دوو نموونـەی سـەركەوتوو لـە زمـانی عەرەبیدا، ئاماژە بە "الأعلام / خير الدين زركلي" و "مُعجم المـؤلفين / عُمـر رضـا الكحالـە" دەكـا، كـە یەكـەمیان سـاڵی ١٩٦٩ز. نووسـینی كۆتـایی پـێ هـاتووە و دووهەمین ساڵی ١٩٦١. واتا زیاتر لە چل ساڵ و پەنجا ساڵی پێش.

قسه لـه شـێوازی کـار و ڕادەی زانـستی بـوونی بەرهەمەکەیـە، کـە لەمـەڕ "مێژووی ناوداران"ەوە، وەك مامۆستا خۆی دەفەرمویٚ: "بە جۆرێکی زانـستییانه و بابەتییانه ئەنجام دراوە" و بنەمایـەکی باشـە بـۆ ئـەو پـڕۆژەی زۆر دەمێکـە بـە ئاواتییە. بەڵام ئایا ناتـەواوی ژیاننامـە و بەرهـەمی دە و پـازدە و تەنانـەت پـەنجا کەسـایەتی لـەو کتێبـەدا، کـە زیـاتر لـە هـەزار نـاوداری لـە سـەرەتای مێـژووی ئیسلامییەوە پێمان ناساندووە، وا دەکا کە بە دوایدا لەو گوتە پەژیوان ببێتـەوە و بفەرمویٚ: "چاپی ئێستەی، وەك سەرچـاوەیەکی مێـژووی زانـا و نـاودارانی کـورد، دەوڵەمەندی بە خوێنەر و لێکۆڵەران نابەخشێت و ئەو لێکۆڵەرەی تەنها پشت بـەم سەرچاوە ببەستێت، ڕەنجەکەی بە فیڕۆ و بەرهەمەکەی نابەکام دەردەچێت."؟

**ڕەخنەیەکی سەرەکی مامۆستا قەرەداغی، لابردنی زۆرێك شـیعره لـە پاچـڤە کوردییەکەدا.**

جارێك ئەوەمان لەبیر بێ لە سەرانسەری ئەو کتێبەدا، تاقە بەیتێکی کوردی و تەنانەت عەرەبیش لا نەچووە، مەگەر بە هەڵە داکەوتبیٚ و تـەنیا شـیعری فارسـیی لیٚ کـەم کراوەتـەوە، ئـەویش نـە هـەمووی. شـاعیری وامـان هەیـە لـە کتێبـە فارسییەکەدا، پێنج نموونەی شیعری هاتووە، من یەك یان دوو نموونەم لیٚ هێناوە.

ـ ئەوە بۆ؟

ــ بـە ڕای مـن وەرگێـڕ پـێش ئـەوەی دەسـت بـۆ کارەکـەی بـەریٚ، پێویـستە خوێنەری خۆی هێندێك بناسیٚ و لە سەریەتی بەراوردێکی گشتی لـە کۆمەڵگاکـەی هەبیٚ.

ئەو کتێبە لە سەرەتاوە بە فارسی نووسراوە و چاپ کراوە و چەند جاریش لە چـاپ دراوەتـەوە. ئـەوی خوێندوویـە، بـیٚ شـك فارسـی زانیـوە و لـە شـیعرە فارسییەکانیشی چێژەی خۆی دەسکەوتووە. وەرگێڕانی بە کوردی ، بۆ ئەو چینە لە کوردانە کە یا هەر فارسی نازانن یان لایەنی کەم باش تـیٚ ناگـەن، واتـا کـوردی باشوور. ئەوجار کوا ڕەوایـە بـۆ ئـەو چـینە، لـە کتێبێکـی کوردیـدا، ئـەو هـەمووە شـیعرە دژوارە فارسـییانە خزابـیٚ؟ کـە زۆربـەی خوێنـەران ـ وەك گوتمـان ـ هـیچ سەری لیٚ دەرناکەن و تەنیا ئەستوورایی کتێبەکـە زۆرتـر دەکاتـەوە و هیـچی تـر.

دەنا هێنانی دەق بە دەقی ئەو پتر لە هەزارو دووسەد بەیتە شیعرە، چ ئەرك و زەحمەتێکی بۆ وەرگێڕ هەیە؟

**ڕەخنەیەکی زۆر بە ڕێی و جێی مامۆستا قەرەداغی**، لە سەر هێنانە سەر ڕێنووسی کوردیی ناوەکە، چ ناوی کەس و چ ناوی شوێن. ئەوە، بەتایبەت بۆ ناوی شوێنەکان، زۆر ڕاستە و ڕێنووسی سەقەتی زمانی فارسی ڕێگە نادا خوێنەر، یان ئێستا بڵێین وەرگێڕ، ئەگەر بۆ خۆی ئاشنایەتی لەگەڵ شوێنەکەدا نەبێ، بۆی ساغ بێتەوە، وەك یەکەم خاڵ کە مامۆستا دەستی ناوەتە سەری و دەفەرموێ: "سُهرووردی" دەبێ بکرێتە "سووروەوەردی" نەك "سوورەبەردی"، کەچی "سوورەبەرد"، گوندێکی کوردی نێوان بیجاڕ و زەنجان، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانە و دیارە مامۆستا ناوی ئەو گوندەی نەبیستووە و لە لاپەڕەی ٦٣، دێڕی ١٧ی وەرگێڕاوەکەش (باسی شێخی ئیشراق)، ورد نەبۆتەوە، تا ئەو ڕاستییەی بۆ ڕوون ببێتەوە کە لە سەرەتا دا "سوورەبەردی" بووە و فارس کردوویەتە "سوهرەوەردی" و "سوهرەوەرد" یان "سوورەوەرد"، مەلای مەزبوورە گوتەنی، مانای تێ نەکراوە!

هەروەك لە دوایین خاڵی ئەو بەشەدا، باسی مەلا ئەبووبەکر ناوێکە، خەڵکی گوندی "ساردکە"ی سەر بە ڕواندز، کە لە دەقی فارسی و کوردیی کتێبەکەدا ناوی عەشیرەتەکەی "پیرپوستەمی" نووسراوە و ئەگەرچی هەر ئێستاش لە شاری سنە، ناوی بنەماڵەیی "پیرپوستەمی"مان هەنە، بەلام کە مامۆستا دەفەرموێ "میرپوستەمی" ڕاستە، بێ شك هەر وایە و ئێمە کە لە ڕواندز دوورین، ناوی هۆز و عەشیرەتەکانی ئەوێمان تەنیا لە کتێباندا خوێندووتەوە و ئەوەش جێی متمانە نییە.

خاڵێکی تر: مامۆستا قەرەداغی وەکو ڕەخنەیەك ئاوڕ لە ناونامەی کتێبەکە دەداتەوە و دەفەرمووێ: "دووجار ناوی نالی هاتووە، جارێك بە (نالی مەلا خدر)، جارێکی دی (مەلا خدر نالی) ل: پەنجاوپێنج" وایە، بەلام نەك تەواو. جارێك بە : نالی (مەلا خدر) و جاری تر: مەلا خدر نالی.

- فەرقییان چییە؟

ـ لە پێشەکی کتێبەکە، لاپەڕەی نۆ، تێبینی ژمارە ٢، لە ٢٠ دێردا، چۆنیەتی دەرهێنانی ناونامەکە و هۆی بە دوو یان هێندێ جار، سێ شێوە هێنانی ناوەکان، ڕوون کراوەتەوە و وا دیارە مامۆستا دیسان ئەو بەشەی وەبەرچاو نەکەوتووە، دەنا ئەوە تەنیا تایبەت بە نالی نییە و نزیك بە نیوەی ناوەکان دەگرێتەوە، بە کورتی بۆ ئاسانکارییەکی زیاتر، کە ئەگەر خوێنەر کەسایەتییەکی بە هەر ناو یان نازناوێکەوە ناسی، بتوانێ بیدۆزێتەوە. کەسی وامان هەن بە دوو یان سێ ناوەوە ناوازەیە و بۆی هەیە خوێنەر تەنیا یەکیانی لە بیر بێ، بەو کارە لەگەڵ ئەو ناونامەدا کراوە، مادام لە کتێبەکەدا ناوی هەبێ، لەو ناونامەدا هەر دەبیندرێتەوە. وەکو: ئەبوومەنسوور (**قازی سەدرەدینی جزیری**) / قازی سەدرەدینی جزیری (**ئەبومەنسوور**) یان: وەحدەتی کرماشانی (**تاماسب قولی خانی کەلهوڕ**)/ تاماسب قولی خانی کەلهوڕ (وەحدەتی کرماشانی). یان: شێخ عومەری قەرەداغی (**ئیبنول قەرەداغی**) / ئیبنول قەرەداغی (**شێخ عومەر**) و....

دیارە ئەو وردەکارییانە، لای ئێمە هێشتا تەواو باوی نەساندووە و جێی خۆی نەکردۆتەوە و لە کتێبە کوردییەکاندا دەگمەنە، بەلاَم ئێمەی نووسەر یان وەرگێڕ، لەسەرمانە وەکو قانوونێك بۆ کتێبانمان و خزمەتێك بە خوێنەرانمان، دەکاری بێنین و ڕەواجی پێ بدەین.

جا کە هاتینە سەر باسی ناو و ناونامە، جێی خۆیەتی ئەوەشمان لە بەر چاو بێت کە لەو دوو بەرگە مێژووەدا، ئەو هەزاران ناوە عەرەبی و فارسی و ترکییە نووسراون، وا کراوە کە لەسەر ڕێنووسی کوردی، بەلاَم بێژەی زمانەکەی خۆی بێ. وەك: "**حوسەین**" و "**مەنووچیهر**" و "**ئوزون**"، نەك "**حوسێن**" و "**مەنووچەر**" و "**ئۆزۆن**"، کە زۆربەی کتێبانی ئەوڕۆکەش، ئەوەیان نەکردووە.

گرنگترین ڕەخنەی مامۆستای بەڕێزم لەو کارە ئەوەیە: بۆچی خاوەن ناوێکی تازەم لە کتێبەکە زیاد نەکردووە و ئەو کتێبە ئەوەندە ساڵێ پێش، بە فارسی چۆن بووە، هەر ئەوەم وەپێش چاوی خوێنەرانی دەقە کوردییەکەشی خستووە؟

لە ڕاستیدا ئەو گرنگترین ڕەخنەیە، بوو بە هۆی گەورەترین سەرسووڕمانم، ئاخر پێشەکی بەرگی دووهەم، بە ناوی "**چارێ لە ناچاری**"، تەنیا وەرامی ئەو

پرسیارەیە و بەس. سەرم لەوەدا سووڕماوە، مامۆستا قەرەداغی کە سووکە گۆڕانکارییەکی وەکی ئەوەی سەردێڕی **"خانا پاشا قوبادی"** بۆتە **"خانای قوبادی"** لە چاو دانەکەوتووتەوە، ئەگەر چی لە یەکەم دێڕدا "خانا پاشای قوبادی"ش دیسان نووسراوە! ئەوجار ناوی وتارەکەی تازە "ئەم کتێبەم خوێندەوە" چۆن دەبێ ئەو پێشەکییەی نەخوێندبێتەوە؟! دەی خۆ ئەگەریش بیخوێندایەتەوە و پێچەوانەی هەموو ئەوانەی تا ئێستا خوێندوویانە، لێبووردانەکەی پەسند نەکردایە، بەرپەرچی دەداوە، نەك ئەوەی هەر بە لایدا نەڕوا و هیچ لێوە نەکا!

جا بۆ ئاگاداری مامۆستا و ئەو کەسانەی وتارەکەی مامۆستایان بینیوە و چاویان بە **"مێژووی ناودارانی کورد"** نەکەوتووە، لێرەدا بەندی کۆتایی ئەو پێشەکییە، دەقاودەق دەخەمە بەرچاو:

".... ئێستا کە دەقی کوردی ئەو مێژووە دەخوێنینەوە، بیست ساڵی تر بەسەر چووە و کاروانێك لە ناودارانمان، هەر کام بە جۆرێك، ئێمە و ئەم دنیایەیان بەجێ هێشتووە، کەسانی وەك: ....(٢٣ ناو).... خوێنەری هێژا باش دەزانێ ئەگەر ماجدی لە شاری خۆیدا غەریب، بیهەوێ ژینامەی ڕاست و ڕەوا بۆ هەموو ئەو کەسانە بنووسێ، دوور نییە لەسەر هێندێکیان، سەرزلان سەری پان بکەنەوە و لەسەر هێندێ تر، سەروشکان فتوای کافربوونی بدەن و بۆ بڕێ ڕەخنە و ڕوونکردنەوەی مێژووییش، تەنانەت هەواڵنیشی شارەوەدەری بکەن. کە وا بوو، یان دەبێ "بۆ مەبەست سەر بنەوێنێ تاوێ" و وا بنووسێ **"هیچ زەرەری بۆ پەز نەبێ"**! یا خۆ بە لای کەسانی بڤەدا نەچێ و مەلا گوتەنی، خۆ لەم " قُلْ یا أیُها الکافرُونَ" نەدا!

بەڕاستی هیچیانم پێ نەکرا و لە ناچاری، چارم لەوەدا دیت جارێ دەس ڕاگرم و تا دەورێکمان لێ دەکرێتەوە و وامان لێ دێ لەسەر بیر و بۆچوون، بە سەر و گوێلاکی یەکدا نەدەین و بتوانین بە هێمنی و پشوودرێژی قسە بکەین و قسەی یەکتر ببیسین، باسی کەس نەکەم!

زۆر بە ئاواتم تا ماوم، بتوانم شوێنی ئەم کارە بایەخدارە بگرم و بەبێ

لایەنگری، درێژەی ژیاننامەی ناودارانمان بنووسم، بەڵام با بزانین چییان بۆ چارەنووسمان نووسیوە.

براتان: ماجد مەردۆخ ڕۆحانی زستانی ١٣٨٩ك. هـ. (٢٠١١ز.)

له سەرینەی ئەوانەدا

مامۆستا گیان! ئەو کتێبە هەرچۆنێك بەرهەم هاتووە، ئێستا خاوەن تایبەتمەندییەکە، نەك هەر لە کتێبخانەی کورد بۆ زمان و وێژەی فارسیش، کە هەزار ساڵە خزمەتی دەکەن کتێبێکی وا نووسراوە. ئەوەی کە بەو هەموو بەفراوانییەوە، تاقە دێڕێکی تێدا بەدی ناکرێ سەرچاوەکەی لە پەنادا نەنووسرابێ. جێ خۆی نەبوو وەکو ڕەخنەگرێکی بێ لایەن، سووکە ئاماژەیەکیشت بەو تایبەتمەندییە بەر و هێژایە بکردایە؟

ئەوجار وەك خۆت فەرمووتە، من نوسخەیەکی ئەو کتێبەم هیچ نایە خزمەتی ئێوە بەڕێزان لە ئەکادیمیا و ئێوەش لە دانیشتنی ڕۆژی ٢٠١٠/١٠/١٠دا خستووتانەتە بەر باس و هەر بۆخۆت لەو دانیشتنە بڕوات وا بووە کە: "کتێبێکی باشە، بەڵام ئەگەر چی و چی بکرێت، باشتر دەبێت". کە دوای بڵاوبوونەوەی کتێبەکەش، هاتمە هەولێر و سەردانی ئەکادیمیام کرد، هەر کام لە مامۆستایان چاویان پێم کەوت، پیرۆزبایی ئەوکارە، بە بڕوای ئەوان، بایەخدارەیان لێم کرد.

دەی سا داوا دەکەم جارێکی تر چاوێك بەو گوتاری "من ئەم کتێبەم خوێندەوە"دا بگێڕە و بزانە هیچت بۆ هێشتۆتەوە؟ تەنانەت گەیاندووتە ئەو حاندە، ئەگەر ئەکادیمیا بەرایی چاپی داوە، بەڕای تۆ هەڵەی کردووە و دیسان ئەگەر دوکتۆر ئازاد هاتۆتە سنە و "ماندوو نەبی"یەکی بەمن گوتووە، جێی گلە و گازندەی جەنابتە!

لە کۆتاییدا:

ئێستاش، کە چاپی هەوەڵی ئەو کتێبە لە تەواوبوونە، وەك خۆت دەفەرمووی، نەچووە بچێت، ئەگەر ڕێم هەبێ، وەك قوتابییەك دێمە خزمەتت و چۆك دەدەم و دیسان ئەوی ڕێنوێنی جەنابت بێ و بۆ منی ڕۆژهەڵاتی دەست بدا، جێگای لە سەر سەرمە، بەشکوو بە یارمەتی مامۆستای بەڕێزم، چاپی دووهەم وای لێ بێ، دڵی دڵسۆزانی کوردستان و چاوی خوێنەرانی هاوزمانم ڕوونتر بکاتەوە.

# رواق الأكراد في الأزهر
# وآثارهم في المكتبة الأزهرية

**الدكتور عماد عبدالسلام رؤوف**
**عضو لجنة الوثائق والمخطوطات في الأكاديمية الكردية**
**وأستاذ في كلية الآداب- جامعة صلاح الدين**

على الرغم من أننا لا نستطيع أن نحدد البدايات الأولى لوفود الكُرد إلى مصر في العصور الإسلامية، إلاّ أن في وسعنا أن نؤكد بأن تأسيس الدولة الأيوبية في القرن السادس الهجري كان سبباً قوياً في اضطراد ذلك الوفود إليها بأعداد مُلفتة لنظر المؤرخين. وكان للمتغيرات العامة التي مَرَّ بها المشرق الإسلامي بعد اجتياح المغول له في منتصف القرن التالي دورها في تعاظم الثقل الاجتماعي والعسكري للكُرد في مختلف المدن المصرية، فشهد عهد الدولتين المملوكتين اللتين تعاقبتا على حكم مصر ظهور شخصيات كردية بارزة لها أثرها في الحياة الاجتماعية والثقافية بما أنشأته، وَرَعَته، من نشاطات مدنية متنوعة، مثل إنشاء المدارس والرُّبُط ورعاية طلبة العلم وما يتصل بذلك من خدمات عامة مهمة. وكانت مصر مَوئلاً لكثير من العلماء الكرد الذين وجدوا في أجوائها المتفتحة، والبعيدة عن الاضطراب العام الذي عم البلاد الإسلامية عهد ذاك، مجالاً للنبوغ العلمي[1]، فكان من هؤلاء العلماء مثلا النحوي ابن الحاجب الدُويني، وعالم القراءات زين الدين الكردي المعروف بالحافظ العراقي، وغيرهم كثير، وبما أن معظم هؤلاء كان مؤلفاً فإن أثرهم لم يقتصر على طلبتهم المباشرين فحسب، وإنما انتشر في أصقاع اسلامية عديدة، وتجاوز زمنهم إلى أزمان متعاقبة، فمنظومتا (الكافية) و(الشافية) لابن الحاجب، أصبحتا جزءاً من مفردات ما يحفظه طلبة النحو وعلمائه في العالم الإسلامي كله، أما علم القراءات

القرآنية فلم يكن في وسع طالب، أيّاً كانت هويته، أن يتجاوز مؤلفات الحافظ زين الدين الكردي العراقي، فإن تجاوزها عُدَّ ذلك نقصاً فادحاً في مصادر تخصصه العلمي.

وكان التقدم العلمي الكبير الذي شهده الجامع الأزهر في عهد دولتي المماليك، والشهرة الذائعة التي بلغها في مختلف العلوم الإسلامية[٢]، سبباً في أن يقصده النابهون من الكرد للأخذ عن علمائه، والالتقاء بغيرهم من طلبة العلم من البلاد الإسلامية المختلفة، والإغتراف مما حفلت به خزائن كتبه من علم وافر، ولا شك في أن عناية الأزهر بدراسة وتدريس الفقه الشافعي، كان سبباً آخر في أن تهفو قلوب طلبة العلوم الكرد، وهم جميعاً من أتباع هذا المذهب، للانتظام في سلك طلبته والأخذ عن علمائه.

ومن غير المحدد التاريخ الذي شهد نشوء أول تجمع علمي مستقر لطلبة العلم الكرد في الأزهر، ومن الراجح أنه نشأ في عهد المماليك، أو في أواخره على وجه التحديد، مَثله في ذلك مثل كثير من التجمعات العلمية التي نشأت بسبب توافد طلبة بعض البلاد الإسلامية إليه[٣]، وسبب ترجيحنا هذا أنه ما أن انقضت صفحة آخر دولة مملوكية، ودخلت مصر في سيادة الدولة العثمانية، حتى وجدنا أن أكثر تلك التجمعات تنشئ لها (أروقة)[٤] لها داخل الجامع، تقترن بأسماء الأقطار الإسلامية التي وَفدت منها، فكان ثمة أروقة خاصة بالشوام (الشاميين) والأتراك والجاويين والمغاربة والصعايدة والبغداديين والهنود وغيرهم. وليس ثمة ما يحدد زمن انشاء رواق خاص للأكراد[٥]، وإن كانت ترددت إليه الاشارات منذ القرن الحادي عشر للهجرة (١٧م). وكان رحّالة شامي، هو فضل الله بن مُحب الدين المُحبّي قد نزل فيه نحو سنة ١٠٥٢هـ/ ١٦٤٢م، فذكر أن في الأزهر (رُواقات)، وأنه لم يكن ينقطع "ما يُتلى فيه آناء الليل وأطراف النهار من تلاوة القرآن العظيم، وإملاء حديث النبي النبيه الكريم، وأصول الدين وبقية العلوم، كما هو مشهور معلوم"[٦]. وصرح الرَّحالة التركي أوليا جلبي في أثناء إقامته في القاهرة في سنة ١٠٨٣هـ/١٦٧٢م بوجود رواق خاص بالأكراد، فذكر أنه كان في الأزهر في عهده طلبة من خمسين أمة يقيمون بأروقتهم المخصصة لهم حول صحن الجامع، ويعملون دوماً على تعلم علوم مختلفة، ونَوَّه بأسماء بعض هذه الأروقة، فكان منها (رِواق الأكراد)، إلى جانب أروقة (الروم) أي

الــترك، و(الفُــنج) مــن الــسودان الــشرقي، و(البلخــي) و(التُــستر) و(العجــم) و(الداغستانيين)، وأن "أوقافه هائلة يقصر اللسان عن وصفها"[٧]. وفي التاريخ نفسه زار الرحالة ابراهيم الخياري المدني الأزهر فأعجب بالحياة العلمية فيـه، وقـال" وأمـا وضعه فأروقة تحيط بجوانبه الثلاثة، يختص كـل رواق منهـا بطائفـة مخـصوصة"[٨]، ومع أنه لم يسم رواقاً بذاته برواق الأكراد، إلاّ أن مـن المؤكـد كونـه موجـوداً آنـذاك، وذلك لأنه وصف كل ما يحيط به من أروقة ومعالم، فضلاً عـن تـصريح أوليـا جلـبي باسمه على ما مر بنا.

وكانت سيدة صالحة تـدعى أم هـاني قـد وقفت علـى عـالم كـردي يُـدعى علـي الكردي الزرزوري[٩]، ثم على ذريته ونسله، ثـم علـى رواق الأكـراد، مـصحفاً كتبـت في أوله نـص الوقفيـة، وهـي مؤرخـة في ٢٣ شـعبان سـنة ١٠٩٧هــ/١٦٨٥م. ويعـد هـذا المصحف من نفائس المصاحف المودعة في المكتبة، فهو مُحلّـى بكـثير مـن الـذهب، والزخارف، ومما يلفت النظر أن في آخـر هـذا المـصحف مـا يـشير إلى أنـه كتـب أولاً (برَسم خِزانة مولانا السلطان المالك الظاهر أبي سعيد محمد جقمق نصره الله نـصراً عزيزاً وفتح له فتحاً مبيناً بمحمد وآله)، وتحت الدائرة ما يأتي (خِدمة الملوك طوغان بن عبد الله السَيفي أركَماش اليَشبُكي)[١٠] وقد تولى جقمق السلطنة مـن سـنة ٨٤٢ إلى سـنة ٨٥٧هــ /١٤٣٨-١٤٥٢م ، فيكـون هـذا المـصحف قـد أعيـد وقفـه علـى رواق الأكراد بعد نحو قرنين سنة من تاريخ وقفـه الأول، ممـا دَلَّ علـى الأهميـة المتزايـدة لهذا الرواق في هذه الحقبة.

ويعـد الـتعمير الـشامل والتوسـعة الكـبيرة الـتي قـام بهـا عبـدالرحمن كتخُـدا مُستَحفظان سنة ١١٦٧هـ/١٧٥٣م من أهم ما شـهده الأزهـر في العـصر العثمـاني، إذ يذكر الجبرتي أن هذا الرجل أحبَّ الأزهر فوَسَّعه وأضاف إليـه منـشآت عديـدة منهـا رواق خاص بـ(الصعايدة) وهم القادمون من صعيد مـصر، وجـدد رواقـين للمكـاويين (المكيين) والتكروريين (أهل تكرور في غربي أفريقيا)[١١]، بل شمـل اهتمامـه منـشآت الأزهر الأخرى[١٢]، فلا يبعد أن يكون منها رواق الأكراد، لاسيما وأن هـذا الـرواق يقـع مجاوراً للمئذنة التي أنشأها عند باب الأزهر. وكان من أعمال هذا الأمير أنه أنـشأ في حي الحسينية سنة ١١٧٠هـ/ ١٧٥٦م جامعاً ضـم مجموعـة مـن أضـرحة الـصالحين،

عُرف بجامع الكردي، وذلك لأن أشهر تلك الأضرحة لرجل كردي يدعى شرف الدين، عرف بالصلاح وكثرة الكرامات، وقد توفي سنة ٦٦٧هـ/١٢٦٨م[١٣].

ومع أننا لا نملك وصفاً لما يشتمل عليه هذا الرواق إلاّ أن وصف الجبرتي لرواق الصعايدة يمكن أن يعطينا تصوراً لما كانت عليه الأروقة عامة، من ذلك أنه كان يضم " مرافق ومنافع ومطبخ ومخادع وخزائن كتب"، فهو إذاً يشبه أن يكون قسماً داخلياً متكاملاً بحسب مصطلح هذه الأيام. وبحكم تزايد عدد الطلبة الكرد في هذا الرواق وخارجه فقد زاد عدد الكتب في مكتبته، من ذلك أن الحاج عبدالرحمن كتخدا مستحفظان وقف ربعة قرآن شريف تجزئة ثلاثين ، على "أروقة الأكراد والصعايدة والشوام" في سنة ١١٧٤هـ/١٧٦٠م. وكانت هذه الربعة مؤرخة في رجب سنة ١١٦٦هـ/١٧٥٢م، ومعها كتاب التأويل في معاني التنزيل المشهور بتفسير الخازن، مؤرخة في سنة ١١٧٠هـ/١٧٥٦م، ويوجد نص الوقفية بظهر الصفحة الأولى من كل جزء. وأول الربعة محلى بالذهب والألوان، وفواصل الآي بالذهب، وما تزال هذه المخطوطة محفوظة في المكتبة الأزهرية حتى اليوم[١٤].

ومن المخطوطات التي وقفت على (رواق الأكراد) في هذا العصر مصحف نفيس وقفه الحاج أحمد تابع محمد كتخدا الملا علي، والمصحف في مجلدين مذهبين ملونين، وفي الصفحة الثالثة من المجلد الثاني نص الوقفية، وفي الصفحة الأخيرة ما يفيد أنه مكتوب قبل سنة ستمائة، ويقع في١٧٧ ورقة[١٥].

ووقف الحاج محمود بن أبي بكر الكردي مصحفاً سنة ١٢٤٥هـ/١٨٢٩م، ويقع المصحف في ٣٠٦ ورقة ، كتبت فواتح السور فيه بالمداد الأحمر، وفواصل الآي محلاة بالذهب[١٦].

كما وقفت السيدة عائشة بنت فاطمة مصحفاً على رواق الأكراد، على ما ورد في نص الوقفية الذي في أوله[١٧].

ووقف الخواجة فلك الدين بن نورالدين الجيلاني على رواق الأكراد الربع الأول من القرآن الكريم على رواق الأكراد، بحسب وقفية وردت في أوله، إلاّ أن هذه الوقفية خلت من تاريخها[١٨].

ووقف الحاج حسين الكردي، ويظهر أنه كان عالماً أو طالب علم، مصحفاً جميلاً على رواق الأعجام[١٩].

